ابوداود سليمان بن الاشعث السجستاني

هەزار فەرموودە لە فەرموودەکانی

# سوننەنی ئەبوداود






وەرگێڕانی

ناصح ابراهيم سازانی

بەرگی سێیەم

التفسير



# هەزار فەرموده
# لە فەرمودەکانی
# سونەنی ئەبو داود

## بەرگی سێیەم

لە فەرمودەی دووهەزاروچل و شەشر تا سێ هەزار و هەشتاوهەشت


نوسینی

أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني

وعليها أحكام العلامة المحدث محمد بن ناصرالدين الألباني

علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان

وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی




﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا
نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ
شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾

الحشر: ٧

# پێشەکی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنا وسَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَهَ إلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

لەدوايي دا:

خوای گەورەو پەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ۚ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر: ٧. واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر **صلى الله عليه وسلم** پـێ ی دان وەریبگرن, وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بێنن.

هەروەها پێغەمبەری خوا **صلى الله عليه وسلم** دەفەرمووێت: (مَنْ أحْدَثَ فِي أمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[1]. واتە: هەر کەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیـاد بکـات کە تیایدا نەبێت, ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و دەدرێتەدواوە.

پێشەوای فەرمودەناس ئەبو داود ناوی سـولەیمانی کـوڕی ئەشعەسـی کـوڕی بەشـیری کوڕی شەددادی کوڕی عەمری ئەئەزەدی ئەسسەجەستانییە لـە سـاڵی (٢٠٢)ی کۆچـی لەدایك بووەو لەساڵی (٢٧٥) لە بەسرە کۆچی دوایی کردووە.

خاوەنی سونەنی ئەبو داودە کە زۆر لە زانایان مەدحیان کردووەو پێیـان وایـە،س کـە لەدوای فەرمودە (صحیح)ەکانی پێشەوایان بوخاری و موسلیمەوە دێت.

ئەم پەرتوکە بەنرخـەش تـا ئێسـتا وەرنەگێڕراوەتـە سـەر زمـانی شـیرینی کـوردی, هەرچەندە ئێمەش کوڕی ئەو مەیدانە نین بەڵام بە پشتیوانی خوای گەورە بە باشمـان زانـی شان بدەینە بەر ئەو ئەرکە قورسەو وەریبگێڕین, دەق لەسەر کتێبی (سنن أبي داود حكم

---

[1] - مُتَفَقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري ٢٤١/٣ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ١٣٢/٥ ( ١٧١٨) ( ١٧ ) و( ١٨).

على أحاديثه وأثاره وعلق عليه العلامة المحدث محمد ناصرالدين الألباني, أعتنى به أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان). چاپی دووهەمی ساڵی ١٤٢٧ی کۆچی بەرامبەر بە ٢٠٠٧ی زایینی (مكتبة المعارف).

بۆ وەرگێڕانیشی سودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە.

١- (عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).

٢- (بذل المجهود في حل أبي داود لعلامة المحدث الكبير شيخ خليل أحمد سهارنفوري.

٣- شرح سنن أبي داود لعبدالمحسن العباد.

٤- تفسير سنن أبي داود (معالم السنن ) لأبي سليمان الخطابي.

٥- مختصر سن أبى داود للحافظ عبدالعظيم المنذرى.

لە پەروەردگاری باڵادەست دەپاڕێمەوە لێمان وەربگرێت بە (صەدەقەی جاریە)و (زانستی سوود لێ وەرگیراو).

إنه نِعمَ المَولى ونِعمَ النَصير.

وەرگێڕ

ناصح ئیبراهیم سازانی .

سلێمانی ساڵی ١٤٣٢ هـ - ٢٠١١ی ز.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای كتێبی هاوسەرگیری

# ٦ – أول الكتاب النكاح

## باسی هاندان لەسەر هاوسەرگیری.

## ١ – باب التَّحْرِيضِ عَلَى النِّكَاحِ.

٢٠٤٦ - (صحيح) عن علقمة قال: إِنِّى لأَمْشِى مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ بِمِنًى إِذْ لَقِيَهُ عُثْمَانُ, فَاسْتَخْلاَهُ, فَلَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّهِ أَنْ لَيْسَتْ لَهُ حَاجَةٌ قَالَ لِى: تَعَالَ يَا عَلْقَمَةُ, فَجِئْتُ, فَقَالَ لَهُ عُثْمَانُ: أَلاَ نُزَوِّجُكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ بِجَارِيَةٍ بِكْراً, لَعَلَّهُ يَرْجِعُ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ مَا كُنْتَ تَعْهَدُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ, لَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ, فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ, وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ, وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ, فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ).

واتە: لە عەلقەمەوە دەگێرنەوە, كە وتویەتی: لە مینا لەگەڵ (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی مەسعوددا دەڕۆیشتم, (عُثْمَان)ی رەزای خوای لێ بێ پێ گەیشت داوای لێ كرد كە

جیاببنەوە دوو بەدوو کۆبوونەوە, کاتێ کە بینی (عَبْدُ اللَّه) پیویستی بە هاوسەرگیری نیە یان کاتێ کە گفتوگۆی نێوانیان تەواو بوو پێی وتم: ئەی عەلقەمە وەرە, منیش چووم بۆ لایان, (عُثْمَان) پێی وت: ئەی باوکی (عَبْدُ الرَّحْمَن) با کەنیزەکێکی کچت بۆ مارە بکەم بەڵکو چالاکی و هێزی جەستەت بۆ بگەڕێنێتەوەو سەردەمی لاویت بۆ نوێ بکاتەوە؟ چونکە ژنهێنان ژیانەوەیە بۆ جەستە, (عَبْدُ اللَّه) وتی: ئەمەی تۆ وتت تەواوە, بێگومان لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بیستووە دەیفەرموو: (ئەی لاوەکان هەر یەکێك لە ئێوە ئەگەر توانای هاوسەرگیری هەیە با ژن بهێنێت, چونکە ژن هێنان ئەبێتە هۆی چاوگرتنەوە لە سەیرکردنی حەرام و, خۆپاراستن لە زیناکردن و بەدرەوشتی, ئەوەشی توانای نیە ژن بهێنێت با بەڕۆژوو بێت, چونکە ڕۆژوو ئەیخەسێنێ و هۆکارێکی گرنگە بۆ دامرکاندنەوەی حەزو ئارەزوە ناپەسەندەکانی ئەو کەسە ئەپارێزێت لە خراپەو تاوان).

## باسی ئەوەی کە فەرمانی پێکراوە مارەکردنی ئافرەتی دیندارە

## ٢ - باب مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنْ تَزْوِيجِ ذَاتِ الدِّينِ

**٢٠٤٧ - (صحيح) عن أبي هريرة, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (تُنْكَحُ النِّسَاءُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا, وَلِحَسَبِهَا, وَلِجَمَالِهَا, وَلِدِينِهَا, فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە, کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئافرەت لەبەر چوار شت دەخوازرێت: لەبەر سامان و ماڵەکەی, یان لەبەر ناوداری بنەماڵەکەی, یا لەبەر جوانی و شۆخ و شەنگیەکەی, یاخود لەبەر دین و

ڕەوشتەکەی, جاتۆش ئەی ئەو کەسەی ئەتەوێ ژن بهێنی دیندارەکە هەڵبژێرەو ئاوڕ مەدەرەوە بەلای ماڵ و سامان و شتی تردا تادەستت پڕ بەرەکەت بێت, ئەگەر وا نەکەیت دەستت بەقوڕدا چێت).

## باسی دەربارەی مارەکردنی کچان.

## ٣ – باب فِي تَزْوِيجِ الأَبْكَارِ.

**٢٠٤٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: قَالَ: لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَتَزَوَّجْتَ). قُلْتُ: نَعَم, قَالَ: (بِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا). فَقُلْتُ: ثَيِّبًا, قَالَ: (أَفَلاَ بِكْرٌ تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە, کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم: (ژنت هێناوە), وتم: بەڵێ, فەرمووی: (کچت هێناوە یان بێوەژن), وتم بێوەژن, فەرمووی: (بۆ کچت نەهێنا بۆ ئەوەی گەمەت لەگەڵدا بکات و گەمەی لەگەڵ بکەیت؟ ئەوکاتە دڵخۆش ئەبوون بەیەکتر و چاکتر بەیەکەوە دەگونجان).

# باسی نەهی کردن لە هێنانی ئەو ئافرەتانەی کە منداڵیان نابێت.

## ٤ – باب النَّهْيِ عَنْ تَزْوِيجِ مَنْ لَمْ يَلِدْ مِنَ النِّسَاءِ.

**٢٠٤٩ - (صحيح) عن ابن عباس قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ! قَالَ: (غَرِّبْهَا). قَالَ: أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي. قَالَ: (فَاسْتَمْتِعْ بِهَا).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە, کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: ژنەکەم دەست بەڕووی کەسەوە نانێ! هەرکەس بیەوێ دەستی بۆ بەرێ یان کاری خراپی لەگەڵ بکات ڕێگری لە نەفسی خۆی ناکات, یان هەرکەسێ داوای شتێ لە ماڵی مێردەکەی لێ بکات ڕێگری لێ ناکات! فەرمووی: (لێی دووربکەوەرەوە, تەڵاقی بدە), وتی: ئەترسم دوایی دڵم بۆی لێ بدات و بکەومە ناو حەرامەوە, فەرمووی: (بیهێڵەرەوە و چاودێری بکەو چێژی لێ وەربگرە).

**٢٠٥٠– (حسن صحيح) عن معقل بن يسار قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّي أَصَبْتُ امْرَأَةً ذَاتَ حَسَبٍ وَجَمَالٍ وَإِنَّهَا لاَ تَلِدُ, أَفَأَتَزَوَّجُهَا قَالَ: (لاَ). ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَنَهَاهُ, ثُمَّ أَتَاهُ الثَّالِثَةَ, فَقَالَ: (تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُودَ فَإِنِّي مُكَاثِرٌ بِكُمُ الأُمَمَ).**

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە هاتووە, کە وتویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی گوت: من ئافرەتێکی خانەدان و خاوەن سامان و جوانم خۆشدەوێ و ئەمەوێ خوازبێنی بکەم بەلاّم منالّی نابێ, ئایا بیکەمە هاوسەری خۆم؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێگەی نەدا فەرمووی: (نەخێر مەیهێنە), لەپاشدا دووەم جار هاتەوەو بەهەمان شێوە ڕێگەی نەدا, جا سێیەم جار هاتەوە پێی فەرموو: (ئەو ئافرەتانە بکەنە هاوسەری خۆتان کە منالّیان ئەبێ و خاوەنی خۆشەویستی و ئەوینن, چونکە من شانازی بەزۆریتانەوە دەکەم لەناو گەل و نەتەوەکانی تردا, حەزیش دەکەم ژمارەتان زۆر بێ). - بێگومان ئافرەت دایك و خوشك و پورەکانی دەکرێت بە پێوەر بۆی بۆ ئەوەی بزانرێت کە وەچە دەخاتەوە و خاوەنی خۆشەویستی و ئەوینە یان نا-.

## باسی دەربارەی ئایەتی: (ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً)

## ٥ - باب فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً)

٢٠٥١ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب, عن أبيه, عن جده, أَنَّ مَرْثَدَ بْنَ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ كَانَ يَحْمِلُ الأُسَارَى بِمَكَّةَ, وَكَانَ بِمَكَّةَ بَغِيٌّ يُقَالُ لَهَا: عَنَاقُ, وَكَانَتْ صَدِيقَتَهُ, قَالَ: جِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ, فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْكِحُ عَنَاقَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ عَنِّي, فَنَزَلَتْ :(وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ). فَدَعَانِي فَقَرَأَهَا عَلَيَّ وَقَالَ: (لاَ تَنْكِحْهَا).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە, لە باوکیەوە, لە باپیریەوە دەگێڕنەوە, کە (مَرْثَدَ)ی کوڕی (أَبِی مَرْثَدَ)ی غەنەوی دیلی لە مەککەوە دەهێنا بۆ مەدینە, لە مەککە ئافرەتێکی بەرەڵای داوێن پیس هەبوو ناوی: عەناق بوو, لەسەردەمی نەفامی دا دۆستی (مَرْثَدَ) بوو, وتی: هاتمە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عەناق مارە بکەم؟ وتی: قسەی نەکردو بێ دەنگ بوو, ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ) سورة النور: ٣. واتە: ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکات پیاوی زیناکەر یان پیاوی موشریك نەبێ. (مَرْثَدَ) وتی: بانگی کردم ئایەتەکەی بۆ خوێندمەوەو فەرمووی: (مارەی نەکەیت).

**٢٠٥٢ - (صحيح) عن أبي هريرة, قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَنْكِحُ الزَّانِي الْمَجْلُودُ إِلاَّ مِثْلَهُ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە, کە وتویەتی پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم فەرموویەتی: (زیناکەری تۆڵە لێ سەندراو نابێ یەکێکی وەك خۆی نەبێت بیهێنێت).

## باسی دەربارەی کەسێ کەنیزەکەی خۆی ئازاد بکات و لەپاشدا مارەی بکات.

## ٦ – باب فِي الرَّجُلِ يَعْتِقُ أَمَتَهُ ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا.

**٢٠٥٣ - (صحيح) عن أبو موسى قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ أَعْتَقَ جَارِيَتَهُ وَتَزَوَّجَهَا كَانَ لَهُ أَجْرَانِ).**

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێرنەوە, کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەس کەنیزەکەی خۆی ئازاد بکات و مارەی بکات دوو پاداشتی بۆ هەیە، پاداشتی ئازادکردنی و پاداشتی مارەکردنی).

**٢٠٥٤ - (صحيح) عن أنس بن مالك, أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْتَقَ صَفِيَّةَ وَجَعَلَ عِتْقَهَا صَدَاقَهَا.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە, کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) صەفیەی ئازاد کرد, ئازادکردنەکەی کردە مارەیی بۆی و مارەی کرد لەخۆی.

## باسی ئەو ئافرەتانەی بەهۆی خزمایەتیەوە حەرام دەبن بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبن.

## ٧ - باب يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ.

٢٠٥٥ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه و سلم، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلاَدَةِ).

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە, كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی بەهۆی خزمایەتی لەدایك بوونەوە حەرام ببێ بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبێ.

٢٠٥٦ - (صحيح) عن أم سلمة, أن أم حبيبة قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ, هَلْ لَكَ فِي أُخْتِي؟ قَالَ: (فَأَفْعَلُ مَاذَا؟). قَالَتْ: فَتَنْكِحُهَا. قَالَ: (أُخْتَكِ). قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: (أَوَتُحِبِّينَ ذَاكِ). قَالَتْ: لَسْتُ بِمُخْلِيَةٍ بِكَ, وَأَحَبُّ مَنْ شَرَكَنِي فِي خَيْرٍ أُخْتِي, قَالَ: (فَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِي). قَالَتْ: فَوَاللَّهِ لَقَدْ أُخْبِرْتُ أَنَّكَ تَخْطُبُ دُرَّةَ - أَوْ ذَرَّةَ, شَكَّ زُهَيْرٌ - بِنْتَ أَبِي سَلَمَةَ. قَالَ: (بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ). قَالَتْ: نَعَمْ, قَالَ: (أَمَا وَاللَّهِ لَوْ لَمْ تَكُنْ رَبِيبَتِي فِي حِجْرِي

**مَا حَلَّتْ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، أَرْضَعَتْنِي وَأَبَاهَا ثُوَيْبَةُ، فَلاَ تَعْرِضْنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ).**

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە هاتووە، کە ئوممو حەبیبە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆچی خوشکەکەم مارە ناکەیت؟ فەرمووی: (چی بکەم؟). وتی: مارەی بکەو بیکەرە هاوسەری خۆت، فەرمووی: (خوشکەکەت مارە بکەم؟). وتی: بەڵێ. فەرمووی: (جا پێت خۆشە). وتی: ئەوە نەبێ کە تەنیا هەر من ژنت بم و تۆ تەنیا هەر بۆ من بیت، خۆشەویسترین کەسیش کە هاوبەشم بێ لە بەهرەی هاوسەرێتی تۆدا ئەو خوشکەمە بۆیە حەزدەکەم مارەی بکەی، هەتا ئەو سەربەرزی و شانازیەش بەو ببڕێت، فەرمووی: (بێگومان ئەو کارە حەڵاڵ نیە بۆ من - چونکە مارەکردنی دوو خوشك پێکەوە حەڵاڵ نیە - ). وتی: سوێند بە (الله) پێم گەیشتوە کە تۆ دەتەوێ خوازبێنی (دُرَّةَ) یان (ذَرَّةَ)ی کچی ئەبو سەلەمە بکەیت — راوی زوهەیر گومانی هەبوو لەسەر (دُرَّةَ) یان (ذَرَّةَ) — ، فەرمووی: (کچی ئوممو سەلەمەی خێزانم). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەوە راست نیە، ئەگەر ئەو کچی ئوممو سەلەمەی خێزانیشم نەبوایەو خۆم بەخێوم نەکردایە هەر حەڵاڵ نەبوو بۆم، چونکە ئەوە برازای شیریمە، (ثُوَيْبَة) شیری داوە بە من و بە باوکی ئەو، ئیتر لەمەولا نە کچەکانتان نە خوشکەکانتان پێشنیار مەکەن بۆ من کە مارەیان بکەم).

## باسی سەبارەت بە مێردی ئافرەتە شیردەرەکە کە ئایا شیرخۆرەکە وەك منداڵی ئەوی لێ دێ یان نا؟

## ٨ - باب فِي لَبَنِ الْفَحْلِ.

٢٠٥٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَخَلَ عَلَيَّ أَفْلَحُ بْنُ أَبِي الْقُعَيْسِ فَاسْتَتَرْتُ مِنْهُ. قَالَ: تَسْتَتِرِينَ مِنِّي وَأَنَا عَمُّكِ؟ قَالَتْ: قُلْتُ: مِنْ أَيْنَ؟ قَالَ: أَرْضَعَتْكِ امْرَأَةُ أَخِي. قَالَتْ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِي الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِي الرَّجُلُ! فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَحَدَّثْتُهُ فَقَالَ: (إِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە, کە وتویەتی: ئەفلەحی کوڕی ئەبو قوعەیس هات بۆ سەردانم منیش خۆم لێ حەشاردا بۆ ئەوەی نەمبینێ, وتی: خۆتم لێ حەشاردەدەی لەکاتێکدا کە من مامی تۆم؟ وتی: وتم: لە کوێوە؟ وتی: براژنم شیری پێ داوی شیری براژنی منت خواردوە, وتی: ژن شیری پێ داوم خۆ شیری پیاوم نەخواردوە, پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتە ژوورەوە بۆلام منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە, فەرمووی: (ئەوە مامی تۆیە یەکێکە لە مەحرەمەکانت با سەردانت بکات).

## باسی دەربارەی شیردان بە کەسی گەورە.

## ٩ - باب فِي رَضَاعَةِ الْكَبِيرِ.

٢٠٥٨ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها, أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا رَجُلٌ, قَالَ حَفْصٌ: فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ, - ثُمَّ اتَّفَقَا - قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ. فَقَالَ: (انْظُرْنَ مَنْ إِخْوَانُكُنَّ فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە, کە جارێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) رۆشتە ژوورەوە بۆلای لەوکاتەدا پیاوێ لەلای دانیشتبوو, حەفص وتی: لەلای قورس و گران بوو روخساری گۆڕاو تورەیی پێوە دیاربوو — لەپاشدا هەردوو راوی یەکدەنگن — عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە برای شیریمە, فەرمووی: (باش بزانن و سەرنج بدەن لە خوشك و برای شیریتان, چونکە شیرخواردن ئەوەیە لەبەر برسێتی بێت - کاتێ دامەزراو و کاریگەری دەبێت کە لەکاتی ساوایدا لەبەر برسێتی ئەو شیرە بخوات).

٢٠٥٩ - (صحيح) عن ابن مسعود قال: لاَ رِضَاعَ إِلاَّ مَا شَدَّ الْعَظْمَ وَأَنْبَتَ اللَّحْمَ. فَقَالَ أَبُو مُوسَى: لاَ تَسْأَلُونَا وَهَذَا الْحَبْرُ فِيكُمْ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێرنەوە, کە وتویەتی: شیرخواردن ئەوەیە کە ئێسك

بەهێز و پتەو بكات و گۆشتی پێ بگیرێت واتە منداڵەكە لەجیاتی خواردن بیخوات, ئەبو موسا وتی ئیتر پرسیار لە ئێمە مەكەن چونكە ئەوە كەڵە زانایە لەناوتاندا.

٢٠٦٠ - (ضعيفK والصواب وقفه, وهو الذي قبله) عن ابن مسعود, عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ، وَقَالَ: أَنْشَزَ الْعَظْمَ.

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە هاتووە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جـا راوی بە هەمان مانا فەرمودەی ناوبراوی گێڕایەوە، وتی: شیر خواردن ئەوەیە،كە ئێسك گەورە و بەهێز بكات.

## باسی ئەگەر كەسێكی گەورە شیری ئافرەتێكی خوارد چ كەسێ دەبێتە مەحرەم بۆی.

## ١٠ – باب مَنْ حَرَّمَ بِهِ.

٢٠٦١ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه و سلم وأم سلمة: أَنَّ أَبَا حُذَيْفَةَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ كَانَ تَبَنَّى سَالِمًا، وَأَنْكَحَهُ ابْنَةَ أَخِيهِ هِنْدَ بِنْتَ الْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَهُوَ مَوْلًى لامْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، كَمَا تَبَنَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدًا، وَكَانَ مَنْ تَبَنَّى رَجُلاً فِي الْجَاهِلِيَّةِ دَعَاهُ النَّاسُ إِلَيْهِ وَوُرِّثَ مِيرَاثَهُ، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فِي ذَلِكَ: ( ٱدْعُوهُمْ لِآبَآئِهِمْ). إِلَى قَوْلِهِ:

(فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ ). فَرُدُّوا إِلَى آبَائِهِمْ، فَمَنْ لَمْ يُعْلَمْ لَهُ أَبٌ كَانَ مَوْلًى وَأَخًا فِي الدِّينِ. فَجَاءَتْ سَهْلَةُ بِنْتُ سُهَيْلِ بْنِ عَمْرٍو الْقُرَشِيِّ ثُمَّ الْعَامِرِيِّ - وَهِيَ امْرَأَةُ أَبِي حُذَيْفَةَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا نَرَى سَالِمًا وَلَدًا وَكَانَ يَأْوِي مَعِي وَمَعَ أَبِي حُذَيْفَةَ فِي بَيْتٍ وَاحِدٍ وَيَرَانِي فُضْلاً وَقَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِمْ، مَا قَدْ عَلِمْتَ فَكَيْفَ تَرَى فِيهِ؟ فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (أَرْضِعِيهِ). فَأَرْضَعَتْهُ خَمْسَ رَضَعَاتٍ فَكَانَ بِمَنْزِلَةِ وَلَدِهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ فَبِذَلِكَ كَانَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا تَأْمُرُ بَنَاتِ أَخَوَاتِهَا وَبَنَاتِ إِخْوَتِهَا أَنْ يُرْضِعْنَ مَنْ أَحَبَّتْ عَائِشَةُ أَنْ يَرَاهَا وَيَدْخُلَ عَلَيْهَا، وَإِنْ كَانَ كَبِيرًا خَمْسَ رَضَعَاتٍ، ثُمَّ يَدْخُلَ عَلَيْهَا، وَأَبَتْ أُمُّ سَلَمَةَ وَسَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُدْخِلْنَ عَلَيْهِنَّ بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ حَتَّى يَرْضَعَ فِي الْمَهْدِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللَّهِ مَا نَدْرِي لَعَلَّهَا كَانَتْ رُخْصَةً مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِسَالِمٍ دُونَ النَّاسِ؟!.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) و ئوممو سەلەمەوە دەگێڕنەوە، کە (أَبَا حُذَيْفَةَ)ی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدی شەمش سالمی کردبو بە کوڕی خۆی، برازاکەی خۆی لێ مارە کرد هیندی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، سالم خزمەتکاری ئافرەتێکی ئەنصاری بوو، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى

الله عليه وسلم) زەیدی كردبو بە كوڕی خۆی، لەسەردەمی نەفامی دا هەركەس یەكێكی بكردایە بە كوڕی خۆی بە (تبنی)كوڕكراو ئەوە بە كوڕی ئەو كەسە بانگ دەكراو دەناسرا میراتی لەماڵی ئەو كەسە پێ دەبرا، هەتا خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ). واتە: (ئەو بە كوڕكراوانە) بەناوی باوكیانەوە بانگیان بكەن. هەتا: (فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ). واتە: ئینجا ئەگەر باوكیان نەناسن (تا بەناویانەوە بانگیان بكەن) ئەوانە برای دینی و دۆست و خۆشەویستانن.

سەهلەی كچی سوهەیلی كوڕی عەمری قورەشی لەپاشدا عامیری، كە هاوسەری (أبي حُذَيْفَةَ) بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەوسا ئێمە (سالم)مان بەكوڕی خۆمان دەزانی و لەگەڵ (أبي حُذَيْفَةَ)دا دەهاتە ژوورەوە بۆ لامان دەمایەوەو بەكراسێكەوە منی دەبینی - واتە سەرو، گەردن و، دەستەكان و، پێكانی دەبینی - ، خۆشت دەزانی خوای گەورە چی ئایەتێكی ناردۆتە خوارەوە دەربارەیان، سالمیش گەورە بووە تۆ لەبارەیەوە چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (شیری بدەرێ). سەهلە پێنج جار شیری دایە، ئیتر بەو شیرە سالم وەك كوڕی خۆی لێهات، لەبەر ئەوە عائیشەش ڕەزای خوای لێ بێ فەرمانی كرد بە كچی خوشكەزاكانی و كچی برازاكانی شیر بدەن بەو كەسانەی كە عائیشە پێی خۆشە بیان بینێ و سەردانی بكەن، ئەگەر گەورەش بوون، پێنج جار شیریان بدەنێ، لەپاشدا بچنەژوورەوە بۆلای، بەڵام ئوممو سەلەمەو هاوسەرەكانی تری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەو جۆرە شیرخواردنە ڕێگەیان نەدەدا ئەو كەسانە سەردانیان بكەن و بیانبینن هەتا بە ساوایی شیریان نەخواردایە، وتیان بە عائیشە: سوێند بە (الله) ئێمە نازانین لەوانەیە ئەو ڕوخسەتە تەنیا بۆ سالم بێت بۆ هیچ كەسێكی تر نەبێت لە خەڵك[1].

---

[1] - شەرعزانەكان پێیان وایە كە مەبەست لە شیردان لێرەدا ئەمەیە كە سوهەیلە شیری خۆی كردۆتە دەفرێكەوەو ناردویەتی بۆ سالم بۆ ئەوەی بیخواتەوە, سوهەیلە پێنج جار ئەم كارەی دوبارە كردۆتەوە بەوەش بووە بە مەحرەمی. لە كتێبی (سنن أبي داود) وەرگیراوە.

# باسی ئایا لە پێنج جار کەمتر ئافرەت و پیاو لەیەکتر حەرام دەکات؟

# ١١ - باب هَلْ يُحَرِّمُ مَا دُونَ خَمْسِ رَضَعَاتٍ؟

**٢٠٦٢ - (صحيح) عن عائشة أنها قالت: كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، فَتُوُفِّيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُنَّ مِمَّا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لەپێشدا ئەمە ئایەتی قورئان بوو: (عَشْرُ رَضَعَاتٍ يُحَرِّمْنَ). واتە: دە ژەم شیرخواردنی دیاریکراو، ئافرەت و پیاو لەیەك حەرام دەکەن. لەپاشدا ئەم دە ژەمە هەڵوەشایەوە و بوو بە پێنج ژەم: (خَمْس مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ). واتە: پێنج ژەم شیرخواردنی دیاریکراو، ئافرەت و پیاو لەیەك حەرام دەکەن. لەدوایدا ئەمەش نەسخ بودوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد هەندێ کەس هەر بە قورئانیان دەزانی و دەیانخوێندەوە.

**٢٠٦٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلاَ الْمَصَّتَانِ).**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مژێك و دوو مژ شیرخواردن ئافرەت حەرام ناکات.

## باسی شیردان لەدوای لەشیربڕینەوە.

## ١٢ – باب فِي الرَّضْخِ عِنْدَ الْفِصَالِ.

**٢٠٦٤ - (ضعيف) عن حجاج بن حجاج، عن أبيه قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يُذْهِبُ عَنِّي مَذَمَّةَ الرَّضَاعَةِ، قَالَ: (الْغُرَّةُ الْعَبْدُ أَوِ الأَمَةُ).**

واتە: لە حەججاجی کوڕی حەججاجەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چ شتێ حەقی منداڵی شیرەخۆرەم لەسەر ناهێڵێت هەتا جێبەجێی بکەم بەتەواوی، فەرمووی: (پێشکەشکردنی بەندەیەك ئیتر نێر بێت یان مێ).

## باسی ئەو ئافرەتانەی کە مارەکردنیان پێکەوە حەرامە.

## ١٣ – باب مَا يُكْرَهُ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُنَّ مِنَ النِّسَاءِ.

**٢٠٦٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلاَ الْعَمَّةُ عَلَى بِنْتِ أَخِيهَا، وَلاَ الْمَرْأَةُ عَلَى خَالَتِهَا، وَلاَ الْخَالَةُ عَلَى بِنْتِ أُخْتِهَا، وَلاَ تُنْكَحُ الْكُبْرَى عَلَى الصُّغْرَى، وَلاَ الصُّغْرَى عَلَى الْكُبْرَى).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئافرەت کۆناکرێتەوە لەگەڵ پوریدا ئیتر خوشکی باوکی بێت یان خوشکی دایکی، یان خوشکی دایکی باوکی بێت، پوریش کۆناکرێتەوە لەگەڵ کچی خوشکەکەی و کچی براکەیدا، ئافرەت کۆناکرێتەوە لەگەڵ پوریدا ئیتر خوشکی دایکی بێت یان خوشکی باوکی دایکی بێت، گەورە مارەناکرێت بەسەر بچوکدا، بچوکیش مارەناکرێت بەسەر گەورەدا.

**٢٠٦٦ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا، وَبَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەی کردوە ئافرەت کۆبکرێتەوە لەگەڵ پوریدا ئیتر خوشکی باوکی بێت یان خوشکی دایکی.

**٢٠٦٧ - (ضعيف) عن أبن عباس، عن النبي صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ الْعَمَّةِ وَالْخَالَةِ، وَبَيْنَ الْخَالَتَيْنِ وَالْعَمَّتَيْنِ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله عنه وسلم) قەدەغەیکردوە ئافرەت کۆبکرێتەوە لەگەڵ پوریدا ئیتر خوشکی باوکی بێت یان خوشکی دایکی، هەروەها لەگەڵ دوو پور پێکەوە.

**٢٠٦٨ - (صحيح) عن عروة بن الزوبير: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا**

تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ )؟ قَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي هِيَ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حِجْرِ وَلِيِّهَا، فَتُشَارِكُهُ فِي مَالِهِ، فَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ أَنْ يَتَزَوَّجَهَا بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا فَيُعْطِيَهَا مِثْلَ مَا يُعْطِيهَا غَيْرُهُ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوهُنَّ، إلاَّ أَنْ يُقْسِطُوا لَهُنَّ وَيَبْلُغُوا بِهِنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ مِنَ الصَّدَاقِ، وَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ. قَالَ عُرْوَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ اسْتَفْتَوْا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ فِيهِنَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ( وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ ). قَالَتْ: وَالَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ أَنَّهُ يُتْلَى عَلَيْهِمْ فِي الْكِتَابِ الآيَةُ الأُولَى الَّتِي قَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ). قَالَتْ عَائِشَةُ: وَقَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي الآيَةِ الآخِرَةِ: (وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ). هِيَ رَغْبَةُ أَحَدِكُمْ عَنْ يَتِيمَتِهِ الَّتِي تَكُونُ فِي حِجْرِهِ حِينَ تَكُونُ قَلِيلَةَ الْمَالِ وَالْجَمَالِ، فَنُهُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا رَغِبُوا فِي مَالِهَا وَجَمَالِهَا مِنْ يَتَامَى النِّسَاءِ إلاَّ بِالْقِسْطِ مِنْ أَجْلِ

رَغْبَتِهِمْ عَنْهُنَّ. قَالَ يُونُسُ: وَقَالَ رَبِيعَةُ فِي قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى) قَالَ: يَقُولُ: اتْرُكُوهُنَّ إِنْ خِفْتُمْ فَقَدْ أَحْلَلْتُ لَكُمْ أَرْبَعًا.

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە لە عائیشەی پوری ڕەزای خوای لێ بێ پرسیوە دەربارەی ئەم ئایەتە: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ)؟ سورة النساء: ٣. واتە: وە ئەگەر ترسان دادپەروەر نەبن لە (مارەیی) ئەو ئافرەتە بێ باوکانەدا (مارەیان مەکەن)، ئەوە مارە بکەن لەو ئافرەتانەی حەڵاڵن بۆتان.

عائیشە وتی: ئەی خوشکەزای خۆم، ئەم ئایەتە دەربارەی کچانی بێ باوك هاتەخوارەوە کە لە ماڵی سەرپەرشتیکارەکانیاندا بن - واتە لەلای ئامۆزا یان کوڕانی ئامۆزایان بن — جا ئەو سەرپەرشتیکارە لەبەر سامان و ماڵی کچەکە یان لەبەر جوانیەکەی بچێت مارەی بکات لەخۆی، ئەوەندەی کە گونجاوە مارەیی پێ نادا، بۆیە خوای گەورە نەهی لێ کردن کە کاری لەو شێوە بکەن، مەگەر وەك ژنانی تر مارەییان پێ بدەن و ناهەقیان بەرامبەر نەکەن، ئەوە لەو حاڵەتەدا دروستە مارەیان بکەن، ئەگینا خوای گەورە فەرمانی پێ کردون کە ژنانی تر مارە بکەن.

عوروە وتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: خەڵکەکە لەدوای هاتنی ئەم ئایەتەوە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بۆیان ڕون بکاتەوە، خوای گەورە لە وەڵامدا ئەم ئایەتەی تری ناردەخوارەوە: (وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ فِي يَتَامَى النِّسَاءِ الَّتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ). سورة النساء: ١٢٧. واتە: وە (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئافرەتان، بڵێ خوا وەڵامتان دەداتەوە دەربارەیان، وە ئەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئاندا (وەڵامێکە) لەبارەی کچانی هەتیوەوە ئەوانەی

پێیان نادەن ئەوەی نووسراوە بۆیان (واتە میراتی باوكیان)، وە حەز ناكەن مارەیان بكەن (لەبەر میراتەكەشیان ناهێڵن شوو بكەن).

عائیشە رەزای خوای لێ بێ وتی: ئەوەی كە خوای گەورە باسی دەكات لە قورئاندا بۆتان دەخوێنرێتەوە، ئایەتەكەی یەكەمە كە خوای گەورە لەوێدا فەرمووی: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ) سورة النساء: ٣.

هەروەها وتیشی: وە ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە لە ئایەتەكەی تردا: (وَتَرْغَبُونَ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ). لەبەرئەوەیە كە هەندێك لە ئێوە ئەگەر سەرپەرشتیكاری كچێكی هەتیو بوو، ماڵ و سامانی كەم بوو، وە جوانیش نەبوو، ئەوا حەزناكات مارەی بكات بۆ خۆی، بەلاَم ئەگەر جوان بوو ماڵ و سامانیشی زۆربوو، ئەوا لەبەر بەرژەوەندی خۆیان مارەیان دەكەن بۆ خۆیان مافی تەواوی خۆیان پێ نادەن، جا خوای گەورە رێگەی شتی وایان پێ نادات، مەگەر دادپەروەربن لەگەڵیان.

یونوس وتی: دەربارەم ئەم ئایەتە: (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَـٰمَىٰ)النساء: ٣. رەبیعە وتی: دەفەرموێت: ئەگەر ترسان دادپەروەرنەبن وازیان لێ بهێنن، بچن ژنی تر بهێنن هەتا چوار بۆتان حەلاَڵە.

٢٠٦٩ – (صحيح) عن علي بن الحسين رضي الله عنهما: أَنَّهُمْ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ مِنْ عِنْدِ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ مَقْتَلَ الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيّ رضى الله عنهما لَقِيَهُ الْمِسْوَرُ بْنُ مَخْرَمَةَ، فَقَالَ: لَهُ هَلْ لَكَ إِلَيَّ مِنْ حَاجَةٍ تَأْمُرُنِي بِهَا؟ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: لاَ. قَالَ: هَلْ أَنْتَ مُعْطِيَّ سَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَغْلِبَكَ الْقَوْمُ عَلَيْهِ؟ وَايْمُ اللَّهِ لَئِنْ أَعْطَيْتَنِيهِ لاَ يُخْلَصُ إِلَيْهِ أَبَدًا حَتَّى يَبْلُغَ إِلَى نَفْسِي إِنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي

طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ خَطَبَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ عَلَى فَاطِمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَخْطُبُ النَّاسَ فِي ذَلِكَ عَلَى مِنْبَرِهِ هَذَا، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ مُحْتَلِمٌ، فَقَالَ: (إِنَّ فَاطِمَةَ مِنِّي وَأَنَا أَتَخَوَّفُ أَنْ تُفْتَنَ فِي دِينِهَا). قَالَ: ثُمَّ ذَكَرَ صِهْرًا لَهُ مِنْ بَنِي عَبْدِ شَمْسٍ فَأَثْنَى عَلَيْهِ فِي مُصَاهَرَتِهِ إِيَّاهُ فَأَحْسَنَ، قَالَ: (حَدَّثَنِي فَصَدَقَنِي، وَوَعَدَنِي فَوَفَّى لِي، وَإِنِّي لَسْتُ أُحَرِّمُ حَلاَلاً وَلاَ أُحِلُّ حَرَامًا، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لاَ تَجْتَمِعُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ وَبِنْتُ عَدُوِّ اللَّهِ مَكَانًا وَاحِدًا أَبَدًا).

واتە: لە عەلی کوڕی حوسەین (زين العابدين)ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، ئەدوای کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلی رەزای خوایان لێ بێ، لەلایەن یەزیدی کوڕی موعاویەوە نێردرانەوە بۆ شاری مەدینە، میسوەری کوڕی مەخرەمەی پێ گەیشت لە مەدینە، پێی وت: هەر پێویستیەکت هەیە فەرمانم پێ بکە هەتا بۆتی جێبەجێ بکەم؟ وتی: وتم نا، وتی: ئایا شمشێرەکەی پێغەمبەری خوایان (صلى الله عليه وسلم) داوە بە تۆ، من دەترسم ئەم قەومە بەزۆر لێتی بسەنن، سوێند بە (الله) ئەگەر بیدەی بە من هەتا لەژیاندا مابم کەس دەستی نایگاتێ، بێگومان عەلی کوڕی (أَبِي طَالِبٍ) رەزای خوای لێ بێ داوای کچی ئەبو جەهلی کرد بەسەر (فَاطِمَة)دا رەزای خوای لێ بێ گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو لەسەر ئەم مینبەرەی خۆی وتاری بۆ خەڵك دەخوێندەوە، ئەوکاتە من باڵغ بووم، فەرمووی: ( (فَاطِمَة) لە منەو دەترسم کە تووشی بەڵاو فیتنە ببێت لە دینەکەیدا). راوی وتی: لەپاشدا باسی زاوایەکی تری کرد کە لە بەنی (عبد الشمس) بوو، بە چاکی ستایشی کرد بۆ ئەو زاوایەتیەی و چاکیەی، فەرمووی: (هەرچی وت راستی کرد

لەگەڵمدا، بەڵێنی پێدام و بەجێی هێنا، وە من حەرام حەڵاڵ ناکەم، وە حەرام حەڵاڵ ناکەم، بەڵام سوێند بە (الله) هەرگیز کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و کچی دوژمنێکی خوای گەورە لەیەك شوێندا کۆنابنەوە).

**٢٠٧٠ - (صحيح) عن ابن أبي مليكة، بهذا الخبر، قال: فَسَكَتَ عَلِيٌّ عَنْ ذَلِكَ النِّكَاحِ.**

واتە: لە ئیبنو ئەبو مولەیکەوە هەمان بەسەرهات هاتووە، وتی: ئیتر پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ لەو هاوسەرگیریە بێدەنگ بوو، پەشیمان بویەوە.

**٢٠٧١ - (صحيح) عن المسور بن مخرمة: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (إِنَّ بَنِى هِشَامِ بْنِ الْمُغِيرَةِ اسْتَأْذَنُونِى أَنْ يُنْكِحُوا ابْنَتَهُمْ مِنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِى طَالِبٍ، فَلاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، ثُمَّ لاَ آذَنُ، إِلاَّ أَنْ يُرِيدَ ابْنُ أَبِى طَالِبٍ أَنْ يُطَلِّقَ ابْنَتِي وَيَنْكِحَ ابْنَتَهُمْ! فَإِنَّمَا ابْنَتِى بَضْعَةٌ مِنِّى، يُرِيبُنِى مَا أَرَابَهَا، وَيُؤْذِينِى مَا آذَاهَا).**

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێرنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە لەسەر مینبەر فەرموویەتی: ( بەنی هاشمی کوڕی موغیرە داوای ئەوەم لێ دەکەن رێیان بدەم کە کچی خۆیان بدەن بە عەلی کوڕی (أَبِی طَالِبٍ)، منیش هەرگیز رێیان پێ نادەم،لەپاشدا رێیان پێ نادەم، لەپاشدا رێیان پێ نادەم، مەگەر کوڕی (أَبِی طَالِبٍ) کچەکەم تەڵاق بدات و کچەکەی ئەوان بهێنێت، چونکە (فَاطِمَة) پارچەیەکە لە

حەستەی من، ئەوەی توشی شك و گومانی بکات ئەوە من توشی شك و گومان دەکات، هەرچی ئازار بەو بگەیەنێت بەمنیشی دەگەیەنێت).

## باسی سەبارەت بە حەرام بوونی هاوسەرگیری کاتی[1].

## ١٤ – باب فِي نِكَاحِ الْمُتْعَةِ.

**٢٠٧٢ – (شاذ، والمحفوظ زمن فتح، كما سيأتي) عن الزهري قال: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فَتَذَاكَرْنَا مُتْعَةَ النِّسَاءِ فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ رَبِيعُ بْنُ سَبْرَةَ: أَشْهَدُ عَلَى أَبِي أَنَّهُ حَدَّثَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.**

واتە: لە زوهریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەخزمەت عومەری کوڕی (عبد العزیز)دا بووین باسی هاوسەرگیری کاتیمان دەکرد، پیاوێ کە پێیان دەوت رەبیعی کوڕی سەبرە: پێی وت: شایەتی دەدەم لەسەر باوکم باسی ئەوەی کردوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەحەجی مالاوایی دا حەرامی کردووە.

- شێخ ئەلبانی دەڵێت: ئەم فەرموودە (شاذ)ە، بەلام فەرموودەی (محفوظ) ئەوەیە کە لەسەردەمی رزگارکردنی شاری مەککەدا حەرامی کردووە - .

[1] - (نِكَاحِ الْمُتْعَةِ): بریتە لە هاوسەرگیری کاتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کاتێ کە ماوەکە تەواو بوو ئیتر جیادەبنەوە.

٢٠٧٣ - (صحيح) عن ربيع بن سبرة، عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَرَّمَ مُتْعَةَ النِّسَاءِ.

واتە: لە رەبیعی کوڕی سەبرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاوسەرگیری کاتی حەرامکردوە.

## باسی دەربارەی ژن بە ژن.

## ١٥ - باب فِي الشِّغَارِ.

٢٠٧٤ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. زَادَ مُسَدَّدٌ فِي حَدِيثِهِ، قُلْتُ لِنَافِعٍ: مَا الشِّغَارُ؟ قَالَ: يَنْكِحُ ابْنَةَ الرَّجُلِ وَيُنْكِحُهُ ابْنَتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ، وَيَنْكِحُ أُخْتَ الرَّجُلِ وَيُنْكِحُهُ أُخْتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ژن بە ژنی قەدەغەکردوە، موسەددەد لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد، وتم بە نافع: ئەی ژن بە ژن چۆنە؟ وتی: پیاوێ کچەکەی خۆی مارە ببڕێ لە پیاوێکی تر لەسەر ئەوەی ئەویش کچەکەی خۆی مارە ببڕێت لەو هیچ مارەییان لە نێواندا نەبێت.

٢٠٧٥ - (حسن) عن عبد الرحمن بن هرمز الأعرج: أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْعَبَّاسِ، أَنْكَحَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَكَمِ ابْنَتَهُ، وَأَنْكَحَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ ابْنَتَهُ، وَكَانَا جَعَلاَ صَدَاقًا فَكَتَبَ

مُعَاوِيَةُ إِلَى مَرْوَانَ يَأْمُرُهُ بِالتَّفْرِيقِ بَيْنَهُمَا، وَقَالَ فِي كِتَابِهِ: هَذَا الشِّغَارُ الَّذِي نَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی هورموز ئەعرەجەوە دەگێڕنەوە، کە عەباسی کوڕی عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەباس، کچەکەی خۆی مارەبڕی لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی حەکەم، عَبْدُ الرَّحْمَن)یش کچەکەی خۆە مارەبڕی لە عەباسی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەباس، موعاویە نامەی نوسی بۆ مەروان کە لێکیان جیابکاتەوە، لە نامەکەیدا نوسی: ئەمە ئەو ژن بە ژنەیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەیکردوە.

## باسی سەبارەت بە مارەکردنی حەڵاڵ کردنەوە (مارە بە جاش).

## ١٦ - باب فِي التَّحْلِيلِ.

٢٠٧٦ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه - قال اسماعيل: وَأُرَاهُ قَدْ رَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - : أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ).

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، ئیسماعیل وتی: وا دەبینم کە فەرمودەکەی بەرزکردەوە هەتا گەیاندیەوە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) - ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (نەفرینی خوای گەورە لەسەر ئەو کەسە بێت

کە ژنێك دەهێنێت بۆ ئەوەی حەلاڵی بکاتەوە بۆ مێردە کۆنەکەی، وە نەفرینی خوای گەورەش لەو پیاوە بێت کە ژنی بۆ حەلاڵ دەکرێتەوە).

**٢٠٧٧ - (صحيح) عن الحارث الأعور، عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم - قال: فَرَأَيْنَا أَنَّهُ عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ - عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ.**

واتە: لە (حارث)ی کوڕی ئەعوەرەوە، لە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: - پێمان وابو ئەو پیاوە پێشەوا عەلی بێت ڕەزای خوای لێ بێ - ، ڕاوی فەرموودەی پێشوی لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە، بە هەمان مانا.

## باسی دەربارەی نابێ بەندە ژن بهێنێ بە بێ ڕێپێدانی گەورەکەی.

## ١٧ – باب فِي نِكَاحِ الْعَبْدِ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ.

**٢٠٧٨ - (حسن) عَنْ جَابِرٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيُّمَا عَبْدٍ تَزَوَّجَ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَهُوَ عَاهِرٌ).**

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر بەندەیە بەبێ پرسی گەورەکەی ژن بخوازێت ئەوە زیناکارە).

٢٠٧٩ - (ضعيف) عن أبن عمر، أن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا نَكَحَ الْعَبْدُ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوْلاَهُ فَنِكَاحُهُ بَاطِلٌ)[1].

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر بەندەیەك بەبێ پرسی گەورەکەی ژن بخوازێت ئەوە نکاح)ژن خواستنەکەی پوچ و بەتاڵە).

## باسی سەبارەت بە حەرامە پیاو خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بکات.

## ١٨ - باب فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ.

٢٠٨٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نابێ پیاو خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بکات، مەگەر خوازبێنی کەری پێشو وازبێنێ یان ئەو رێگەی بدا).

---

[1] - قَالَ أَبُو دَاوُد: هَذَا الْحَدِيثُ ضَعِيفٌ وَهُوَ مَوْقُوفٌ وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما.

٢٠٨١ - (صحيح) عن أبن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَخْطُبُ أَحَدُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ، وَلاَ يَبِيعُ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، إِلاَّ بِإِذْنِهِ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نابێ پیاو خوازبێنی لەسەر خوازبێنی برای دینی خۆی بکات، هەروەها نابێ مامەڵە بەسەر مامەڵەی براکەیدا بکات، مەگەر خۆی ڕێگەی بدا).

## باسی سەبارەت بە پیاوێ ئەگەر ویستی ئافرەتێ بخوازێ با سەیری بکات.

## ١٩ - باب فِي الرَّجُلِ يَنْظُرُ ظإِلَى الْمَرْأَةِ وَهُوَ يُرِيدُ تَزْوِيجَهَا.

٢٠٨٢ - (حسن) عن جابر بن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ، فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ). قَالَ: فَخَطَبْتُ جَارِيَةً فَكُنْتُ أَتَخَبَّأُ لَهَا، حَتَّى رَأَيْتُ مِنْهَا مَا دَعَانِي إِلَى نِكَاحِهَا وَتَزَوُّجِهَا فَتَزَوَّجْتُهَا.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّـه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان ویستی ژنـێ داوا بکـات ئەگـەر توانـای بـوو سەیری ئەو شوێنانەی بکات کە دەبێ بەهۆی خواستنی با سەیری بکات)، جابر وتی: جـا داوای کەنیزەکێکم کرد خۆم حەشاردا **لە پەناوە** سەیری ئەو شوێنانەیم کرد کە بوو بەهۆی خواستنی، لەپاشدا مارەم کرد.

## باسی دەربارەی (وەلی)سەرپەرشتیار.

## ٢٠ - باب فِي الْوَلِيِّ.

**٢٠٨٣ - عن عائشة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهَا فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ (فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَالْمَهْرُ لَهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا، فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لاَ وَلِيَّ لَهُ).**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر ئـافرەتێ شـووی کردبێـت بـەبێ مۆڵـەت و ڕێ پێـدانی وەلیەکەی مارەبڕینەکەی پوچ و بەتاڵەو دانەمەزراوە) سێ جار فـەرمووی: مارەبڕینـەکـەی پوچ و بەتاڵەو دانەمەزراوە، (جا ئەگەر هاتوو پیاوەکە چووە لای ئەوە مـارەیی دەکـەوێت بەوەی کە داوێنی پێی حەڵاڵ بووە، ئەگەر لەگەڵ وەلیەکەدا ناکۆکیان هەبوو بۆیە نەیـدەدا بە شوو، ئەوە گەورەی موسوڵمانان - یان دەسەڵات (دادگا) - وەلی ئەو کەسەیە کە وەلی نیە - لەڕێگای دادوەرەوە دەتوانێت شوو بکات- ).

**٢٠٨٤ – (صحيح) عن عائشة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم، بمعناه. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: جَعْفَرٌ لَمْ يَسْمَعْ مِنَ الزُّهْرِيِّ كَتَبَ إِلَيْهِ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ڕاوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە. ئەبو داود دەڵێت: ڕاوی فەرمودەکە جەعفەر لە پێشەوا زوهری نەبیستوە بەڵکو بۆی نوسیوە.

**٢٠٨٥ - (صحيح) عن أبو موسى، أن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نِكَاحَ إِلاَّ بِوَلِيٍّ).**

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ژن ماردبڕین بوونی نیە مەگەر بە بوونی وەلی).

**٢٠٨٦ - (صحيح) عن أم حبيبة: أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ ابْنِ جَحْشٍ فَهَلَكَ عَنْهَا، وَكَانَ فِيمَنْ هَاجَرَ إِلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ، فَزَوَّجَهَا النَّجَاشِيُّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ عِنْدَهُمْ.**

واتە: کاتێ کە هەندێ لەموسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ خاکی حەبەشە، ئوممو حەبیبەو مێردەکەی لەگەڵیان بوون، مێردەکەی - بوو بەگاور ئەویش لێی جیابوەوە - لەوێ مێردەکەی لەناوچو، جا نەجاشی پاشای حەبەشە ئوممو حەبیبەی مارەبڕی لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە ئەوکاتە لەوێ دەژیا.

# باسی سەبارەت بە ڕێگریکردنی ئافرەت لە گەڕانەوەی بۆلای مێردی لەپاش بەسەرچونی عیددە.

## ٢١ - باب فِي الْعَضْلِ.

٢٠٨٧ - (صحيح) عن معقل بن يسار قال: كَانَتْ لِي أُخْتٌ تُخْطَبُ إِلَيَّ، فَأَتَانِي ابْنُ عَمّ لِي فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ، ثُمَّ طَلَّقَهَا طَلاَقًا لَهُ رَجْعَةٌ، ثُمَّ تَرَكَهَا حَتَّى انْقَضَتْ عِدَّتُهَا، فَلَمَّا خُطِبَتْ إِلَيَّ أَتَانِي يَخْطُبُهَا، فَقُلْتُ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أُنْكِحُهَا أَبَدًا. قَالَ: فَفِيَّ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ ) الآيَةَ. قَالَ: فَكَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي فَأَنْكَحْتُهَا إِيَّاهُ.

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خوشکێکم هەبوو خوازبێنی لەمن دەکرا، جا ئامۆزایەکم هاتە داوای و لێم مارەبڕی، لەپاشدا تەڵاقی دا بەڵام دەیتوانی بیباتەوە، ئینجا وازی لێهێنا هەتا عیددەی بەسەرچو، کاتێ داخوازیم لێ کرا هاتە لام و داخوازی کردەوە، وتم: نەخێر سوێند بە (الله) هەرگیز لێت مارەنابڕمەوە، جا لەبارەی منەوە ئەم ئایەتە دابەزی: (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ ). واتە: کاتێك ژنەکانتان تەڵاقدا عیددەیان تەواو بوو ئیتر قەدەغەیان مەکەن کە شوو بکەن بە مێردەکانیان. مەعقیل وتی: لەبەر ئەوە کەفارەتی سوێندەکەم داو لێم مارەکردەوە.

## باسی ئەو ئافرەتەی دوو وەلی بیدەن بەشوو.

## ٢٢ - باب إِذَا أَنْكَحَ الْوَلِيَّانِ.

٢٠٨٨ - (ضعيف) عن سمرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ زَوَّجَهَا وَلِيَّانِ فَهِيَ لِلأَوَّلِ مِنْهُمَا، وَأَيُّمَا رَجُلٍ بَاعَ بَيْعًا مِنْ رَجُلَيْنِ فَهُوَ لِلأَوَّلِ مِنْهُمَا).

واتە: لە سەمورەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو ئافرەتەی دوو وەلی بیدەن بەشوو ئەوە بۆ یەکەمەکەیان دەبێت، ئەو پیاوەی شتێ بفرۆشێت بە دوو کەس ئەوە بۆ یەکەمەکەیان دەبێت).

## باسی ئەم ئایەتە: (لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ).

## ٢٣ - باب قَوْلِهِ تَعَالَى: (لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ).

٢٠٨٩ - (صحيح) عن ابن عباس - قَالَ الشَّيْبَانِيُّ: وَذَكَرَهُ عَطَاءٌ أَبُو الْحَسَنِ السُّوَائِيُّ وَلاَ أَظُنُّهُ إِلاَّ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ - فِي هَذِهِ الآيَةِ (لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ). قَالَ:

كَانَ الرَّجُلُ إِذَا مَاتَ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ مِنْ وَلِيِّ نَفْسِهَا، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ زَوَّجَهَا أَوْ زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە - شەیبانی وتی: (عطاء) ئەبو حەسەنی سوائیی باسی کردو وتی وا ئەزانم تەنیا لە ئیبنو عەباسەوە هاتوە - کە دەربارەی ئەم ئایەتە: (لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ). واتە: حەلاڵ نیە بۆتان کە ئافرەتان بەزۆر (بە ناچاری) بەمیراتی بەرن (بۆخۆتان)، وە بەرگری شوکردنیان لێ مەکەن.

وتویەتی: کاتێ کە پیاوێ دەمرد میرات بەرەکانی شایەن تر بوون بۆ ژنەکەی وەك لە خزمەکانی و باوك و باپیری خۆی، ئەگەر بیانویستایە مارەیان دەکرد، یان دەیاندا بەشوو، ئەگەر بیشیانویستایە نەیاندەدا بەشوو، جا ئەم ئایەتە لەوبارەوە دابەزی - ئەو عادەتەی پوچەڵ کردەوەو کارەکەی گەڕاندەوە بۆ کەسوکاری ژنەکە خۆی - .

٢٠٩٠ - (حسن صحيح) عن ابن عباس قال: (لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ). وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ يَرِثُ امْرَأَةَ ذِي قَرَابَتِهِ، فَيَعْضُلُهَا حَتَّى تَمُوتَ أَوْ تَرُدَّ إِلَيْهِ صَدَاقَهَا، فَأَحْكَمَ اللَّهُ عَنْ ذَلِكَ وَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە دەربارەی ئەم ئایەتە: (لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًاۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن

﴿يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾. واتە: حەڵاڵ نیە بۆتان کە ئافرەتان بەزۆر (بە ناچاری) بـەمیراتی بەرن (بۆخۆتان)، وە بەرگری شوکردنیان لێ مەکەن، بۆ ئەوەی کە هەندێ لەو (مارەییەی) کە پێتان داون بیبەن بۆ خۆتان، مەگەر کاتێ کە کردەوەیـەکی زۆر ناشـیرین (زینـا) بـە ئاشکرا بکەن.

وتویەتی: ئەمەش ئەوەیە لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر پیـاوێ ژنـی یـەکێ لـە خزمـە نزیکەکانی وەك میراتی بەرکەوتایە، نەیدەهێشت شوو بکات هەتا دەمرد یان مارەییەکەی دەگەڕاندەوە بۆی، خوای گەورە لەوبارەوە بڕیاری دەرکردو، ئەوەشی قەدەغەکرد.

**٢٠٩١ - (صحيح بما قبله) عن الضحاك، بِمَعْنَاهُ، قَالَ: فَوَعَظَ اللَّهُ ذَلِكَ.**

واتە: لە (ضحاك)ەوە دەگێڕنەوە، راوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە، راوی وتی: خوای گەورە ئامۆژگاری خەڵکی کردو ئەو کارەی قەدەغەکرد.

## باسی سەبارەت بە بێوەژن مارە نابڕرێت هەتا فەرمان لە خۆی وەرنەگیرێت.

## ٢٤ – باب فِي الاِسْتِئْمَارِ.

**٢٠٩٢ - (صحيح) عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبـي صـلى الله عليه وعلى آله وسلم قال: (لاَ تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّـى تُسْـتَأْمَرَ وَلاَ الْبِكْرُ إِلاَّ بِإِذْنِهَا). قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَمَا إِذْنُهَا؟ قَالَ: (أَنْ تَسْكُتَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بێوەژن مارە نابڕدرێت هەتا فەرمان لەخۆی وەرنەگیرێت، کچیش مارە نابڕدرێت هەتا خۆی رێگە نەدات)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) رێگەدانی کچ چۆن دەبێت؟ فەرمووی: (بێدەنگ بونیەتی).

**٢٠٩٣ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (تُسْتَأْمَرُ الْيَتِيمَةُ فِي نَفْسِهَا فَإِنْ سَكَتَتْ فَهُوَ إِذْنُهَا، وَإِنْ أَبَتْ فَلاَ جَوَازَ عَلَيْهَا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەتیو لەپێش مارەبڕینا پرسی پێ دەکرێت، جا ئەگەر بێدەنگ بوو ئەوە رازییە، بەڵام ئەگەر رێگەی نەدا ئەوا بەزۆر مارە ناکرێ).

**٢٠٩٤ - (شاذ) عن محمد بن عمرو، بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ، زَادَ فِيهِ، قَالَ: (فَإِنْ بَكَتْ أَوْ سَكَتَتْ). زَادَ (بَكَتْ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَيْسَ (بَكَتْ) بِمَحْفُوظٍ، وَهُوَ وَهَمٌ فِي الْحَدِيثِ، الْوَهَمُ مِنِ ابْنِ إِدْرِيسَ، أَوْ مِنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْعَلاَءِ.**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی عەمرەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەد هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، فەرمووی: (جا ئەگەر گریا یان بێدەنگ بوو). (بكت) واتە: ئەگەر گریای بۆ زیاد کرد. ئەبو داود دەڵێت: (بكت) لەبەرنەکراوەو، لە فەرموودەکەدا (وهم)ە، (وەهم)ەکەش لە ئیبنو ئیدریسەوەیە یان لە موحەممەدی کوڕی عەلائەوەیە.

(صحيح) عن عائشة قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْبِكْرَ تَسْتَحِي أَنْ تَتَكَلَّمَ! قَالَ: (سُكَاتُهَا إِقْرَارُهَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کچ پێی شەرمە قسە بکات، فەرمووی: (بێدەنگ بوونی ڕازیبونیەتی).

**٢٠٩٥ – (ضعيف) عن أبن عمر قال: قـال رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم: (آمِرُوا النِّسَاءَ فِي بَنَاتِهِنَّ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە وتویـەتی: پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (با ئافرەتان پرس بکەن بە کچەکانیان پـێش ئـەوەی بیاندەن بەشوو).

## باسی سەبارەت بە کچیٚ کە باوکی بیدات بە شوو پرسی پیٚ نەکات.

## ٢٥ – باب فِي الْبِكْرِ يُزَوِّجُهَا أَبُوهَا وَلاَ يَسْتَأْمِرُهَا.

**٢٠٩٦ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ جَارِيَةً بِكْرًا أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَتْ أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ كَارِهَةٌ، فَخَيَّرَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە کەنیزەکێکی کچ هاتـە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتـی: بـاوکم داومـی بەشـو بـەڵام مـن پـێم ناخۆشەو بەدڵم نیە، پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) کچـەکەی سەرپشـك کـرد، کـە بەگوێی باوکی بکات یان شوکردنەکەی هەڵوەشێنێتەوە.

**٢٠٩٧ - (صحيح) عن عن عكرمة، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَمْ يَذْكُرِ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَكَذَلِكَ رَوَاهُ النَّاسُ مُرْسَلاً مَعْرُوفٌ.**

واتە: عیکریمە فەرمودەی پێشوی لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) گێڕاوەتەوە. ئەبو داود دەڵێت: راوی باسی ئیبنو عەباسی رەزای خوایان لێ بێ نەکرد، هەر بەو شێوەیە ناسراوەو خەڵك بە (مرسل)ی گێڕاویانەتەوە.

## باسی دەربارەی بێوەژن.

## ٢٦ – باب فِي الثَّيِّبِ.

**٢٠٩٨ - (صحيح) عن أبن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْمَرُ فِي نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویوتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (بێوەژن لەپێشترە بە خۆی هەتا ودلیەکەی، وە کچیش لەشووکردنیدا مۆڵەتی لێ دەخوازرێت، رازیبونیشی بێدەنگ بونیەتی).

**٢٠٩٩ - (صحيح بلفظ (تستأمر) دون ذكر أبوها) عن عبد الله بن الفضل بإسناده ومعناه قال (الثَّيِّبُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا**

وَالْبِكْرُ يَسْتَأْمِرُهَا أَبُوهَا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (أَبُوهَا) لَيْسَ بِمَحْفُوظٍ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی (فضل)وە فەرموودەی پێشو بە هەمان سەنەدو مانا هاتووە، فەرمووی: (بێوەژن لەپێشترە بە خۆی هەتا وەلیەکەی، وە کچیش لەشووکردنیدا مۆڵەتی لێ دەخوازرێت، رازیبونیشی بێدەنگ بوونیەتی). ئەبو داود دەڵێت: وشەی (أَبُوهَا) لەبەرنەکراوە.

٢١٠٠ - (صحيح) عن ابن عباس: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لَيْسَ لِلْوَلِيِّ مَعَ الثَّيِّبِ أَمْرٌ، وَالْيَتِيمَةُ تُسْتَأْمَرُ وَصَمْتُهَا إِقْرَارُهَا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بێوەژن فەرمانی بەشوودانی بەدەست خۆیەتی بۆ وەلیەکەی نیە فەرمانی پێ بکات هەتا خۆی رازی نەبێت، وە کچی هەتیویش لەشووکردنیدا مۆڵەتی لێ دەخوازرێت، رازیبونیشی بێدەنگ بوونیەتی).

٢١٠١ - (صحيح) عن خنساء بنت خدام الأنصارية: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَرَدَّ نِكَاحَهَا.

واتە: خەنسائی کچی خیدامی ئەنصاری بێوەژن بوو، باوکی دای بەشو ئەویش پێی ناخۆش بوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هات بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش هەڵیوەشاندەوە.

## باسی دەربارەی هاوتایی.

## ٢٧ - باب فِي الأَكْفَاءِ.

٢١٠٢ - (حسن) عن أبي هريرة: أَنَّ أَبَا هِنْدٍ حَجَمَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْيَافُوخِ فَقَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَا بَنِي بَيَاضَةَ أَنْكِحُوا أَبَا هِنْدٍ وَانْكِحُوا إِلَيْهِ). قَالَ: (وَإِنْ كَانَ فِي شَيْءٍ مِمَّا تَدَاوَوْنَ بِهِ خَيْرٌ فَالْحِجَامَةُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە جارێ ئەبو هیند کەڵەشاخی لە سەری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گرت، فەرمووی: (ئەی بەنی (بَيَاضَة) ژن بدەن بە ئەبو هیندو ژنی لێ بخوازن)، هەروەها فەرمووی: (ئەم شتانەی کە ئێوە تەداوی پێ دەکەن ئەگەر باشیان تێدا بێت ئەوا یەکێکیان کەڵەشاخ گرتنە).

## باسی دەربارەی مارەکردنی ئافرەتێ پێش لەدایك بوونی.

## ٢٨ - باب فِي تَزْوِيجِ مَنْ لَمْ يُولَدْ.

٢١٠٣ - (ضعيف) عن ميمونة بنت كردم قالت: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي فِي حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَدَنَا إِلَيْهِ أَبِي، وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ لَهُ،

فَوَقَفَ لَهُ وَاسْتَمَعَ مِنْهُ، وَمَعَهُ دِرَّةٌ كَدِرَّةِ الْكُتَّابِ، فَسَمِعْتُ الأَعْرَابَ وَالنَّاسَ وَهُمْ يَقُولُونَ: الطَّبْطَبِيَّةَ الطَّبْطَبِيَّةَ الطَّبْطَبِيَّةَ، فَدَنَا إِلَيْهِ أَبِي، فَأَخَذَ بِقَدَمِهِ، فَأَقَرَّ لَهُ، وَوَقَفَ عَلَيْهِ، وَاسْتَمَعَ مِنْهُ، فَقَالَ: إِنِّي حَضَرْتُ جَيْشَ عِثْرَانَ - قَالَ: ابْنُ الْمُثَنَّى جَيْشَ غِثْرَانَ - فَقَالَ طَارِقُ بْنُ الْمُرَقَّعِ: مَنْ يُعْطِينِي رُمْحًا بِثَوَابِهِ، قُلْتُ: وَمَا ثَوَابُهُ؟ قَالَ: أُزَوِّجُهُ أَوَّلَ بِنْتٍ تَكُونُ لِي. فَأَعْطَيْتُهُ رُمْحِي، ثُمَّ غِبْتُ عَنْهُ، حَتَّى عَلِمْتُ أَنَّهُ قَدْ وُلِدَ لَهُ جَارِيَةٌ وَبَلَغَتْ، ثُمَّ جِئْتُهُ، فَقُلْتُ لَهُ: أَهْلِي جَهِّزْهُنَّ إِلَيَّ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَفْعَلَ حَتَّى أُصْدِقَهُ صَدَاقًا جَدِيدًا غَيْرَ الَّذِي كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، وَحَلَفْتُ لاَ أُصْدِقُ غَيْرَ الَّذِي أَعْطَيْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَبِقَرْنِ أَيِّ النِّسَاءِ هِيَ الْيَوْمَ). قَالَ: قَدْ رَأَتِ الْقَتِيرَ. قَالَ: (أَرَى أَنْ تَتْرُكَهَا). قَالَ: فَرَاعَنِي ذَلِكَ، وَنَظَرْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ مِنِّي، قَالَ: (لاَ تَأْثَمُ، وَلاَ يَأْثَمُ صَاحِبُكَ).

واتە: لە مەیمونەی کچی کەردەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ حەجی مالآوایی، منیش لەگەڵ باوکم لەخزمەتیدا دەرچوین بۆ حەج، پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بینی بەسەر وشترێکەوە بوو، داردەستێکی پێ بوو وەك ئەوەی کە مامۆستای مندالآن پێیەتی، باوکم لێی نزیك بویەوە، ئەویش راوەستاو گوێی بۆ گرت، گوێم لە خەڵك و عەرەبە دەشتەکیەکان بوو دەیانوت:

(الْطَّبْطَبِيَّةَ، الطَّبْطَبِيَّةَ، الطَّبْطَبِيَّةَ). وایان لێکداوەتەوە کە مەبەست لە دەنگی ڕۆشتن و جوڵانە، مەیمونە وتی: باوکم لێی نزیك بویەوە، قاچی گرت، ئەویش ڕاوەستاو گوێی بۆ گرت، مەیمونە وتی: باوکم وتی: من ئامادەی سوپای (عِثْرَان) بووم، (ابْنُ الْمُثَنَّى) وتی: سوپای (غِثْرَان) — (طَارِق)ی کوڕی مورەقەع وتی: ئەوەی ڕمێکم بداتێ خەڵاتی دەکەم و پاداشتی دەدەمەوە، وتم: پاداشتەکەی چیە؟ وتی: یەکەم کچێ کە بوومان لێی مارەدەبڕم، ئەویش ڕمەکەی خۆی دایە، - بێگومان ئەم سوپایە لەپێش ئیسلامدا بووە — لەپاشدا منی نەبینیەوە هەتا زانیم کە کچێکیان بووەو باڵغ بووە، ئینجا هاتم بۆلای وتم: خێزانەکەم بۆ ئامادەبکەن، سوێندی خوارد کە کاری لەو جۆرە ناکات هەتا مارەییەکی تری نەداتێ جگە لەو مارەییەی کە پێشتر لەنێوان ئەم و ئەودا بوو کە ڕمێك بوو، منیش سوێندم خوارد کە جگە لەوەی کە پێشتر پێم داوی هیچی ترت نادەمێ، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (ئەمڕۆ لە تەمەنی چ ئافرەتێکدایە؟). وادەبینم کە پیر بووە، فەرمووی: (پێم وایە وازی لێ بهێنیت چاکترە). کەردەم وتی: ئەو وتەیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ترساندمی، سەیری پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) کرد، کە ئەوەی لێ بینیم فەرمووی: (خۆت گوناهبار مەکە، وە هاوڕێکەشت گوناهبار مەکە).

**٢١٠٤ - (ضعيف) عن إبراهيم بن ميسرة: أَنَّ خَالَتَهُ أَخْبَرَتْهُ، عَنِ امْرَأَةٍ - قَالَتْ: هِيَ مُصَدَّقَةٌ امْرَأَةُ صِدْقٍ قَالَتْ: بَيْنَا أَبِي فِي غَزَاةٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذْ رَمِضُوا فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ يُعْطِينِي نَعْلَيْهِ وَأُنْكِحُهُ أَوَّلَ بِنْتٍ تُولَدُ لِي؟ فَخَلَعَ أَبِي نَعْلَيْهِ فَأَلْقَاهُمَا إِلَيْهِ، فَوُلِدَتْ لَهُ جَارِيَةٌ فَبَلَغَتْ، وَذَكَرَ نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ قِصَّةَ الْقَتِيرِ.**

واتە: لە ئیبراهیمی کوڕی مەیسەرەوە دەگێڕنەوە، کە پوری لە ئافرەتێکەوە پێی

راگەیاندووە - وتی: ئافرەتێکی راستگۆ بوو - ئافرەتەکە وتی: جارێ باوکم لەسەردەمی نەفامی دا لە غەزایەکدا دونیا ئەوەندە گەرم بوو ژێر پێیان داخ بوو بوو، پیاوێ وتی: کێ نەعلەکانی خۆیم دەداتێ یەکەم کچێ کە بوومان لێی ماردەبڕم؟ باوکم نەعلەکانی داکەندو بۆی هەڵدا، جا کچێکیان بوو، هەواڵەکە گەیشتەوە بە باوکم، راوی بە هەمان مانا فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام باسی بەسەرهاتی پیری کچەکەی نەکرد.

## باسی مارەیی.

## ٢٩ - باب الصَّدَاقِ.

٢١٠٥ - (صحيح) عن أبي سلمة قال: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا عَنْ صَدَاقِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَتْ: ثِنْتَا عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشٌّ. فَقُلْتُ: وَمَا نَشٌّ؟ قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ.

واتە: ئەبو سەلەمە وتی: لە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسی مارەیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەند بوو؟ وتی: مارەیی ژنەکانی دوانزە ئوقیەو نیو بوو، عائیشە وتی: دەزانی نیو چەندە؟ وتم: نەو، وتی: نیو ئوقیەیە، ئوقیەیەکیش چل درهەمە کە هەمووی دەکاتە پێنج سەد درهەمی زیوینی ئەو سەردەمە.

٢١٠٦ - (حسن صحيح) عن أبي العجفاء السلمي قال: خَطَبَنَا عُمَرُ رَحِمَهُ اللَّهُ فَقَالَ: أَلاَ لاَ تُغَالُوا بِصُدُقِ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللَّهِ لَكَانَ أَوْلاَكُمْ

بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ وَلاَ أُصْدِقَتِ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً.

وتی: لە ئەبو جەعفائی سولەمییەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتاری بۆ دەداین وتی: ئاگاداربن زیادەڕەوی مەكەن لە مارەیی ئافرەتاندا، چونكە ئەگەر مایەی رێز بوایە بۆ دونیا، یان هۆكاری تەقواو لەخواترسان بوایە بۆ دوارۆژ، ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەپێشتر بوو بۆ ئەوە لەئێوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله عیه وسلم) مارەیی نەكردوە بۆ هیچ یەكێك لە خێزانەكانی، وە مارەییش نەكراوە بۆ هیچ یەكێك لە كچەكانی زیاتر بێت لە دوانزە ئوقیە.

٢١٠٧- (صحيح) عن أم حبيبة: أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ جَحْشٍ فَمَاتَ بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، فَزَوَّجَهَا النَّجَاشِيُّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَمْهَرَهَا عنه أَرْبَعَةَ آلاَفٍ، وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَ شُرَحْبِيلَ ابْنِ حَسَنَةَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حَسَنَةُ هِيَ أُمُّهُ.

واتە: كاتێ كە ئوممو حەبیبە هاوسەری (عُبَيْدِ اللَّهِ)ی كوڕی جەحش بوو لەگەڵ موسوڵمانان كۆچیان كرد بۆ خاكی حەبەشە، لەوێ (عُبَيْدِ اللَّهِ)ی هاوسەری مرد، نەجاشی پاشای حەبەشە ئوممو حەبیبەی مارەبڕی لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و چوار هەزار درهەمی كردە مارەیی و، بە شورەحەبیلی كوڕی حەسەنەدا ناردی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم). ئەبو داود دەڵێت: (حسنة) دایكی بوو.

٢١٠٨ - (ضعيف) عن الزهري: أَنَّ النَّجَاشِيَّ زَوَّجَ أُمَّ حَبِيبَـةَ بِنْـتَ أَبِـي سُفْيَانَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ عَلَـى صَـدَاقِ أَرْبَعَةِ آلاَفِ دِرْهَمٍ، وَكَتَبَ بِذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَبِلَ.

واتە: لە زوهریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نەجاشی پاشای حەبەشە ئوممو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانی مارەبڕی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر چوار هەزار درهەم مارەیی، جا ئەوەی نوسی بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەویش قبوڵی کرد.

## باسی کەمی مارەیی.

## ٣٠ – باب قِلَّةِ الْمَهْرِ.

٢١٠٩ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ رَأَى عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَوْفٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَعَلَيْهِ رَدْعُ زَعْفَـرَانٍ، فَقَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ (مَهْـيَمْ؟). فَقَـالَ: يَـا رَسُولَ اللَّهِ تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، قَالَ: (مَا أَصْدَقْتَهَا؟). قَـالَ: وَزْنَ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ: (أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفی ڕەزای خوای لێ بێ بینی شوێنەواری زەعفەرانی پێوە دیار بوو زەرد

هەڵگەڕابوو، فەرمووی: (ئەحواڵت چۆنە ئەمە چییە بۆ وات لێ هاتوە؟). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ژنێکم مارەبڕیوە بۆ خۆم، فەرمووی: (چیت کردۆتە مارەیی؟). وتی: لەسەر پارچە زێڕێك، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (دەعوەتی شایی بکە هەرچەندە بە بزنێك یان بەرخێکیش بوبێت).

**٢١١٢ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَعْطَى فِي صَدَاقِ امْرَأَةٍ مِلْءَ كَفَّيْهِ سَوِيقًا أَوْ تَمْرًا فَقَدِ اسْتَحَلَّ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّـه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی پڕی مشتێ ئاردی ورد یان خورما بدات لەمارەیی ئافرەتێکدا ئەوە بۆی حەڵاڵە).

**(صحيح) قال أبو داود: عن جابر قال: كُنَّا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَسْتَمْتِعُ بِالْقُبْضَةِ مِنَ الطَّعَامِ عَلَى مَعْنَى الْمُتْعَةِ.**

ئەبو داود دەڵێت: لە جابرەوە هاتوە، کە وتویەتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بڕێکی کەم خواردنمان دەدا لەجیاتی مارەیی هاوسەرگیری کاتی. - هاوسەرگیری کاتی لەسەرتاوە دروست بوو بەڵام لەپاشدا حەرام کرا - .

## باسی دەربارەی مارەییە كە كارێك بێت ئەگەر ئەنجامی بدات ئەوە مارەییەكەی داوە.

## ٣١ - باب فِي التَّزْوِيجِ عَلَى الْعَمَلِ يُعْمَلُ.

٢١١١ - (صحيح) عن سهل بن سعد الساعدي: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى قَدْ وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ، فَقَامَتْ قِيَامًا طَوِيلاً، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا إِيَّاهُ؟). فَقَالَ: مَا عِنْدِى إِلاَّ إِزَارِى هَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّكَ إِنْ أَعْطَيْتَهَا إِزَارَكَ جَلَسْتَ وَلاَ إِزَارَ لَكَ، فَالْتَمِسْ شَيْئًا). قَالَ: لاَ أَجِدُ شَيْئًا، قَالَ: (فَالْتَمِسْ وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ). فَالْتَمَسَ فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَهَلْ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ شَيْءٌ). قَالَ: نَعَمْ سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا، لِسُوَرٍ سَمَّاهَا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ).

واتە: سەهلی كوڕی سەعدی ساعدی دەڵێت: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتووم خۆم ببەخشم بە تۆ،

ـەودیەکی زۆر وەستا، پیاوێ هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر خۆت پێویستت پێی نیە لەمنی مارە بڕە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئایا هیچت هەیە کە بیکەیتە مارەیی؟). وتی هیچم نیە ئەم بەرکۆشەم نەبێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر بەرکۆشەکەتی بدەیتێ خۆت بێ بەرکۆش دەمێنیتەوە، بگەڕێ بۆ شتێکی تر). وتی: هیچ شك نابەم، فەرمووی: (بگەڕێ ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت باشە). ئەویش گەڕا هیچی نەدۆزیەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (لە قورئان چیت پێیە چی دەزانیت؟). وتی: بەڵێ سورەتی ئەوەو ئەوە، چەند سورەتێکی ناوبرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (ئەوا لێم مارەم کردی لەسەر ئەو قورئانەی کە دەیزانیت فێری بکەیت).

**٢١١٢ - (ضعيف) عن أبي هريرة، نَحْوَ هَذِهِ الْقِصَّةِ، لَمْ يَذْكُرِ الإِزَارَ وَالْخَاتَمَ، فَقَالَ: (مَا تَحْفَظُ مِنَ الْقُرْآنِ). قَالَ: سُورَةَ الْبَقَرَةِ أَوِ الَّتِى تَلِيهَا، قَالَ: (فَقُمْ فَعَلِّمْهَا عِشْرِينَ آيَةً، وَهِىَ امْرَأَتُكَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هەمان بەسەرهات هاتووە، بەڵام باسی بەکۆش و ئەنگوستیلەی نەکرد، فەرمووی: (قورئانت هیچ لەبەرە؟). وتی: سورەتی بەقەرە یان ئەوەی دوای ئەو - واتە: سورەتی (آل عمران) - ،، فەرمووی: (هەستە بیست ئایەتی فێر بکە ئەوە هاوسەری تۆیە).

**٢١١٣ - (ضعيف) عن مكحول نحو خبر سهل قال: وَكَانَ مَكْحُولٌ يَقُولُ: لَيْسَ ذَلِكَ لأَحَدٍ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .**

واتە: لە مەكحولەوە هەمان فەرموودەی سەهل هاتووە، راوی وتی: مكحول دەڵێت: ئەمە تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) لەدوای ئەویش بۆ هیچ كەسێكی تر نیە.

## باسی دەربارەی كەسێ ئافرەتێك بخوازێ مارەیی بۆ دیاری نەكات هەتا دەمرێت.

## ٣٢ - باب فِيمَنْ تَزَوَّجَ وَلَمْ يُسَمِّ صَدَاقًا حَتَّى مَاتَ.

**٢١١٤ - (صحيح) عن عبد الله، فِي رَجُلٍ تَزَوَّجَ امْرَأَةً فَمَاتَ عَنْهَا، وَلَمْ يَدْخُلْ بِهَا، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا الصَّدَاقَ، فَقَالَ: لَهَا الصَّدَاقُ كَامِلاً وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ وَلَهَا الْمِيرَاثُ، فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ سِنَانٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِهِ فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) - ی كوڕی مەسعود — یان پرسی سەبارەت بە ئافرەتێك كە پیاوێ مارەی كردوە، لەپاشدا بمرێت، بەبێ ئەوەی مارەیی بۆ دیاری بكات، وە پێش ئەوەی بچێتە لای؟ وتی: من وادەبینم كە مارەیی ئافرەتانی وەك خۆی بۆ هەیەو، عیددەشی لەسەرەو، میراتیشی بۆ هەیە، جا مەعقەلی كوڕی سینان وتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر بەم شێوەیە بڕیای دا لەبارەی بیروەعی كچی واشیقەوە.

**٢١١٥ - (صحيح) عن عبد الله، وَسَاقَ عُثْمَانُ مِثْلَهُ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) - ی کوڕی مەسعود - وە دەگێڕنەوە، (عثمان) بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە.

٢١١٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عتبة بن مسعودة: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ أُتِيَ فِي رَجُلٍ، بِهَذَا الْخَبَرِ، قَالَ: فَاخْتَلَفُوا إِلَيْهِ شَهْرًا، أَوْ قَالَ: مَرَّاتٍ، قَالَ: فَإِنِّي أَقُولُ فِيهَا: إِنَّ لَهَا صَدَاقًا كَصَدَاقِ نِسَائِهَا، لاَ وَكْسَ وَلاَ شَطَطَ، وَإِنَّ لَهَا الْمِيرَاثَ، وَعَلَيْهَا الْعِدَّةُ، فَإِنْ يَكُ صَوَابًا فَمِنَ اللَّهِ، وَإِنْ يَكُنْ خَطَأً فَمِنِّي وَمِنَ الشَّيْطَانِ، وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ بَرِيئَانِ، فَقَامَ نَاسٌ مِنْ أَشْجَعَ فِيهِمُ الْجَرَّاحُ وَأَبُو سِنَانٍ، فَقَالُوا: يَا ابْنَ مَسْعُودٍ، نَحْنُ نَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَاهَا فِينَا فِي بِرْوَعَ بِنْتِ وَاشِقٍ، وَإِنَّ زَوْجَهَا هِلاَلُ بْنُ مُرَّةَ الأَشْجَعِيُّ، كَمَا قَضَيْتَ. قَالَ: فَفَرِحَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ فَرَحًا شَدِيدًا حِينَ وَافَقَ قَضَاؤُهُ قَضَاءَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: سەبارەت بەو پیاوەی کە ئافرەتێکی مارە کرد و لەپاشدا مرد وەك لە فەرمودەی پێشودا هاتوە، ئەشجەعیەکان هاتنە لای (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعود، ئەویش لەپاش مانگێ وەڵامی دانەوەو وتی: من بە ئیجتیهادی خۆم لەم بارەوە دەڵێم: بە ئەندازەی مارەیی ژنانی کەسوکاری خۆی مارەیی بۆ دادەنرێت و بەبێ کەم و زۆر و زوڵم و ستەم، بەشە میراتیش دەگرێ و، عیددەشی لەسەرە، ئەگەر بڕیارەکەم راست بێ ئەوە لە خوای گەورەوەیە، ئەگەر هەڵەشم کردبێ ئەوە لە خۆم و لە شەیتانەوەیە، خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بەرین لێی، کۆمەڵێ لە ئەشجەعیەکان هەستانەوە کە جەڕاح و ئەبو

سینانیان لەناودا بوو وتیان: ئەی ئەبا مەسعود، ئێمە شایەتی دەدەین کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر بەم شێوەیە بڕیای دا بۆمان لەبارەی بیروەعی کچی واشیقەوە، کاتێ کە هیلالی کوڕی موڕەی ئەشجەعی مارەی بڕی، راوی وتی: (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی مەسعود زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو لەبەر ئەوەی وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دابو.

٢١١٧ - (صحيح) عن عقبة بن عامر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِرَجُلٍ: (أَتَرْضَى أَنْ أُزَوِّجَكَ فُلاَنَةَ؟). قَالَ: نَعَمْ. وَقَالَ لِلْمَرْأَةِ: (أَتَرْضِينَ أَنْ أُزَوِّجَكِ فُلاَنًا؟). قَالَتْ: نَعَمْ. فَزَوَّجَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ، فَدَخَلَ بِهَا الرَّجُلُ، وَلَمْ يَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا، وَلَمْ يُعْطِهَا شَيْئًا، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ الْحُدَيْبِيَةَ، وَكَانَ مَنْ شَهِدَ الْحُدَيْبِيَةَ لَهُ سَهْمٌ بِخَيْبَرَ، فَلَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَوَّجَنِي فُلاَنَةَ، وَلَمْ أَفْرِضْ لَهَا صَدَاقًا، وَلَمْ أُعْطِهَا شَيْئًا، وَإِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي أَعْطَيْتُهَا مِنْ صَدَاقِهَا سَهْمِي بِخَيْبَرَ، فَأَخَذَتْ سَهْمًا، فَبَاعَتْهُ بِمِائَةِ أَلْفٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَزَادَ عُمَرُ - بْنُ الْخَطَّابِ وَحَدِيثُهُ أَتَمُّ - فِي أَوَّلِ الْحَدِيثِ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خَيْرُ النِّكَاحِ أَيْسَرُهُ). وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلرَّجُلِ، ثُمَّ سَاقَ مَعْنَاهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يُخَافُ أَنْ يَكُونَ هَذَا الْحَدِيثُ مُلْزَقًا لأَنَّ الأَمْرَ عَلَى غَيْرِ هَذَا.

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) بە پیاوێکی فەرمووو: (رازی دەبیت فلانە ئافرەتت لـێ مـارە بکـەم؟). وتـی: بـەڵێ، بـە ئافرەتێکیشی فەرموو: (رازی دەبیت مارەت ببڕم لە فلانە پیـاو؟). وتـی: بـەڵێ، ئینجـا لەیەکی مارەکردن، پیاوەکە گواستیەوەو چووە لای و، هیچ مارەیی بۆ دیـاری نـەکرد، وە هیچیشی نەدایە، ئەو پیاوە کاتی خۆی بەشداری روداوی حودەیبیەی کربوو، ئەوانەش کە لە حودەیبیەدا بەشداریان کردبوو لە خەیبەردا پشکیان هەبوو، لەکاتی سەرەمەرگدا وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فلانە ژنی لیّ مارەکردم نە مارەییم بۆ دیاری کـردووە، نە هیچیشم داوەتیّ، جا ئێوە بە شایەت بن ئەوا من ئەو پشکەم کە لە خەیبەرە، لەجیاتی مارەیی دەیدەم بە هاوسەرەکەم، ژنەکەش پشکەکەی وەرگرت و فرۆشتی بـە سـەد هـەزار درهەم. ئەبو داود دەڵێت: لە عومەر - ی کـوڕی (خَطَّـاب)ە - وە رەزای خـوای لـیّ بـیّ هەمان فـەرمودە هـاتوە، راوی ئەمـەی بـۆ زیـاد کـرد فەرمودەکـەی ئـەم تـەواوترە - لەسەرتای فەرمودەکەوە شێخی ئەبو داود وتی: پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (باشترین هاوسەرگیری ئەوەیە کـە سـوك و ئاسـان بێـت). هـەروەها وتـی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) فـەرمووی بـە پیـاویّ، جـا راوی بـە هـەمان مانـا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە لە عومەری کوڕی (خَطَّـاب)ەوە رەزای خوای لیّ بیّ، ئـەبو داود وتی: ئەترسم ئەم فەرمودە زیاد بێت کارەکە لەسەر ئەم شێوەیە نەبێت — واتە ئەوەی لەبارەی هەڵسوکەوتی نەخۆشەوە هاتوە کە لە مـاڵ و سـامانەکەی دەربکـات و تایبـەتی بکات بە هەندیّ لە میراتبەرەکانیەوە، ئەمەش وەك زانراوە کردەوەی صەحابەیەو نادرێتـە پاڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) -.

## باسی سەبارەت بە وتاری خوازبێنی.

## ٣٣ - باب فِي خُطْبَةِ النِّكَاحِ.

٢١١٨ - (صحيح) عن عبد الله قال: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُطْبَةَ الْحَاجَةِ: (إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا (١))، (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ (١٠٢))، (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا (٧٠) يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا (٧١)).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) - ی کوڕی مەسعود - ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەم شێوەیە وتاری خوازبێنی فێرکردین: (سوپاس و ستایش بۆ خوایە، ستایشی دەکەین و داوای کۆمەکی و لێخۆشبونی لێ دەکەین، پەنا دەگرین بە خوا

نە خراپی دەروونمان، هەرکەسێ خوا ڕێنمایی بکات گومڕاکەری نیە، وە هەرکەسێ گومڕا ببێت ڕێنمایی کەری نیە، وە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (اللە). تاکی بێ هاوبەشە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بەندەو نێردراوی خوایە). (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾) سورة نساء: ١.

واتە: خۆتان بپارێزن لەو خوایەی کە بە ناوی ئەوەوە داوادەکەن لەیەکتر، وە (خۆتان بپارێزن لەپچڕاندنی) خزمایەتی، بەڕاستی خوا هەمیشە چاودێرە بەسەرتانەوە.

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾) سورة آل عمران: ١٠٢.

واتە: ئەی ئەوانەی کەبڕواتان هێناوە بترسن لەخوا ترسانێك کە شیاوێتی، وە مەمرن هەر بەمسوڵمانی نەبێ.

(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾) سورة الأحزاب: ٧١.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن و قسە ڕاست و دروست بکەن. کردەوەکانتان چاك دەکات و لەتاوانەکانتان خۆش دەبێ و، هەر کەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە.

**٢١١٩ - (ضعيف) عن ابن مسعود: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا تَشَهَّدَ، ذَكَرَ نَحْوَهُ، وَقَالَ: بَعْدَ قَوْلِهِ (وَرَسُولُهُ). (أَرْسَلَهُ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ، مَنْ يُطِعِ اللَّهَ**

وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ، وَمَنْ يَعْصِهِمَا فَإِنَّهُ لاَ يَضُرُّ إِلاَّ نَفْسَهُ، وَلاَ يَضُرُّ اللَّهَ شَيْئًا).

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتاری خوازبێنی دەخوێندەوەو شایەتومانی دەهێنا، راوی بە هەمان شێوە فەرموودەکەی پێشوی گێڕایەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەدوای: (وَرَسُولُهُ) فەرمووی: (بەهەق رەوانەی کرد پێش هاتنی قیامەت کە ترسێنەر و موژدەدەر بێت، هەرکەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێ ئەوە رێی راستی دۆزیوەتەوە، هەرکەس سەرپێچییان بکات ئەوە جگە لەخۆی زیان لەکەسی تر نادات و، بە هیچ شێوەیەك زیان بە خوا ناگەیەنێت).

٢١٢٠ - (ضعيف) عن رجل من بني سليم قال: خَطَبْتُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُمَامَةَ بِنْتَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَأَنْكَحَنِي مِنْ غَيْرِ أَنْ يَتَشَهَّدَ.

واتە: پیاوێکی بەنی سولەیمی وتی: خوازبێنی ئومامەی کچی (عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)م کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەبێ ئەوە وتاری خوازبێنی بخوێنێتەوەو شایەتومان بهێنێ لێی مارە بڕیم.

## باسی مارەبڕینی کچی بچوك.

## ٣٤ – باب فِي تَزْوِيجِ الصِّغَارِ.

٢١٢١ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا بِنْتُ سَبْعٍ - قَالَ: سُلَيْمَانُ أَوْ سِتّ - وَدَخَلَ بِي وَأَنَا بِنْتُ تِسْعٍ.

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) منی مارە کرد حەوت ساڵان بووم — سولەیمان وتی: شەش - ، کاتێ کە گواستمیەوە نۆ ساڵان بووم.

## باسی مانەوە لەلای کچی تازە بوك.

## ٣٥ – باب فِي الْمَقَامِ عِنْدَ الْبِكْرِ.

٢١٢٤ - (صحيح) عن أم سلمة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: (لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِي).

واتە: ئوممو سەلەمە دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) منی گواستەوە سێ شەو لەلام مایەوە، لەپاشدا فەرمووی: (وا مەزانە کە سێ شەو دەمێنمەوە

لەلات قەدر و ڕێزت کەمە لەلام، ئەگەر حەز دەکەیت دەیکەم بە حەوت شەو، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر بۆ تۆ بیکەم بە حەوت شەو ئەوە دەبێت بۆ ژنەکانی تریشم بیکەم بە حەوت شەو).

**٢١٢٣ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: لَمَّا أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَفِيَّةَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا. زَادَ عُثْمَانُ وَكَانَتْ ثَيِّبًا.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) صەفیەی گواستەوە سێ شەو لەلای مایەوە، (عُثْمَان) لەریوایەتەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: صەفیە بێوەژن بوو.

**٢١٢٤ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا، وَلَوْ قُلْتُ إِنَّهُ رَفَعَهُ لَصَدَقْتُ، وَلَكِنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ كَذَلِكَ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر تازە زاوا کچی هێنا بەسەر بێوەژندا حەوت ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە ئینجا دابەشی بکات، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا سێ ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە پاشان دابەشی بکات. ڕاوی وتی: ئەگەر بڵێم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەها دەفەرموێت ئەوە ڕاست دەکەم، بەڵام نەیوت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەها دەفەرموێت، بەڵکو وتی: سوننەت بەم شێوەیە.

# باسی سەبارەت بە پیاوێ بچێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی شتێ لە مارەیی بداتێ.

# ٣٦ - باب فِي الرَّجُلِ يَدْخُلُ بِامْرَأَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُنْقِدَهَا شَيْئًا.

٢١٢٥ - (حسن صحيح) عن ابن عباس قال: لَمَّا تَزَوَّجَ عَلِيٌّ فَاطِمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطِهَا شَيْئًا) قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ، قَالَ: (أَيْنَ دِرْعُكَ الْحُطَمِيَّةُ؟).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب) رەزای خوای لێ بێ (فاطمة)ی مارەکرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (شتێکی بدەرێ لە مارەییدا)، وتی: هیچم نیە تاکو بیدەمێ، فەرمووی: (کوا قەڵغانە (حُطمِيَّة)ەکەت) — ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێویستە پیاو شتێ لەمارەیی بداتە هاوسەرەکەی پێش ئەوەی بیگوازێتەوەو بچێتە لای - .

٢١٢٦ - (ضعيف) عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلاَمُ لَمَّا تَزَوَّجَ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَرَادَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا، فَمَنَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى يُعْطِيَهَا شَيْئًا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ

لَيْسَ لِي شَيْءٌ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطِهَا دِرْعَكَ). فَأَعْطَاهَا دِرْعَهُ، ثُمَّ دَخَلَ بِهَا.

واتە: یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەڵێت: کاتێ کە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) مارەکرد، ویستی بیگوێزێتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رێگری لێ کرد هەتا شتێکی بداتێ لە مارەییدا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ شتێك نابەم هەتا بیدەمێ، فەرمووی: (قەڵغانەکەتی بدەرێ). ئەویش قەڵغانەکەی دایە، لەپاشدا گواستیەوە.

٢١٢٧ - (ضعيف) عن ابن عباس، مِثْلَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتوە، جا راوی بەهەمان مانا فەرموودەکەی پێشوی گێڕایەوە.

٢١٢٨ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أُدْخِلَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا قَبْلَ أَنْ يُعْطِيَهَا شَيْئًا.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردوم کە رێ بدەم پیاو بچێتە لای ژنەکەی پێش ئەوەی کە هیچ مارەیی بداتێ.

٢١٢٩ - (ضعيف) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ نُكِحَتْ عَلَى صَدَاقٍ أَوْ حِبَاءٍ أَوْ عِدَةٍ قَبْلَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لَهَا، وَمَا كَانَ بَعْدَ عِصْمَةِ النِّكَاحِ فَهُوَ لِمَنْ أُعْطِيَهُ، وَأَحَقُّ مَا أُكْرِمَ عَلَيْهِ الرَّجُلُ: ابْنَتُهُ أَوْ أُخْتُهُ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر ئافرەتێ لەسەر ماردییە مارە کرا، یان بە هەرشتێك، یا بەلێنی شتێکی پێ درا پێش ئەوەی مارە بکرێت، ئەوە هی ئەو ئافرەتەیە، ئەوەی لەپاش مارەبڕینەکە بڕیار درا بۆ ئەو کەسەیە، کە بڕیاری بۆ دەدرێت، شایستەترین شت کە پاداشتی پیاوی پێ بدرێتەوەو ڕێزی بۆ دابنرێت: کچی یان خوشکیەتی.

## باسی چی دەوترێت بە کەسێ کە ژن بگوێزێتەوە واتە چ دوعایەکی بۆ دەکرێت.

## ٣٧ - باب مَا يُقَالُ لِلْمُتَزَوِّجِ.

٢١٣٠ - (صحيح) عن أبي هريرة، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا رَفَّأَ الإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ قَالَ: (بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) هـەركاتێ كە دوعای خۆشگوزەرانی و پێكـەوە ژیـانی بـە ئـارامی بكردایـە بـۆ كەسـێ كـە ژنـی بگواستایەتەوە دەیفەرموو: (خوای گەورە لێت پیرۆز بكات و، فەڕت بەسـەردا برێـژێ و، لەسەر خێر و چاكە كۆتان بكاتەوە).

## باسی پیاوێ ژنێ مارەبكات لەپاشدا بۆی دەركەوت كە سكی پڕە حوكمی چی یە؟

## ٣٨ - باب فِي الرَّجُلِ يَتَزَوَّجُ الْمَرْأَةَ فَيَجِدُهَا حُبْلَى.

٢١٣١ - (ضعيف) عن سعيد بن مسيب، عن رجل من الأنصـار - قـال ابْنُ أَبِي السَّرِيِّ: مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَقُلْ مِنَ الأَنْصَارِ، ثُمَّ اتَّفَقُـوا - يُقَـالُ لَـهُ بَصْـرَةُ قَـالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً بِكْرًا فِي سِتْرِهَا، فَدَخَلْتُ عَلَيْهَـا، فَـإِذَا هِـيَ حُبْلَى، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَهَا الصَّدَاقُ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَالْوَلَدُ عَبْدٌ لَكَ فَـإِذَا وَلَـدَتْ). قَـالَ الْحَسَنُ: (فَاجْلِدْهَا). وَقَالَ ابْنُ أَبِي السَّرِيِّ: (فَاجْلِدُوهَا). أَوْ قَالَ: (فَحُدُّوهَا). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَـذَا الْحَـدِيثَ قَتَـادَةُ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، وَرَوَاهُ يَحْيَى بْنُ أَبِـي كَثِيرٍ، عَنْ يَزِيدَ بْنِ نُعَيْمٍ، عَنْ سـعيد بـن مسـيب، وَعَطَـاءٌ

الْخُرَاسَانِيُّ، عن سعيد بن مسيب، أَرْسَلُوهُ كُلُّهُمْ. وَفِي حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، أَنَّ بَصْرَةَ بْنَ أَكْثَمَ نَكَحَ امْرَأَةً، وَكُلُّهُمْ قَالَ فِي حَدِيثِهِ: جَعَلَ الْوَلَدَ عَبْدًا لَهُ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی مەسەییەبەوە، لە پیاوێکی ئەنصاریەوە – ئیبنو ئەبو سەرِی وتی: لە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، نەیوت لە پیاوێکی ئەنصاریەوە، لەپاشدا راویەکان هاوڕان – کە بە (بَصْرَةَ) ناسراو بوو، دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێکم مارەبڕی بە حسابی ئەوەی کە کچەو کەس نەچوەتە لای، کاتێ کە چومە لای، دەبینم سکی پڕە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (مارەیی دەکەوێت مادەم شەرمگەی بۆ تۆ حەڵاڵ بووەو چویتەتە لای، ئەگەر منداڵەکەش لەدایك بوو دەبێتە بەندەی تۆ). حەسەن وتی: فەرمووی: (فَاجْلِدْهَا). واتە: داری لێ بدە. ئیبنو ئەبو سەرِی وتی: فەرمووی: (فَاجْلِدُوهَا). واتە: با دادوەر بڕیار بدات داری لێ بدەن. یان وتی: (فَحُدُّوهَا). واتە: حەددی لەسەرە. ئەبو داود دەڵێت: قەتادە ئەم فەرموودەی گێراوەتەوە، لە سەعیدی کوڕی یەزیدەوە، لە ئیبنو مەسەییەبەوە، وە یەحیای کوڕی (أَبِي كَثِيرٍ) لە یەزیدی کوڕی نوعەیمەوە، لە سەعیدی کوڕی مەسەییەبەوە، وە (عطاء)ی خۆراسانی لە سەعیدی کوڕی مەسەییەبەوە، لە هەر سێکیانەوە بە (مرسل)ی هاتوە، لە فەرموودەکەی یەحیای کوڕی (أَبِي كَثِيرٍ)دا هاتوە، کە (بَصْرَةَ)ی کوڕی (أكثم) ئافرەتێکی مارە بڕی، هەر یەکەیان لە فەرموودەکەیدا وتی: منداڵەکە دەبێتە بەندەی.

٢١٣٢ - (ضعيف) عن سعيد بن مسيب، أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ بَصْرَةُ بْنُ أَكْثَمَ، نَكَحَ امْرَأَةً، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ. زَادَ: وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا. وَحَدِيثُ ابْنِ جُرَيْجٍ أَتَمُّ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی مەسەییەبەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ کە بە (بَصْرَةُ)ی کوڕی (أكثم) ناسراو بوو، ئافرەتێکی مارەکرد، جا راوی بە هەمان مانا فەرمودەکەی گێڕایەوە، موحەممەدی کوڕی (مثنى) لە ریوایەتەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەیەکی جیا کردنەوە. بەڵام فەرمودەکەی ئیبنو جورەیج تەواو ترە واتە فەرمودەکەی پێشو.

## باسی دەربارەی دابەشکردنی کاتی مانەوە لەنێوان چەند ژنێکدا.

## ٣٩ - باب فِي الْقَسْمِ بَيْنَ النِّسَاءِ.

**٢١٣٣ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا: جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەسێ دوو ژنی هەبێ یەکێکیانی زیاتر بوێت و لەگەڵیاندا دادپەروەر نەبێ: ئەوە لە ڕۆژی قیامەت کە دێت بۆ مەیدانی مەحشەر لایەکی لەنگە).

**٢١٣٤ - (ضعيف) عن عائشة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْسِمُ فَيَعْدِلُ وَيَقُولُ: (اللَّهُمَّ هَذَا قَسْمِي فِيمَا أَمْلِكُ، فَلاَ تَلُمْنِي فِيمَا تَمْلِكُ وَلاَ أَمْلِكُ). يَعْنِي الْقَلْبَ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) کاتی مانەوەی خۆی لەلای ژنەکانی بەداد و یەکسانی دابەش دەکردو، دەیفەرموو: (خودایە ئەمە دابەشکردنی منە لەو شتەدا کە لەدەسەڵاتی مندایە، سا خوایە لێم مەگرە سەبارەت بە شتێك کە لەدەسەڵاتی تۆدایە) — کە خۆشویستن و ئارەزووی دڵە لەدەسەڵاتی مندا نیە- .

**٢١٣٥ - (حسن صحيح) عن هشام بن عروة، عن أبيه قال: قالت عائشة: يَا ابْنَ أُخْتِي، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يُفَضِّلُ بَعْضَنَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْقَسْمِ، مِنْ مُكْثِهِ عِنْدَنَا، وَكَانَ قَلَّ يَوْمٌ إِلاَّ وَهُوَ يَطُوفُ عَلَيْنَا جَمِيعًا، فَيَدْنُو مِنْ كُلِّ امْرَأَةٍ مِنْ غَيْرِ مَسِيسٍ حَتَّى يَبْلُغَ إِلَى الَّتِي هُوَ يَوْمُهَا فَيَبِيتُ عِنْدَهَا، وَلَقَدْ قَالَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ حِينَ أَسَنَّتْ وَفَرِقَتْ أَنْ يُفَارِقَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ يَوْمِي لِعَائِشَةَ، فَقَبِلَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْهَا. قَالَتْ: نَقُولُ: فِي ذَلِكَ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَفِي أَشْبَاهِهَا - أُرَاهُ قَالَ - : (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا ).**

واتە: لە هیشامی کوڕی عوروەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی خوشکەزای خۆم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) وەك یەك دەمایەوە لەلامان فەزڵی هەندێکمانی نەدەدا بەسەر هەندێکی ترماندا، کەم ڕۆژ هەبوو ئیللا هەموو خێزانەکانی بەسەردەکردەوە، لە سەرجەم خێزانەکانی نزیك دەبۆوە

بەبێ ئەوەی بچێتە لایان، هەتا دەگەیشە لای ئەو ژنەی کە سەرەی خۆی بوو، ئیتر شەو لەلای ئەو دەمایەوە، سەودەی کچی زەمعە کاتێ کە بەساڵاچو ترسی ئەوەی هەبوو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێی جیابێتەوەو تەڵاقی بدات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژەکەی من بۆ عائیشە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قبوڵی کرد. عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: دەڵێم: بۆ ئەوەو وێنەی ئەوە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ ). سورة النساء: ١٢٨. واتە: وە ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە گوێ پێ نەدان یا پشت هەڵکردنی مێردەکەی - ئەوە هەردووکیان هیچ گوناهێکیان لەسەر نی یە کە ئاشتەواییەکی چاك بکەن لە نێوان خۆیاندا، هەر ئاشتەوایی و یەك کەوتن چاکترە - .

**٢١٣٦ - (صحيح) عن عائشة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَأْذِنُنَا إِذَا كَانَ فِي يَوْمِ الْمَرْأَةِ مِنَّا بَعْدَ مَا نَزَلَتْ: (تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ ). قَالَتْ مُعَاذَةُ: فَقُلْتُ لَهَا: مَا كُنْتِ تَقُولِينَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَتْ: كُنْتُ أَقُولُ: إِنْ كَانَ ذَلِكَ إِلَيَّ لَمْ أُوثِرْ أَحَدًا عَلَى نَفْسِي.**

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: ئەگەر سەرەی یەکێکمان بوایە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕوخسەتی لێ دەخواستین کە بیدەین بە یەکێکی ترمان لەدوای ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزی: (تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ ). سورة الأحزاب: ٥١. واتە: (ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) سەرەی) هەریەکێ لەخێزانەکانت ویست دوای

ئەو هەر یەکێ لەوانت ویست (پێشی بخەو) بیهێنە بۆ لای خۆت. (مُعَاذَة) وتی: پێم وت: ئەی تۆ چیت بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وت: عائیشە وتی: قبولم نەدەکرد و تە سەرەکەمم نەدەدا بە کەسیان.

٢١٣٧ - (صحيح) عن عائشة قالت: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ إِلَى النِّسَاءِ - يَعْنِى فِى مَرَضِهِ - فَاجْتَمَعْنَ، فَقَالَ: (إِنِّى لاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ أَدُورَ بَيْنَكُنَّ، فَإِنْ رَأَيْتُنَّ أَنْ تَأْذَنَّ لِىَ فَأَكُونَ عِنْدَ عَائِشَةَ فَعَلْتُنَّ). فَأَذِنَّ لَهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردی بەدوای خێزانەکانیدا — لەکاتی نەخۆشیەکەیدا - ، ئەوانیش کۆبونەوە، فەرمووی: (من ناتوانم بگەرێم بەسەرتاندا، ئەگەر رێگەم پێ بدەن ئەوا لەلای عائیشە دەمێنمەوە). ئەوانیش رێگەیان پێ دا.

٢١٣٨ - (صحيح) عن عائشة زوج النبى صلى الله عليه وسلم قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا، غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ.

واتە: لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عادەتی وەها بوو کاتێ کە دەچوو بۆ سەفەرێ لەنێوان ژنەکانیدا قورعەی دەکرد، جا ناوی کامیان دەردەچو ئەوەیانی لەگەڵ

خۆی دەبرد بۆ سەفەرەکە، بۆ هەریەکێ لە ژنەکانی شەو و ڕۆژێکی تەرخان کردبو، بـەلاّم سەودەی کچی زەمعە ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بو بە عائیشە.

## باسی دەربارەی پیاوێ لەکاتی مارەبڕینەکەدا مەرجی بۆ دانرا کە لەگەڵ هاوسەرەکەی لەولاّتی خۆیدا بمێنێتەوە، ئایا دروستە لەو ولاّتە دەرچێت یان نا؟

## ٤٠ - باب فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِطُ لَهَا دَارَهَا.

**٢١٣٩ - (صحيح) عن عقبة بن عامر: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم أنه: (إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ: مَـا اسْـتَحْلَلْتُمْ بِـهِ الْفُرُوجَ).**

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم) فەرموویەتی: (باشترین مەرجێ کە ئێوەی موسوڵمان بیبەنە سەر، ئەو مەرجەیە کە ژنـی پێ حەلاڵ دەکەن بۆ خۆتان).

# باسی سەبارەت بە مافی پیاو لەسەر ژنەکەی.

## ٤١ - باب فِي حَقِّ الزَّوْجِ عَلَى الْمَرْأَةِ.

٢١٤٠ - (صحيح دون جملة القبر) عن قيس بن سعد قال: أَتَيْتُ الْحِيرَةَ فَرَأَيْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِمَرْزُبَانٍ لَهُمْ، فَقُلْتُ: رَسُولُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُسْجَدَ لَهُ، قَالَ: فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: إِنِّي أَتَيْتُ الْحِيرَةَ فَرَأَيْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِمَرْزُبَانٍ لَهُمْ، فَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ نَسْجُدَ لَكَ، قَالَ: (أَرَأَيْتَ لَوْ مَرَرْتَ بِقَبْرِي أَكُنْتَ تَسْجُدُ لَهُ؟). قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: (فَلاَ تَفْعَلُوا، لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لأَحَدٍ لأَمَرْتُ النِّسَاءَ أَنْ يَسْجُدْنَ لأَزْوَاجِهِنَّ، لِمَا جَعَلَ اللَّهُ لَهُمْ عَلَيْهِنَّ مِنَ الْحَقِّ).

واتە: قەیسی کوڕی سەعد دەڵێت: چووم بۆ حیرە سەیرم کرد خەڵکەکەی سەجدەیان دەبرد بۆ شاسوارەکەیان، منیش وتم: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شایەنترە کە سەجدەی بۆ ببرێت، وتی: کاتێ کە هاتمەوە چومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێم وت: چووم بۆ حیرە سەیرم کرد خەڵکەکەی سەجدەیان دەبرد بۆ شاسوارەکەیان، تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شایەنتری کە سەجدەت بۆ بەرین، فەرمووی: (پێم بڵێ ئەگەر لەلای گۆڕێکەوە رەتبوی سەجدەی بۆ دەبەی یان سەجدە دەبەی بۆ ئەو کەسەی کە لەناو گۆڕەکەدایە؟)، وتم: نەخێر، فەرمووی: (دە شتی وا مەکەن، من ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێ سەجدە ببات بۆ کەسێکی تر، ئەوا فەرمانم دەکرد بە ژنان سەجدە بەرن بۆ مێردەکانیان، چونکە خوای گەورە ئەوەندە ماف و رێزی داناوە بۆ پیاوان لەسەر ژنان).

٢١٤١ - (صحيح) عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر پیاو داوای سەرجێی لە ژنەکەی بکات ژنەکەی ملی نەدایە، پیاوەکە دڵی لێی یەشاو بەدڵ ڕەنجاوی ڕۆژی کردەوەو شەوی بەڕێ کرد، ئەو شەوە تا بەیانی مەلائیکەکان نەفرەتی لێ دەکەن).

## باسی سەبارەت بە مافی ژن لەسەر پیاوەکەی.

## ٤٢ - باب فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ عَلَى زَوْجِهَا.

٢١٤٢ - (حسن صحيح) عن حكيم بن معاوية القشيري، عن أبيه قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا حَقُّ زَوْجَةِ أَحَدِنَا عَلَيْهِ قَالَ: (أَنْ تُطْعِمَهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوَهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ - أَوِ اكْتَسَبْتَ - ، وَلاَ تَضْرِبِ الْوَجْهَ، وَلاَ تُقَبِّحْ، وَلاَ تَهْجُرْ إِلاَّ فِي الْبَيْتِ).
قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (وَلاَ تُقَبِّحْ). أَنْ تَقُولَ قَبَّحَكِ اللَّهُ.

واتە: لە حەکیمی کوڕی موعاویەی قوشەیریەوە، لە باوکیەوە، دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مافی ژن لەسەر مێرد چیە؟ فەرمووی: (خواردنی پێ بدە لەوەی کە خۆت دەیخۆی، پۆشاکی بۆ بکە وەك ئەوەی کە بۆ

خۆتی دەکەیت، لەدەم و چاوی مەدەو، قسەی ناشیرینی پـێ مـەڵێ و، لەماڵـەوە نـەبێت جێی لێ جیامەکەرەوە - ). ئەبو داود دەڵێت: (وَلاَ تُقَبِّحْ). پێـی نـەڵێیت خـوای گـەورە ناشیرینت کات.

**٢١٤٣ - (حسن صحيح) عن بهز بن حكيم، حـدثني أبـي، عـن جـدي، قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ نِسَاؤُنَا مَا نَأْتِى مِنْهُنَّ وَمَـا نَـذَرُ، قَالَ: (ائْتِ حَرْثَكَ أَنَّى شِئْتَ، وَأَطْعِمْهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَاكْسُـهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ، وَلاَ تُقَبِّحِ الْوَجْهَ، وَلاَ تَضْرِبْ). قَالَ أَبُـو دَاوُدَ: رَوَى شُعْبَةُ: (تُطْعِمُهَا إِذَا طَعِمْتَ، وَتَكْسُوهَا إِذَا اكْتَسَيْتَ).**

واتە: بەهزی کوڕی حەکیم دەڵێت: باوکم لە باپیرمەوە بۆی گێڕاینەوە وتـی: وتم: ئـەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن چێژ لە ژنـەکانمان وەرگـرین؟ فـەرمووی: (تـۆوی خۆت بوەشێنە ناو کێڵگەکەتەوە بەهەرشێوەیەك دەتـەوێت -لەشـوێنی تایبـەتی خـۆی ـەپێشەوە نەك لەدواوە - ، خواردنی پێ بدە لەوەی کە خۆت دەیخۆی، پۆشـاکی بـۆ بکـە وەك ئەوەی کە بۆ خۆتی دەکەیت، دەم و چاوی ناشیرین مەکەو، لێی مەدە).

**٢١٤٤ - (صحيح) عن معاوية القشيري قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: فَقُلْـتُ: مَـا تَقُـولُ فِـى نِسَـائِنَا؟ قَـالَ: (أَطْعِمُوهُنَّ مِمَّا تَـأْكُلُونَ، وَاكْسُـوهُنَّ مِمَّـا تَكْتَسُـونَ، وَلاَ تَضْرِبُوهُنَّ، وَلاَ تُقَبِّحُوهُنَّ).**

واتە: لە موعاویەی قوشەیرییەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: وتم: دەربارەی مافی ژنەکانمان بەسەرمانەوە چی دەفـەرموی؟

فەرمووی: (خواردنیان پێ بدەن لەوەی کە خۆتان دەیخۆن، پۆشاکیان بۆ بکەن لەوەی کە بۆ خۆتانی دەکەن، لێیان مەدەن و، قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێن).

**٢١٤٥ - (حسن) عن أبي حرة الرقاشي عن عمه : أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (فَإِنْ خِفْتُمْ نُشُوزَهُنَّ فَاهْجُرُوهُنَّ فِى الْمَضَاجِعِ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو ئافرەتانەی کەئێوە دەترسن سەرپێچیتان بکەن ئەوە جێگەیان لێ جیابکەنەوەو لەگەڵیان مەخەون.

## باسی سەبارەت بە لێدانی ژنان.

## ٤٣ – باب فِى ضَرْبِ النِّسَاءِ.

**٢١٤٨ - (صحيح) عن إياس بن عبد الله بن أبي ذباب قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللَّهِ). فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: ذَئِرْنَ النِّسَاءُ عَلَى أَزْوَاجِهِنَّ، فَرَخَّصَ فِى ضَرْبِهِنَّ، فَأَطَافَ بِآلِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ! فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَقَدْ طَافَ بِآلِ مُحَمَّدٍ نِسَاءٌ كَثِيرٌ يَشْكُونَ أَزْوَاجَهُنَّ! لَيْسَ أُولَئِكَ بِخِيَارِكُمْ).**

واتە: لە ئیاسی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی (أَبِى ذُبَاب)ە وە دەگێڕنەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لە ژنەکانتان مەدەن).پێشەوا عومـەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ هاتە لای پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسـلم) وتـی: ژنان ترسیان شکاوە لە مێردەکانیان، جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسـلم) رێگـەی دا لێیـان بدەن بە لێدانێکی سوك ئازاریان نەدەن و هیچ شوێنێکیان نەشکێنن، ئـیتر زۆر لـە ژنـان هاتنـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) سـکالأیان دەکـرد لەدەسـتی مێردەکانیان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (زۆر لە ژنان هاتونەتـە سـەر مالی موحەممەد سکالا دەکەن لەدەستی مێردەکانیـان، ئـەم جـۆرە مێردانـە کـە ئـازاری ژنەکانیان دەدەن لە پیاوە باشەکانتان نین).

**٢١٤٧ - (ضعيف) عن عمر بن الخطاب : عن النبِى صـلى الله عليـه و سلم قال: (لاَ يُسْأَلُ الرَّجُلُ فِيمَا ضَرَبَ امْرَأَتَهُ).**

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) فەرموویـەتی: (پیـاو لەسـەر لێـدانی ژنەکـەی لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت – ئەگەر مەرج و سنوری لێدان لەبەرچاو بگرێت - ).

# باسی ئەوەی فەرمانی پیٚ کراوە دەربارەی چاوداخستن.

## ٤٤ – باب مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنْ غَضِّ الْبَصَرِ.

**٢١٤٨ - (صحيح) عن جرير قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نَظْرَةِ الْفَجْأَةِ، فَقَالَ: (اصْرِفْ بَصَرَكَ).**

واتە: جەریر - ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه) — دەڵێت: لەبارەی سەیرکردنی کتوپڕەوە پرسیام لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد؟ ئەویش فەرمووی: چاوت وەرچەرخێنەو روو بکە بەولاوە.

**٢١٤٩ - (صحيح) عن ابن بريدة، عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم لعلي رضي الله عنه: (يَا عَلِيُّ، لاَ تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الأُولَى، وَلَيْسَتْ لَكَ الآخِرَةُ).**

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە پێشەوا عەلی فەرموو: (ئەی عەلی، تەماشا لەسەر تەماشا مەکە، چونکە یەکەم تەماشا هی خۆتە لەبەرئەوە لەناکاو بووە، بەڵام دووەم تەماشا هی تۆ نیە لەبەر ئەوە گوناهە).

**٢١٥٠ - (صحيح) عن ابن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ لِتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا).**

واتە: لە ئیبنو مەسعوودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسلم) فەرموویەتی: (نابێت ژن سەرنجی ژنێکی تر بدات و باسی لەش و لار و جوانی ئـەو ئافرەتە بکات بۆ مێردەکەی بەشێوەیە وەك ئەوەی کە مێردەکەی سەیری بکات).

**٢١٥١ - (صحيح) عن جابر، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى امْـرَأَةً فَدَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَقَضَى حَاجَتَهُ مِنْهَا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ لَهُمْ: (إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ فَإِنَّهُ يُضْـمِرُ مَـا فِـي نَفْسِهِ).**

واتە: جابر دەڵێت: جارێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتێکی بینی، چوو بۆ لای زەینەبی کچی جەحش پێویستی خۆی جێبەجێ کرد، لەپاشدا هاتەوە بۆ ناو هاوەڵانی و پێی فەرموون: (بێگومان ژن لەشێوەی شەیتاندا دێـت، جـا ئەگـەر یـەکێکتان ژنێکـی بینیوای دی و ئارەزووی جولاّ با بچـێتە لای ژنەکـەی خـۆی چـونکە ئـەوە ئـارەزووی کـەم دەکاتەوە).

**٢١٥٢ - (صحيح) عن ابن عباس قال: ما رأيت شيئا أشبه باللمم، مما قال أبو هريرة، عن النبي صلى الله عليه و سلم: (إِنَّ اللَّـهَ**

كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَـا، أَدْرَكَ ذَلِـكَ لاَ مَحَالَـةَ، فَزِنَا الْعَيْنَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالـنَّفْسُ تَمَنَّـى وَتَشْتَهِي، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ وَيُكَذِّبُهُ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: هیچ شتێكم نەدیوە بچوێنرێت بـە گوناهی بچوك، وەك ئەوەی كە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خـواوە (صلی الله علیه وسـلم) دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (ئادەمیزاد خوای گەورە بەشی خۆی لە زینا بۆ نوسیوە، بـۆ هەركەس نوسرا بێت هەر دەبێت توشی ئەوە ببیّ، جا زینای چاوەكان تەماشاكردنە، زینای زمان قسەكردنە، زینای نەفس و دەروون ئـاوات خواسـتن و ئارەزووكردنـە، شـەرمگایش ئەمە بەدی دەهێنیّ یان بەدرۆی دەخاتەوە).

٢١٥٣ - (حسن) عن أبي هريرة: أن النبي صلى الله عليه و سلم قـال: (لِكُلِّ ابْنِ آدَمَ حَظُّهُ مِنَ الزِّنا)، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: (وَالْيَدَانِ تَزْنِيَـانِ، فَزِنَاهُمَـا الْـبَطْشُ، وَالـرِّجْلاَنِ تَزْنِيَـانِ، فَزِنَاهُمَـا الْمَشْيُ، وَالْفَمُ يَزْنِي، فَزِنَاهُ الْقُبَلُ).

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (هەموو ئادەمیزادیّ بەشی خـۆی لـە زینـا بـۆ هەیـە)، جـا راوی هـەمان بەسەرهاتی گێڕایەوە، فەرمووی: (دەستەكان زینا دەكەن، زیناكەشیان دەست وەشـاندن و دەستبازیە، پێكان زینا دەكەن، زیناكەشیان رۆشتنە بـۆ ئـەو كـارە، دەم زینـا دەكـات، زیناكەشی ماچ و موچە).

٢١٥٦ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: (وَالأُذُنُ زِنَاهَا الاِسْتِمَاعُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) .. ، راوی هەمان بەسەرهاتی گێڕایەوە، فەرمووی: (زینای گوێش گوێگرتنە لە قسە- ی زیناکەرەکەی ن ئەو کەسەی کە لە نێوانیاندایەو ڕێکیان دەخات - ).

## باسی دەربارەی چوونە لای ژنی کۆیلە (سەبایا)

## ٤٥ - باب فِي وَطْءِ السَّبَايَا.

٢١٥٥ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ يَوْمَ حُنَيْنٍ بَعْثًا إِلَى أَوْطَاسٍ، فَلَقُوا عَدُوَّهُمْ، فَقَاتَلُوهُمْ، فَظَهَرُوا عَلَيْهِمْ وَأَصَابُوا لَهُمْ سَبَايَا، فَكَأَنَّ أُنَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَحَرَّجُوا مِنْ غِشْيَانِهِنَّ، مِنْ أَجْلِ أَزْوَاجِهِنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي ذَلِكَ: (وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ) أَيْ فَهُنَّ لَهُمْ حَلَالٌ إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژی حونەین لەشکرێکی نارد بۆ سەر (أَوْطَاس)، دەگەن بە دوژمنەکانیان و جەنگیان لەگەڵ دەکەن و، سەردەکەون بەسەریانداو هەندێ ژنیان بە دیل لێ دەگرن، هەندێ لە هاوەڵان ناوێرن بچنە لای ئەو ژنە دیلانە، گوایە ئەوانە مێردیان هەیەو مێردەکانیشیان هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرن، خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ) النساء: ٢٤. واتە: (هەروەها حەرام کراوە لێتان ئەوانەی کەمێردیان هەیە لە ئافرەتان جگە لەوانەی کە بوونەتە موڵکتان (کەنیزەك).

واتە: ئەو ژنە دیلانە کە عیددەی شەرعیان تەواو بوو ئیتر دروستە بۆ خاوەنە موسوڵمانەکانیان بچنە لایان.

**٢١٥٦ - (صحيح) عن أبي الدرداء: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي غَزْوَةٍ فَرَأَى امْرَأَةً مُجِحًّا فَقَالَ: (لَعَلَّ صَاحِبَهَا أَلَمَّ بِهَا؟). قَالُوا: نَعَمْ، فَقَالَ: (لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنَةً تَدْخُلُ مَعَهُ فِي قَبْرِهِ، كَيْفَ يُوَرِّثُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ؟! وَكَيْفَ يَسْتَخْدِمُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ؟!).**

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە غەزایەکا لەبەر دەرگای ڕەشماڵێکەوە تێپەڕ بوو، ژنێکی سك پڕی دی، مانگی خۆی بوو، فەرمووی: (ڕەنگە خاوەنەکەی چوبێتە لای؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (خەریك بوو نەفرەتێکی وەهای لێ بکەم لەگەڵیا بچێتە گۆڕەکەیەوە، ئەوە چۆن دەبێ، ئەگەر ئەو سکە دەکاتە میراتبەری خۆی لەکاتێکدا ئەو میراتە بۆ ئەو حەڵاڵ نیە، یان چۆن ئەو سکە دەکاتە بەندەو خزمەتکاری خۆی لەکاتێکدا بۆی حەڵاڵ نیە).

٢١٥٧ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري ورفعه أنه قال في سَبَايَا أَوْطَاسٍ: (لاَ تُوطَأُ حَامِلٌ حَتَّى تَضَعَ، وَلاَ غَيْرُ ذَاتِ حَمْلٍ حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، فەرمودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دەربارەی ئافرەتەکانی (أَوْطَاس) فەرموویەتی: (سك پڕێك هەتا سکەکەی دانەنێ نابێ خاوەنە تازەکەی بچێتە لای، ئەو کەنیزەکەیشی کە سکی نیە هەتا نەکەوێتە بێ نوێژی و پاك نەبێتەوە بۆ خاوەنە تازەکەی دروست نیە بچێتە لای).

٢١٥٨ - (حسن) عن رويفع بن ثابت الأنصاري قال: قَامَ فِينَا خَطِيبًا، قَالَ: أَمَا إِنِّي لاَ أَقُولُ لَكُمْ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ يَوْمَ حُنَيْنٍ، قَالَ: (لاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْقِيَ مَاءَهُ زَرْعَ غَيْرِهِ). يَعْنِي إِتْيَانَ الْحَبَالَى (وَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَقَعَ عَلَى امْرَأَةٍ مِنَ السَّبْيِ حَتَّى يَسْتَبْرِئَهَا، وَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَبِيعَ مَغْنَمًا حَتَّى يُقْسَمَ).

واتە: لە روەیفیعی کوڕی (ثابت)ی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەستا وتاری بۆدایین، بەڵام من تەنیا باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە لە ڕۆژی حونەین دا لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بیستووە، فەرمووی: (هەر پیاوێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ بە ئاوی خۆی نەمامی کەسێکی تر ئاو بدات). واتە چونە لای

ئافرەتی سك پڕ. (وە هەر پیاوێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێت بچێتە لای ژنی کۆیلە (سەبایا)ی کافران هەتا ئەو ژنە منداڵدانی پاك دەبێتەوە و دەردەکەوێت کە منداڵی تێدا نیە، بەم شێوەیە ئەگەر سکی هەبوو بەدانانی سکەکە، ئەگەر سکیشی نەبوو بە پاك بوونەوە لە بێ نوێژی، هەروەها هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێت لە دەستکەوتی موسوڵمانان بفرۆشێت هەتا دابەش نەکرێت بەسەریاندا).

**٢١٥٩ - عن ابن إسحاق بهذا الحديث. قال: (حَتَّى يَسْتَبْرِئَهَا بِحَيْضَةٍ). زَادَ (فِيهِ: بِحَيْضَةٍ وَهُوَ وَهَمٌ مِنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ وَهُوَ صَحِيحٌ فِي حَدِيثِ أَبِي سَعِيدٍ، زَادَ) (وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَرْكَبْ دَابَّةً مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَعْجَفَهَا رَدَّهَا فِيهِ! وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَلْبَسْ ثَوْبًا مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فِيهِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْحَيْضَةُ لَيْسَتْ بِمَحْفُوظَةٍ وَهُوَ وَهَمٌ مِنْ أَبِي مُعَاوِيَةَ.**

واتە: لە ئەبو ئیسحاقەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، فەرمووی: (هەتا ئەو ژنە منالّدانی پاك دەبێتەوە بە پاك بوونەوە لە بێ نوێژی). ڕاوی لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بِحَيْضَةٍ) (وهم)ە لە ئەبی موعاویەوە، کە ڕاست و دروستە لە فەرموودەکەی ئەبو سەعیددا، ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە با سواری وڵاخێك نەبێت لە دەستکەوتی موسوڵمانان هەتا لەڕ دەبێت لەدوایدا بیگێڕێتەوە، وە هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورەو بە ڕۆژی دوایی هەیە با جل و بەرگێك لە دەستکەوتی موسوڵمانان لەبەر نەکات هەتا کۆنی دەکات لەدوایدا

بیگێڕێتەوە). ئەبو داود دەڵێت: راوی لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بِحَيْضَةٍ) نەبەرکراو(محفوظ) نیە (وهم)ە لە ئەبی موعاویەوە.

## باس و خواسی کاروبارە جیاوازەکانی هاوسەرگیری.

## ٤٦ – باب فِي جَامِعِ النِّكَاحِ.

**٢١٦٠ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (إِذَا تَزَوَّجَ أَحَدُكُمُ امْرَأَةً أَوِ اشْتَرَى خَادِمًا فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَإِذَا اشْتَرَى بَعِيرًا فَلْيَأْخُذْ بِذِرْوَةِ سَنَامِهِ وَلْيَقُلْ: مِثْلَ ذَلِكَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ أَبُو سَعِيدٍ: (ثُمَّ لِيَأْخُذْ بِنَاصِيَتِهَا وَلْيَدْعُ بِالْبَرَكَةِ). فِى الْمَرْأَةِ وَالْخَادِمِ.**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کاتێ یەکێ لە ئێوە ژن دەهێنێ، یان نۆکەرێ یا کارەکەرێ دەکرێت با بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا، وَمِنْ شَرِّ مَا جَبَلْتَهَا عَلَيْهِ). واتە: خوایە من داوای خێرو خۆشی ئەمە خۆی و چاکەو خێری خوڕەوشت و رەفتاری باشی ئەمەت لێ دەکەم، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەمە خۆی و لە خراپی ڕەوشت و رەفتاری، وە کاتێ کە وشترێکی کڕی دەست بگرێ بە نوکی کۆپارەکەیەوەو هەمان دوعا بخوێنێ. ئەبو داود دەڵێت: ئەبو سەعید

ئەمەی بۆ زیاد کرد: ( لە پاشدا دەست بگرێ بەو مووەی کە بەشی پێشەوەی سەریەوەیەو دوعای خێر و پیت و فەڕ و بەرەکەتی بۆ بکات). بۆ ژن و بۆ نۆکەر یان کارەکەر.

**٢١٦١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال النبي صلى الله عليه و سلم: (لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ أَنْ يَكُونَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ: لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کاتێ یەکێك لە ئێوە دەیەوێت بچێتە لای خێزانی خۆی با بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا). واتە: بەناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە، شەیتان دوور بخەرەوە لەو منداڵەی کە پێمان دەبەخشیت. ئەوە ئەگەر خوای گەورە لەو جارەدا بڕیاری منداڵی بۆ دان، هەرگیز شەیتان ئازاری پێ ناگەیەنێت.

**٢١٦٢ - (حسن) عن أبي هريرة، قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی بچێتە لای ئافرەت لەپاشەوە، ئەوە دوور خراوەیە لە ڕەحمەتی خوایی).

٢١٦٣ - (صحيح) عن جابر قال: إِنَّ الْيَهُودَ يَقُولُونَ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ فِي فَرْجِهَا مِنْ وَرَائِهَا كَانَ وَلَدُهُ أَحْوَلَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جولەکەکان دەیانوت: ئەگەر پیاو لەڕووی دواوە لەشوێنی منداڵ بوونەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی دروست بێت، ئەوە منداڵەکەی خێل دەردەچێت، خوای گەورە لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ). سورة البقرة: ٢٢٣. واتە: ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن جا تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە بەهەرشێوەیەك دەتانەوێ (لەشوێنی تایبەتی خۆی کە پێشەوەیە نەك لەدواوە).

٢١٦٤ - (حسن) عن ابن عباس قال: إِنَّ ابْنَ عُمَرَ - وَاللَّهُ يَغْفِرُ لَهُ - أَوْهَمَ! إِنَّمَا كَانَ هَذَا الْحَيُّ مِنَ الأَنْصَارِ - وَهُمْ أَهْلُ وَثَنٍ - مَعَ هَذَا الْحَيِّ مِنْ يَهُودَ - وَهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ - وَكَانُوا يَرَوْنَ لَهُمْ فَضْلاً عَلَيْهِمْ فِي الْعِلْمِ، فَكَانُوا يَقْتَدُونَ بِكَثِيرٍ مِنْ فِعْلِهِمْ، وَكَانَ مِنْ أَمْرِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَنْ لاَ يَأْتُوا النِّسَاءَ إِلاَّ عَلَى حَرْفٍ، وَذَلِكَ أَسْتَرُ مَا تَكُونُ الْمَرْأَةُ، فَكَانَ هَذَا الْحَيُّ مِنَ الأَنْصَارِ قَدْ أَخَذُوا بِذَلِكَ مِنْ فِعْلِهِمْ، وَكَانَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ قُرَيْشٍ يَشْرَحُونَ النِّسَاءَ شَرْحًا مُنْكَرًا، وَيَتَلَذَّذُونَ مِنْهُنَّ مُقْبِلاَتٍ وَمُدْبِرَاتٍ، وَمُسْتَلْقِيَاتٍ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الْمَدِينَةَ تَزَوَّجَ رَجُلٌ مِنْهُمُ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَذَهَبَ يَصْنَعُ

**بِهَا ذَلِكَ، فَأَنْكَرَتْهُ عَلَيْهِ، وَقَالَتْ: إِنَّمَا كُنَّا نُؤْتَى عَلَى حَرْفٍ فَاصْنَعْ ذَلِكَ وَإِلاَّ فَاجْتَنِبْنِي، حَتَّى شَرِيَ أَمْرُهُمَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ) أَيْ مُقْبِلاَتٍ وَمُدْبِرَاتٍ وَمُسْتَلْقِيَاتٍ، يَعْنِي بِذَلِكَ مَوْضِعَ الْوَلَدِ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئیبنو عومەر بە هەڵەدا چووە — خوای گەورە لێی خۆش بێت — بێگومان ئەم ناوچەیە لە ئەنصارەکان - کە بت پەرست بوون — لەگەڵ ئەم ناوچەیە لە جولەکەکان — کە خاوەن نامەی ئاسمانی بوون — ئەنصارەکان پێیان وابوو کە جولەکەکان لە زانست و زانیاریدا فەزڵیان هەیە بەسەریانەوە چونکە خاون نامەی ئاسمانین، بۆیە لە زۆر کاروکردەوەدا شوێن جولەکەکان دەکەوتن، جا حاڵی جولەکەکان وەها بوو لەسەر یەك شێوە دەچونە لای ژنەکانیان ئەویش بریتی بوو لە حاڵەتی پاڵکەوتن لەسەر تەنیشت، ئەم رێگەیەش داپۆشراو تر بوو بۆ ئافرەت، بۆیە ئەنصارەکانی ئەم ناوچەیە ئەو کارەیان لێ وەرگرتن و بەو شێوەیە دەچونە لای ژنەکانیان، خەڵکی ئەم ناوچەیە لە قورەیشیەکانیش لە هەموو لایەکەوە دەچوونە لای ژنەکانیان بەلاّم لە رێگەی منداڵ بوونەوە لەگەڵیان جوت دەبوون، کاتێ کە (مهاجرین)کۆچەران گەیشتنە مەدینە یەکێ لەوان ژنێکی لە ئەنصارەکان هێنا، ویستی لەسەر ئەو شێوەیەی خۆیان بچێتە لای بەلاّم ئەو رازی نەبوو وتی: ئێمە لەسەر یەك شێوە کاری سەرجێی ئەنجام دەدەین ئەویش بریتە لە حاڵەتی پاڵکەوتن لەسەر تەنیشت، ئەگەر رازیت بەو شێوەیە بکەی باشە ئەگەرنا لێم دووربکەوەرەوە، هەتا کار گەیشتە ئەوەی دەنگ و باسەکەیان گەورەبوو، گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، خوای گەورەش لەو بارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ).

سورة البقرة: ٢٢٣.

## باسی چوونە لای ژن و لە ئامێزگرتنی لەكاتی بێ نوێژیدا – بێگومان چوونە لای ژن لەكاتی بێ نوێژیدا حەرامە – .

## ٤٧ – باب فِي إِتْيَانِ الْحَائِضِ وَمُبَاشَرَتِهَا.

٢١٦٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ الْيَهُودَ كَانَتْ إِذَا حَاضَتْ مِنْهُمُ امْرَأَةٌ أَخْرَجُوهَا مِنَ الْبَيْتِ، وَلَمْ يُؤَاكِلُوهَا، وَلَمْ يُشَارِبُوهَا، وَلَمْ يُجَامِعُوهَا فِي الْبَيْتِ، فَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (جَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ، وَاصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ غَيْرَ النِّكَاحِ). فَقَالَتِ الْيَهُودُ: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أَنْ يَدَعَ شَيْئًا مِنْ أَمْرِنَا إِلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ! فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْيَهُودَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا، أَفَلاَ نَنْكِحُهُنَّ فِي الْمَحِيضِ؟ فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ قَدْ وَجِدَ عَلَيْهِمَا فَخَرَجَا، فَاسْتَقْبَلَتْهُمَا هَدِيَّةٌ مِنْ

لَبَنٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمَا، فَسَقَاهُمَا فَظَنَنَّا أَنَّهُ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا.

واته: له ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە جولەکە هەر کاتێ ئافرەتێکیان بکەوتایەتە بێ نوێژیەوە، لە ماڵ دەریان دەکرد، نە خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵی دەخوارد، نە لە ماڵیشەوە لەگەڵی دادەنیشتن، بەڵکو پارێزیان لێ دەکردو جێیان بۆ جیادەکردەوە، بۆیە یارانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەیەوە لێیان پرسی؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ نارد: (وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ...) سورة: البقرة:٢٢٢. واتە: وە پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی حەیز بڵێ حەیز ئازارە، کەواتە دوربکەونەوە لە هاوسەرەکانتان لەکاتی حەیزدا... هەتا کۆتایی ئایەتەکە، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لە ماڵەکاندا لەگەڵیان کۆببنەوەو، هەموو شتێکیان لەگەڵ ئەنجام بدەن جگە لە (جماع)کاری جوتبوون). جولەکە وتیان: ئەم پیاوە دەیەوێت لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێتەوە. جا ئوسەیدی کوڕی (حُضَیْر) و عەببادی کوڕی بیشر چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جولەکە ئاواو ئاوا دەڵێن، ئەی بۆچی ڕێگامان پێ نادەی هەتا لەکاتی بێ نوێژیدا بچینە لایان و دروست ببین لەگەڵیاندا؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕووی گرژ کردو ڕەنگی گۆڕا، هەتا وامان دەزانی کە لێیان تورە بووە، بۆیە هەردووکیان هەستان چوونە دەرەوەو ڕۆیشتن، لەپاشدا هەندێ شیریان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیان و خواردیانەوەو تێگەیشتن کە دڵی لێیان نەیاشەوە.

٢١٦٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كُنْتُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَبِيتُ فِي الشِّعَارِ الْوَاحِدِ، وَأَنَا حَائِضٌ طَامِثٌ، فَإِنْ أَصَابَهُ مِنِّي شَيْءٌ غَسَلَ مَكَانَهُ وَلَمْ يَعْدُهُ، وَإِنْ أَصَابَ - تَعْنِي ثَوْبَهُ - مِنْهُ شَيْءٌ غَسَلَ مَكَانَهُ وَلَمْ يَعْدُهُ وَصَلَّى فِيهِ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: من و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پۆشاکێکدا پێکەوە خەوتین لە کاتێکدا کە من بێ نوێژ بووم، ئەگەر خوێنی حەیزەکەم بەری بکەوتایە تەنها شوێنەکەی دەشت،، لەوە زیاتر نا، وە ئەگەر خوێنی حەیزەکەم بەر پۆشاکەکەی بکەوتایە تەنها شوێنەکەی دەشت، پاشان نوێژی پێوە دەکرد.

٢١٦٧ - (صحيح) عن ميمونة بنت الحارث: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُبَاشِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ وَهِيَ حَائِضٌ أَمَرَهَا أَنْ تَتَّزِرَ، ثُمَّ يُبَاشِرُهَا.

واتە: لە مەیمونەی کچی (حَارِث)ەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر یەکێ لە ئێمە بێ نوێژ بوایە فەرمانی پێ دەکرد کە نێوان ئەژنۆ و ناوکی بە پۆشاکێ داپۆشێت، لەپاشدا گەمەی لەگەڵ دەکردو چێژی لێ وەردەگرت.

# باسی دەربارەی کەفارەتی ئەو کەسەی کە دەچێتە لای ژنەکەی لەکاتی بێ نوێژیدا.

## ٤٨ – باب فِي كَفَّارَةِ مَنْ أَتَى حَائِضًا.

**٢١٦٨ - (صحيح) عن أبن عباس، عن النبِي صلى الله عليه وسلم: فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: (يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، سەبارەت بە کەسێك کە دەچێتە لای خێزانەکەی و جیماعی لەگەڵ دەکات لە کاتێکدا کە بێ نوێژە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (دەبێ دیناری، یان نیو دینار ببەخشێت). مەبەست لەدیناری زێڕە.

**٢١٦٩ - (صحيح موقوف) عن ابن عباس قال: إِذَا أَصَابَهَا فِي الدَّمِ فَدِينَارٌ، وَإِذَا أَصَابَهَا فِي انْقِطَاعِ الدَّمِ فَنِصْفُ دِينَارٍ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئەگەر لەسەردتای خوێنی بێ نوێژیەوە جیماعی لەگەڵ کرد: ئەوە دەبێ یەك دینار ببەخشێت، بەڵام ئەگەر لە کاتی وشکایی هاتنی خوێنەکەدا بوو: ئەوە دەبێ نیو دینار ببەخشێت.

# باسی سەبارەت بە خۆکێشانەوە لەکاتی نزیک بونەوەی ئاو هاتنەوەدا بۆ ئەوەی تۆوەکە نەچێتە رەحمیەوە.

## ٤٩ – باب مَا جَاءَ فِي الْعَزْلِ.

**٢١٧٠ - (صحيح) عن أبو سعيد، ذُكِرَ ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِي الْعَزْلَ - قَالَ: (فَلِمَ يَفْعَلُ أَحَدُكُمْ؟). وَلَمْ يَقُلْ: فَلاَ يَفْعَلْ أَحَدُكُمْ، (فَإِنَّهُ لَيْسَتْ مِنْ نَفْسٍ مَخْلُوقَةٍ إِلاَّ اللَّهُ خَالِقُهَا).**

واتە: ئەبو سەعید دەڵێت: لەلای پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەوە کرا – واتە خۆکێشانەوە(عزل) – پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بۆچی کەسێ لە ئێوە ئەو کارە دەکات). نەیفەرموو: هیچ کەسێ لە ئێوە ئەو کارە نەکات، (چونکە بێگومان ئەو نەفسەی کە خوای گەورە بڕیار بدات بەدیبهێنێ هەر بەدی دەهێنێت ئیتر کەسێ لە ئێوە (عزل) بکات یان نا).

**٢١٧١ - عن أبي سعيد الخدري: أن رجلا قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارِيَةً وَأَنَا أَعْزِلُ عَنْهَا، وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ، وَأَنَا أُرِيدُ مَا يُرِيدُ الرِّجَالُ، وَإِنَّ الْيَهُودَ تُحَدِّثُ أَنَّ الْعَزْلَ مَوْءُودَةُ الصُّغْرَى، قَالَ: (كَذَبَتْ يَهُودُ، لَوْ أَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَخْلُقَهُ مَا اسْتَطَعْتَ أَنْ تَصْرِفَهُ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من كەنیزەكێكم هەیە كاتێ كە دەچمە لای لەكاتی نزیك بونەوەی ئاو هاتنەوەدا خۆم دەكێشمەدواوە، چونكە حەزناكەم سكی پڕ ببێت و ببێتە دایكی مندالّم ئیتر بۆم نەبێت بیفرۆشم، منیش ئەوەم دەوێت كە پیاوان دەیانەوێت واتە فرۆشتنی و دەستخستنی مالّ و سامان، جولەكەكانیش دەلّێن: (عزل) كچ زیندە بەچالّكردنی بچوكە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (جولەكە درۆ دەكەن، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت دروستی بكات تۆ ناتوانی قەدەغەی بكەیت).

**٢١٧٢ - (صحيح) عن ابن محيريز قال: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَرَأَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ، فَجَلَسْتُ إِلَيْهِ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْعَزْلِ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ بَنِي الْمُصْطَلِقِ، فَأَصَبْنَا سَبْيًا مِنْ سَبْيِ الْعَرَبِ، فَاشْتَهَيْنَا النِّسَاءَ، وَاشْتَدَّتْ عَلَيْنَا الْعُزْبَةُ، وَأَحْبَبْنَا الْفِدَاءَ، فَأَرَدْنَا أَنْ نَعْزِلَ، ثُمَّ قُلْنَا: نَعْزِلُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ أَظْهُرِنَا قَبْلَ أَنْ نَسْأَلَهُ عَنْ ذَلِكَ؟! فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: (مَا عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا، مَا مِنْ نَسَمَةٍ كَائِنَةٍ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِلاَّ وَهِيَ كَائِنَةٌ).**

واتە: لە ئیبنو موحەیریزەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: چومە مزگەوت ئەبو سەعیدی خودریم بینی لەلای دانیشتم، دەربارەی (عزل) لێم پرسی؟ ئەبو سەعید وتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) غەزای (بَنِي الْمُصْطَلِقِ)مان كردو ژنانی عەرەبمان دەستكەوت، زۆریش حەزمان لە چێژ وەرگرتن لە ژن بوو، بێ ژنیش زۆری بۆ هێنا بووین چونكە دەمێ بوو لەسەفەردا بووین، حەزیشمان لە فرۆشتنی ئەو ژنە كۆیلانە هەبوو،

ئەوەش دەترساین ئەگەر بچینە لایان سکیان پڕ ببێ و ببن بە دایکی منداڵمان و ئیتر ئەوان نەبێ بیان فرۆشین، بۆیە ویستمان بچنە لایان و لەکاتی نزیک بوونەوەی ئاو دەتنەوەدا خۆمان بکێشینەوە هەتا ئاوەکە نەگاتە جێی خۆی و نەبێ بە منداڵ، لەپاشدا وتمان: ئێمە (عزل) بکەین لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەناوماندایە پێش ئەوەی پرسی پێ بکەین کە ئایا (عزل) دروستە یان نا؟! جا لەوبارەوە لێمان پرسی، ئەویش فەرمووی: (ئەو کارەی کە دەیکەن لەپێناوی ئەوەدا کە سکیان پڕ نەبێ هیچ شتێ دەگەڕێنێتەوە لەوەی کە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داوە، چونکە هەر نەفسێ هەتا ڕۆژی قیامەت خوای گەورە بڕیاری لەسەر دابێ کە دروست ببێت ئەوە هەر دەبێ دروست ببێت).

**٢١٧٣ - (صحيح) عن جابر قال: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنَّ لِي جَارِيَةً أَطُوفُ عَلَيْهَا، وَأَنَا أَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ، فَقَالَ: (اعْزِلْ عَنْهَا إِنْ شِئْتَ، فَإِنَّهُ سَيَأْتِيهَا مَا قُدِّرَ لَهَا). قَالَ: فَلَبِثَ الرَّجُلُ، ثُمَّ أَتَاهُ، فَقَالَ: إِنَّ الْجَارِيَةَ قَدْ حَمَلَتْ، قَالَ: (قَدْ أَخْبَرْتُكَ أَنَّهُ سَيَأْتِيهَا مَا قُدِّرَ لَهَا).**

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی ئەنصاری هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتی: من کەنیزەکێکم هەیە دەچمە لای حەزیش ناکەم سکی پڕ بێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر حەز دەکەیت (عزل) بکە، چونکە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێ منداڵتان ببێ هەر دەبێ). وتی: پیاوەکە لەپاش ماوەیە هاتەوە، وتی: کەنیزەکەکە سکی پڕە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (پێم ڕاگەیاندی ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێ منداڵتان ببێ هەر دەبێ).

## باسی كارێكی خراپە كەسێ لەگەڵ ژنەكەی خۆی (جماع) كاری سەرجێی بكات لەپاشدا لەلای خەڵك باسی بكات.

## ٥٠ - باب مَا يُكْرَهُ مِنْ ذِكْرِ الرَّجُلِ مَا يَكُونُ مِنْ إِصَابَةِ أَهْلِه.

٢١٧٤ - (ضعيف) عن شيخ من طفاوة قال: تَثَوَّيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ بِالْمَدِينَةِ، فَلَمْ أَرَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشَدَّ تَشْمِيرًا، وَلاَ أَقْوَمَ عَلَى ضَيْفٍ مِنْهُ، فَبَيْنَمَا أَنَا عِنْدَهُ يَوْمًا وَهُوَ عَلَى سَرِيرٍ لَهُ، وَمَعَهُ كِيسٌ فِيهِ حَصًى أَوْ نَوًى - وَأَسْفَلُ مِنْهُ جَارِيَةٌ لَهُ سَوْدَاءُ - وَهُوَ يُسَبِّحُ بِهَا، حَتَّى إِذَا أَنْفَدَ مَا فِي الْكِيسِ أَلْقَاهُ إِلَيْهَا فَجَمَعَتْهُ فَأَعَادَتْهُ فِي الْكِيسِ، فَرَفعتْهُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَلاَ أُحَدِّثُكَ عَنِّي وَعَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: بَيْنَا أَنَا أُوعَكُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَقَالَ: (مَنْ أَحَسَّ الْفَتَى الدَّوْسِيَّ؟). ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. فَقَالَ: رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ ذَا يُوعَكُ فِي

جَانِبِ الْمَسْجِدِ، فَأَقْبَلَ يَمْشِي حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيَّ، فَقَالَ لِي مَعْرُوفًا، فَنَهَضْتُ، فَانْطَلَقَ يَمْشِي حَتَّى أَتَى مَقَامَهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ، فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ وَمَعَهُ صَفَّانِ مِنْ رِجَالٍ وَصَفٌّ مِنْ نِسَاءٍ، أَوْ: صَفَّانِ مِنْ نِسَاءٍ، وَصَفٌّ مِنْ رِجَالٍ، فَقَالَ: (إِنْ أَنْسَانِي الشَّيْطَانُ شَيْئًا مِنْ صَلاَتِي فَلْيُسَبِّحِ الْقَوْمُ وَلْيُصَفِّقِ النِّسَاءُ). قَالَ: فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يَنْسَ شَيْئًا مِنْ صَلاَتِهِ، فَقَالَ: (مَجَالِسَكُمْ مَجَالِسَكُمْ). زَادَ مُوسَى (هَا هُنَا). ثُمَّ حَمِدَ اللَّهَ تَعَالَى وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (أَمَّا بَعْدُ). ثُمَّ اتَّفَقُوا ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى الرِّجَالِ فَقَالَ: (هَلْ مِنْكُمُ الرَّجُلُ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ فَأَغْلَقَ عَلَيْهِ بَابَهُ وَأَلْقَى عَلَيْهِ سِتْرَهُ، وَاسْتَتَرَ بِسِتْرِ اللَّهِ؟!). قَالُوا نَعَمْ. قَالَ: (ثُمَّ يَجْلِسُ بَعْدَ ذَلِكَ فَيَقُولُ فَعَلْتُ كَذَا فَعَلْتُ كَذَا!). قَالَ: فَسَكَتُوا، قَالَ: فَأَقْبَلَ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ: (هَلْ مِنْكُنَّ مَنْ تُحَدِّثُ). فَسَكَتْنَ فَجَثَتْ فَتَاةٌ، قَالَ: مُؤَمَّلٌ فِي حَدِيثِهِ فَتَاةٌ كَعَابٌ عَلَى إِحْدَى رُكْبَتَيْهَا وَتَطَاوَلَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَرَاهَا وَيَسْمَعَ كَلاَمَهَا، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُمْ لَيَتَحَدَّثُونَ وَإِنَّهُنَّ لَيَتَحَدَّثْنَهْ فَقَالَ: (هَلْ تَدْرُونَ مَا مَثَلُ ذَلِكَ). فَقَالَ: (إِنَّمَا ذَلِكَ مَثَلُ شَيْطَانَةٍ لَقِيَتْ شَيْطَانًا فِي السِّكَّةِ فَقَضَى مِنْهَا حَاجَتَهُ وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ

إِلَيْهِ أَلاَ وَإِنَّ طِيبَ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَلَمْ يَظْهَرْ لَوْنُهُ أَلاَ إِنَّ طِيبَ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَلَمْ يَظْهَرْ رِيحُهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مِنْ هَا هُنَا حَفِظْتُهُ عَنْ مُؤَمَّلٍ وَمُوسَى (أَلاَ لاَ يُفْضِيَنَّ رَجُلٌ إِلَى رَجُلٍ، وَلاَ امْرَأَةٌ إِلَى امْرَأَةٍ، إِلاَّ إِلَى وَلَدٍ أَوْ وَالِدٍ). وَذَكَرَ ثَالِثَةً فَأُنْسِيتُهَا وَهُوَ فِي حَدِيثِ مُسَدَّدٍ وَلَكِنِّي لَمْ أُتْقِنْهُ كَمَا أُحِبُّ.

واتە: لە شێخێکی (طُفَاوَة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە مەدینە بومە میوانی ئەبو هورەیرە، لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ پیاوێکم نەدیوە ئەوەندەی ئەبو هورەیرە لە پەرستشدا کۆشش بکات، ئەوەندەش خزمەتی میوان بکات و میوان پەروەربێ، رۆژێکیان لەلای بووم ئەو لەسەر چەرپایە یان تەختەبەندەکەی خۆی بوو، کیسەیەکی پێ بوو کیسەکە وردە بەرد، یان ناوکە خورمای تێدا بوو، کەنیزەکێکی رەش لەخوار چەرپایەکەوە بوو، ئەبو هورەیرە بە وردە بەردو ناوکە خورماکان تەسبیحاتی کرد هەتا دانە دانە تەواوی کردن و هیچ لە کیسەکەدا نەما، جا کیسەکەی هەڵدا بۆ کەنیزەکەکە ئەویش وردە بەردو ناوکە خورماکانی کۆکردەوەو کردنیەوە ناو کیسەکەو بەرزیکردەوە بۆ ئەبو هورەیرە، جا ئەبو هورەیرە وتی: باسی فەرمودەیەکت بۆ نەکەم لەبارەی خۆم و پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)؟ شێخەکەی (طُفَاوَة) وتی: وتم بەڵێ بۆم باس بکە، ئەبو هورەیرە وتی: جارێ لەمزگەوت تایەکی زۆرم هەبوو ئازارم زۆر بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هات بۆ مزگەوت سێ جار فەرمووی: (کێ لاوە دەوسیەکەی دیوە واتە کێ ئەبو هورەیرە دیوە؟)، پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەتا لە لایەکی مزگەوتەکەدایە تایەکی زۆری لێهاتوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرەو رووم هات هەتا گەیشتە لام، دەستی خستە سەر دڵ و سنگم بۆ ئەوەی سوکنایی دڵم بێت، فەرمودەیەکی چاکی بۆ باس کردم، منیش هەستام، پێغەمبەر (صلی

لله عليه وسلم) لێیدا رۆشت هەتا گەیشتەوە ئەو شوێنەی کە نوێژی تێدا دەکرد، رووی کردە ئەوانەی کە لەوێدا ئامادە بوون، دوو ریز لە پیاوان و، ریزێ لە ئافرەتانی لەگەڵ بوو، یان: دوو ریز لە ئافرەتان و، ریزێ لە پیاوانی لەگەڵ بوو، فەرمووی: (ئەگەر شەیتان شتێکی لە نوێژەکەم لەبیر بردمەوە، ئەوە با پیاوان بە (سبحان الله)کردن ئاگادارم بکەنەوە، ژنانیش بە بەری دەستیان بدەن لە پشتی دەستەکەی تریان)، ئەبو هورەیرە وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژەکەی کردو هیچی لەیاد نەچوو، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (پابەند بن بە کۆڕ و دانیشتنەکەتانەوە، پابەند بن بە کۆڕ و دانیشتنەکەتانەوە)، موسا راوی فەرموودەکە لێرەدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: لەپاشدا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، ئینجا فەرمووی: (لەدواییدا). ئینجا راویەکان یەکران: لەپاشدا روی کردە پیاوان و فەرمووی: (ئایا کاتێ یەکێ لە ئێوە بیەوێ لەگەڵ ژنەکەی کاری سەرجێیی بکات دەرگا لەسەر خۆی و ژنەکەی دادەخات و خۆی دادەپۆشێت بە تەواوی بەو شێوەیەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوە؟!). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: لەپاشدا ئەو کەسە لە کۆڕێکدا دادەنیشێ و دەڵێت: ئەوەو ئەوەم کرد، ئاواو ئاوام کرد - واتە نهێنیەکانی نێوان خۆی و ژنەکەی بڵاو دەکاتەوە - ). وتی: خەڵکەکە لەشەرماندا بێدەنگ بوون، ئەبو هورەیرە وتی: لەپاشدا روی کردە ژنان و فەرمووی: (ئایا کەسێ لە ئێوە باسی نهێنیەکانی خۆی و مێردەکەی لەلای ژنان باس دەکات؟) ئەوانیش لەشەرماندا بێدەنگ بوون، ئافرەتێکی لاو لەسەر ئەژنۆی دانیشت، موئەممەل لە فەرموودەکەیدا وتی: لەسەر ئەژنۆی دانیشت، ملی بەرزی کردەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ببینێ و گوێی لە وتەکانی بێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوانیش و ژنانیش باسی ئەوە دەکەن، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئایا دەزانن وێنەی ئەوە چۆنە لە ناشیرینیدا؟). فەرمووی: (بێگومان ئەوە نمونەی وەك نمونەی شەیتانێکی نێر وایە لە رێگایەکدا بگات بە شەیتانێکی مێ کاری سەرجێیی لەگەڵ بکات و خەڵك تەماشای بکەن، ئاگاداربن بۆنی خۆشی پیاوان ئەوەیە بۆنی هەبێ رەنگی نەبێ، بۆنی خۆشی ئافرەتانیش ئەوەیە رەنگی هەبێ و بۆنی نەبێ). ئەبو داود دەڵێت: هەتا ئێرە

فەرمودەكەم لەبەر كردوە لە موئەممەل و موساوە، واتە لە هەردوو راویەكەوە، (ئاگـاداربن با دوو پیاو پێكەوە لەناو جێگایەكدا نەخەون بەڕوتی، هـەروەها دوو ئـافرەتیش پێكـەوە لەناو جێگایەكدا نەخەون بەڕوتی). وتەی سێیەمیشی فـەرموو بـەڵام مـن لـەیادم چـوو، ئەمەش لە فەرمودەكەی موسەددەد دایە، بەڵام من بۆم لەبەر نەكراوە وەك دەمەوێت.

**كۆتایی پەرتوكی هاوسەرگیری.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی تەڵاق

## ٧- أول كتاب الطلاق: تفريع أبواب الطلاق.

## باسی کەسێ ژنێ لەبەرچاوی مێردەکەی بخات.

## ١ – باب فِيمَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا.

٢١٧٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا، أَوْ عَبْدًا عَلَى سَيِّدِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لەسەر بەرنامەو ڕێبازی ئێمە نیە ئەو کەسەی کە ژنێ لەبەرچاوی مێردەکەی دەخات، یان بەندەیە لەبەرچاوی گەورەکەی دەخات – بەوەی فێڵیان لێ بکات و ئاژاوەو دووبەرەکی بخاتە نێوانیانەوەو لەیەکیان بکات -).

## باسی ئافرەتێ داوا لە پیاوێ بکات ژنەکەی تەڵاق بدات بۆ ئەوەی خۆی جێی بگرێتەوە.

## ٢ - باب فِي الْمَرْأَةِ تَسْأَلُ زَوْجَهَا طَلاَقَ امْرَأَةٍ لَهُ.

**٢١٧٦ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلاَقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا، وَلْتَنْكِحْ، فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نابێ ئافرەتی موسوڵمان داوای تەڵاقدانی خوشکی موسوڵمانی بکات، بۆ ئەوەی جێی بگرێتەوە، با شو بە پیاوێکی تر بکات، وە هەر ئەوەی بۆ هەیە کە بۆی دانراوە).

## باسی سەبارەت بە (کراهة)ی تەڵاق.

## ٣ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الطَّلاَقِ.

**٢١٧٧ - (ضعيف) عن محارب قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَا أَحَلَّ اللَّهُ شَيْئًا أَبْغَضَ إِلَيْهِ مِنَ الطَّلاَقِ).**

واتە: لە موحاریبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خوای گەورە هیچ شتێکی حەڵاڵ نەکردوە بێزراوتر بێت لەلای لە تەڵاق).

٢١٧٨ - (ضعيف) عن ابن عمر، عن النبي صلى الله عليه وسلم: (أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى الطَّلاَقُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (بێزراوترین حەڵاڵ لای خوای گەورە بریتییە لە تەڵاق).

## باسی تەڵاقی سوننی[١].

## ٤ - باب فِي طَلاَقِ السُّنَّةِ.

٢١٧٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ).

---

[١] - پێشەوا بوخاری لە (صحيح)ەکەیدا دەڵێت: تەڵاقی سوننی بریتییە لەوەی پیاوێ ژنەکەی تەڵاق بدات دوای ئەوەی کە ژنەکەی پاك بوبێتەوە لە خوێنی حەیز, کاری سەرجێیی لەگەڵ نەکات بە شاهیدی دوو شایەت.

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ى كوڕى عومەر ڕەزاى خوایان لىٚ بىٚ لە سەردەمى پێغەمبەرى خوادا (صلى الله عليه وسلم) ژنەكەى تەلاٚق دا لەكاتێكدا كە ژنەكەى لەحەیزدا بوو، جا عومەر لەبارەى حوكمى ئەو تەلاٚقەوە پرسیارى كرد لە پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش فەرمووى: (فەرمانى پىٚ بكە با بیگێڕێتەوە، لەپاشدا با لەلاى بێت هەتا پاك دەبێتەوەو، ئینجا دەكەوێتەوە حەیزەوە، لەپاشدا پاك دەبێتەوە، ئەوكاتە ئەگەر بیەوێت ڕاى بگرىٚ، یان ئەگەر ویستى لەسەرى هەبوو تەلاٚقى بدات پێش ئەوەى بچێتە لاى تەلاٚقى بدات، ئەمەش ئەو ماوە(عدە)یەیە كە خواى گەورە فەرمانى پىٚ كردووە ئافرەتى تێدا تەلاٚق بدرێت).

**٢١٨٠ - (صحيح) عن نافع: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ وَهِيَ حَائِضٌ تَطْلِيقَةً، بِمَعْنَى حَدِيثِ مَالِكٍ.**

واتە: لە نافعەوە دەگێڕنەوە، كە ئیبنو عومەر ڕەزاى خوایان لىٚ بىٚ ژنەكەى تەلاٚق دا لەكاتێكدا كە لەحەیزدا بوو بە یەك تەلاٚق، جا ڕاوى فەرموودەكەى گێڕایەوە بە هەمان ماناى فەرموودەكەى مالیك واتە فەرموودەى پێشو.

**٢١٨١ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لْيُطَلِّقْهَا إِذَا طَهُرَتْ، أَوْ وَهِيَ حَامِلٌ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزاى خوایان لىٚ بىٚ دەگێڕنەوە، كە ژنەكەى تەلاٚق دا لەحەیزدا بوو، جا عومەر ڕەزاى خواى لىٚ بىٚ پرسیارى كرد لە پێغەمبەرى خوا (صلى الله

عليه وسلم) لەبارەی حوكمی ئەو تەلاقەوە؟ ئەویش فەرمووی: (فەرمانی پێ بكە با بیگێڕێتەوە، لەپاشدا كاتێ كە پاك بویەوە تەلاقی بدات، یان كە سكی پڕ بوو).

**٢١٨٢ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِرَسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَغَيَّظَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُمْسِكْهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ فَتَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَهَا طَاهِرًا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ، فَذَلِكَ الطَّلَاقُ لِلْعِدَّةِ كَمَا أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە ژنەكەی تەلاق دا لەحەیزدا بوو،جا عومەر رەزای خوای لێ بێ پرسیاری كرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) لەبارەی حوكمی ئەو تەلاقەوە؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) توڕەبوو، لەپاشدا فەرمووی: (فەرمانی پێ بكە با بیگێڕێتەوە، لەپاشدا با لەلای بێت هەتا پاك دەبێتەوە، ئینجا دەكەوێتەوە حەیزەوە، لەپاشدا پاك دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر ویستی لەسەری بوو تەلاقی بدات پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەمەش ئەو ماوە(عدە)یەیە كە خوای گەورە فەرمانی پێ كردوە ئافرەتی تێدا تەلاق بدرێت).

**٢١٨٣ - (صحيح) عن يونس بن جبير، أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: كَمْ طَلَّقْتَ امْرَأَتَكَ؟ فَقَالَ: وَاحِدَةً.**

واتە: یونوسی كوڕی جوبەیر: لە ئیبنو عومەری پرسی وتی: چەند تەلاقی ژنەكەت داوە؟ ئەویش وتی: یەك تەلاق.

٢١٨٤ - (صحيح) عن يونس بن جبير قال: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ، قَالَ: قُلْتُ: رَجُلٌ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: تَعْرِفُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، فَأَتَى عُمَرُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: (مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا فِي قُبُلِ عِدَّتِهَا). قَالَ: قُلْتُ: فَيُعْتَدُّ بِهَا؟ قَالَ: فَمَهْ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ؟!.

واتە: یونوسی كوڕی جوبەیر دەڵێت: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەرم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی: وتم: پیاوێ ژنەكەی تەڵاق دەدات لەكاتێكدا كە ژنەكەی لە حاڵەتی بێ نوێژیدایە حوكمی چی یە؟ وتی: (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر دەناسی؟ وتم: بەڵێ، وتی: بێگومان (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ژنەكەی تەڵاق دا لەحەیزدا بوو، جا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی حوكمی ئەو تەڵاقەوە لێی پرسی؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (فەرمانی پێ بكە با بیگێڕێتەوە، لەپاشدا لەسەرەتای ماوە(عدە)كەیەوە با تەڵاقی بدات). وتی: وتم: ئایا تەڵاقەكەی حسابەو ئیعتیباری هەیە؟ وتی: ئەی بۆچی حساب نیەو ئیعتیباری نیە؟ ئەی تۆ چی دەڵێی ئەگەر ئەو تەڵاقدەرە نەیتوانی ژنەكە بگەڕێنێتەوە و فەرمانەكەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجێ بێنێ، یان گێل و ئەحمەق بوو سەرپێچی كردو ژنەكەی نەگەڕاندەوە ئایا بۆی دەبێتە بەهانە(عذر)و تەڵاقەكەی دەكەوێت؟ یان تۆ چی دەڵێی ئەگەر كابرای تەڵاقدەر عەقڵی نەماو توانای گەڕانەوەی لەدەستدا ئایا ژنەكە بە موعەلەقی بمێنێتەوە نە مێردی هەبێ و نە تەڵاقدراو بێ واتە: هەرچۆنێك بێت ئەو تەڵاقە حساب دەكرێت هەرچەندە تەڵاقێكی بیدعیەو خیلافی سونەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەڵاقەكەی خواردوە.

٢١٨٤ – (صحيح) عن أبو الزبير: أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَيْمَنَ مَوْلَى عُرْوَةَ يَسْأَلُ ابْنَ عُمَرَ - وَأَبُو الزُّبَيْرِ يَسْمَعُ - قَالَ: كَيْفَ تَرَى فِي رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ حَائِضًا؟ قَالَ: طَلَّقَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَأَلَ عُمَرُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَرَدَّهَا عَلَيَّ وَلَمْ يَرَهَا شَيْئًا، وَقَالَ: (إِذَا طَهُرَتْ فَلْيُطَلِّقْ أَوْ لِيُمْسِكْ). قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَقَرَأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ). فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ عَنِ ابْنِ عُمَرَ: يُونُسُ بْنُ جُبَيْرٍ وَأَنَسُ بْنُ سِيرِينَ وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ وَزَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ وَأَبُو الزُّبَيْرِ وَمَنْصُورٌ، عَنْ أَبِي وَائِلٍ، مَعْنَاهُمْ كُلُّهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَ، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَ، وَكَذَلِكَ رَوَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، وَأَمَّا رِوَايَةُ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَالِمٍ وَنَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَهُ أَنْ يُرَاجِعَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيضَ، ثُمَّ تَطْهُرَ، ثُمَّ إِنْ شَاءَ طَلَّقَ، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَ،

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە هاتوە، كە لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئەیمەنی بەندەی رزگاركراوی عورووەی بیستوە، - ئەبو زوبەیر بیستی - وتی: رات چی یە دەربارەی پیاوێ ژنەكەی تەلاق بدات لەكاتێكدا كە لە حەیزدا بێت؟ (عَبْدُ الرَّحْمَن) وتی: (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ژنەكەی تەلاق دا لەحەیزدا بوو، جا عومەر لەبارەی حوكمی ئەو تەلاقەوە لە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) پرسی وتی: بێگومان (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر ژنەكەی تەلاق دا لەحەیزدا بوو، (عَبْدُ اللَّه) وتی: بۆی گەڕاندمەوەو بە هیچی نەبینی - واتە بە تەلاقی نەژمارد - ، وە فەرمووی: (كاتێ كە پاك بویەوە با تەلاقی بدات یان رای بگرێت لەلای خۆی). ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ ...). سورة الطلاق: ١. واتە: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (بەئومەتەكەت بڵێ) هەر كاتێ ویستان ژنانتان تەلاق بدەن، با تەلاقیان بدەن لەكاتی عیدەیاندا (ئەو كاتەی لەحەیز پاك بوونەتەوەو لەگەڵیان دروست نەبوون). لەسەرەتای ماوە(عدە)كەیانەوە. ئەبو داود دەڵێت: یونوسی كوڕی جوبەیر و، ئەنەسی كوڕی سیرین و، سەعیدی كوڕی جوبەیر و، زەیدی كوڕی ئەسلەم و، ئەبو زوبەیر و مەنصور ئەم فەرموودەیان لە ئیبنو عومەرەوە، لە ئەبی وائلەوە گێڕاوەتەوە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ كرد بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی هەتا پاك دەبێتەوە، ئینجا ئەگەر ویستی لەسەری هەبوو تەلاقی بدات، یان ئەگەر ویستی رای بگرێ. ئەبو داود دەڵێت: هەروەها موحەممەدی كوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن) ، لە سالمەوە، لە ئیبنو عومەرەوە بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە، بەڵام ریوایەتەكەی زوهری، لە سالمەوە لە نافعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە بەم شێوەیە هاتوە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ كرد بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی هەتا پاك دەبێتەوە، ئینجا دەكەوێتە حەیزەوە، لەپاشدا پاك دەبێتەوە، جا ئەگەر ویستی تەلاقی بدات، یان ئەگەر ویستی رای بگرێ.

# باسی پیاوێ ژنەکەی تەڵاق بدات و بیگێڕێتەوەو شاهیدی نەگرتبێ

## ٥ – باب الرَّجُلِ يُرَاجِعُ وَلاَ يُشْهِدُ.

٢١٨٦ - (صحيح) عن عمران بن الحصين: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ ثُمَّ يَقَعُ بِهَا، وَلَمْ يُشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا وَلاَ عَلَى رَجْعَتِهَا، فَقَالَ: طَلَّقْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، وَرَاجَعْتَ لِغَيْرِ سُنَّةٍ، أَشْهِدْ عَلَى طَلاَقِهَا وَعَلَى رَجْعَتِهَا، وَلاَ تَعُدْ.

واتە: لە عمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە پرسیاری لێ کراوە سەبارەت بە پیاوێ ژنەکەی تەڵاق بدات بە تەڵاقی رەجعی لەپاشدا بچێتە لای، نە بۆ تەڵاقەکەی شاهیدی گرتبێ، نە بۆ گێڕانەوەکەی؟ ئەویش وتویەتی: تۆ لەسەر غەیری سوننەت تەڵاقت داوە وە لەسەر غەیری سوننەت گێڕاوتەتەوە، شاهید بگرە لەسەر تەڵاقدان و لەسەر گێڕانەوەشی، دووبارەی مەکەرەوەو جارێکی تر کاری وەها مەکە.

# باسی سەبارەت بە بەندە چۆن ژنەکەی تەڵاق بدات؟ چی سوننەتە لەسەری کە بیکات؟ دەتوانێ چەند تەڵاقی بدات؟

## ٦ - باب فِي سُنَّةِ طَلاَقِ الْعَبْدِ.

**٢١٨٧ - (ضعيف) عن أبو حسن مولى بني نوفل: أَنَّهُ اسْتَفْتَى ابْنَ عَبَّاسٍ فِي مَمْلُوكٍ كَانَتْ تَحْتَهُ مَمْلُوكَةٌ فَطَلَّقَهَا تَطْلِيقَتَيْنِ، ثُمَّ عَتَقَا بَعْدَ ذَلِكَ: هَلْ يَصْلُحُ لَهُ أَنْ يَخْطُبَهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَضَى بِذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: ئەبو حەسەنی بەندەی رزگارکراوی بەنی نەوفلْ دەڵێت: سەبارەت بە کۆیلەیە کە کەنیزەکێ هاوسەری بێت دوو تەڵاقەی بدات، لەپاشدا ئازاد کران پرسیارکرا لە ئیبنو عەبباس: ئایا بۆی هەیە مارەی بکاتەوە، یان نا؟ ئیبنو عەبباس وتی: بەڵێ بۆی هەیە مارەی بکاتەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوەهای کردووە بەم شێوەیە بڕیاری داوە.

**٢١٨٨ - (ضعيف) عن علي، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ بِلاَ إِخْبَارٍ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَقِيَتْ لَكَ وَاحِدَةٌ، قَضَى بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ فەرمودەی پێشو بەهەمان سەنەدو مانا هاتوە بە بێ هەواڵ – واتە بە (عن فلان، عن فلان، ... ) - ئیبنو عەبباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: تەڵاقێکت دەمێنێ – بێگومان بەندە دوو تەڵاقی هەیە، چونکە ئازاد

کرو: تەلاقەکانیشی دەبنەوە بە سیان - ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاوەهای کردووە بەم شێوەیە بڕیاری داوە.

**٢١٨٩ - (ضعيف) عن عائشة، عن النبى صلى الله عليه وسلم قال: (طَلاَقُ الأمَةِ تَطْلِيقَتَانِ، وَقُرْؤُهَا حَيْضَتَانِ). قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: عَنْ عَائِشَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: (وَعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ حَدِيثٌ مَجْهُولٌ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (تەلاقی کەنیزەك دوو تەلاقە، ماوە(عدە)یشی دوو حەیزە). ئەبو عاصم دەڵێت: لە عائیشەوە، لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمودەی پێشوو هەمان مانا هاتوە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە راوی لەجیاتی (وَقُرْؤُهَا حَيْضَتَانِ). وتی: (وعِدَّتُهَا حَيْضَتَانِ). ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە فەرموودەیەکی (مجهول)ە.

**٢١٩٠ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: أن النبى صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ طَلاَقَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ، وَلاَ عِتْقَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ، وَلاَ بَيْعَ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ). زَادَ ابْنُ الصَّبَّاحِ: (وَلاَ وَفَاءَ نَذْرٍ إِلاَّ فِيمَا تَمْلِكُ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (مرۆڤ مافی تەلاقدانی ئافرەتێکی نیە کە هاوسەرو شەرعی ئەو نیە، ناشتوانێت بەندەیە ئازاد بکات کە هی خۆی نەبێت، وە

ناشتوانێت شتێ بفرۆشێت مەگەر هی خۆی بێت)، راوی ئیبنو صەباح ئەمەی بۆ زیاد کرد: (وەفای نەزری شتێکی لەسەر نیە کە موڵکی خۆی نەبێت).

## باسی سەبارەت بە تەڵاقدان لەپێش مارەبڕیندا.

## ٧ - باب فِي الطَّلاَقِ قَبْلَ النِّكَاحِ.

**٢١٩١ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، زَادَ: (مَنْ حَلَفَ عَلَى مَعْصِيَةٍ فَلاَ يَمِينَ لَهُ، وَمَنْ حَلَفَ عَلَى قَطِيعَةِ رَحِمٍ فَلاَ يَمِينَ لَهُ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، فەرمودەی پێشو بەهەمان سەنەدو مانا هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەوەی سوێند بخوات لەسەر گوناهێ کە بیکات نابێ سوێندەکەی بەجێ بێنێ، ئەوەی سوێند بخوات لەسەر بڕینی پەیوەندی خزمایەتی نابێ سوێندەکەی بەجێ بێنێ - دەبێت کەفارەتی سوێندەکەی بدات - ).

**٢١٩٢ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فِي هَذَا الْخَبَرِ، زَادَ: (وَلاَ نَذْرَ إِلاَّ فِيمَا ابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُ اللَّهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ئەم هەواڵە فەرمووی ... راوی ئەمەی بۆ

زیاد کرد: (نەزری شتێکی لەسەر نیە کە ئەنجامی بدات مەگەر ئەو نەزرە لەگوێڕایەڵی بۆ خوای گەورەدا بێت).

## باسی تەڵاقدان لەکاتی توڕەیی و رق و قیندا.

## ٨ - باب الطَّلاَقِ عَلَى غَيْظٍ.

٢١٩٣ - (حسن) عن محمد بن عبيد بن أبي صالح الذي كان يسكن إيليا، قال: خَرَجْتُ مَعَ عَدِيِّ بْنِ عَدِيّ الْكِنْدِيِّ حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَبَعَثَنِي إِلَى صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ، وَكَانَتْ قَدْ حَفِظَتْ مِنْ عَائِشَةَ، قَالَتْ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ طَلاَقَ وَلاَ عَتَاقَ فِي غَلاَقٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْغِلاَقُ أَظُنُّهُ فِي الْغَضَبِ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی (عُبَيْدِ اللّه)ی کوڕی ئەبو صالّحەوە کە لە ئیلیا دەژیا، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ عەدی کوڕی عەدی کیندی دەرچووم هەتا گەیشتینە شاری مەککە، ناردمی بۆ لای صەفیەی کچی شەیبە، کە لە خاتو عائیشەوە فەرمودەی لەبەر دەکرد، وتی: لە عائیشە بیستم وتی: لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بیستوە فەرمووی: (نە تەڵاقدان و نە ئازادکردنی کۆیلە بەزۆر نابن، یان هیچیان لەکاتی توڕەبونی نەڕادەبەدەردا سەرناگرن. ئەبو داود دەڵێت: پێم وایە (الْغِلاَق) واتە لەکاتی توڕەبوندا.

## باسی تەڵاقی گاڵتەو سوعبەت.

## ٩ - باب الطَّلاَقِ عَلَى الْهَزْلِ.

**٢١٩٤ - (حسن) عن أبي هريرة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ، وَالطَّلاَقُ، وَالرَّجْعَةُ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سێ شت هەیە راستیان راستیەو گاڵتەشیان هەر راستیە: ژن مارەكردن و تەڵاقدان و گێڕانەوەشی).

**٢١٩٥ - (حسن صحيح) عن ابن عباس قال: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴾ الآيَةَ، وَذَلِكَ أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِرَجْعَتِهَا وَإِنْ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، فَنُسِخَ ذَلِكَ، وَقَالَ: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ﴾.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ ﴾. سورة البقرة: ٢٢٨. ئەوەیە جاران پیاو كە

ژنەکەی تەڵاق دایە ئەو شایەنتر بوو بە گێڕانەوەی با سێ تەڵاقەشی بدایە، هەتا خوای گەورە بەم ئایەتە ئەمەی هەڵوەشاندەوە، فەرمووی: (ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ). سورة البقـرة: ٢٢٩.
واتە: ژن تەڵاقدان دووجارە.

## باسی هەڵوەشانەوە(نسخ)ی گێڕانەوەی ژن لەدوای کەوتنی هەر سێ تەڵاقەکەی.

## ١٠ - باب نَسْخِ الْمُرَاجَعَةِ بَعْدَ التَّطْلِيقَاتِ الثَّلاَثِ.

٢١٩٦ - (حسن) عن ابن عباس قال: طَلَّقَ عَبْدُ يَزِيدَ - أَبُو رُكَانَةَ وَإِخْوَتِهِ - أُمَّ رُكَانَةَ، وَنَكَحَ امْرَأَةً مِنْ مُزَيْنَةَ، فَجَاءَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: مَا يُغْنِى عَنِّى إِلاَّ كَمَا تُغْنِى هَذِهِ الشَّعْرَةُ - لِشَعْرَةٍ أَخَذَتْهَا مِنْ رَأْسِهَا - فَفَرِّقْ بَيْنِى وَبَيْنَهُ. فَأَخَذَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَمِيَّةٌ، فَدَعَا بِرُكَانَةَ وَإِخْوَتِهِ، ثُمَّ قَالَ لِجُلَسَائِهِ:(أَتَرَوْنَ فُلاَنًا يُشْبِهُ مِنْهُ كَذَا وَكَذَا؟) - مِنْ عَبْدِ يَزِيدَ - (وَفُلاَنًا يُشْبِهُ مِنْهُ كَذَا وَكَذَا؟). قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِعَبْدِ يَزِيدَ: (طَلِّقْهَا). فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: (رَاجِعِ امْرَأَتَكَ أُمَّ رُكَانَةَ وَإِخْوَتِهِ). فَقَالَ: إِنِّى طَلَّقْتُهَا ثَلاَثًا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: (قَدْ عَلِمْتُ رَاجِعْهَا). وَتَلاَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ

لِعِدَّتِهِنَّ ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ نَافِعِ بْنِ عُجَيْرٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رُكَانَةَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ فَرَدَّهَا إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَصَحُّ، لأَنَّ وَلَدَ الرَّجُلِ، وَأَهْلَهُ أَعْلَمُ بِهِ، أَنَّ رُكَانَةَ إِنَّمَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ فَجَعَلَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاحِدَةً.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (عَبْدُ يَزِيد) - باوکی روکانەو براکەی روکانە - ئوم رکانەی سێ بەسێ تەلاقداو ئافرەتێکی لە هۆزی موزەینە مارەبڕی، جا ئافرەتەکە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، شکایەتی حاڵی خۆی کرد وتی: ئەبو روکانە سودی بۆ من نیە وەك چۆن ئەم تاڵە موە سود بە من ناگەیەنێ واتە ئەبو روکانە پەکی کەوتوەو توانای ئەنجامدانی کاری ژن و مێردایەتی نیە، بۆیە لێکمان جیاکەرەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) غیرەت گرتی و تورە بوو بۆ ئەو درۆیەی کە ئافرەتەکە کردی، بۆیە روکانەو براکانی بانگ کرد، لەپاشدا بەوانەی کە لەدەورو بەری دانیشتبوون فەرموو: (ئایا دەزانن فلاّن ئەوەو ئەوەی لە (عَبْدُ يَزِيد) دەچێت، وە فلاّن ئەوەو ئەوەی لە (عَبْدُ يَزِيد) دەچێت، مەبەستی لە هەندێ لە منداڵەکانی بوو - بێگومان (عَبْدُ يَزِيد) پەکی نەکەوتوە وەك تۆ دەیڵێی پەکی کەوتوە). وتیان بەڵێ، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە (عَبْدُ يَزِيد)ی فەرموو: (تەلاّقی بدە). ئەویش تەلاّقی دا، لەپاشدا فەرمووی: (ئوم رکانە بگێڕەرەوە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ بەسێ تەلاّقم داوە لە یەك کۆڕ و دانیشتندا، فەرمووی: (ئەزانم سێ بەسێ تەلاّقت داوە، بیگێڕەرەوە). جا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ). سورة الطلاق: ١. واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (بە ئوممەتەکەت بڵێ) هەر کاتێ ویستان ژنانتان تەلاّق بدەن، با

تەڵاقیان بدەن لەکاتی عیدەیاندا (ئەو کاتەی لەحەیز پاك بوونەتەوەو لەگەڵیان دروست نەبوون).

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی نافعی کوڕی عوجەیر و (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کوڕی روکانە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، کە روکانە ژنەکەی بە یەکجاری تەڵاقداو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆی گێڕایەوە راست و دروست(صحیح) ترە، لە فەرموودەکەی ئیبنو عەباس، چونکە نافعی کوڕی عوجەیر و (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەلی لە خانەوادەی روکانەن بێگومان خانەوادەو منداڵەکانی پیاوێ ئاگادارن ترن بە حاڵی ئەو پیاوە لە کەسانی تر، ئەبو روکانە ژنەکەی خۆی بە یەکجاری تەڵاقدا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە یەك تەڵاق بۆی حساب کرد.

**٢١٩٧ - (صحيح) عن مجاهد قال: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاثًا، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ رَادُّهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: يَنْطَلِقُ أَحَدُكُمْ فَيَرْكَبُ الْحَمُوقَةَ ثُمَّ يَقُولُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! وَإِنَّ اللَّهَ قَالَ: (وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا) وَإِنَّكَ لَمْ تَتَّقِ اللَّهَ فَلَمْ أَجِدْ لَكَ مَخْرَجًا، عَصَيْتَ رَبَّكَ، وَبَانَتْ مِنْكَ امْرَأَتُكَ، وَإِنَّ اللَّهَ قَالَ: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ). فِي قُبُلِ عِدَّتِهِنَّ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَى هَذَا الْحَدِيثَ حُمَيْدٌ الأَعْرَجُ وَغَيْرُهُ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَرَوَاهُ شُعْبَةُ عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَأَيُّوبُ وَابْنُ جُرَيْجٍ جَمِيعًا، عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ**

عَبَّاسٍ، وَرَوَاهُ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ رَافِعٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَرَوَاهُ الأَعْمَشُ عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، كُلُّهُمْ قَالُوا فِي الطَّلاَقِ الثَّلاَثِ: إِنَّهُ أَجَازَهَا، قَالَ: وَبَانَتْ مِنْكَ، نَحْوَ حَدِيثِ إِسْمَاعِيلَ عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَثِيرٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَرَوَى حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، إِذَا قَالَ: (أَنْتِ طَالِقٌ ثَلاَثًا). بِفَمٍ وَاحِدٍ فَهِيَ وَاحِدَةٌ. وَرَوَاهُ إِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ هَذَا قَوْلُهُ، لَمْ يَذْكُرِ ابْنَ عَبَّاسٍ وَجَعَلَهُ قَوْلَ عِكْرِمَةَ.

واتە: لە موجەهیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت ئیبنو عەباسدا بووم، پیاوێ ژنەکەی سێ بە سێ تەلاق دابوو هات بۆلای لەوبارەوە لێی پرسی، راوی وتی: ئیبنو عەباس ئەوەندە بێدەنگ بوو وام دەزانی ژنەکەی بۆی دەگەڕێنێتەوە، لەپاشدا وتی: کەسێ لەئێوە گەوجی و ئەحمەقی سواری سەری دەبێ و کاری گەوج و گێلانە ئەنجام دەدات و لەپاشدا پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێ: ئەی ئیبنو عەباس! ئەی ئیبنو عەباس! رزگارم بکە، لەکاتێکدا کە خوای گەورە دەفەرمویێت: (وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا). سورة الطلاق: ٢. واتە: هەرکەسێ لە خوای گەورە بترسێ و سنورەکانی بپارێزێ، خوای گەورە دەروی خێری لێ دەکاتەوە. بێگومان تۆ نە لە خوای گەورە ترساوی وە نە سنورەکانیشت پاراستوە، هیچ رێگا چارەیەکت نەماوە، سەرپێچی پەروەردگارت کردوەو، ژنەکەشت تەلاقی کەوتوە، خوای گەورە دەفەرمویێت: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ). واتە: ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (بە ئومەتەکەت بڵێ) هەر کاتێ ویستان ژنانتان تەلاق بدەن، با

تەڵاقیان بدەن لەکاتی عیدەیاندا (ئەو کاتەی لەحەیز پاك بوونەتــەوەو لەگــەڵیان دروســت نەبوون). لەسەرەتای ماوە(عدە)کەیانەوە. ئەبو داود دەڵێت: هەموو ئەو راویانەی سەرەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، هەر هەمووشیان ســەبارەت بــە تــەڵاقی سێ بەسێ وتویانە: ئیبنو عەباس بە سێ بەسێ حسابی کردوەو بــە یــەك تــەڵاق حســابی نەکردوە، وتی: ژنەکەشت تەڵاقی کەوتوە.

ئەبو داود دەڵێت: لە ریوایەتێکی تردا لە ئیبنو عەباسەوە هاتوە، کە وتویەتی: ئەگەر کەسێ یەکجار بە ژنەکەی خۆی وت: (سێ بەسێ تەڵاقت کەوتبێ) ئــەوە بــە یــەکێ بــۆی حسابە، هەندێ لە راویەکان وتویانە ئەمە وتەی عیکریمەیە نەك ئیبنو عەباس.

**٢١٩٨ - (صحيح) عم محمد بن إياس: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا هُرَيْـرَةَ وَعَبْـدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ سُئِلُوا عَنِ الْبِكْرِ يُطَلِّقُهَـا زَوْجُهَـا ثَلاَثًا، فَكُلُّهُمْ قَالُوا: لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ.**

واتە: موحەممەدی کوڕی ئیاس دەڵێت: سەبارەت بە کچێ کە مێردەکەی سێ بــە ســێ تەڵاقی بدات لە ئیبنو عەباس و ئــەبو هــورەیرە و (عَبْدُ اللَّـه)ی کــوڕی عــەمری کــوڕی عاص)یان پرسی، هەر هەموویان وتیان: بۆی حەڵاڵ نیە هەتا شو نەکات بە پیاوێکی تر.

(صحيح بما قبله) قال أبو داود: وَرَوَى مَالِكٌ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ بُكَيْرِ بْنِ الأَشَجِّ عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِى عَيَّاشٍ أَنَّهُ شَهِدَ هَذِهِ الْقِصَّةَ حِينَ جَاءَ مُحَمَّدُ بْنُ إِيَاسِ بْـنِ الْبُكَيْـرِ إِلَـى ابْنِ الزُّبَيْرِ وَعَاصِمِ بْنِ عُمَرَ، فَسَأَلَهُمَا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالاَ اذْهَبْ إِلَى ابْـنِ عَبَّـاسٍ وَأَبِـى هُرَيْـرَةَ فَإِنِّى تَرَكْتُهُمَا عِنْدَ عَائِشَةَ رَضِىَ اللهُ عَنْهَا، ثُمَّ سَاقَ هَذَا الْخَبَرَ.

ئەبو داود دەڵێت: مالیك لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە، لە بوکەیری کوڕی ئەشــەجەوە، لە موعاویەی کوڕی ئەبو عەییاشەوە، کە شایەتحاڵی ئەم بە سەرهاتە بووە لەکاتێکدا کــە موحەممەدی کوڕی ئیاسی کوڕی بوکەیر هات بۆلای ئیبنو زوبەیر و عاصمی کوڕی عومەر لەوبارەوە پرسیاری لێ کردن، ئەوانیش وتیان: بڕۆ بۆلای ئیبنو عــەباس و ئــەبو هــورەیرە

پرسیار لەوان بکە چونکە من لەلای عائیشە رەزای خوای لێ بێ بەجێم هێشتن، جا راوی ئەم بەسەرهاتەی گێڕایەوە.

(صحيح) قال أبو داود: وَقَوْلُ ابْنِ عَبَّاسٍ هُوَ أَنَّ الطَّلاَقَ الثَّلاَثَ تَبِينُ مِنْ زَوْجِهَا مَدْخُولاً بِهَا وَغَيْرَ مَدْخُولٍ بِهَا: لاَ تَحِلُّ لَهُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ، هَذَا مِثْلُ خَبَرِ الصَّرْفِ، قَالَ فِيهِ، ثُمَّ إِنَّهُ رَجَعَ عَنْهُ، يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ.

ئەبو داود دەڵێت: وتەی: ئیبنو عەباس کە دەڵێ کەسێ ژنەکەی سێ بە سێ تەلاق بدات ئیتر چوبێتە لای یان نەچوبێتە لای تەلاقی دەکەوێ و بۆی حەلاڵ نابێتەوە هەتا شو نەکات بە پیاوێکی تر، ئەمە وەك هەواڵی سو(ربا)کەیە — پارە بە پارە یان ئاڵتون بە ئاڵتون کە لە سەرەتاوە ئیبنو عەباس پێی وابوو دەست بە دەست دروستە لەپاشدا لێی پاشگەز بویەوە - ، جا راوی لە فەرموودەکەیدا وتی: لەپاشدا ئیبنو عەباس لێی پاشگەز بویەوە.

**٢١٩٩ - (ضعيف) عن طاوس: أَنَّ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ أَبُو الصَّهْبَاءِ كَانَ كَثِيرَ السُّؤَالِ لاِبْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الرَّجُلَ كَانَ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا جَعَلُوهَا وَاحِدَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَصَدْرًا مِنْ إِمَارَةِ عُمَرَ؟! قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بَلَى، كَانَ الرَّجُلُ إِذَا طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَدْخُلَ بِهَا جَعَلُوهَا وَاحِدَةً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَصَدْرًا مِنْ إِمَارَةِ عُمَرَ، فَلَمَّا — أن - رَأَى النَّاسَ - يعني عمر - قَدْ تَتَابَعُوا فِيهَا قَالَ: أَجِيزُوهُنَّ عَلَيْهِمْ.**

واته: له (طَاوُس)ەوه دەگێرنەوه، كه وتویەتی: پیاوێ كه ناوی ئـەبو (الصَّـهْبَاء) بـوو پرسیاری زۆری دەكرد له ئیبنو عەباس، وتی: ئایا دەزانیت كه لەسـەردەمی پێغەمبـەری خوا صلى الله عليه وسلم) خۆیـدا و هـەروەها لەسـەردەی خەلافـەتی ئـەبو بـەكردا و چـەند سالێكیش لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی عومەردا، سێ تەلاقە تەنیا بەیەك تەلاق دادەنرا؟ ئیبنو عەباس وتی: بەڵێ، لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صـلى الله علیـه وسـلم) خۆیـدا و هەروەها لەسەردەی خەلافەتی ئەبو بەكردا و چەند ساڵێكیش لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی عومەردا، ئەگەر پیاوێ ژنەكەی سێ به سێ تەلاق بدایه پێش ئـەوەی چـوبێتە لای ئـەوه یەك تەلاق بۆی حساب دەكرا، كاتێ كه عومەر بینی خـەڵك زۆر سـێ بـه سـێ تـەلاق دەكردەهێنن و ئاسانكاری تێدا دەكەن، وتی: بـه تـەلاقی سـێ بـه سـێ حسـابی بكـەن هەتا بریان بۆ ئەوەی خەڵكەكە ئەوەنده بەكاری نەهێنن و ئاسانكاری تێدا نەكەن.

**٢٢٠٠ - (صحيح) عن عن ابن طاوس، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَا الصَّـهْبَاءِ قَـالَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: أَتَعْلَمُ إِنَّمَا كَانَتِ الثَّلَاثُ تُجْعَـلُ وَاحِـدَةً عَلَـى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِـي بَكْـرٍ وَثَلَاثًـا مِـنْ إِمَارَةِ عُمَرَ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: نَعَمْ.**

واته: له ئیبنو (طَاوُس)ەوه، له باوكیەوه دەگێرنەوه، كه ئەبو ئەبو (الصَّـهْبَاء) وتی به ئیبنو عەباس: ئایا دەزانیت كه سێ تەلاقە بەیەك تەلاق دادەنرا لەسەردەمی پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆیدا هەروەها لەسەردەی خەلافەتی ئەبو بـەكردا و سـێ سـاڵیش لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی عومەردا ؟ ئیبنو عەباس وتی: بەڵێ.

## باسی نیەت و تەلاق مەبەست پێی چییە؟ بێگومان بۆ تەلاقی كینایە وەك: بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوكت، ئیعتیبار بە نیەتە.

## ١١ – باب فِيمَا عُنِيَ بِهِ الطَّلاَقُ وَالنِّيَّاتُ.

**٢٢٠١ - (صحيح) عن عمر بن الخطاب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ).**

واتە: لە پێشەوا عومەری كوڕی (خَطّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو كارو كردەوانەی پاداشت و تۆڵەیان لەسەرە بەپێی نیازو مەبەستەكانن، بێگومان هەموو كەسێك بە گوێرەی نیەت و مەبەستی خۆی پاداشت و تۆڵەی بۆ دەنوسرێت، هەركەسێ مەبەستی كۆچكردنەكەی لە مەككەوە بۆ مەدینە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێ ئەوە كۆچكردنەكەی بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە و پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) و بە پاداشتی خۆی دەگات، وە هەركەسێ مەبەستی كۆچكردنەكەی بۆ كارێكی دونیایی بێ یان بۆ مارەكردنی ئافرەتێ بێ ئەوە كۆچكردنەكەی بەپێی نیازەكەیەتی و خێری ناگات).

**٢٢٠٢ - (صحيح) عبد الرحمن بن عبد الله بن كعب بن مالك: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبٍ - وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ - قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ، فَسَاقَ قِصَّتَهُ فِي تَبُوكَ قَالَ: حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ مِنَ الْخَمْسِينَ إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْتِي، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ، قَالَ: فَقُلْتُ: أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لاَ بَلِ اعْتَزِلْهَا فَلاَ تَقْرَبَنَّهَا، فَقُلْتُ لامْرَأَتِي: الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ فِي هَذَا الأَمْرِ.**

واته: له (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی کهعبی کوڕی مالیکهوه دهگێڕنهوه، که (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی کهعب – (عَبْدُ اللّه) یهکێ بوو له کوڕهکانی دهستی کهعبی رادهکێشا لهکاتێکدا که کوێر بوو بوو - وتی: له کهعبی کوڕی مالیکم بیستوه، سهرهاتی غهزای تهبوکی گێڕایهوه، وتی: جا که له پهنجا شهوهکه چل شهوی رۆیشت – بێگومان پێغهمبهر (صلى الله عليه وسلم) فهرمانی دابو کهس قسه لهگهڵ ئهو سێ کهسهدا نهکات له غهزای تهبوك دواکهوتبون ههتا پهنجا شهو - ئهوکاته فروستادهو نێردراوی پێغهمبهری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاته لام وتی: پێغهمبهری خوا (صلى الله عليه وسلم) فهرمانت پێ دهکات که له ژنهکهت دورکهویتهوه، وتی: وتم: تهڵاقی بدهم، یان چی بکهم؟ وتی: نا بهڵکو لێی نزیك مهبهرهوه، منیش به ژنهکهمم وت: بڕۆرهوه بۆماڵی باوانت خۆی لهلایان بمێنهرهوه، ههتا خوای گهوره بڕیار لهسهر ئهم کاره دهدات و بهلایهکدا دهخات.

## باسی ئەگەر پیاوێ ژنەکەی خۆی سەرپشك کرد کە لێی جیاببێتەوە ئایا تەڵاقی دەکەوێت یان نا.

## ١٢ – باب فِي الْخِيَارِ.

٢٢٠٣ - (صحيح) عن عائشة قالت: خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاخْتَرْنَاهُ، فَلَمْ يَعُدَّ ذَلِكَ شَيْئًا.

عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵبژاردنی دایە دەست خۆمان ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، ئیتر ئەوی بە هیچ دانەنا – واتە خۆمانی کرد بە سەرپشك کە یا بە ژنێتی ئەو رازی بین یان لێی جیاببینەوە، ئێمەش هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەمووومان ئەومان (صلى الله عليه وسلم) هەڵبژارد، ئیتر ئەوەی بە تەڵاق حساب نەکرد لەسەرمان – .

## باسی پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ: کاری خۆت بەدەستی خۆت بێ حوکمی چیە؟

## ١٣ – باب فِي أَمْرُكِ بِيَدِكِ.

٢٢٠٤ - (ضعيف) عن حماد بن زيد قال: قُلْتُ لأَيُّوبَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا قَالَ: بِقَوْلِ الْحَسَنِ فِي: (أَمْرُكِ بِيَدِكِ؟) قَالَ: لاَ، إِلاَّ شَيْءٌ حَدَّثَنَاهُ قَتَادَةُ، عَنْ كَثِيرٍ مَوْلَى ابْنِ سَمُرَةَ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ،

**عن أبي هريرة، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِنَحْوِهِ، قَالَ أَيُّوبُ: فَقَدِمَ عَلَيْنَا كَثِيرٌ فَسَأَلْتُهُ؟ فَقَالَ: مَا حَدَّثْتُ بِهَذَا قَطُّ، فَذَكَرْتُهُ لِقَتَادَةَ، فَقَالَ: بَلَى وَلَكِنَّهُ نَسِيَ.**

واتە: لە حەمادی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە ئەیوبم وت: ئایا دەزانی کە هیچ کەسێ وەك وتەی حەسەنی وتوە دەربارەی: (پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ کاری خۆت بەدەستی خۆت بێ سێ تەلاقەیە). وتی: نەخێر، تەنیا ئەوە نەبێ کە قەتادە بۆی گێڕاینەوە، لە (کَثِیر)ی بەندەی رزگارکراوی کوڕی سەمورەوە، لە ئەبو سەلەمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بە هەمان شێوە - واتە کە سێ تەلاقەیە - ، ئەیوب وتی: راوی فەرموودەکە (کَثِیر) هات بۆ لامان منیش لەوبارەوە لێم پرسی؟ وتی: هەرگیز باسی شتی وەهام نەکردوە، منیش بەسەرهاتەکەم بۆ قەتادە باس کرد. قەتادەش وتی: بەڵێ بۆی باس کردوم، بەڵام خۆی لەیادی چوە.

**٢٢٠٥ - (صحيح مقطوع) عن الحسن في: (أَمْرُكِ بِيَدِكِ)؟ قَالَ: ثَلَاثٌ.**

واتە: لە حەسەنەوە هاتوە، دەربارەی (پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ کاری خۆت بەدەستی خۆت بێ — ئایا بە سێ تەلاقە حسابە؟ - ). حەسەن وتی: بەڵێ، بە سێ تەلاقە حسابە.

## باسی سەبارەت بە تەڵاقدان بە یەکجاری.

## ١٤ – باب فِي الْبَتَّةِ.

**٢٢٠٦ - (ضعيف) عن نافع بن عجير بن عبد يزيد بن ركانة: أَنَّ رُكَانَةَ بْنَ عَبْدِ يَزِيدَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ سُهَيْمَةَ الْبَتَّةَ، فَأَخْبَرَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ، وَقَالَ: وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ (بها) إِلاَّ وَاحِدَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَاللَّهِ مَا أَرَدْتَ إِلاَّ وَاحِدَةً؟). فَقَالَ رُكَانَةُ: وَاللَّهِ مَا أَرَدْتُ إِلاَّ وَاحِدَةً، فَرَدَّهَا إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَطَلَّقَهَا الثَّانِيَةَ فِي زَمَانِ عُمَرَ، وَالثَّالِثَةَ فِي زَمَانِ عُثْمَانَ.**

واتە: لە نافعی کوڕی عوجەیری کوڕی (عَبْد يَزِيد)ی کوڕی روکانەوە هاتوە، کە روکانەی کوڕی (عَبْد يَزِيد) ژنەکەی کە ناوی سوهەیمە بوو بە یەکجاری تەڵاقدا، جا ئەو هەواڵەی راگەیاند بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: سوێند بە (اللّه) مەبەستم تەنیا یەك تەڵاق بوو، فەرمووی: (بەڵێ: سوێند بە (اللّه) مەبەستم تەنیا یەك تەڵاق بوو؟). روکانە وتی: سوێند بە (اللّه) مەبەستم تەنیا یەك تەڵاق بوو، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ژنەکەی بۆ گێڕایەوە، جا لەسەردەی خەلافەتی عومەردا تەڵاقی دووەمی دا. وە لەسەردەی خەلافەتی (عثمان)دا تەڵاقی سێیەمی دا.

**٢٢٠٧ - (ضعيف) عن ركانة بن عبد يزيد، عن النبي صلى الله عليه وسلم، بِهَذَا الْحَدِيثِ.**

واتە: لە روکانەی کوڕی (عَبْد يَزِيد)ەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

**٢٢٠٨ - (ضعيف) عن عبد الله بن علي بن يزيد بن ركانة، عن أبيه، عن جده، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ الْبَتَّةَ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (مَا أَرَدْتَ؟). قَالَ: وَاحِدَةً، قَالَ: (آللَّهِ). قَالَ: آللَّهِ، قَالَ: (هُوَ عَلَى مَا أَرَدْتَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ ابْنِ جُرَيْجٍ أَنَّ رُكَانَةَ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا، لِأَنَّهُمْ أَهْلُ بَيْتِهِ، وَهُمْ أَعْلَمُ بِهِ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەلی کوڕی یەزیدی کوڕی روکانەوە، لە باوکیەوە، لە باپیرەوە دەگێرنەوە، کە ژنەکەی بە یەکجاری تەلاقدا، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، باسەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (مەبەستت چی بوو؟) وتی: مەبەستم یەك تەلاق بوو، فەرمووی: (بڵێ: سوێند بە (الله) مەبەستم تەنیا یەك تەلاق بوو؟)، روکانە وتی: سوێند بە (الله) مەبەستم تەنیا یەك تەلاق بوو، فەرمووی: مەبەستت چی بووبێ هەر ئەوە حسابە؟) ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە راست و دروست(صحيح) ترە، بێگومان روکانە ژنەکەی سێ بە سێ تەلاق دا، لە فەرمودەکەی ئیبنو جورەیج، چونکە ئەو راویانەی کە ئەم فەرمودەیان گێڕاوەتەوە لە خانەوادەی روکانەن بێگومان خانەوادەو منداڵەکانی پیاوێ ئاگادارن ترن بە حاڵی ئەو پیاوە لە کەسانی تر.

## باسی سەبارەت بە کەسێ ئەگەر تەڵاق هات بە دڵیدا لە ڕێگەی وەسوەسەوە.

## ١٥ - باب فِي الْوَسْوَسَةِ بِالطَّلاَقِ.

٢٢٠٩ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لأُمَّتِي عَمَّا لَمْ تَتَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ، وَبِمَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (خوای گەورە چاوپۆشی دەکات لەو وەسوەسەیەی کە دێت بە دڵی ئوممەتی مندا بە مەرجێ بە کردەوە ئەنجامی نەدەن و بە زمان نەیڵێن).

## باسی دەربارەی پیاوێ بە ژنەکەی بڵێ ئەی خوشکەکەم، بێگومان ئەوە دروست نیە.

## ١٦ - باب فِي الرَّجُلِ يَقُولُ لاِمْرَأَتِه يَا أُخْتِي.

٢٢١٠ - (ضعيف) عن أبي تميمة الهجيمي: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لاِمْرَأَتِهِ: يَا أُخَيَّةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أُخْتُكَ هِيَ؟!). فَكَرِهَ ذَلِكَ وَنَهَى عَنْهُ.

...تە: لە ئەبو تەمیمەی هوجەیمییەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ بە ژنەکەی وت: ئەی ...خوشکەکەم - (أُخَيَّه) بچوك کراوەی وشەی خوشکە - ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه ...) فەرمووی: (ئایا ئەوە خوشکی تۆیە؟). پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر پێی ...خۆش بوو وە نەهیشی لیٚ کرد.

٢٢١١ - (صحيح) عن أبي تميمة، عَنْ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ: (يَا أُخَيَّةُ)، فَنَهَاهُ.

...تە: لە ئەبو تەمیمەوە، لە پیاوێکی هۆزەکەیەوە دەگێرنەوە، کە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیستوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوێی لە پیاوێ بوو بە ژنەکەی ...ت: (ئەی خوشکەکەم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەهی لیٚ کرد.

٢٢١٢ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم: (أَنَّ إِبْرَاهِيمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَكْذِبْ قَطُّ إِلاَّ ثَلاَثًا: ثِنْتَانِ فِي ذَاتِ اللَّهِ تَعَالَى، قَوْلُهُ: (إِنِّي سَقِيمٌ). وَقَوْلُهُ: (بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا). وَبَيْنَمَا هُوَ يَسِيرُ فِي أَرْضِ جَبَّارٍ مِنَ الْجَبَابِرَةِ إِذْ نَزَلَ مَنْزِلاً، فَأُتِيَ الْجَبَّارُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُ نَزَلَ هَا هُنَا رَجُلٌ مَعَهُ امْرَأَةٌ هِيَ أَحْسَنُ النَّاسِ! قَالَ: فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَسَأَلَهُ عَنْهَا، فَقَالَ: إِنَّهَا أُخْتِي، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَيْهَا، قَالَ: إِنَّ

هَذَا سَأَلَنِى عَنْكِ فَأَنْبَأْتُهُ أَنَّكِ أُخْتِى، وَإِنَّهُ لَيْسَ الْيَوْمَ مُسْلِمٌ غَيْرِى وَغَيْرُكِ، وَإِنَّكِ أُخْتِى فِى كِتَابِ اللَّهِ فَلاَ تُكَذِّبِينِى عِنْدَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئیبراهیم سەلامی خوای لەسەر بێ هەرگیز درۆی نەدەكرد تەنیا سێ جار نەبێ - لەڕاستیدا ئەویش درۆ نەبوە - ، دوانیان لەبەر رەزامەندی زاتی خوای گەورە. وتەكەی كە وتی: (من نەخۆشم - نایەم لەگەڵتان بۆ جەژنەكەتان لەدەرەوەی شار- ). هەروەها وتەكەی كە وتی: (ئەم بتە گەورەیان ئەمەی كردوه -- واتە بتەكانی تری شكاندوە - ). جارێكیش بە زەوی خاوەن دەسەلاتێكی ستەمكاردا گوزەری دەكرد لە شوێنێ دابەزی، هەواڵیان دا بە پاشا ستەمكارەكە پێیان وت: لەم ناوەدا پیاوێ دابەزیوە ئافرەتێكی لەگەڵدایە جوانترین ئافرەتە! پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: پاشا ناردی بەدوایدا، ئیبراهیم رۆشت بۆلای پاشاكە، پاشا لێی پرسی وتی: ئەو ئافرەتە چیتە؟ فەرمووی: خوشكمە، كاتێ كە گەڕایەوە بۆلای خێزانەكەی وتی: پاشا دەربارەی تۆ لێی پرسیم منیش وتم: خوشكمە، ئەمڕۆ لێرەدا جگە لە من و تۆ هیچ موسوڵمانێكی تری لێ نیە، بێگومان تۆش خوشكی ئیمانی منی، بۆیە لەلای ئەو بەدرۆم نەخەیتەوە.

## باسی سەبارەت بە پیاو بە ژنەکەی خۆی بڵێ: تۆ لە جێگەی دایکمی.

## ١٧ - باب فِي الظِّهَارِ.

٢٢١٣ - (حسن) عن سلمة بن صخر قال: كُنْتُ امْرَأً أُصِيبُ مِنَ النِّسَاءِ مَا لاَ يُصِيبُ غَيْرِى، فَلَمَّا دَخَلَ شَهْرُ رَمَضَانَ خِفْتُ أَنْ أُصِيبَ مِنَ امْرَأَتِى شَيْئًا يُتَابَعُ بِى حَتَّى أُصْبِحَ، فَظَاهَرْتُ مِنْهَا حَتَّى يَنْسَلِخَ شَهْرُ رَمَضَانَ، فَبَيْنَمَا هِىَ تَخْدُمُنِى ذَاتَ لَيْلَةٍ إِذْ تَكَشَّفَ لِى مِنْهَا شَىْءٌ، فَلَمْ أَلْبَثْ أَنْ نَزَوْتُ عَلَيْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ خَرَجْتُ إِلَى قَوْمِى فَأَخْبَرْتُهُمُ الْخَبَرَ، وَقُلْتُ: امْشُوا مَعِى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالُوا: لاَ وَاللَّهِ. فَانْطَلَقْتُ إِلَى النَّبِىِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: (أَنْتَ بِذَاكَ يَا سَلَمَةُ؟). قُلْتُ: أَنَا بِذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَرَّتَيْنِ، وَأَنَا صَابِرٌ لأَمْرِ اللَّهِ، فَاحْكُمْ فِىَّ مَا أَرَاكَ اللَّهُ، قَالَ: (حَرِّرْ رَقَبَةً). قُلْتُ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَمْلِكُ رَقَبَةً غَيْرَهَا، وَضَرَبْتُ صَفْحَةَ رَقَبَتِى! قَالَ: (فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ). قَالَ: وَهَلْ أُصِبْتُ الَّذِى أُصِبْتُ إِلاَّ مِنَ الصِّيَامِ؟! قَالَ: (فَأَطْعِمْ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ بَيْنَ سِتِّينَ مِسْكِينًا). قُلْتُ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لَقَدْ بِتْنَا وَحْشَيْنِ، مَا لَنَا طَعَامٌ

قَالَ: (فَانْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ صَدَقَةِ بَنِي زُرَيْقٍ، فَلْيَدْفَعْهَا إِلَيْكَ، فَأَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ، وَكُلْ أَنْتَ وَعِيَالُكَ بَقِيَّتَهَا). فَرَجَعْتُ إِلَى قَوْمِي، فَقُلْتُ: وَجَدْتُ عِنْدَكُمُ الضِّيقَ وَسُوءَ الرَّأْيِ، وَوَجَدْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السَّعَةَ وَحُسْنَ الرَّأْيِ وَقَدْ أَمَرَنِي – أَوْ: أَمَرَ لِي – بِصَدَقَتِكُمْ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی صەخرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: من پیاوێ بووم زۆر حەزم لە ئافرەت بوو زوو زوویش دەچومە لای خێزانم، پێ نازانم هیچ پیاوێکی تر وەك من بێ، جا کاتێ کە مانگی رەمەزان هات ترسام خۆم پێ رانەگیرێت و ڕۆژوەکەم بەتاڵ بێتەوە بۆیە (ظِّهَار)م لە ژنەکەم کرد تا رەمەزان تەواو دەبێت، شەوێکیان خزمەتی دەکردم شتێکم بۆ دەرکەوت منیش خۆمم بۆ نەگیراو لەگەڵی جوت بووم، کاتێ کە ڕۆژ بویەوە چوم بۆلای هۆزەکەم بەسەرهات و هەواڵی خۆم پێ راگەیاندن و پێم وتن: وەرن لەگەڵم با بڕۆین بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیارم بۆ بکەن لەوبارەوە، ئەوانیش وتیان: نا سوێند بە (اللّه) ئێمە شتی وەها ناکەین، جا خۆم بە تەنیا چوم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵەکەم پێ راگەیاند، فەرمووی: (ئەی سەلەمە تۆ خۆت ئەو کارەت کردوە). وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆم ئەو کارەم کردوە، فەرمووی: (ئەی سەلەمە تۆ خۆت ئەو کارەت کردوە). وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆم ئەو کارەم کردوە، ئەوەتا ئامادەم و ئارام دەگرم لەبەردەم حوکم و بڕیاری خوای گەورەدا، فەرمووی: (دە کۆیلەیە رزگار بکە ئەی سەلەمە). وتم: بەو (اللّه)یەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردوە تەنها خاوەنی ئەم گەردنەی خۆمم، بە دەستم کێشام بە لایەکی گەردنمدا، فەرمووی: (دە دوو مانگ ڕۆژوو بەسەر یەکەوە بگرە). وتم: ئەم هەموو بەڵایەی کە توشم بووە بە هۆی ڕۆژوەوە بوە، فەرمووی: (دە خواردنی شەست

هەژار و کەمدەست بدە لە ویسقێ خورما). وتم: بەو (اللّه)یەی کە تۆی بە حەق رەوانە کردووە خۆم و ژنەکەم ئەم شەومان بە سکی خاڵی و بەبێ خواردن بردۆتە سەر، فەرمووی: دەی برۆ بۆلای خاوەنی زەکاتی (بَنِي زُرَيْق) پێی بڵێ با پێتی بدات، جا خواردنی شەست هەژار و کەمدەستی لێ بدە ئەوەشی مایەوە خۆت و خێزانەکەت بیخۆن). جا منیش گەڕامەوە بۆلای هۆزەکەم پێم وتن: ئێوە دنیاتان لێ هێنامەوە یەك و راتان خراپ بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دڵ فراوان و رای زۆر چاك بوو، فەرمانی پێدام کە زەکاتەکەتان وەربگرم و بیدەم لە کەفارەتی (ظِّهَار)ەکەمدا هەروەها خۆم خانەوادەکەشم پێی بخۆین.

٢٢١٤ - (حسن دون قول (والعرق...) عن خويلة بنت مالك بن ثعلبة قالت: ظَاهَرَ مِنِّى زَوْجِي أَوْسُ بْنُ الصَّامِتِ، فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَشْكُو إِلَيْهِ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُجَادِلُنِي فِيهِ، وَيَقُولُ: (اتَّقِي اللَّهَ فَإِنَّهُ ابْنُ عَمِّكِ). فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ: (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا ) إِلَى الْفَرْضِ، فَقَالَ: (يُعْتِقُ رَقَبَةً). قَالَتْ: لاَ يَجِدُ، قَالَ: (فَيَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ). قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ مَا بِهِ مِنْ صِيَامٍ، قَالَ: (فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا). قَالَتْ: مَا عِنْدَهُ مِنْ شَيْءٍ يَتَصَدَّقُ بِهِ، قَالَتْ: فَأُتِيَ سَاعَتَئِذٍ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنِّي أُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ، قَالَ: (قَدْ أَحْسَنْتِ اذْهَبِي فَأَطْعِمِي بِهَا عَنْهُ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَارْجِعِي إِلَى ابْنِ عَمِّكِ). قَالَ: وَالْعَرَقُ

**سِتُّونَ صَاعًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ فِي هَذَا: إِنَّهَا كَفَّرَتْ عَنْهُ مِنْ غَيْرِ أَنْ تَسْتَأْمِرَهُ. وَقَالَ: العرق: مكتل يسع ثلاثين صاعا.**

واتە: لە خوەیلەی کچی مالیکی کوڕی (ثَعْلَبَة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: مێردەکەم ئەوسی کوڕی صامیت (ظِّهَـار)ی لێ کردم وتی تۆ لە جێگەی دایکمی، منیش چوم بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سکالاّی خۆمم لەلا کرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گفتوگۆی لەگەڵ کردم فەرمووی: (لە خوای گەورە بترسە چونکە کوڕی مامتە). نەڕۆشتم هەتا قورئان دابەزی: (قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَـٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا). سورة المجادلة: ١. واتە: خوای گەورە قسەی ئەو ژنەی بیست کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردی (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) لەبارەی مێردەکەیەوە... هەتا کەفارەتی فەرز کرد، جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (با کۆیلەیە رزگار بکات). وتی: نیەتی، فەرمووی: (کەواتە با دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت بەسەر یەکەوە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی پیر و بەساڵاچوە توانای ڕۆژوو گرتنی نەماوە، فەرمووی: (دەی با خواردنی شەست هەژار و کەمدەست بدات). وتی: هیچی نیە بیکات بە خێر لە کەفارەتی (ظِّهَار)دا کەیدا، راوی وتی: لەوکاتەدا (عَرَق)ێك خورمایان هێنا - (عرق) دەفرێکە بۆ پێوانەی شت بەکار دەهێنرا - ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی دام بۆ ئەوەی بیدەم لە کەفاردتی (ظِّهَـار)ە کەدا، منیش وتم: منیش بە (عرق)ێ خورمای تر یارمەتی دەدەم، فەرمووی: (کارێکی چاکت کرد، بڕۆ خواردنی شەست هەژار و کەمدەستی لێ بدە لەجیاتی کەفارەتەکەدا، لەپاشدا بگەڕێرەوە بۆلای کوڕە مامەکەت). راوی فەرموودەکە یەحیای کوڕی ئادەم وتی: (عرق) شەست مەن(صاع)ە. ئەبو داود لەوبارەوە دەڵێت: کەفارەتەکەی دا بەبێ ئەوەی مێردەکەی ڕێگەی بدات.

٢٢١٥ - (حسن دون قول (والعرق...) عن ابن إسحاق، بهذا الإسناد نحوه، إلا أنه قال: وَالْعَرَقُ مِكْتَلٌ يَسَعُ ثَلاَثِينَ صَاعًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ يَحْيَى بْنِ آدَمَ.

واتە: لە ئیبنو ئیسحاقەوە بە هەمان فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە راوی وتی: (عرق) دەفرێکە سی مەن(صاع) خواردن دەگرێت. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە راست و دروست(صحیح) ترە لە فەرموودەکەی یەحیای کوڕی ئادەم واتە لە فەرموودەکەی پێشو.

٢٢١٦ - (صحيح) عن أبي سلمة بن عبد الرحمن قال: يَعْنِي بِالْعَرَقِ زَنْبِيلاً يَأْخُذُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا.

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن) دەڵێت: (عَرَق) زەنبیلەیەکە پانزە مەن(صاع) خواردن دەگرێت.

٢٢١٧ - (حسن) عن سليمان بن يسار بهذا الخبر قال: فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَمْرٍ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَهُوَ قَرِيبٌ مِنْ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، قَالَ: (تَصَدَّقْ بِهَذَا). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلَى أَفْقَرَ مِنِّي وَمِنْ أَهْلِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلْهُ أَنْتَ وَأَهْلُكَ).

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە ئەم بەسەرهاتە هاتوە، وتی: لەوکاتەدا خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش خورماکەی دایە، کە نزیکەی پانزە مەن(صاع) دەبوو، فەرمووی: (ئەمە بکە بەخێر). وتی: کەس بە ئەندازەی من و خێزانەکەم پێویستی بەم خورمایە نیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (دەی بڕۆ خۆت و خێزانەکەت بیخۆن).

**٢٢١٨ - (صحيح) عن أوس أخي عبادة بن الصامت: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْطَاهُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ إِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَعَطَاءٌ لَمْ يُدْرِكْ أَوْسًا وَهُوَ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ قَدِيمُ الْمَوْتِ، وَالْحَدِيثُ مُرْسَلٌ.**

واتە: لە ئەوسی برای عوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پانزە مەن(صاع) لە جۆی دایە ئەویش دەکاتە خواردنی شەست کەس، ئەبو داود دەڵێت: (عطاء) ئەوسی نەدیوە ئەو لە جەنگاوەرانی بەدر بووە و زوو وەفاتی کردوە، فەرمودەکە (مرسل)ە.

**٢٢١٩ - (صحيح) عن هشام بن عروة: أَنَّ جَمِيلَةَ كَانَتْ تَحْتَ أَوْسِ بْنِ الصَّامِتِ، وَكَانَ رَجُلاً بِهِ لَمَمٌ، فَكَانَ إِذَا اشْتَدَّ لَمَمُهُ ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ كَفَّارَةَ الظِّهَارِ.**

واتە: هیشامی کوڕی عوروە دەڵێت: جەمیلە[1] کە هاوسەری ئەوسی کوڕی صامیت

[1] - خێزانەکەی ئەوس ناوی خەولە یان خویلە بووە لەوانەیە بە دوو ناو بانگ کرا بێت یان جەمیلە نازناوی (شۆرەتی) خەولە بێت, خوای گەورە خۆی باش دەیزانێت.

دوو- ئەوس هەڵچونی زۆر بوو وە زۆر پێویستی بە ئافرەت بوو، کاتێ کە زۆری بۆ بهێنایە (ظِهار)ی لە ژنەکەی دەکرد، خوای گەورە لەبارەی ئەوەوە ئایەتی کەفارەتی (ظِّهَار)ی دابەزاند.

**٢٢٢٠ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها، مِثْلَهُ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ بە هەمان شێوە فەرمودەی پێشو هاتوە.

**٢٢٢١ - (صحيح) عن عكرمة: أَنَّ رَجُلاً ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ، ثُمَّ وَاقَعَهَا قَبْلَ أَنْ يُكَفِّرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ: (مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟). قَالَ: رَأَيْتُ بَيَاضَ سَاقَيْهَا فِي الْقَمَرِ، قَالَ: (فَاعْتَزِلْهَا حَتَّى تُكَفِّرَ عَنْكَ).**

واتە: عیکریمە دەڵێت: پیاوێ (ظِّهَار)ی لە ژنەکەی خۆی کرد، لەپاشدا لەگەڵی جوت بوو پێش ئەوەی کەفارەتی (ظِّهَار)ەکەی بدات، جا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵەکەی پێ راگەیاند، فەرمووی: (چی ئەمەی پێ کردی؟)، وتی: سپیایی قاچەکانیم دی لە مانگەشەودا خۆم پێ رانەگیرا، فەرمووی: (لێی دورکەوەرەوە هەتا کەفارەتی (ظِّهَار)ەکەت دەدەیت).

**٢٢٢٢ - (صحيح بشواهده) عن عكرمة: أَنَّ رَجُلاً ظَاهَرَ مِنَ امْرَأَتِهِ فَرَأَى بَرِيقَ سَاقِهَا فِي الْقَمَرِ فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَهُ أَنْ يُكَفِّرَ.**

واتە: عیکریمە دەڵێت: پیاوێ (ظِّهَار)ی لە ژنەکەی کرد، لەبەر تریفـەی مانگەشـەودا جوانی لاقەکانی دی لەگەڵی جوت بوو، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليـه وسلم) هەواڵەکەی پێ راگەیاند، ئەویش فەرمانی پێدا کە کەفارەتی (ظِّهَار)ەکەی بدات.

٢٢٢٣ - (صحيح بشواهده) عن ابن عباس عن النبِي صـلى الله عليـه وسلم، نَحْوَهُ، وَلَمْ يَذْكُرِ (السَّاقَ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ، لە پێغەمبـەرەوە (صلى الله عليه وسـلم)، فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، بەڵام راوی باسی (لاقی) نەکرد.

٢٢٢٤ – (صحيح بشواهده) عن عكرمة، عن النبِـى صـلى الله عليـه وسلم، نَحْوِ حَدِيثِ سُفْيَانَ.

واتە: لە عیکریمەوە، لە پێغەمبـەردوە (صلى الله عليه وسـلم)، هـاتوە وەك فەرمودەکـەی سوفیان واتە فەرمودەی پێشو.

٢٢٢٥ – (صحيح بشواهده) قَالَ أَبو دَاوُدَ: سَـمِعْتُ مُحَمَّـدَ بْـنَ عِيسَـى يُحَدِّثُ بِهِ، حَدَّثَنَا الْمُعْتَمِرُ قَالَ: سَـمِعْتُ الْحَكَـمَ بْـنَ أَبَـانَ يُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَلَمْ يَـذْكُرِ ابْـنَ عَبَّـاسٍ، (قَـالَ عَـنْ عِكْرِمَةَ) قَالَ أَبو دَاوُدَ: كَتَبَ إِلَيَّ الْحُسَيْنُ بْنُ حُرَيْثٍ قَـالَ: أَخْبَرَنَا الْفَضْلُ بْنُ مُوسَى، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الْحَكَمِ بْنِ أَبَـانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، بِمَعْنَاهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەی پێشوم لە موحەممەدی کوڕی عیسا بیستوە، موعتەمیر حەی گێڕاینەوە وتی: فەرموودەی پێشوم لە حەکەمی کوڕی ئەبان بیستوە، بەڵام موعتەمیر باسی ئیبنو عەباسی نەکرد، (وتی لە عیکریمەوە)، ئەبو داود دەڵێت: نوسی بۆ حوسەینی کوڕی (حُرَیْث) وتی: (فَضْل)ی کوڕی موسا بۆی گێڕاینەوە، لە مەعمەرەوە، لە حەکەمی کوڕی ئەبانەوە، لە عیکریمەوە، لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ، بە هەمان مانای فەرموودەی پێشو، لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم).

**٢٢٢٦ - (صحيح) عن ثوبان رضي الله عنه أنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلاَقًا فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ).**

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (هەر ژنێ داوای تەڵاق و جیابونەوە بکات لە مێردەکەی بەبێ هیچ هۆیەك ئەوە بۆنی بەهەشتی لەسەر حەرامە).

## باسی (خلع) ئەوەیە ئافرەت شتێك لە مارەییەکەی خۆی کە ڕێك دەکەون لەسەری بداتە مێردەکەی بۆ ئەوەی لە بەرامبەریدا تەڵاقی بدات.

## ١٨ - باب فِي الْخُلْعِ.

٢٢٢٧ - (صحيح) عن حبيبة بنت سهل الأنصارية، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، وَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ إِلَى الصُّبْحِ فَوَجَدَ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ عِنْدَ بَابِهِ فِي الْغَلَسِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ هَذِهِ؟). فَقَالَتْ: أَنَا حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ، قَالَ: (مَا شَأْنُكِ؟). قَالَتْ: لاَ أَنَا وَلاَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ- لِزَوْجِهَا - فَلَمَّا جَاءَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذِهِ حَبِيبَةُ بِنْتُ سَهْلٍ). وَذَكَرَتْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَذْكُرَ، وَقَالَتْ حَبِيبَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُلُّ مَا أَعْطَانِي عِنْدِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ: (خُذْ مِنْهَا)، فَأَخَذَ مِنْهَا، وَجَلَسَتْ هِيَ فِي أَهْلِهَا.

واتە: لە حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصارییەوە کە هاوسەری (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە تاریکی کۆتایی شەودا لەماڵ دەرچو بۆ نوێژی بەیانی بینی حەبیبە کچی سەهل لەبەردەم دەرگای

ماڵەکەیاندایە، فەرمووی: (ئەمە کێیە؟). وتی: من حەبیبەی کچی سەهلم، فەرمووی: (ئەوە لێرە چی دەکەیت چ پێویستیەك تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟). وتی: نە من و نە مێردەکەم (ثابت)ی کوڕی قەیس پێکەوە نامانکرێ، کاتێ کە (ثابت)ی کوڕی قەیس هات، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (ئەمە حەبیبەی کچی سەهلە) ئەوەندەی کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت باسی بەسەرهاتی خۆی کرد — دەیویست تەڵاقی بدات و ڕزگاری ببێ لەدەستی - ، حەبیبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەموو ئەو مارەییەی کە پێی داوم لەلامە دەیگێڕمەوە بۆی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (ثابت)ی کوڕی قەیسی فەرموو: (لێی وەربگرە)، (ثابت)یش لێی وەرگرت - و لە حەبیبە جیابویەوە - ، جا حەبیبەش چووەوە بۆ ناو کەسوکاری خۆی و لێی دانیشت.

**٢٢٢٨ - (صحيح) عن عائشة، أَنَّ حَبِيبَةَ بِنْتَ سَهْلٍ كَانَتْ عِنْدَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ فَضَرَبَهَا فَكَسَرَ بَعْضَهَا، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ الصُّبْحِ فَاشْتَكَتْهُ إِلَيْهِ فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَابِتًا فَقَالَ: (خُذْ بَعْضَ مَالِهَا وَفَارِقْهَا)، فَقَالَ: وَيَصْلُحُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (نَعَمْ)، قَالَ: فَإِنِّي أَصْدَقْتُهَا حَدِيقَتَيْنِ وَهُمَا بِيَدِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (خُذْهُمَا فَفَارِقْهَا)، فَفَعَلَ.**

واتە: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: حەبیبەی کچی سەهلی ئەنصاریی کە هاوسەری (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بوو، (ثابت) دای لە حەبیبەو هەندێك لە ئەندامەکانی جەستەی شکاند - لەریوایەتی پێشەوا (نسائی)دا دەستی شکاند - ئەویش لەدوای نوێژی بەیانی هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سکاڵای خۆی

كردو شكاتی كرد لە (ثابت)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) (ثابت)ی بانگ كردو پێی فەرموو: (هەندێ لە مارەییەكەی بدەرێ و لێی جیابەرەوە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئایا دروستە هەندێ لە مارەییەكەی بدەمێ و لێی جیاببمەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: من دوو باخم پێ داوە لە مارەییدا ئێستا هەردوكیان بەدەستی ئەوەوەن و ئەو سەرپەرشتیان دەكات، جا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هەردوكیانی بدەرێ و لێی جیاببەرەوە). ئەویش هەردوو باخەكەی دایەو لێی جیابویەوە.

**٢٢٢٩ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ امْرَأَةَ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ اخْتَلَعَتْ مِنْهُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِدَّتَهَا حَيْضَةً.**

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ، دەڵێت: ژنەكەی (ثابت)ی كوری قەیس خولعی كرد لەگەڵ مێردەكەی، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) یەك بێ نوێژی بۆ دانا بۆ ماوە(عدە)كەی.

**٢٢٣٠ - (صحيح موقوف) عن ابن عمر قال: عِدَّةُ الْمُخْتَلِعَةِ حَيْضَةٌ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ، دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ماوە(عدە)ی ژنی خولع كراو یەك بێ نوێژی یە.

# باسی دەربارەی کەنیزەکێ ئازاد بکرێت لەکاتێکدا کە ژنی پیاوێکی ئازاد یان کۆیلە بێت

## ١٩ - باب فِي الْمَمْلُوكَةِ تَعْتِقُ وَهِيَ تَحْتَ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ.

٢٢٣١ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ مُغِيثًا كَانَ عَبْدًا فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اشْفَعْ لِي إِلَيْهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا بَرِيرَةُ اتَّقِي اللَّهَ فَإِنَّهُ زَوْجُكِ وَأَبُو وَلَدِكِ). فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَأْمُرُنِي بِذَلِكَ قَالَ: (لاَ، إِنَّمَا أَنَا شَافِعٌ). فَكَانَ دُمُوعُهُ تَسِيلُ عَلَى خَدِّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْعَبَّاسِ: (أَلاَ تَعْجَبُ مِنْ حُبِّ مُغِيثٍ بَرِيرَةَ وَبُغْضِهَا إِيَّاهُ).

واتە: ئیبنو عەبباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: (مُغیث) کۆیلەیە بوو لەکاتێکدا کە بەریرەی هاوسەری ئازاد کرا، (مُغیث) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)! تکەم بۆ بکە لەلای بەریرەی هاوسەرم بەڵکو لێم جیانەبێتەوەو بێتەوە ژێر ڕکێفی من، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: (ئەی بەریرە لەخوای گەورە بترسە چونکە مغیث) مێردی تۆیەو باوکی منداڵەکەتە). بەریرە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله عبه وسلم) فەرمانم پێ دەکەیت، فەرمووی: (نەخێر، فەرمانت پێ ناکەم بەڵکو من تکاکارم). لەوکاتەدا (مُغیث) فرمێسك بەڕومەتیا دەهاتەخوارەوە، پێغەمبەری خوا (صلی

الله علیه وسلم) بە عەباسی فەرموو: ( خۆشەویستی (مُغیث)ت بۆ بەریرە بەلاوە سەیر نیـە، لەگەڵ رق كینەی بەریرە بۆ (مُغیث) ).

**٢٢٣٢ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ عَبْدًا أَسْوَدَ يُسَمَّى مُغِيثًا، فَخَيَّرَهَا - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - وَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ.**

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: مێردەكەی بەریرە كۆیلەیەكی رەش بوو، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد، فەرمانی دا بە بەریرە كە بە یەك بێ نوێژی ماوە(عدە)كەی بگرێت.

**٢٢٣٣ - (صحيح لكن قوله (لَوْ كَانَ حُرًّا لَمْ يُخَيِّرْهَا) ) عن عائشة، في قصة بريرة قالت: كَانَ زَوْجُهَا عَبْدًا فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاخْتَارَتْ نَفْسَهَا، وَلَوْ كَانَ حُرًّا لَمْ يُخَيِّرْهَا.**

واتە: لە بەسەرهاتەكەی بەریرەدا، عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: مێردەكەی بەریرە كۆیلە بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد: كە یا وەك جاران كە خۆشی كەنیزەك بوو ئازاد نەكرابوو بەلای مێردەكەیەوە دانیشێت، یان هەر لە ئێستاوە دەستی لێ هەڵگرێت، ئەویش لە مێردەكەی جیابویەوە، ئەگەر مێردەكەی بەریرە ئازاد بوایە ئەوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی سەرپشك نەدەكرد.

**٢٢٣٤ - (صحيح) عن عائشة: أَنَّ بَرِيرَةَ خَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَ زَوْجُهَا عَبْدًا.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّرنەوە، كە پیّغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد، لەكاتیّكدا كە میّردەكەی كۆیلە بوو.

## باسی ئەوانەی كە دەڵیّن: میّردەكەی بەریرە ئازاد بوو

## ٢٠ - باب مَنْ قَالَ: كَانَ حُرًّا.

**٢٢٣٥ - (صحيح) عن عائشة: أَنَّ زَوْجَ بَرِيرَةَ كَانَ حُرًّا[1] حِينَ أُعْتِقَتْ، وَأَنَّهَا خُيِّرَتْ، فَقَالَتْ: مَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ مَعَهُ وَإِنَّ لِي كَذَا وَكَذَا.**

واتە: عائیشە رەزای خوای لیّ بیّ دەڵیّ: بیّگومان كاتیّ كە بەریرە ئازاد كرا میّردەكەی بەریرە ئازاد بوو، بۆیە پیّغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كرد، بەریرە وتی: پیّم خۆش نیە لەگەڵی بمیّنمەوە ئەگەر ئەوەندەو ئەوەندەم بداتیّ - لە ماڵی دونیا، واتە ئەگەر ماڵ و سامانیّكی زۆریشم بداتیّ لەسەر ئەوە - .

# باسی هەتا كەی ئافرەت لە هەڵبژاردن سەرپشك دەكرێت.

# ٢١ – باب حَتَّى مَتَى يَكُونُ لَهَا الْخِيَارُ.

**٢٢٣٦ - (ضعيف) عن عائشة: أَنَّ بَرِيرَةَ أُعْتِقَتْ، وَهِيَ عِنْدَ مُغِيثٍ - عَبْدٍ لآلِ أَبِى أَحْمَدَ - فَخَيَّرَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ لَهَا: (إِنْ قَرِبَكِ فَلاَ خِيَارَ لَكِ).**

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: كاتێك كە بەریرە ئازاد كرا ژنی (مغیث) بوو – (مغیث)یش كۆیلەی خانەوادەی ئەبو ئەحمەد بوو – ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەریرەی لە هەڵبژاردن سەرپشك كردو پێی فەرموو: (لەم ماوەیەدا ئەگەر مێردەكەت بێتە لات و جوت ببێ لەگەڵت ئیتر پەشیمان بونەوەت بۆ نیە).

## باسی ژن و مێردێ کە هەردوکیان کۆیلە بن ئەگەر ئازاد کران ئەوە ژنەکە لە هەڵبژاردن سەرپشك ناکرێت، چونکە هەردوکیان ئازادن و لەیەك ئاستدان

## ٢٢ – باب فِي الْمَمْلُوكَيْنِ يُعْتَقَانِ مَعًا هَلْ تُخَيَّرُ امْرَأَتُهُ.

٢٢٣٧ - (ضعيف) عن عائشة: أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَعْتِقَ مَمْلُوكَيْنِ لَهَا، زَوْجٌ، قَالَ: فَسَأَلَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَأَمَرَهَا أَنْ تَبْدَأَ بِالرَّجُلِ قَبْلَ الْمَرْأَةِ.

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ ژن و مێردێ کە هەردوکیان کۆیلەی ئەو دەبن دەیەوێت ئازادیان بکات، راوی دەڵێ: لەوبارەوە لە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) پرسی، ئەویش فەرمانی پێدا کە لەپێشدا پیاوەکە ئازاد بکات ئینجا ژنەکە.

# باسی ژن و مێردێكی كافر ئەگەر یەكێكیان موسوڵمان بوو

## ٢٣ – باب إِذَا أَسْلَمَ أَحَدُ الزَّوْجَيْنِ.

**٢٢٣٨ - (ضعيف) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ مُسْلِمًا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ جَاءَتِ امْرَأَتُهُ مُسْلِمَةً بَعْدَهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَسْلَمَتْ مَعِي، فَرَدَّهَا عَلَيْهِ.**

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێ هات موسوڵمان بوو، لەپاشدا ژنەكەشی هات ئیمانی هێناو موسوڵمان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ مندا موسوڵمان بووە بۆم بگێڕەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆی گێڕایەوەو بە هاوسەری ئەو مایەوە.

**٢٢٣٩ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: أَسْلَمَتِ امْرَأَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَزَوَّجَتْ، فَجَاءَ زَوْجُهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَسْلَمْتُ، وَعَلِمَتْ بِإِسْلاَمِي، فَانْتَزَعَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ زَوْجِهَا الآخَرِ، وَرَدَّهَا إِلَى زَوْجِهَا الأَوَّلِ.**

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ژنێ موسوڵمان بوو، شوی كرد بە كەسێكی تر، لەپاشدا مێردەكەی

...ته‌خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) ...یش موسوڵمان بووم، ژنه‌كه‌شم ده‌زانێ كه موسوڵمان بووم، جا پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله ... وسلم) ژنه‌كه‌ی له مێردی دووه‌می سه‌نده‌وه‌و گێڕایه‌وه بۆ مێردی یه‌كه‌می.

## باسی ژن و مێردێكی كافر ئه‌گه‌ر ژنه‌كه موسوڵمان بوو رۆشت له‌پاشدا مێرده‌كه‌شی موسوڵمان بوو هه‌تا كه‌ی ژنه‌كه‌ی بۆ ده‌گێڕدرێته‌وه.

## ٢٤ - باب إِلَى مَتَى تُرَدُّ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ إِذَا أَسْلَمَ بَعْدَهَا.

٢٢٤٠ - (صحيح دون ذكر السنين) عن ابن عباس قال: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِي بِالنِّكَاحِ الأَوَّلِ، لَمْ يُحْدِثْ شَيْئًا. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو فِي حَدِيثِهِ: بَعْدَ سِتِّ سِنِينَ، وَقَالَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ: بَعْدَ سَنَتَيْنِ.

واته: ئیبنو عه‌باس ره‌زای خوایان لێ بێ ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) ...ینه‌بی كچی دایه‌وه به مێرده‌كه‌ی كه ئه‌بو عاص بوو هه‌ر به‌ماره‌یی پێشو، هیچ شتێكی ...ز، په‌یدا نه‌بوو. موحه‌ممه‌دی كوڕی عه‌مر له فه‌رمووده‌كه‌یدا وتی: له‌پاش شه‌ش ساڵ بۆی گێڕایه‌وه، حه‌سه‌نی كوڕی عه‌لی ره‌زای خوایان لێ بێ وتی: له‌پاش دوو ساڵ.

## باسی ئەگەر پیاوێ موسوڵمان بێت و زیاد لە چوار ژنی هەبێ، یان دوو خوشك پێكەوە ژنی بن.

## ٢٥ – باب فِي مَنْ أَسْلَمَ وَعِنْدَهُ نِسَاءٌ أَكْثَرُ مِنْ أَرْبَعٍ أَوْ أُخْتَانِ.

٢٢٤١ - (صحيح) عن الحارث بن قيس - قال مسدد: ابن عميرة وقال وهب: الأسدي -، قال: أَسْلَمْتُ وَعِنْدِي ثَمَانُ نِسْوَةٍ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اخْتَرْ مِنْهُنَّ أَرْبَعًا).

٢٢٤٢ - (صحيح) عن قيس بن الحارث، بمعناه.

واتە: لە (حارث)ی كوڕی قەیسەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان مانا هاتوە.

٢٢٤٣ - (حسن) عن الضحاك بن فيروز، عن أبيه أنه قال: (قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَسْلَمْتُ وَتَحْتِي أُخْتَانِ، قَالَ: (طَلِّقْ أَيَّتَهُمَا شِئْتَ).

واتە: لە (ضَحَّاكِ)ی كوڕی فەیروزەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، من موسوڵمان بووم و دوو خوشك هاوسەرمن. فەرمووی: (ئەوەیان ویستت لێیەتی تەلاقی بدە).

## باسی باوك و دایكێكی كافر ئه‌گه‌ر یه‌كێكیان موسوڵمان بوو، منداڵێكیان هه‌بێ بۆ كامیان ده‌بێ..

## ٢٦ - باب إِذَا أَسْلَمَ أَحَدُ الأَبَوَيْنِ مَعَ مَنْ يَكُونُ الْوَلَدُ.

٢٢٤٤ - (صحيح) عن رافع بن سنان: أَنَّهُ أَسْلَمَ وَأَبَتِ امْرَأَتُهُ أَنْ تُسْلِمَ فَأَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: ابْنَتِي وَهِيَ فَطِيمٌ أَوْ شِبْهُهُ، وَقَالَ رَافِعٌ: ابْنَتِي. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اقْعُدْ نَاحِيَةً). وَقَالَ لَهَا: (اقْعُدِي نَاحِيَةً). قَالَ: وَأَقْعَدَ الصَّبِيَّةَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ قَالَ: (ادْعُوَاهَا). فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أُمِّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَّ اهْدِهَا). فَمَالَتِ الصَّبِيَّةُ إِلَى أَبِيهَا، فَأَخَذَهَا.

واته: له رافیعی كوڕی سینانه‌وه ده‌گێڕنه‌وه: كاتێ كه رافع موسوڵمان بوو ژنه‌كه‌ی نه‌یده‌ویست موسوڵمان ببێت، بۆیه ژنه‌كه‌ی هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: كچه‌كه‌م له شیر براوه‌ته‌وه، یان وه‌ك منداڵێ وایه كه له شیر برابێته‌وه، رافعیش وتی: كچی منه، پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) به رافعی فه‌رموو: (له لایه‌كه‌وه دانیشه). به ژنه‌كه‌شی فه‌رموو: (تۆش له لاكه‌ی تره‌وه دانیشه). كچه‌كه‌شی له نێوانیاندا دانیشاند، له‌پاشدا فه‌رمووی: (بانگی بكه‌ن بۆ لای خۆتان). كچه‌كه رووی وه‌رچه‌رخاند به‌ره‌و لای دایكی بڕوات، پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی پاڕایه‌وه‌و فه‌رمووی: ( خودایه هیدایه‌تی بده‌و رێی راستی نیشان بده). جا كچه‌كه رووی وه‌رچه‌رخاندو رۆشت بۆلای باوكی، باوكیشی هه‌ڵی گرت و بردیه‌وه.

# باسی سەبارەت بە نەفرین لەیەك كردن لەلایەن ژن و مێردەوە.

## ٢٧ - باب فِي اللِّعَانِ.

٢٢٤٥ - (صحيح) عن سهل بن سعد الساعدي: أَنَّ عُوَيْمِرَ بْنَ أَشْقَرَ الْعَجْلَانِيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيٍّ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ سَلْ لِي يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا، حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ، جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ لَهُ: يَا عَاصِمُ، مَاذَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: عَاصِمٌ لَمْ تَأْتِنِي بِخَيْرٍ قَدْ كَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي سَأَلْتُهُ عَنْهَا، فَقَالَ عُوَيْمِرٌ: وَاللَّهِ لَا أَنْتَهِي حَتَّى أَسْأَلَهُ عَنْهَا، فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ وَسَطَ النَّاسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ فَتَقْتُلُونَهُ أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: (قَدْ أُنْزِلَ فِيكَ وَفِي صَاحِبَتِكَ قُرآنٌ، فَاذْهَبْ فَأْتِ بِهَا). قَالَ سَهْلٌ: فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا فَرَغَا قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا عُوَيْمِرٌ ثَلاَثًا قَبْلَ أَنْ يَأْمُرَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَتْ تِلْكَ سُنَّةَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە دەگێڕنەوە، کە عوەیمیری کوڕی عەجلانی ـەت بۆ خزمەت عاصیمی کوڕی عەدی، پێی وت: ئەی عاصیم، پێم بڵێ ئەگەر پیاوێك ـەر ژنەکەیەوە پیاوێ بگرێت ئەگەر بیکوژێ ئێوە لەتۆڵەیدا دەیکوژنەوە، ئەگەر ـیکوژێ چی بکات؟ ئەی عاصیم ئەم پرسیارەم بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه ـم. عاصیم رۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیارەکەی لێ کرد. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیارەکەی پێ ناخۆش بوو، بەڵکو بە شورەیشی ـ. تەنانەت عاصیم کە ئەو وەڵامەی بیست لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ـەلایەوە زۆر قورس و گران بوو، کاتێ کە عاصیم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، عوەیمیر چوو بۆلای ـ پێی وت: ئەی عاصیم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی فەرموو؟ عاصیم وتی: خێرە نەدی لێت، بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیارەکەی تۆی پێ ـخۆش بوو لەبارەی هاوسەرەکەتەوە، عوەیمیر وتی: سوێند بە (الله) وازناهێنم هەتا ـەوبارەوە خۆم لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەپرسم، جا عوەیمیر خۆی رۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لەوکاتەدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەناو کۆمەڵێ خەڵکدا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر پیاوێك پیاوێ ـگرێت بەسەر ژنەکەیەوە ئەگەر بیکوژێ ئێوە لەجیاتیدا دەیکوژنەوە، ئەگەر نەیکوژێ چی ـکات؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (خوای گەورە دەربارەی تۆو ژنەکەت

ئایەتی ناردۆتە خوارەوە، بڕۆ ژنەکەت بهێنە بۆ ئێرە). سەهل وتی: من لەناو خەڵکەکەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم (صلی الله علیه وسلم)، کە ژن و مێردەکە نەفرینیان لەیەك کرد بە پێی ئەو دەستورەی کە خوا دیاریکردوە، کاتێ کە لێ بونەوە عوەیمیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر قبوڵی بکەمەوە بە ژنی خۆم ئەوە مانای وایە کە بوختانم بۆ کردوە، لەبەر ئەوە سێ بەسێ تەلاقی دا پێش ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ بکات. راوی فەرمودەکە ئیبنو شیهاب: دەڵێت: لەدوای ئەم روداوەوە ئیتر دەستوری نەفرین لەیەك کردن بەم شێوەیە بوو.

**٢٢٤٦ - (حسن) عن عباس بن سهل، عن أبيه، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِعَاصِمِ بْنِ عَدِيّ: (أَمْسِكِ الْمَرْأَةَ عِنْدَكَ حَتَّى تَلِدَ).**

واتە: لە عەباسی کوڕی سەهلەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە عاصیمی کوڕی عەدی فەرموو: (ئافرەتەکە لای خۆت بهێڵەرەوە هەتا منداڵی دەبێت). — عاصیم گەورەی هۆزەکەی بوو، وە یەکێك بووە لە مەحرەمەکانی ئافرەتەکە - .

**٢٢٤٧ - (صحيح) عن سهل بن سعد الساعدي قال: حَضَرْتُ لِعَانَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً. وَسَاقَ الْحَدِيثَ قَالَ فِيهِ، ثُمَّ خَرَجَتْ حَامِلاً فَكَانَ الْوَلَدُ يُدْعَى إِلَى أُمِّهِ.**

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی دەڵێت: لەوکاتەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم (صلی الله علیه وسلم) کە ژن و مێردەکە نەفرینیان لەیەك کرد، تەمەنیشم پانزە ساڵان

بوو. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە تێدا وتی: ژنەکەی عوەیمیر کاتێ کە دەرچو دیار بوو کە سکی پڕ بوو، منداڵەکەش رەچەڵەك(نەسەب)ی درایە لای دایکی و بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا.

**٢٢٤٨ - (صحيح) عن سهل بن سعد، في خبر المتلاعنين، قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَدْعَجَ الْعَيْنَيْنِ عَظِيمَ الأَلْيَتَيْنِ فَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ قَدْ صَدَقَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أُحَيْمِرَ كَأَنَّهُ وَحَرَةٌ فَلاَ أُرَاهُ إِلاَّ كَاذِبًا). قَالَ: فَجَاءَتْ بِهِ عَلَى النَّعْتِ الْمَكْرُوهِ.**

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە سەبارەت بە بەسەرهاتی ئەو ژن و مێردەی کە نەفرینیان لێك کرد دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: چاودێری بکەن، ئەگەر ژنەکەی عوەیمیر بە منداڵەکەیەوە هات منداڵەکە چاوی رەش بوو، سمتی گەورە بوو ئەوە عوەیمیر راست دەکات، بەڵام ئەگەر هات سورکەلە بوو وەك مەرمازەڵە ئەوە عوەیمیر درۆ دەکات). سەهل وتی: کاتێ کە هات لەو پیاوە دەچوو کە تۆمەتبار کرابوو.

**٢٢٤٩ - (صحيح) عن سهل بن سعد الساعدي، بهذا الخبر قال: فَكَانَ يُدْعَى - يَعْنِي الْوَلَدَ - لأُمِّهِ.**

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعدیەوە ئەم بەسەرهاتە هاتووە، سەهل وتی: جا منداڵەکە بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا.

٢٢٥٠ - (صحيح) عن سهل بن سعد، في هذا الخبر قال: فَطَلَّقَهَا ثَلاَثَ تَطْلِيقَاتٍ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَنْفَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ مَا صُنِعَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سُنَّةً. قَالَ سَهْلٌ: حَضَرْتُ هَذَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَضَتِ السُّنَّةُ بَعْدُ فِي الْمُتَلاَعِنَيْنِ أَنْ يُفَرَّقَ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ لاَ يَجْتَمِعَانِ أَبَدًا.

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە بەسەرهاتی پێشو هاتوە، کە وتویەتی جا سێ بەسێ تەڵاقی دا بە ئامادەبوونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڕێوەی برد، ئەوەی کە کردی لەلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سوننەتە، سەهل وتی: بۆ ئەمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم (صلى الله عليه وسلم)، سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وا ڕۆیشتوە لەدوای نەفرەت کردن لەنێوان ژن و مێرددا ژن و مێردەکە بۆ هەمیشە لێك جیابکرێنەوە جارێکی تر بۆ یەك نەبن.

٢٢٥١ - (صحيح) عن سهل بن سعد قال: شَهِدْتُ الْمُتَلاَعِنَيْنِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تَلاَعَنَا. وَتَمَّ حَدِيثُ مُسَدَّدٍ. وَقَالَ الآخَرُونَ: إِنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَرَّقَ بَيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ فَقَالَ الرَّجُلُ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا - لَمْ يَقُلْ بَعْضُهُمْ عَلَيْهَا - قَالَ

**أُبو دَاوُدَ: لَمْ يُتَابِعِ ابْنَ عُيَيْنَـةَ أَحَـدٌ عَلَـى أَنَّـهُ فَـرَّقَ بَـيْنَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ.**

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خـوادا (صلى الله عليه وسلم) تەمەنم پانزە ساڵان بوو ئەو ژن و مێردەم بینـی کـە نـەفرینیان لەیـەك کرد. پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسـلم) جیایکردنـەوە لەیـەك، لێـرەدا فەرمودەکـەی موسەددەد تەواو بوو، راویەکانی تر دەڵێن: سەهل پێغەمبەری خـوای (صلى الله عليه وسـلم) ژن و مێردەکەی بینی جیایکردنەوە لەیەك، پیاوەکە واتە عوەیمیر وتی: ئـەی پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر قبوڵی بکەمەوە بە ژنی خۆم ئەوە مانای وایە کە بوختانم بۆ کردوە – هەندێ لە راویەکان وشەی (عَلَيْهَا)یان نەوت - ئەبو داود دەڵێت: هـیچ کەسـێ لەوەدا شـوێن ئیبنـو عوەینـە نەکـەوت کـە ئـەو ژن و مێـردەی شـەرە نـەفرینیان کـرد پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جیای کردبێتەوە.

**٢٢٥٢ - (صحيح) عن سهل بن سعد، في هذا الحديث: وَكَانَـتْ حَـامِلاً، فَأَنْكَرَ حَمْلَهَا، فَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى إِلَيْهَا، ثُمَّ جَرَتِ السُّنَّةُ فِي الْمِيرَاثِ أَنْ يَرِثَهَا وَتَرِثَ مِنْهُ مَا فَرَضَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهَا.**

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هەواڵی پێشو هاتوە. کە وتویـەتی: ئافرەتەکـە لـەو کاتەدا سکی پڕ بوو، پیاوەکە ئینکاری ئەوەی دەکرد کە سکەکە لەو بێت، جا منداڵەکـە بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا، ئیتر لەدوای ئەوەوە سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وا پەیڕەو دەکرا کە منداڵەکە لە دایکی میرات بەرێ و، دایکیشی لە منداڵەکە.

٢٢٥٣ - (صحيح) عن عبد الله قال: إِنَّا لَلَيْلَةُ جُمْعَةٍ فِي الْمَسْجِدِ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فِي الْمَسْجِدِ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً فَتَكَلَّمَ بِهِ جَلَدْتُمُوهُ أَوْ قَتَلَ قَتَلْتُمُوهُ، فَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى غَيْظٍ! وَاللَّهِ لأَسْأَلَنَّ عَنْهُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِهِ رَجُلاً فَتَكَلَّمَ بِهِ جَلَدْتُمُوهُ، أَوْ قَتَلَ قَتَلْتُمُوهُ، أَوْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى غَيْظٍ! فَقَالَ: (اللَّهُمَّ افْتَحْ). وَجَعَلَ يَدْعُو، فَنَزَلَتْ آيَةُ اللِّعَانِ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ﴾. هَذِهِ الآيَةُ فَابْتُلِيَ بِهِ ذَلِكَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْنِ النَّاسِ، فَجَاءَ هُوَ وَامْرَأَتُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَلاَعَنَا، فَشَهِدَ الرَّجُلُ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، ثُمَّ لَعَنَ الْخَامِسَةَ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ. قَالَ: فَذَهَبَتْ لِتَلْتَعِنَ فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَهْ). فَأَبَتْ فَفَعَلَتْ، فَلَمَّا أَدْبَرَا قَالَ: (لَعَلَّهَا أَنْ تَجِيءَ بِهِ أَسْوَدَ جَعْدًا). فَجَاءَتْ بِهِ أَسْوَدَ جَعْدًا.

واتە: لە (عَبْدُ اللّه) — ی کوڕی مەسعودە - وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: شەوێکی هەینی ئێمە کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەمزگەوتدا بووین پیاوێ لە ئەنصار هاتەژورەوە وتی: ئەگەر پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە پیاوێ بگرێت ئەگەر

ـسی بکات داری حەدی لێ دەدەن، ئەگەر بیکوژێ ئێوە لەتۆڵەیدا دەیکوژنەوە، ئەگەر ێدەنگ بوو ئەوە لەسەر رق و تورەیی بێدەنگ دەبێت رق و کینەکەی لەدڵدا هەر دەمێنێت، سوێند بە (الله) خۆم لەوبارەوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەپرسم، کاتێ کە رۆژ بویەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیارەکەی لێ کرد. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر یەکێ پیاوێ بگرێت بەسەر ژنەکەیەوە ئەگەر باسی بکات داری حەدی لێ دەدەن، ئەگەر بیکوژێ ئێوە لەتۆڵەیدا دەیکوژنەوە، ئەگەر بێدەنگیش بێت ئەوە لەسەر رق و تورەیی بێدەنگ دەبێت رق و کینەکەی لەدڵدا هەر دەمێنێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (خودایە بڕیار لەسەر ئەمە بدەو حوکمی خۆتمان لەم بارەوە بۆ بەیان بکە). لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەپاڕایەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: (وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ... ). النور: ٦. واتە: ئەو (پیاوانەی) بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن، وە بێجگە لەخۆیان هیچ شایەتێکیان نی یە ...

جا خوای گەورە بە بەڵایە ئەو پیاوەی تاقی کردەوە لەناو خەڵکدا، خۆی و ژنەکەی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو شێوەیەی کە خوای گەورە بڕیاری لەسەردابوو شەرە نەفرینیان کرد، جا پیاوەکە چوار جار سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە بێگومان لەراستگۆیانە - کە دەڵێت خێزانەکەم بینیوە زینای کردووە - لەپاشدا لە پێنجەم جاردا وتی: نەفرینی خوای گەورەی لەسەر من بێ ئەگەر درۆ بکەم، راوی وتی: ئافرەتەکەش رۆشت بۆئەوەی نەفرین بکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: ئەکەی، رێگری لێ کرد). ئەویش رەدی کردەوەو کارەکەی ئەنجامدا، کاتێ کە پشتی هەڵکردو لێی دا رۆشت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بەڵکو بە قوڕەشێکی قژ بژەوە بێتەوە واتە بە منداڵێکەوە بێتەوە لەو پیاوە بچێت کە زینای لەگەڵ کردوە). کاتێ کە منداڵەکەی بوو هێنای بەو شێوەیە بوو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی.

٢٢٥٤ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْبَيِّنَةَ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا رَأَى أَحَدُنَا رَجُلاً عَلَى امْرَأَتِهِ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ فَجَعَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الْبَيِّنَةَ وَإِلاَّ فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ). فَقَالَ هِلاَلٌ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ نَبِيًّا إِنِّي لَصَادِقٌ وَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ فِي أَمْرِي مَا يُبَرِّئُ ظَهْرِي مِنَ الْحَدِّ فَنَزَلَتْ ( وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ ) فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ: (مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ). فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمَا فَجَاءَا فَقَامَ هِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ فَشَهِدَ، وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا مِنْ تَائِبٍ؟). ثُمَّ قَامَتْ فَشَهِدَتْ، فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، وَقَالُوا لَهَا: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا سَتَرْجِعُ، فَقَالَتْ: لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ. فَمَضَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ بْنِ سَحْمَاءَ). فَجَاءَتْ

بِهِ كَذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللَّهِ، لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە هیلالی کوڕی ئومەییە تۆمەتی زینا داوێن پیسی دایە پاڵ ژنەکەی خۆی لەگەڵ پیاوێ کە ناوی (شریك)ی کوڕی سحماء) بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بەڵگەو شایەت بێنە ئەگەر نا داری حەد دەدرێت لە پشتت. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەسێ پیاوێ بگرێت بەسەر ژنەکەیەوە بچێت شایەت پەیدا بکات، فەرمووی: (بەڵگەو شایەت بێنە ئەگەر نا داری حەد دەدرێت لە پشتت). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم سوێند بەو (الله)یەی کە تۆی بە حەق رەوانەکردوە، راست دەکەم و، دڵنیام کە خوای گەورە ئایەت دەنێرێتەخوارەوەو پشتم لە داری حەد دەپارێزێت، جا ئەم دوو ئایەتە هاتەخوارەوە: (وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٧﴾ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٨﴾ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٩﴾). النور: ٦ - ٧. واتە: ئەو کەسانەی کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرانیان، لەهەمان کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نیە شایەتییان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردوە، چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لەکۆڵ بکەوێت — ئەگەر شایەد نەبوو — دەبێت هەر یەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بە خوا بڵێت: بەڕاستی من لە ڕاستگۆیانم " کە دەڵێم ئەم ژنەم زینای کردووە " وە بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێ ئەگەر لە درۆزنان بم.

جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوەو ناردی بەدوایاندا، ئەوانیش هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هیلالی کوڕی ئومەییە هەستا شایەتی دا،

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (خوای گەورە دەزانێ كە یەكێكتان درۆ دەكەن. ئایا كەسێ هەیە لەهەردوكتان كە تەوبە بكات؟). لەپاشدا ئافرەتەكە هەستا شایەتی دا. كاتێ كە گەیشتە پێنجەم جار: رق و تورەیی خوای گەورە لەسەر نەفسی من بێت ئەگەر پیاوەكەم راست بكات، وەستاندیان وتیان: بەڕاستی ئیتر ئەمە سزات بۆ پێویست دەكات. ئیبنو عەباس وتی: كەمێ زمانی گیری كردو بەرەو پشت كەمێ هاتەوە، وامان زانی كە پەشیمان دەبێتەوە، لەپاشدا وتی: من هەرگیز تیرەی خۆم سەرشۆڕ ناكەم بە درێژایی رۆژگار، جا سوێندی پێنجەم جاری خوارد كاتێ كە تەواو بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (چاوەڕوانی ئەوە بكەن ئەگەر منداڵەكە چاو ڕەش و سمت قەڵەو و قاچ ئەستور بوو، ئەوە هی شەریكی كوڕی سەحمایە) واتە هیلال راستی كردوە، ئافرەتەكە منداڵێكی لەو شێوەیەی بوو، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە رابورد لە كتێبی خوادا، ئەوە من لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا شتێكی تر دەبوو).

**٢٢٥٥ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ رَجُلاً حِينَ أَمَرَ الْمُتَلاَعِنَيْنِ أَنْ يَتَلاَعَنَا أَنْ يَضَعَ يَدَهُ عَلَى فِيهِ عِنْدَ الْخَامِسَةِ يَقُولُ: إِنَّهَا مُوجِبَةٌ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە كاتێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا بە ژن و مێردەكە نەفرین لەیەكتر بكەن هەر لەو كاتەشدا فەرمانی دا بە پیاوێ لە پێنجەم جاردا دەمی بگرێت و بیوەستێنێ بڵێ: بەڕاستی ئیتر ئەمە سزات بۆ پێویست دەكات.

٢٢٥٦ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: جَاءَ هِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ وَهُوَ أَحَدُ الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ" فَجَاءَ مِنْ أَرْضِهِ عَشِيًّا فَوَجَدَ عِنْدَ أَهْلِهِ رَجُلاً، فَرَأَى بِعَيْنَيْهِ وَسَمِعَ بِأُذُنَيْهِ فَلَمْ يَهِجْهُ حَتَّى أَصْبَحَ، ثُمَّ غَدَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي جِئْتُ أَهْلِي عِشَاءً فَوَجَدْتُ عِنْدَهُمْ رَجُلاً فَرَأَيْتُ بِعَيْنِي وَسَمِعْتُ بِأُذُنِي، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا جَاءَ بِهِ وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ، فَنَزَلَتْ ( وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَٰجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمْ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمْ ) الآيَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا، فَسُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَبْشِرْ يَا هِلاَلُ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَكَ فَرَجًا وَمَخْرَجًا). قَالَ هِلاَلٌ: قَدْ كُنْتُ أَرْجُو ذَلِكَ مِنْ رَبِّي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَرْسِلُوا إِلَيْهَا). فَجَاءَتْ فَتَلاَ عَلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَذَكَّرَهُمَا، وَأَخْبَرَهُمَا أَنَّ عَذَابَ الآخِرَةِ أَشَدُّ مِنْ عَذَابِ الدُّنْيَا، فَقَالَ هِلاَلٌ: وَاللَّهِ لَقَدْ صَدَقْتُ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: قَدْ كَذَبَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (لاَعِنُوا بَيْنَهُمَا). فَقِيلَ لِهِلاَلٍ اشْهَدْ. فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قِيلَ لَهُ: يَا هِلاَلُ اتَّقِ اللَّهَ فَإِنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، وَإِنَّ هَذِهِ الْمُوجِبَةُ الَّتِي

تُوجِبُ عَلَيْكَ الْعَذَابَ. فَقَالَ: وَاللَّهِ لاَ يُعَذِّبُنِي اللَّهُ عَلَيْهَا كَمَا لَمْ يَجْلِدْنِي عَلَيْهَا. فَشَهِدَ الْخَامِسَةَ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ قِيلَ لَهَا اشْهَدِي. فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قِيلَ لَهَا: اتَّقِي اللَّهَ فَإِنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ وَإِنَّ هَذِهِ الْمُوجِبَةُ الَّتِي تُوجِبُ عَلَيْكِ الْعَذَابَ. فَتَلَكَّأَتْ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي، فَشَهِدَتِ الْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا وَقَضَى أَنْ لاَ يُدْعَى وَلَدُهَا لأَبٍ، وَلاَ تُرْمَى وَلاَ يُرْمَى وَلَدُهَا، وَمَنْ رَمَاهَا أَوْ رَمَى وَلَدَهَا فَعَلَيْهِ الْحَدُّ، وَقَضَى أَنْ لاَ بَيْتَ لَهَا عَلَيْهِ وَلاَ قُوتَ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُمَا يَتَفَرَّقَانِ مِنْ غَيْرِ طَلاَقٍ وَلاَ مُتَوَفًّى عَنْهَا، وَقَالَ: (إِنْ جَاءَتْ بِهِ أُصَيْهِبَ أُرَيْصِحَ أُثَيْبِجَ حَمْشَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِهِلاَلٍ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَوْرَقَ جَعْدًا جُمَالِيًّا خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ فَهُوَ لِلَّذِي رُمِيَتْ بِهِ) فَجَاءَتْ بِهِ أَوْرَقَ جَعْدًا جُمَالِيًّا خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ سَابِغَ الأَلْيَتَيْنِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْلاَ الأَيْمَانُ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ). قَالَ عِكْرِمَةُ: فَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَمِيرًا عَلَى مُضَرَ وَمَا يُدْعَى لأَبٍ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هیلالی کوڕی ئومەییە کە یەکێ بوو لەدواکەوتوانی جەنگی تەبوك خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ کردن و پێیان خۆشبو، سەر لە ئێوارەیە لە زەویە کشتوکاڵیەکەی خۆی هاتەوە بینی پیاوێك بەسەر ژنەکەوەیەتی بە چاوی خۆی بینی بە هەردوو گوێی بیستی نەفڕاندی و نە ئیزعاجیشی کرد و دەریشی نەکرد، لەپاشدا کە ڕۆژ بویەوە چو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هیلال وتی: ئێوارە لە زەویە کشتوکاڵیەکەی خۆم هاتمەوە بۆ ماڵەوە دەبینم پیاوێك لەسەر ژنەکەمەوەیە بە چاوی خۆم بینیم بە هەردوو گوێی خۆم بیستم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆری پێ ناخۆش بوو قورس و گران بوو لەسەری، جا خوای گەورە هەردوو ئەم دوو ئایەتەی ناردەخوارەوە: ( وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٦﴾ وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ ﴿٧﴾). النور: ٦ – ٧. واتە: ئەو کەسانەی کە تۆمەتی زینا دەدەنە پاڵ هاوسەرانیان، لەهەمان کاتدا بێجگە لە خۆیان شایەتی تریان نیە شایەتییان بۆ بدەن کە ئەو ژنە زینای کردوە، چونکە چوار شایەت پێویستە بۆ ئیسپاتی زینا، جا بۆ ئەوەی ئەو هەشتا شەلاقەی لەکۆڵ بکەوێت – ئەگەر شایەد نەبوو – دەبێت هەر یەك لەو جۆرە پیاوانە چوار جار بە ناوی خواوە شایەتی بدات و سوێند بخوات بە خوا بڵێت: بەڕاستی من لە نەڕاستگۆیانم " کە دەڵێم ئەم ژنەم زینای کردووە " وە بەچاوی خۆم تاوانەکەیم بینیوە، پێنجەم جاریش بڵێت: نەفرینی خوام لەسەر بێ ئەگەر لە درۆزنان بم.

هەر لەوکاتەدا دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەحی بۆ هاتوە، فەرمووی: (موژدەت لێ بێ ئەی هیلال خوای گەورە دەرووی خێری لێ کردیتەوەو رزگاری کردی لەو بەڵایە). هیلال وتی: منیش بە هیوای ئەوەبوم کە پەروەردگارم دەرووی خێرم لێ بکاتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردی بەدوای ژنەکەی هیلالدا، ئەوانیش هات، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه ئایەتەکانی خوێندەوە بۆیان و ئامۆژگاری کردن و یادی خستنەوە و پێی ڕاگەیاندن کە سزاو تۆڵەی قیامەت سەخت ترە لە سزاو تۆڵەی

دونیا، هیلال وتی: سوێند بە (الله) راست دەکەم بەو شێوەیە بوو کە وتم، ژنەکەی وتی: بەڕاستی هیلال درۆدەکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (مولاعەنە بکەن لە نێوانیاندا). بەهیلال وترا: شایەتی بدە، هیلال چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە لە راستگۆیانە، پێنجەم جار کاتێ کە ویستی شایەتی بدات بەهیلال وترا: ئەی هیلال لە خوای گەورە بترسە چونکە سزاو تۆڵەی دونیا ئاسان ترە لە سزاو تۆڵەی سەختی قیامەت، ئەم جارە ئەگەر راست نەکەیت سزاو تۆڵەی قیامەتت بۆ پێویست دەبێت، هیلال وتی: سوێند بە (الله) خوای گەورە سزای سەختم نادات لە قیامەتدا وەك چۆن لەم دونیادا توشی سزا نابم و لەسەر ئەوە داری حەدم لێ نادرێت، لەپاشدا بە ژنەکەی هیلال وترا: شایەتی بدە، چوار جار شایەتی داو سوێندی خوارد بە خوای گەورە کە لە راستگۆیانە، پێنجەم جار کاتێ کە ویستی شایەتی بدات پێی وترا: لە خوای گەورە بترسە چونکە سزاو تۆڵەی دونیا ئاسان ترە لە سزاو تۆڵەی سەختی قیامەت، ئەم جارە ئەگەر راست نەکەیت سزاو تۆڵەی قیامەتت بۆ پێویست دەبێت، هاتەدواوەو کەمێ وەستا. لەپاشدا وتی: من هەرگیز تیرەی خۆم سەرشۆڕ ناکەم، شایەتی پێنجەم جاریش دا، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێکی جیاکردنەوە، بڕیاری دا: کە کەس منداڵەکە بە ناوی هیلالەوە بانگ نەکات و کەسیش پێی نەڵێ منداڵی زینا، وە کەسیش ژنەکەی هیلال بە زینا تاوانبار نەکات، ئەو کەسەش کاری لەو شێوە بکات و ئەوە بڵێ ئەوە شەلاقەی لێ دەدرێت، هەروەها بڕیاری دا کە هیلالماڵی بۆ دابین نەکات و خەرجیشی نەکێشێ چونکە تەڵاقی نەداوە و مێردەکەشی نەمردوە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەگەر هاتوو منداڵەکەی سورکەڵەی چاوشین بوو سمتی بچوك و لاواز بوو پشتی بەرەو کۆمی بوو قاچی باریك بوو ئەوە لە هیلالە، بەڵام ئەگەر ئەسمەر بوو قژی بژ بوو ئەندامەکانی جەستەی گەورە بوون قاچی ئەستور بوو سمتی شۆڕ بوو ئەوە هی ئەو کەسەیە تاوانبار کراوە بەوەی کە زینای لەگەڵ ژنەکەی هیلال کردوە. کاتێ کە منداڵەکەی هێنا ئەسمەر بوو قژی بژ بوو ئەندامەکانی جەستەی گەورە بوون قاچی ئەستور بوو سمتی

شۆڕ بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر لەبەر شایەتیدان نەبوایە ئەوە من لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا شتێکی ترم دەبوو).

**٢٢٥٧ - (صحيح) عن ابن عمر قال: رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم للمتلاعنين: (حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَالِي. قَالَ: (لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهُوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَلِكَ أَبْعَدُ لَكَ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو ژن و مێردەی کە نەفرینیان لەیەکتر کرد فەرمووی: (حسابتان لەسەر خوای گەورەیەو، یەکێکتان درۆ دەکات، هیچ ڕێگایەکیش نیە بۆ گەڕاندنەوەی بۆلات). پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەی ماڵەکەم واتە ئەو ماردییەی کە داومە پێی نامکەوێتەوە، فەرمووی: (ماڵت ناکەوێ، چونکە ئەگەر قسەکەت ڕاست بێ ئەوە ماڵەکەی دەکەوێ و ئەو مارەبییەی داوتە پێی دەبێ بەهی خۆی نەجیاتی ئەوەی کە بۆت حەڵاڵ بووەو کاری سەرجێیت لەگەڵ کردوە، ئەگەر درۆشت کردوەو بوختانت بۆ کردوە ئەوە خراپتر).

**٢٢٥٨ - (صحيح) عن سعيد بن جبير قال: قلت لابن عمر رضي الله عنهما: رَجُلٌ قَذَفَ امْرَأَتَهُ. قَالَ: فَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ أَخَوَىْ بَنِى الْعَجْلاَنِ، وَقَالَ: (اللَّهُ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ، فَهَلْ مِنْكُمَا تَائِبٌ؟). يُرَدِّدُهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَأَبَيَا فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا.**

واتە: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بە ئیبنو عومەرم رەزای خوایان لێ بێ وت: ئەگەر پیاوێ بوختان بکات بۆ ژنەکەی ئایا جیادەکرێنەوە لەیەکتر؟ وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عوەمیر و ژنەکەی لەیەکتر جیاکردەوە. فەرمووی: (خوا دەزانێ کە یەکێکتان درۆ دەکات، ئایا یەکێ لە ئێوە پەشیمان نابێتەوە؟). سێ جار ئەمەی فەرموو بە گوێیان نەکردو کەسیان پەشیمان نەبونەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جیای کردنەوە لەیەکتر.

**٢٢٥٩ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَانْتَفَى مِنْ وَلَدِهَا، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الَّذِي تَفَرَّدَ بِهِ مَالِكٌ قَوْلُهُ: (وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالْمَرْأَةِ). وَقَالَ يُونُسُ: عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ، فِي حَدِيثِ اللِّعَانِ: وَأَنْكَرَ حَمْلَهَا، فَكَانَ ابْنُهَا يُدْعَى إِلَيْهَا.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) پیاوێ ژنەکەی بە زیناکار دایە قەڵەم و نەفرینی لێ کردو منداڵەکەی بەهی خۆی دانەنا، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جیای کردنەوە لەیەکتر و منداڵەکەی دا بە ئافرەتەکەو رەچەڵەکی دایە پاڵ ئافرەتەکە. ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی کە مالیك تاك بۆتەوە تێیدا ئەمەیە کە: (منداڵەکەی دا بە ئافرەتەکە). یونوس لە زوهریەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، سەبارەت بە فەرمودەی نەفرینەکە دەڵێ: پیاوەکە ئینکاری سکەکەی کرد، منداڵەکەش بەناوی دایکیەوە بانگ دەکرا.

# باسی ئەگەر کەسیٚ گومانی هەبوو لە منداڵەکەی.

# ٢٨ - باب إِذَا شَكَّ فِي الْوَلَدِ.

٢٢٦٠ - (صحيح) عن أبي هريرة، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي جَاءَتْ بِوَلَدٍ أَسْوَدَ، فَقَالَ: (هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (مَا أَلْوَانُهَا؟). قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: (فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ). قَالَ: إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا. قَالَ: (فَأَنَّى تُرَاهُ). قَالَ: عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ. قَالَ: (وَهَذَا عَسَى أَنْ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێك لە تیرەی فەزارە گومانی هەبوو لە منداڵەکەی - چونکە خۆیان سپی بوون و منداڵەکە رەش بوو - بۆیە هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتی: ژنەکەم منداڵێکی رەشی بووە، فەرمووی: ئایا تۆ وشترت هەیە؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (رەنگیان چۆنە؟). وتی: سورن، فەرمووی: (رەشتاڵەیان تێدایە؟). وتی: بەڵێ رەشتاڵەشیان تێدایە، فەرمووی: (ئەوە لەکوێوە هێناویەتی؟). وتی: رەنگە لە ئەسڵدا رەگەزیان لەو رەنگە بوبێت، فەرمووی: ئەم منداڵەیش رەنگە بچێتەوە سەر ئەسڵێکی – دەی کورەکەی تۆیش هەروەها - ).

٢٢٦١ - (صحيح) عن الزهري، بِإِسْنَادِهِ، وَمَعْنَاهُ، قَالَ: وَهُوَ حِينَئِذٍ يُعَرِّضُ بِأَنْ يَنْفِيَهُ.

واتە: لە زوهریەوە بە هەمان مانا فەرموودەی پێشو هاتوە، مەعمەر راوی فەرموودەکە وتی: پیاوە فەزاریەکە وەك بڵێی گومانی هەبێت.

٢٢٦٢ - (صحيح) عن أبي هريرة، أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ وَإِنِّي أُنْكِرُهُ، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: ژنەکەم منداڵێکی رەشی بووە، جا منیش ئینکاری لێ دەکەم و بە منداڵی خۆمی نازانم... ، جا یونوس راوی فەرموودەکە فەرموودەکەی گێڕایەوە: بە هەمان مانا وەك فەرموودەی پێشو.

## باسی باوکێ نکولی بکات لە منداڵەکەی لەکاتێکدا دەزانێ کە هی خۆیەتی.

## ٢٩ - باب التَّغْلِيظِ فِي الانْتِفَاءِ.

٢٢٦٣ - (ضعيف) عن أبي هريرة، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ حِينَ نَزَلَتْ آيَةُ الْمُتَلاَعِنَيْنِ: (أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَدْخَلَتْ عَلَى قَوْمٍ مَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ فَلَيْسَتْ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ وَلَنْ يُدْخِلَهَا اللَّهُ جَنَّتَهُ، وَأَيُّمَا رَجُلٍ جَحَدَ وَلَدَهُ وَهُوَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ احْتَجَبَ اللَّهُ مِنْهُ وَفَضَحَهُ عَلَى رُءُوسِ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو (صلی الله علیه وسلم) لەکاتێکدا کە ئایەتی مولاعەنە دابەزی دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێك زۆڵێك بخاتەوەو بیکات بە منداڵی هۆزێکی تر –بڵێت ئەمە هی مێردەکەمە– ئەوە ئەو ژنە فرێ بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ و خوای گەورە نایخاتە بەهەشتەکەیەوە، وە هەر پیاوێك نکوڵی بکات لە منداڵی خۆی – منداڵەکە بۆ ئەو بڕوانێت و چاوەڕێی سۆزی ئەو بکات – لە قیامەتدا خوای گەورە پەردە دەخاتە نێوان ئەو و خۆیەوەو نایبینێت وە ریسوای دەکات و ئابڕوی دەبات لەلای هەموو مرۆڤەکان هەر لە یەکەمینەوە هەتا دواهەمین).

## باسی سەبارەت بە منداڵی زینا کە هی کێ یەو هی کێ نیە.

## ٣٠ – باب فِي ادِّعَاءِ وَلَدِ الزِّنَا.

**٢٢٦٤ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: قال رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم: (لاَ مُسَاعَاةَ فِي الإِسْلاَمِ، مَنْ سَاعَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَقَدْ لَحِقَ بِعَصَبَتِهِ، وَمَنِ ادَّعَى وَلَدًا مِنْ غَيْرِ رِشْدَةٍ فَلاَ يَرِثُ وَلاَ يُورَثُ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (مُسَاعَاةَ) لە ئیسلامدا قەدەغەیە (مُسَاعَاةَ) واتە: زینا ئەمەش تایبەتە بە کەنیزەکەوە، چونکە کەنیزەك ئەو کارەیان دەکرد بۆ ئەوەی باجی گەورەکەی بداتەوە، بێگومان لەسەردەمی نەفامی(جاهلی)دا ئەگەر کەنیزەکێ باجی گەورەکەی لەلا بوایە ئەوە گەورەکەی دەینارد بۆ ئەوەی داوێن پیسی بکات لە داهاتەکەی

باجەکەی ئەو بداتەوە، بێگومان ئەو کەنیزانەش لەسەر ئەو کارە ناچار دەکران، جا ئیسلام ئەو کارەی قەدەغەکرد، ئەو جۆرە رەچەڵەکانە کە لەسەردەمی نەفامی(جاهلی)دا هەبوون ئیسلام دانیان پێدا نانێت مەگەر ئەوەی کە رابورد ئەوە وەك خۆی دەیهێڵرێتەوە،،لەگەڵ ئەوەشدا کە مارەکردنی سەردەمی نەفامی هەندێکی رەوا بوو هەندێکی تریشی نارەوا. لەدوایدا ئیسلام هەموو مارەکردنێکی غەیرە شەرعی قەدەغەکرد، لەسەردەمی ئیسلامدا ئەوەی لافی ئەوە لێ بدات کە منداڵێکی غەیرە شەرعی هی خۆیەتی ئەوە ئەو منداڵە میرات ناگرێت لە باوکەکەی و، باوکەکەشی میرات لەو ناگرێت.

**٢٢٦٥ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: قال: إنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى أَنَّ كُلَّ مُسْتَلْحَقٍ اسْتُلْحِقَ بَعْدَ أَبِيهِ الَّذِي يُدْعَى لَهُ ادَّعَاهُ وَرَثَتُهُ، فَقَضَى أَنَّ كُلَّ مَنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ يَمْلِكُهَا يَوْمَ أَصَابَهَا فَقَدْ لَحِقَ بِمَنِ اسْتَلْحَقَهُ، وَلَيْسَ لَهُ مِمَّا قُسِمَ قَبْلَهُ مِنَ الْمِيرَاثِ شَيْءٌ، وَمَا أَدْرَكَ مِنْ مِيرَاثٍ لَمْ يُقْسَمْ فَلَهُ نَصِيبُهُ وَلاَ يُلْحَقُ، إِذَا كَانَ أَبُوهُ الَّذِي يُدْعَى لَهُ أَنْكَرَهُ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَمَةٍ لَمْ يَمْلِكْهَا أَوْ مِنْ حُرَّةٍ عَاهَرَ بِهَا فَإِنَّهُ لاَ يُلْحَقُ بِهِ وَلاَ يَرِثُ، وَإِنْ كَانَ الَّذِي يُدْعَى لَهُ هُوَ ادَّعَاهُ فَهُوَ وَلَدُ زِنْيَةٍ مِنْ حُرَّةٍ كَانَ أَوْ أَمَةٍ.**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ویستی بڕیاربدات، واتە ئەگەر منداڵەکە لەو کەنیزەکە بوو کە باوکیان چۆتە لای ئەوە دەگونجێ لە باوکیان بێ، ئەوە براکان پێیان وایە لە خۆیانەو، منداڵی کەنیزەکەکەی باوکیانە، ئەوە دەبێتە برایان، ئەمە ئەگەر باوکیان نکوڵی لێ نەکردبێت، ئەو کاتە رەچەڵەکی دەدرێتە پاڵ باوکیان و، دەبێتە برایان، بەڵام ئەو

ـێ تەی کە لەپێش ئەودا دابەشکراوە ئەوە بەشی ئەوی تێدا نیە، بەڵکو لەو میراتە بەشی ـ:کەوێت کە دابەش نەکراوە، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە سەلماندنی رەچەڵەك نابێـت مەگـەر ـ دەرانەپاڵ، بەڵام لەپێش ئەوەدا بەشی ناکەوێت چـونکە رەچـەڵەکی نەسـەلمێنراوە، ئـەو ـێ تەی کە لەپێش درانەپاڵ دا دابەشکراوە ئەوە بەشی ئەوی تێدا نیە، بەڵام ئـەوەی کـە ـوەتەوە لەماڵی خاوەن میراتەکـەو دابـەش نـەکراوە لـەوە بەشـی دەکـەوێت، ئەمـەش ـەبەرئەوەیە کە یەکێکە لە منداڵەکان، هەروەها پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) ـیـستی بڕیاربدات، واتە: ئەگەر منداڵەکە درایەپاڵ باوکیان و بـە بـرای خۆیانیـان زانـی، ـەڵام باوکیان نکولی لێ کرد ئەوە ئەو درانەپاڵە دروست نیە مادەم باوکیـان نکـولی لـێ کردوە، ئەگەر چـوە لای کـەنیزەکێکی جگـە لـەو، یـان شـەروالْ پیسـی بکـات لەگـەڵ ـ فرەتێکی ئازاددا، ئەوە منداڵەکە نادرێتە پاڵ ئەو هەروەها میراتیش لـە یـەکتر نـاگرن، چونکە منداڵی ئەو نیە، بەڵکو منداڵی زینایە، منداڵە زۆڵەکە و ئەو پیاوەی کـە زینـای کردوە میرات لە یەکتر ناگرن، ئەو منداڵەی کە دەدرێتە پاڵی خۆشی بڵێ هی منـە زۆڵـە ـیتر نە ئافرەتێکی ئازاد بێ یان لە کەنیزەکێ بێ جیاوازی نیە.

**٢٢٦٦ - (صحيح) عن محمد بن راشد، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، زَادَ: وَهُوَ وَلَدُ زِنًا لأَهْلِ أُمِّهِ مَنْ كَانُوا، حُرَّةً أَوْ أَمَةً، وَذَلِكَ فِيمَا اسْتُلْحِقَ فِـي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، فَمَا اقْتُسِمَ مِنْ مَالٍ قَبْلَ الإِسْلاَمِ فَقَدْ مَضَى.**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی راشیدەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانـا هـاتوە، بـەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، لەسەرەتای ئیسلامەوە ئەو منداڵـەی کـە زۆڵ بوایـە دەدرایـە پـاڵ ـ یکی، ئیتر لە ئافرەتی ئازاد بوایە یان کـەنیزەك، ئـەو ماڵـەی کـە لـەپێش ئیسـلامدا ـ بەشکرا ئەوە رۆشت.

# باسی سەبارەت بە شێوەناس.

## ٣١ – باب فِي الْقَافَةِ.

٢٢٦٧ - (صحيح) عن عائشة قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - قَالَ مُسَدَّدٌ وَابْنُ السَّرْحِ: يَوْمًا مَسْرُورًا، وَقَالَ عُثْمَانُ: يُعْرَفُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ - فَقَالَ: (أَيْ عَائِشَةُ أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ رَأَى زَيْدًا وَأُسَامَةَ قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا بِقَطِيفَةٍ وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ؟!). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ أُسَامَةُ أَسْوَدَ، وَكَانَ زَيْدٌ أَبْيَضَ.

واتە: عائیشە دەڵێت: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتەژوورەکەم بۆلام. موسەددەد و ئیبنو سەرح لە ریوایەتەکەیاندا وتیان: عائیشە وتی: ڕۆژێ هاتەژوورەکەم بۆلام زۆر دڵخۆش بوو، (عُثْمَانُ) لە ریوایەتەکەیدا وتی: لە خۆشیاندا روخساری دەدرەوشایەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی عائیشە! دەزانیت موجەززیزی مودلەجی — کە شێوەناسێکی بەناوبانگ بوو هات بۆلام — لەوکاتەدا ئوسامەو باوکی لەژێر پارچەیەك قەدیفەدا بوون سەریان داپۆشرابو بەڵام قاچیان بەدەرەوە بوو، موجەززیز لەسەر ئەو حاڵەتە چاوی پێیان کەوت وتی: ئەم قاچانە لەیەکترن واتە خاوەنی ئەم قاچانە باوك و کوڕن). ئەبو داود دەڵێت: ئوسامە رەش بوو، بەڵام زەید سپی بوو واتە باوکی.

٢٢٦٨ - (صحيح) عن ابن شهاب، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، قَالَ: قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ مَسْرُورًا تَبْرُقُ أَسَارِيرُ وَجْهِهِ. «قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ

أُسَامَةُ أَسْوَدَ، وَكَانَ زَيْدٌ أَبْيَضَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَأَسَارِيرُ وَجْهِهِ. لَمْ يَحْفَظْهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَسَارِيرُ وَجْهِهِ هُوَ تَدْلِيسٌ مِنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ لَمْ يَسْمَعْهُ مِنَ الزُّهْرِيِّ إِنَّمَا سَمِعَ الأَسَارِيرَ مِنْ غَيْرِ الزُّهْرِيِّ. قَالَ: وَالأَسَارِيرُ مِنْ حَدِيثِ اللَّيْثِ وَغَيْرِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَسَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ صَالِحٍ يَقُولُ: كَانَ أُسَامَةُ أَسْوَدَ شَدِيدَ السَّوَادِ مِثْلَ الْقَارِ وَكَانَ زَيْدٌ أَبْيَضَ مِثْلَ الْقُطْنِ﴾.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، کە وتویەتی: عائیشە وتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتەژورەکەم بۆلام زۆر دڵخۆش بوو لە خۆشیاندا روخساری دەدرەوشایەوە، ئەبو داود دەڵێت: ئوسامە رەش بوو بەڵام بۆوکی واتە زەید سپی بوو. ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو عویەینە (أَسَارِيرُ وَجْهِهِ) لەبەر نەیکردوە، ئەبو داود دەڵێت: خەتەکانی روخساری لە ئیبنو عویەینەوە (تدليس)ە چونکە لە زوهری نەبیستوە، بەڵکو (أَسَارِيرُ وَجْهِهِ) لەکەسانی غەیری زوهریەوە بیستوە، (أَسَارِيرُ وجْهِهِ) لە فەرمودەکەی (لیث) و غەیری ئەوە، ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە صاڵحی کوڕی ئەحمەد بوو دەیوت: ئوسامە ئەوەندە رەش بوو وەکو قیر، زەیدیش ئەوەندە سپی بوو وەکو لۆکە.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: ئەگەر ناكۆكی هەبوو لەسەر منداڵێ كە هی كێ یە ئەوە كار بە تیرو پشك (قورعە) دەكرێ.

## ٣٢ – باب مَنْ قَالَ: بِالْقُرْعَةِ إِذَا تَنَازَعُوا فِي الْوَلَدِ.

٢٢٦٩ - (صحيح) عن زيد بن أرقم قال: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَمَنِ فَقَالَ: إِنَّ ثَلاَثَةَ نَفَرٍ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ أَتَوْا عَلِيًّا يَخْتَصِمُونَ إِلَيْهِ فِي وَلَدٍ، وَقَدْ وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ لاِثْنَيْنِ مِنْهُمَا: طِيبَا بِالْوَلَدِ لِهَذَا، فَغَلَيَا، ثُمَّ قَالَ لاِثْنَيْنِ: طِيبَا بِالْوَلَدِ لِهَذَا، فَغَلَبَا، ثُمَّ قَالَ لاِثْنَيْنِ: طِيبَا بِالْوَلَدِ لِهَذَا، فَغَلَبَا، فَقَالَ: أَنْتُمْ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ، إِنِّي مُقْرِعٌ بَيْنَكُمْ، فَمَنْ قُرِعَ فَلَهُ الْوَلَدُ، وَعَلَيْهِ لِصَاحِبَيْهِ ثُلُثَا الدِّيَةِ، فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ، فَجَعَلَهُ لِمَنْ قُرِعَ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ أَضْرَاسُهُ. أَوْ: نَوَاجِذُهُ.

واتە: لە زەیدی كوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خواد (صلى الله عليه وسلم) دانیسشتبوم، پیاوێ لە یەمەنەوە هات وتی: سێ كەس لەخەڵكی یەمەن لەسەر منداڵێ ئاژاوەیان بوو هاتنە لای پێشەوا عەلی - كوڕی (أَبِي طَالِب) - ڕەزای خوای لێ بێ، كە هەرسێكیان لەماوەی یەك پاكێتی دا چوبونە لای ژنێ، دوو دوو

ـیی وتن: کێتان بە خۆشی خۆتان ئەم منداڵـە هەڵدەگرنـەوە بـۆ خۆتـان، ئـەوانیش هـەر حەمووییان هەڵچون و نەیاندەویست، جا پێشەوا عەلی وتی: هی هەرسێکتانەو ئاژاوەتانـە ـەـەری. بۆیە منیش تیرو پشك دەکەم لـە نێوانتانـدا، بـەری هـەرکامتان کـەوت ئـەوە ــ ـەکە بۆ ئەو دەبێت، دوو سێیەکە (دیە)خوێنی دانا لەسـەری کـە هـەر سـێیەکێکی ـ ت بە هاوڕێیەکی، جا تیرو پشکی کـرد لـە نێوانیانـدا، منداڵەکـەی کـرد بەمنـداڵی ـەو ـن کە تیرو پشکەکەی بەرکەوت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە پێکەنی ـەت ددانەکانی بەشی پێشەوەی دەرکەوتن.

**٢٢٧٠ - (صحيح) عن زيد بن أرقم قال: أُتِيَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِثَلاَثَةٍ - وَهُوَ بِالْيَمَنِ - وَقَعُوا عَلَى امْرَأَةٍ فِي طُهْرٍ وَاحِدٍ، فَسَأَلَ اثْنَيْنِ: أَتُقِرَّانِ لِهَذَا بِالْوَلَدِ؟ قَالاَ: لاَ، حَتَّى سَأَلَهُمْ جَمِيعًا، فَجَعَلَ كُلَّمَا سَأَلَ اثْنَيْنِ، قَالاَ: لاَ. فَأَقْرَعَ بَيْنَهُمْ ،فَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِالَّذِي صَارَتْ عَلَيْهِ الْقُرْعَةُ، وَجَعَلَ عَلَيْهِ ثُلُثَيِ الدِّيَةِ، قَالَ: فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ.**

ـ تە: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەلای پێغەمبەری خـوادا ـی الله عليه وسلم) دانیشتبوم، پیاوێ لە یەمەنـەوە هـات وتـی: سـێ کـەس لەخـەڵکی یەمەن لەسـەر منداڵێ ئاژاوەیان بوو هاتنە لای پێشەوا عـەلی - کـوڕی (أبـی طَالـب) - ـ ـی خوای لێ بێ، کە هەرسێکیان لەماوەی یەك پاکێتی دا چوبونە لای ژنـێ، دوو دوو ـیی پرسین: ئایا دانی پێدا دەنێن کە منداڵەکە هی ئەوی ترتانە یان نا، جا لەهـەموویانی پرسـی و هەموویان وتیان: نەخێر، تیرو پشکی کرد لە نێوانیاندا، منداڵەکەی کردبەمنداڵی

ئەوەیانەوە کە تیرو پشکەکەی بەرکەوت، دوو سێیەکە خوێنی دانا لەسەری، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە پێکەنی هەتا ددانەکانی بەشی پێشەوەی دەرکەوتن.

**٢٢٧١ - (ضعيف) عن الخليل – أو ابن الخليل – قال: أُتِيَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي امْرَأَةٍ وَلَدَتْ مِنْ ثَلاَثَة، نَحْوَهُ، لَمْ يَذْكُرِ الْيَمَنَ، وَلاَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلاَ قَوْلَهُ: طِيبَا بِالْوَلَدِ.**

واتە: لە خەلیلەوە –یان لە ئیبنو خەلیلەوە - دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ژنێ هاتە لای پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ڕەزای خوای لێ بێ، کە منداڵێکی لە سێ کەس بوو بوو، راوی بە هەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە، بەڵام باسی یەمەنی نەکرد، وە باسی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) نەکرد، هەروەها باسی (طِيبَا بِالْوَلَدِ.)یشی نەکرد.

## باسی سەبارەت بە جۆرەکانی مارەکردن سەردەمی نەفامی.

## ٣٣ – باب فِي وُجُوهِ النِّكَاحِ الَّتِي كَانَ يَتَنَاكَحُ بِهَا أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ.

**٢٢٧٢ - (صحيح) عن عروة بن الزبير: أن عائشة رضي الله عنها زوج النبي صلى الله عليه وسلم أخبرته: أَنَّ النِّكَاحَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَنْحَاءٍ: فَنِكَاحٌ مِنْهَا نِكَاحُ النَّاسِ**

الْيَوْمَ، يَخْطُبُ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ وَلِيَّتَهُ، فَيُصْدِقُهَا ثُمَّ يَنْكِحُهَا، وَنِكَاحٌ آخَرُ: كَانَ الرَّجُلُ يَقُولُ لاِمْرَأَتِهِ إِذَا طَهُرَتْ مِنْ طَمْثِهَا: أَرْسِلِي إِلَى فُلاَنٍ فَاسْتَبْضِعِي مِنْهُ، وَيَعْتَزِلُهَا زَوْجُهَا، وَلاَ يَمَسُّهَا أَبَدًا حَتَّى يَتَبَيَّنَ حَمْلُهَا مِنْ ذَلِكَ الرَّجُلِ الَّذِي تَسْتَبْضِعُ مِنْهُ، فَإِذَا تَبَيَّنَ حَمْلُهَا أَصَابَهَا زَوْجُهَا إِنْ أَحَبَّ، وَإِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ رَغْبَةً فِي نَجَابَةِ الْوَلَدِ، فَكَانَ هَذَا النِّكَاحُ يُسَمَّى: نِكَاحَ الاِسْتِبْضَاعِ، وَنِكَاحٌ آخَرُ: يَجْتَمِعُ الرَّهْطُ دُونَ الْعَشَرَةِ، فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ كُلُّهُمْ يُصِيبُهَا فَإِذَا حَمَلَتْ وَوَضَعَتْ وَمَرَّ لَيَالٍ بَعْدَ أَنْ تَضَعَ حَمْلَهَا أَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ فَلَمْ يَسْتَطِعْ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْ يَمْتَنِعَ، حَتَّى يَجْتَمِعُوا عِنْدَهَا: فَتَقُولُ لَهُمْ: قَدْ عَرَفْتُمُ الَّذِي كَانَ مِنْ أَمْرِكُمْ، وَقَدْ وَلَدْتُ، وَهُوَ ابْنُكَ يَا فُلاَنُ، فَتُسَمِّي مَنْ أَحَبَّتْ مِنْهُمْ بِاسْمِهِ فَيُلْحَقُ بِهِ وَلَدُهَا، وَنِكَاحٌ رَابِعٌ: يَجْتَمِعُ النَّاسُ الْكَثِيرُ فَيَدْخُلُونَ عَلَى الْمَرْأَةِ لاَ تَمْتَنِعُ مِمَّنْ جَاءَهَا وَهُنَّ الْبَغَايَا، كُنَّ يَنْصِبْنَ عَلَى أَبْوَابِهِنَّ رَايَاتٍ يَكُنَّ عَلَمًا لِمَنْ أَرَادَهُنَّ دَخَلَ عَلَيْهِنَّ، فَإِذَا حَمَلَتْ فَوَضَعَتْ حَمْلَهَا جُمِعُوا لَهَا، وَدَعَوْا لَهُمُ الْقَافَةَ، ثُمَّ أَلْحَقُوا وَلَدَهَا بِالَّذِي يَرَوْنَ، فَالْتَاطَهُ، وَدُعِيَ ابْنَهُ لاَ يَمْتَنِعُ مِنْ ذَلِكَ، فَلَمَّا بَعَثَ اللَّهُ مُحَمَّدًا صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَدَمَ نِكَاحَ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ كُلَّهُ، إلاَّ نِكَاحَ أَهْلِ الإِسْلاَمِ الْيَوْمَ.

واتە: لە عوروەی كوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، كەعائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی ڕاگەیاندوە وتویەتی: بەڕاستی مارەكردن لەسەردەمی نەفامی(جاهلی)دا چوار شێوەی هەبوو: یەك لەوانە ئەم مارەكردنەی ئێستایە كە لەنێو خەڵكدا باوە: پیاوێ داخوازی كچی یەكێكی دەكردو ئەویش دەیدایە لەپاشدا لێی مارەدەكرا.

جۆرێكی تر وابوو: كە مێردێك بە ژنەكەی خۆی دەوت كاتێ كە لە بێنوێژی پاك دەبۆوە: بچۆرە لای فلان كەس و سەرجێی لەگەڵ بكە، ئەمەش لەبەرئەوە بەڵكو منداڵێكی نەجیب زادەی ببێت، ئیتر مێردەكەی هەرگیز نەدەچوە لای هەتا سكی پڕ دەبوو دەردەكەوت كە لەو كەسەیە كە سەرجێی لەگەڵ كردووە، ئەگەر پێی خۆش بوایە ئەو كاتە دەچووە لای، ئەم كارەش بۆ ئەوە بوو كە منداڵەكە نەجیب زادە بێت، ئەمەش مارەیی (الاِسْتِبْضَاع)ی پێ دەوترا.

جۆرێكی تر: چەند پیاوێك كە ژمارەیان لە یەك كەسەوە هەتا نۆ كەس دەبوو، یەك لەدوای یەك سەرجێییان لەگەڵ ئافرەتێك دەكرد، هەتا سكی پڕ دەبوو، لەپاشدا منداڵەكەی دەبوو، چەند شەوێكی بەسەردا دەڕۆیشت ئافرەتەكە دەینارد بەدوای پیاوەكاندا، هیچ كامیان بۆی نەبوو نەیەت، یان بەرهەڵستی بكات، هەموویان لەلای ئافرەتەكە كۆدەبونەوە، ئینجا پێی دەوتن: بێگومان دەزانن كە ئەم منداڵە لەدایك بووە لە ئێوەیە، ئەی فلان كەس ئەمە لە تۆیە، ناوی یەكێكیانی دەبرد و منداڵەكەی دەدایە، ئیتر دەبوە منداڵی ئەو كەسە، ئەویش بۆی نەبوو حەشای لێ بكات یان وەری نەگرێت.

جۆری چوارەم: كۆمەڵە پیاوێ كۆدەبوونەوەو دەچوونە لای ئافرەتێك و سەرجێیان لەگەڵ دەكرد، ئافرەتەكە بەرهەڵستی كەسیانی نەدەكرد، ئەم جۆرە ئافرەتانەش داوێن پیسەكان بوون، ئاڵایەكیان لەسەر ماڵەكانیان دەچەقاند هەتا بناسرێنەوە، هەر پیاوێ ئارەزوی بوایە

دەچوە لایان، کاتێ کە سکی پڕ دەبوو، لەپاشدا منداڵەکەی دەبوو، هەموویان لەلای کۆدەبونەوە، شێوەناسیان بانگ دەکرد، بەڕواڵەت لەهەر کامیان بچوایە دەیاندا بەو کەسە، ئەویش بۆی نەبوو حەشای لێ بکات یان وەری نەگرێت، جا وەری دەگرت و دەیکردە منداڵی خۆی.

کاتێ کە خوای گەورە موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) رەوانەکرد هەموو ئەو مارەکردنانەی سەردەمی نەفامی(جاهلی) پوچەڵ کردەوە، تەنیا ئەم مارەکردنەی ئیسلامی ئەمڕۆ نەبێت.

**٢٢٧٣ - (صحيح) عن عائشة: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ، فَقَالَ سَعْدٌ: أَوْصَانِي أَخِي عُتْبَةُ إِذَا قَدِمْتُ مَكَّةَ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ فَأَقْبِضَهُ فَإِنَّهُ ابْنُهُ. وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي ابْنُ أَمَةِ أَبِي وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي. فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: (الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي عَنْهُ يَا سَوْدَةُ). زَادَ مُسَدَّدٌ فِي حَدِيثِهِ، وَقَالَ: (هُوَ أَخُوكَ يَا عَبْدُ).**

واتە: عائیشە دەڵێت: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عەبدی کوڕی زەمعە لەسەر منداڵێك بوو بە هەرایان، هەردوکیان چونە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، سەعد وتی: کاتی خۆی عوتبەی برام منی راسپارد کاتێ کە چوم بۆ مەککە سەرنجی کوڕی کەنیزەکەکەی زەمعە بدەم لێی بسێنمەوە چونکە کوڕی ئەوە، عەبدی کوڕی زەمعەش وتی: ئەمە برای منەو لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرنجی منداڵەکەی دا بینی لە عوتبە دەچێ، فەرمووی: (منداڵ هی خاوەن

نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ شەرواڵ پیس دەمێنێتەوە، ئەی سەودە خۆتی لێ کەنار بدە ).
واتە بە مەحرەمی مەزانە، موسەددەد لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد وتی:
پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەمە برای تۆیە ئەی عەبد).

**٢٢٧٤ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: قال:**
**قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فُلاَنًا ابْنِى عَاهَرْتُ بِأُمِّهِ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ دِعْوَةَ فِى الإِسْلاَمِ، ذَهَبَ أَمْرُ الْجَاهِلِيَّةِ، الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێك هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فلان کەس کوڕی منە. لەسەردەمی نەفامی دا زینام لەگەڵ دایکی کردوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لە ئیسلامدا ئەم جۆرە داخوازییە نیە، داب و نەریتی سەردەمی نەفامی بەسەرچو، منداڵ هی خاوەن نوێنە، منداڵ ئەگەر باوکی شەرعی نەبوو هی دایکە، کەسی شەرواڵ پیسیش هەناسە ساردە).

## باسی منداڵ هی نوێنە.

## ٣٤ - باب الْوَلَدِ لِلْفِرَاشِ.

٢٢٧٥ - (ضعيف) عن رباح قال: زَوَّجَنِي أَهْلِي أَمَةً لَهُمْ رُومِيَّةً فَوَقَعْتُ عَلَيْهَا فَوَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ مِثْلِي فَسَمَّيْتُهُ عَبْدَ اللَّهِ ثُمَّ وَقَعْتُ عَلَيْهَا فَوَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ مِثْلِي، فَسَمَّيْتُهُ عُبَيْدَ اللَّهِ، ثُمَّ طَبَنَ لَهَا غُلاَمٌ لأَهْلِي رُومِيٌّ، يُقَالُ لَهُ: يُوحَنَّهْ، فَرَاطَنَهَا بِلِسَانِهِ، فَوَلَدَتْ غُلاَمًا كَأَنَّهُ وَزَغَةٌ مِنَ الْوَزَغَاتِ، فَقُلْتُ لَهَا: مَا هَذَا؟ فَقَالَتْ: هَذَا لِيُوحَنَّهْ. فَرَفَعْنَا إِلَى عُثْمَانَ، أَحْسِبُهُ قَالَ مَهْدِيٌّ: قَالَ: فَسَأَلَهُمَا فَاعْتَرَفَا، فَقَالَ لَهُمَا: أَتَرْضَيَانِ أَنْ أَقْضِيَ بَيْنَكُمَا بِقَضَاءِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَضَى أَنَّ الْوَلَدَ لِلْفِرَاشِ. وَأَحْسِبُهُ قَالَ: فَجَلَدَهَا وَجَلَدَهُ وَكَانَا مَمْلُوكَيْنِ.

واتە: ڕەباح دەڵێت: خزمەکانم کەنیزەکێکی ڕۆمیان بۆ مارەکردم منیش چومە لای منداڵێکی ڕەشی وەك خۆمی بوو، منیش ناومنا (عبد اللّه)، لەپاشدا چومە لای منداڵێکی ڕەشی تری وەك خۆمی بوو، ئەویشم ناونا (عُبَيْد اللّه)، لەپاشدا غولامێکی ڕۆمی کە پێیان دەوت: (يُوحَنَّهْ) هەڵیخەڵەتاندو توشی خراپەی کرد، دڵی ڕایکێشا بەلای خۆیداو چوە لای، منداڵێکی بوو وەك شەوگەردێ لە شەوگەردەکان، پێم وت: ئەمە چی یە ئەکوێت هێناوە بۆ ڕەنگی لەمن ناچێت؟ وتی: ئەمە لە (يُوحَنَّهْ)ی ڕۆمیە، داوامان

بەرزکردەوە بۆ لای پێشەوا (عُثْمَان) ڕەزای خوای لێ بێ، پێم وایە ڕاوی وتی: مەهدی وتی: لێی پرسین ئەوانیش دانیان پێدا نا کە زینایان لەگەڵ یەك کردوە، پێشەوا (عُثْمَان) ڕەزای خوای لێ بێ پێی وتن: پێتان خۆشە وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە ئەوەها بڕیارتان بۆ بدەم، بۆیە بڕیاریدا کە منداڵ هی خاوەن نوێنە، پێم وایە وتیشی: شەلاقەی لێدان لەکاتێکدا کە هەردووکیان کۆیلە بوون.

## باسی دەربارەی کێ لەپێشترە بە پەروەردەکردنی منداڵ.

## ٣٥ – باب مَنْ أَحَقُّ بِالْوَلَدِ.

**٢٢٧٦ - (حسن) عن عابد الله بن عمرو قال: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنِي هَذَا كَانَ بَطْنِي لَهُ وِعَاءً، وَثَدْيِي لَهُ سِقَاءً وَحِجْرِي لَهُ حِوَاءً، وَإِنَّ أَبَاهُ طَلَّقَنِي وَأَرَادَ أَنْ يَنْتَزِعَهُ مِنِّي، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنْتِ أَحَقُّ بِهِ مَا لَمْ تَنْكِحِي).**

واتە: (عبد الله)ی کوڕی عەمر دەڵێت: ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم کوڕەم بە پێستی سك هەڵگرتوە، بە شیری خۆم گۆشم کردووە و لەباوەشمدا گەورەم کردوە، بەڵام باوکی تەڵاقی داوم و دەیەوێت لێمی بسەنێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: (تۆ لەپێشتری بۆی هەتا شونەکەیتەوە).

٢٢٧٧ - (صحيح) عن هلال بن أسامة: أن أبا ميمونة سلمى مولى من أهل المدينة رجل صدق قال: بَيْنَمَا أَنَا جَالِسٌ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ فَارِسِيَّةٌ مَعَهَا ابْنٌ لَهَا فَادَّعَيَاهُ وَقَدْ طَلَّقَهَا زَوْجُهَا، فَقَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ - وَرَطَنَتْ لَهُ بِالْفَارِسِيَّةِ - زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اسْتَهِمَا عَلَيْهِ وَرَطَنَ لَهَا بِذَلِكَ فَجَاءَ زَوْجُهَا فَقَالَ: مَنْ يُحَاقُّنِي فِي وَلَدِي، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اللَّهُمَّ إِنِّي لاَ أَقُولُ هَذَا إِلاَّ أَنِّي سَمِعْتُ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَنَا قَاعِدٌ عِنْدَهُ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ زَوْجِي يُرِيدُ أَنْ يَذْهَبَ بِابْنِي وَقَدْ سَقَانِي مِنْ بِئْرِ أَبِي عِنَبَةَ وَقَدْ نَفَعَنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اسْتَهِمَا عَلَيْهِ). فَقَالَ: زَوْجُهَا مَنْ يُحَاقُّنِي فِي وَلَدِي، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذَا أَبُوكَ وَهَذِهِ أُمُّكَ فَخُذْ بِيَدِ أَيِّهِمَا شِئْتَ). فَأَخَذَ بِيَدِ أُمِّهِ فَانْطَلَقَتْ بِهِ.

واتە: لە هیلالی کوڕی ئوسامەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو مەیمونەی سەلمی — کە بەندەی ڕزگارکراوی خەڵکی مەدینە بوو پیاوێکی ڕاستگۆ بوو — وتی: جارێ لەخزمەت ئەبو هورەیرەدا دانیشتبوم ئافرەتێکی فارس هات منداڵێکی خۆی پێ بوو، پیاوەکەی تەڵاقی دا بو هەریەکەیان دەویست منداڵەکە بۆ خۆی بێت، ئافرەتە فارسەکە وتی: ئەی ئەبو هورەیرە! مێردەکەم دەیەوێت منداڵەکەم ببات بۆ خۆی، ئەبو هورەیرە وتی: تیروپشکی لەسەر بکەن، مێردەکەی هات وتی: کێ کێبەرکێم لەگەڵ دەکات لەسەر کوڕی خۆم، ئەبو

هورەیرە وتی: من لە خۆمەوە بڕیار نادەم، جارێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبوم ئافرەتێ هات گوێم لێ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مێردەکەم دەیەوێت کوڕەکەم ببات، لەکاتێکدا کە ئەو لەبیری ئەبو عینەبە ئاوم بۆ دێنێ و بە کەڵکم دێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (تیرو پشکی لەسەر بکەن). مێردەکەی وتی: کێ کێبەرکێم لەگەڵ دەکات لەسەر کوڕی خۆم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەمە باوکتەو ئەوەش دایکتە بە ئارەزووی خۆت دەستی کامیان دەگرێت بیگرە). ئەویش دەستی دایکی گرت، جا دایکەکەی بردی.

**٢٢٧٨ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه، قال: خَرَجَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ إِلَى مَكَّةَ، فَقَدِمَ بِابْنَةِ حَمْزَةَ، فَقَالَ جَعْفَرٌ: أَنَا آخُذُهَا أَنَا أَحَقُّ بِهَا ابْنَةُ عَمِّي وَعِنْدِي خَالَتُهَا وَإِنَّمَا الْخَالَةُ أُمٌّ. فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا ابْنَةُ عَمِّي وَعِنْدِي ابْنَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهِيَ أَحَقُّ بِهَا. فَقَالَ زَيْدٌ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا أَنَا خَرَجْتُ إِلَيْهَا وَسَافَرْتُ وَقَدِمْتُ بِهَا، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ حَدِيثًا قَالَ: (وَأَمَّا الْجَارِيَةُ فَأَقْضِي بِهَا لِجَعْفَرٍ تَكُونُ مَعَ خَالَتِهَا وَإِنَّمَا الْخَالَةُ أُمٌّ).**

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: زەیدی کوڕی (حارثة) بەرەو مەککە دەرچو لەوێ گەیشت بە کچێکی حەمزە، جەعفەر وتی: من دەیگرمە لای خۆم چونکە من لەپێشترم بە سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی کچی مامەو خوشکی دایکی هاوسەرمە. بێگومان خوشکی دایك وەك دایك وایە، پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وتی: من دەیگرمە لای خۆم چونکە من لەپێشترم بە سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی کچی مامەو کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوسەرمە ئەو لەپێشترە بە سەرپەرشتی و

پەروەردەكردنی، زەید وتی: من لەپێشترم بە سەرپەرشتی و پەروەردەكردنی چونكە من دەرچووم بۆی و هاتوم بۆ ئەوەی بیگرمە لای خۆم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوو بەرەو مەدینە، بەسەرهاتەكەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كچەكەی دا بە جەعفەر بۆ ئەوەی لەگەڵ پورەكەیدا بێ و بەخێوی بكات، فەرمووی: (خوشكی دایك لە جێی دایكەو واتە وەك دایك وایە).

**٢٢٧٩ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي ليلى، بهذا الخبر، وليس بتمامه، قال: وَقَضَى بِهَا لِجَعْفَرٍ وَقَالَ: (إِنَّ خَالَتَهَا عِنْدَهُ).**

واتە: لە (عبد الرحمن)ی كوڕی ئەبو لەیلاوە بەسەرهاتی پێشو هاتوە، بەڵام بە تەواوی نا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كچەكەی دا بە جەعفەر: راوی وتی: (چونكە خوشكی دایكی هاوسەری جەعفەر بوو).

**٢٢٨٠ - (صحيح) عن علي، قال: لَمَّا خَرَجْنَا مِنْ مَكَّةَ تَبِعَتْنَا بِنْتُ حَمْزَةَ تُنَادِي يَا عَمِّ يَا عَمِّ، فَتَنَاوَلَهَا عَلِيٌّ فَأَخَذَ بِيَدِهَا وَقَالَ: دُونَكِ بِنْتَ عَمِّكِ، فَحَمَلَتْهَا فَقَصَّ الْخَبَرَ قَالَ: وَقَالَ جَعْفَرٌ: ابْنَةُ عَمِّي وَخَالَتُهَا تَحْتِي. فَقَضَى بِهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِخَالَتِهَا وَقَالَ: (الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ).**

واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: كاتێ كە لە مەككە دەرچوین كچەكەی حەمزە دوامان كەوت بانگی كردین و هاواری كرد ئەی مامە ئەی مامە، پێشەوا عەلی دەستی گرت سواری ولاخەكی كرد و بە (فاطمة)ی هاوسەری وت: بیگرە ئەوە كچی مامەتە — چونكە باوكی واتە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و حەمزە شیری یەكتریان خواردووەو برای شیری یەكتر بوون - (فاطمة)ش كچەكەی هەڵگرت، جا

راوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، وتی: جەعفەر وتی: من دەیگرمە لای خۆم چونکە کچی مامەو خوشکی دایکی هاوسەرمە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کچەکەی دا بە جەعفەر بۆ ئەوەی لەگەڵ پورەکەیدا بێ و بەخێوی بکات، فەرمووی: (خوشکی دایك لە جێی دایکەو واتە وەك دایك وایە).

## باسی ماوە(عدە)ی تەڵاقدراو.

## ٣٦ - باب فِي عِدَّةِ الْمُطَلَّقَةِ.

**٢٢٨١ - (حسن) عن أسماء بنت يزيد بن السكن الأنصارية: أَنَّهَا طُلِّقَتْ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَلَمْ يَكُنْ لِلْمُطَلَّقَةِ عِدَّةٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ حِينَ طُلِّقَتْ أَسْمَاءُ بِالْعِدَّةِ لِلطَّلَاقِ، فَكَانَتْ أَوَّلَ مَنْ أُنْزِلَتْ فِيهَا الْعِدَّةُ لِلْمُطَلَّقَاتِ.**

واتە: ئەسمای کچی یەزیدی سەکەنی ئەنصاری لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) تەڵاق درا، هەتا ئەو کاتەش ماوە(عدە)ی ئافرەتی تەڵاقدراو دیاری نەکرابوو. خوای گەورە لەوبارەوە ئایەتی ناردەخوارەوە، ئەو یەکەم کەس بوو کە تەڵاق درا ئایەت دەربارەی ماوە(عدە)ی ئافرەتی تەڵاقدراو هاتەخوارەوە.

## باسی ماوە(عیدە)ی ئافرەتانی تەڵاقدراو چەند ژمارەیەکی هەیە، بەڵام هەندێکیان ژمارەیان نیەو لەو ماوە دیاریکراوە بەدەرن.

## ٣٧ - باب فِي نَسْخِ مَا اسْتُثْنِيَ بِهِ مِنْ عِدَّةِ الْمُطَلَّقَاتِ.

٢٢٨٢ - (حسن) عن ابن عباس قال: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾. وقَالَ: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ ﴾. فَنُسِخَ مِنْ ذَلِكَ، وَقَالَ: ﴿ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ ﴾. ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ﴾.

واتە: ئیبنو عەباس ئەلی ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾. سورة البقرە: ٢٢٨. واتە: وە ژنە تەڵاقدراوەکان دان بە خۆیاندا دەگرن هەتا ماوەی سێ حەیز.

هەروەها دەڵێت: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ ﴾. سورة الطلاق: ٤. واتە: ئەوانەی کە بێ هیوا دەبن لەکەوتنە حەیزەوە لە ژنانتان، ئەگەر (دەربارەی زانینی عیدەیان) دوو دڵ بوون، ئەوا عیدەیان سێ مانگە.

- هەروەها ئەوانەی کە لەبەر منداڵی هێشتا نەکەوتونەتە حاڵەتی حەیزەوە، ئەوانەش عیددەیان سێ مانگە.

وە دەڵێت: (ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ). سورة الأحزاب: ٤٩. واتە: - کاتێ ئافرەتانی بڕوادارتان مارە کردن — لەپاشدا تەڵاقتاندان پێش ئەوەی کە بچنە لایان، (فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا). سورة الأحزاب: ٤٩. واتە: بێ عیددە بۆیان هەیە شوبکەنەوە، چونکە عیددە بۆ ئەوەیە دەرکەوێ ئاخۆ سکی هەیە یان نا.

## باسی دەربارەی گەڕانەوەی ژنی تەڵاقدراو.

## ٣٨ - باب فِي الْمُرَاجَعَةِ.

**٢٢٨٣ - (صحيح) عن عمر، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا.**

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەفصەی هاوسەری تەڵاقدا، لەپاشدا گێڕایەوە.

## باسی سەبارەت بە خەرجی کێشانی ئافرەتیٚ کە بە یەکجاری تەڵاقی کەوتبیٚ.

## ٣٩ – باب فِي نَفَقَةِ الْمَبْتُوتَةِ.

٢٢٨٤ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ طَلَّقَهَا الْبَتَّةَ وَهُوَ غَائِبٌ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا وَكِيلَهُ بِشَعِيرٍ فَتَسَخَّطَتْهُ فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا لَكِ عَلَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لَهَا: (لَيْسَ لَكِ عَلَيْهِ نَفَقَةٌ). وَأَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي بَيْتِ أُمِّ شَرِيكٍ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ تِلْكَ امْرَأَةٌ يَغْشَاهَا أَصْحَابِي، اعْتَدِّي فِي بَيْتِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَإِنَّهُ رَجُلٌ أَعْمَى، تَضَعِينَ ثِيَابَكِ، وَإِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِي). قَالَتْ: فَلَمَّا حَلَلْتُ ذَكَرْتُ لَهُ أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ وَأَبَا جَهْمٍ خَطَبَانِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَلاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لاَ مَالَ لَهُ انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ). قَالَتْ: فَكَرِهْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: (انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ. فَنَكَحْتُهُ فَجَعَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا وَاغْتَبَطْتُ بِهِ).

واتە: لە (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو عەمری کوڕی حەفص بە یەکجاری تەڵاقیدا خۆشی ئامادە نەبوو، بە وەکیلەکەیدا هەندێ جۆی بۆ نارد، ئەویش

پێی رازی نەبوو، وەكیلەكە وتی: سوێند بە (اللّە) هیچی تۆ لەسەر ئێمە نیە واتە تۆ بژێوی و خەرجیت لەسەر ئێمە نیە، بۆیە ئەویش هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: (خەرجیت ناكەوێتە سەری). فەرمانی دا بە(فاطمة) كە لەماڵی ئوممو شەریكدا عیددە تەواو بكات. لەپاشدا فەرمووی: (ئومموشەریك ئافرەتێكی باش و لەخوا ترس و ناندەرەو میوانی زۆرە هاوەڵانم هاتوچۆی دەكەن، بچۆ بۆ ماڵی ئیبنو ئوممو مەكتوم لەوێ عیددە تەواو بكە. چونكە ئەو پیاوێكی كوێرە تۆ نابینێ، كاتێ كە جلەكانت دادەنێی لەماڵەكەیدا، كاتێ كە عیددەشت تەواو كرد ئاگادارم بكەرەوە). (فاطمة) وتی: جا كە عیددەكەم تەواو بوو بۆم باس كرد واتە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كە موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم خوازبێنیم دەكەن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بەڵام ئەبو جەهم گۆچانەكەی سەرشانی دانانێتە سەرزەوی – واتە توڕەیەو لە ژن دەدات – موعاویەش پیاوێكی هەژارە و هیچی نیە، شو بكە بە ئوسامەی كوڕی زەید). وتی: منیش حەزم لێی نەبوو، دواتر فەرموویەوە: (شو بكە بە ئوسامەی كوڕی زەید)، منیش شوم پێ كرد. خوای گەورە خێر و بێرێكی زۆری بەسەردا رشتن ئافرەتان ئیرەییان پێ دەبرد.

**٢٢٨٥ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ أَبَا حَفْصِ بْنَ الْمُغِيرَةِ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، وَسَاقَ الْحَدِيثَ فِيهِ وَأَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَنَفَرًا مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ أَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا حَفْصِ بْنَ الْمُغِيرَةِ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا، وَإِنَّهُ تَرَكَ لَهَا نَفَقَةً يَسِيرَةً، فَقَالَ: (لاَ نَفَقَةَ لَهَا). وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَحَدِيثُ مَالِكٍ أَتَمُّ.**

واتە: لە (فاطمة)ی كچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، كە ئەبو حەفصی كوڕی موغیرە سێ بە سێ تەلاقیدا، جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە، تێیدا هاتوە، كە خالیدی كوڕی وەلید و چەند كەسێ لە بەنی مەخزوم هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەبو حەفصی كوڕی موغیرە (فاطمة)ی كچی قەیسی سێ بە سێ تەلاقداوەو بژێوی و خەرجی كەمی بۆ داناوە، فەرمووی: (بژێوی و خەرجی لەسەر ئەو نیە). جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە وەك فەرموودەی پێشو، بەلاّم فەرموودەكەی مالیك تەواو ترە واتە فەرموودەی پێشو.

**٢٢٨٦ – (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ أَبَا عَمْرِو بْنَ حَفْصٍ الْمَخْزُومِيَّ طَلَّقَهَا ثَلاَثًا وَسَاقَ الْحَدِيثَ، وَخَبَرَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَيْسَتْ لَهَا نَفَقَةٌ وَلاَ مَسْكَنٌ). قَالَ فِيهِ: وَأَرْسَلَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ لاَ تَسْبِقِينِي بِنَفْسِكِ.**

واتە: لە (فاطمة)ی كچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، كە ئەبو عەمری كوڕی حەفصی مەخزومی سێ بە سێ تەلاقیدا، جا ئەوزاعی راوی فەرموودەكە فەرموودەكەی گێڕایەوە، لەگەڵ بەسەرهاتەكەی خالیدی كوڕی وەلید – كە لەگەڵ چەند كەسێ چوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) - ، ئەوزاعی راوی فەرموودەكە وتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بژێوی و خەرجی و ماڵی ناكەوێتە سەر هەتا بۆی دابین بكات). جا ئەوزاعی لە فەرموودەكەیدا وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی بۆ نارد كە پێشی نەكەوێت واتە شونەكات بە كەس هەتا پرس بەو نەكات.

٢٢٨٧ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس قالت: كُنْتُ عِنْدَ رَجُلٍ مِنْ بَنِي مَخْزُومٍ، فَطَلَّقَنِي الْبَتَّةَ، ثُمَّ سَاقَ نَحْوَ حَدِيثِ مَالِكٍ، قَالَ فِيهِ: (وَلاَ تَفُوتِينِي بِنَفْسِكِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَذَلِكَ رَوَاهُ الشَّعْبِيُّ، وَالْبَهِيُّ، وَعَطَاءٌ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَاصِمٍ، وَأَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي الْجَهْمِ، كُلُّهُمْ عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا.

واتە: لە (فاطمة)ی كچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: هاوسەری پیاوێكی بەنی مەخزومی بووم تەڵاقی دام بە یەكجاری، لەپاشدا راوی فەرموودەكەی وەك فەرموودەكەی مالیك گێڕایەوە، تێیدا وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی بۆ نارد كە پێشی نەكەوێت واتە شونەكات بە كەس هەتا پرس بەو نەكات.

ئەبو داود دەڵێت: هەروەها شەعبی و بەهی و (عطاء) گێڕاویانەتەوە، لە (عبد الرحمن)ی كوڕی عاصمەوە ، لە ئەبو بەكری كوڕی ئەبو جەهمەوە، هەر هەموویان لە (فاطمة)ی كچی قەیسەوە، كە مێردەكەی سێ بە سێ تەڵاقیدا - نەیانوت: بە یەكجاری.

٢٢٨٨ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَفَقَةً وَلاَ سُكْنَى.

واتە: لە (فاطمة)ی كچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، كە مێردەكەی سێ بە سێ تەڵاقیدا، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بژێوی و ماڵی بۆم دانەنا.

٢٢٨٩ - (صحيح) عن فاطمة بنت قيس: أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ أَبِي حَفْصِ بْنِ الْمُغِيرَةِ وَأَنَّ أَبَا حَفْصِ بْنَ الْمُغِيرَةِ طَلَّقَهَا آخِرَ ثَلاَثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَزَعَمَتْ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَفْتَتْهُ فِي خُرُوجِهَا مِنْ بَيْتِهَا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَنْتَقِلَ إِلَى ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، فَأَبَى مَرْوَانُ أَنْ يُصَدِّقَ حَدِيثَ فَاطِمَةَ فِي خُرُوجِ الْمُطَلَّقَةِ مِنْ بَيْتِهَا، قَالَ عُرْوَةُ: وَأَنْكَرَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ.

واتە: (فاطمة)ی کچی قەیسەوە دەگێڕنەوە، کە هاوسەری ئەبو حەفصی کوڕی موغیرە بوو دوا تەلاقی سێ تەلاقەی دا، پێی وابوو کە چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکات سەبارەت بە گواستنەوە و دەرچوونی نەماڵەکەی، فەرمانی پێ دا کە بگوێزێتەوە بۆ ماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم کە پیاوێکی کوێر بوو، بەڵام مەروان — ی کوڕی حەکەم کە فەرمانڕەوای مەدینە بوو — وتی من باوەڕ بەم قسەیە ناکەم، عوروە وتی: عائیشەش ڕەزای خوای لێ بێ ئەم قسەیەی (فاطمة)ی کچی قەیسی نەسەلماندو نکولی لێ کرد.

٢٢٩٠ - (صحيح) عن عبيد الله، قال: أَرْسَلَ مَرْوَانُ إِلَى فَاطِمَةَ فَسَأَلَهَا، فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ أَبِي حَفْصٍ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّرَ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ - يَعْنِي عَلَى بَعْضِ الْيَمَنِ - فَخَرَجَ مَعَهُ زَوْجُهَا، فَبَعَثَ إِلَيْهَا بِتَطْلِيقَةٍ كَانَتْ بَقِيَتْ لَهَا، وَأَمَرَ عَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ وَالْحَارِثَ بْنَ

هِشَامٍ أَنْ يُنْفِقَا عَلَيْهَا، فَقَالاَ: وَاللَّهِ مَا لَهَا نَفَقَةٌ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ حَامِلاً، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لاَ نَفَقَةَ لَكِ إِلاَّ أَنْ تَكُونِي حَامِلاً). وَاسْتَأْذَنَتْهُ فِي الانْتِقَالِ، فَأَذِنَ لَهَا، فَقَالَتْ: أَيْنَ أَنْتَقِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (عِنْدَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ). وَكَانَ أَعْمَى تَضَعُ ثِيَابَهَا عِنْدَهُ وَلاَ يُبْصِرُهَا، فَلَمْ تَزَلْ هُنَاكَ حَتَّى مَضَتْ عِدَّتُهَا، فَأَنْكَحَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُسَامَةَ، فَرَجَعَ قَبِيصَةُ إِلَى مَرْوَانَ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ مَرْوَانُ: لَمْ نَسْمَعْ هَذَا الْحَدِيثَ إِلاَّ مِنَ امْرَأَةٍ، فَسَنَأْخُذُ بِالْعِصْمَةِ الَّتِي وَجَدْنَا النَّاسَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ فَاطِمَةُ حِينَ بَلَغَهَا: ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) حَتَّى (لَا تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا). قَالَتْ: فَأَيُّ أَمْرٍ يَحْدُثُ بَعْدَ الثَّلاَثِ؟

واتە: (عبيد الله) دەڵێت: مەروان – (قبیصە)ی نارد بۆلای (فاطمة)ی كچی قەیس كە پرسیاری لێ بكات لەوبارەوە، ئەویش پێی راگەیاند كە هاوسەری ئەبو حەفصی كوڕی موغیرە بووە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا بە پێشەوا عەلی كوڕی (أبي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ كە ببێتە كاربەدەستی هەندێ لەخەڵكی یەمەن. مێردەكەی (فاطمة)ش لەگەڵی دەرچو بۆ یەمەن، جا پێشتر دوو تەڵاقی دابوو تەڵاقەكەی تری كە مابیو ئەویشی بۆ نارد، فەرمانی دا بە عەیاشی كوڕی ئەبو ڕەبیعەو (حارث)ی كوڕی هیشام كە خەرجی بكێشن، وتیان: سوێند بە (الله) خەرجی ناكەوێتە سەر مێردەكەی مەگەر سكی پڕ بێت، (فاطمة)ش هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله

عليه وسلم) فەرمووی: (خەرجیت ناکەوێتە سەر مێردەکەت مەگەر سکت هەبێ). جا (فاطمة) داوای کرد رێگەی بدەن لەماڵی مێردەکەی بگوێزێتەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رێگەی دا، (فاطمة)ش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ کوێ بڕۆم؟ فەرمووی: ( برۆ بۆ ماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم) پیاوێکی کوێر بوو کە جلەکانی دادەنا لەماڵەکەیدا ئەو نەیدەبینی، ئەویش بەردەوام لەماڵی ئیبنو ئوممو مەکتوم بوو هەتا عیددەکەی تەواو بوو، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مارەی کرد لە ئوسامەی کوڕی زەید، (قبیصە) گەڕایەوە بۆلای مەروان هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە، مەروان وتی: ئەم فەرمودەم نەبیستوە لە ژنێکەوە نەبێت، دەست دەگرین بەو متمانەو کارە بەهێز و دروستەوە کە دەبینین خەڵك لەسەرینی، (فاطمة)ش کاتێ کە قسەکەی مەروانی پێ گەیشتەوە وتی: قورئانەکەی خوای گەورە لەنیوان من و ئێوەدا بێت، خوای گەورە لە ئایەتی یەکەمی سورەتی (الطلاق)دا دەفەرموێت: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ) واتە: لەکاتی دەستپێکردنی عیددەیاندا تەلاقیان بدەن. هەتا دەگاتە: (لَا تَدْرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ). واتە: تۆ چوزانی لەدوای تەلاقەکە چی دەبێت.

(فاطمة)ش وتی: جا چ کارێك لەدوای سێ تەلاقە ئەبێت و دێتەدی.

## باسی کێ نکولی کرد لە قسەکەی (فاطمة)

## ٤٠ – باب مَنْ أَنْكَرَ ذَلكَ عَلَى فَاطِمَةَ

٢٢٩١ - (صحيح) عن أبي إسحاق، قال: كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ الْجَامِعِ مَعَ الأَسْوَدِ، فَقَالَ: أَتَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَقَالَ: مَا كُنَّا لِنَدَعَ كِتَابَ رَبِّنَا وَسُنَّةَ نَبِيِّنَا

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِقَوْلِ امْرَأَةٍ لاَ نَدْرِي أَحَفِظَتْ ذَلِكَ أَمْ لاَ.

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێت: لەگەڵ ئەسوەد - ی كوڕی زەید — دا لە مزگەوتی (جامع) — ی كوفە - بووین، ئەسوەد وتی: (فاطمة)ی كچی قەیس هات بۆ خزمەت پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ — لەوانەیە وتبێتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ماڵ و خەرجی بۆم دانەنا چونكە مێردەكەم بەیەكجاری تەڵاقی دابووم — پێشەوا عومەر وتی: ئێمە حوكم و بڕیاری قورئان و سوننەت واز لێ ناهێنین بە قسەی ئافرەتێك كە نازانین ئایا فەرموودەكەی بە باشی لەبەركردوە یان نا - كە سەلماندنی ماڵ و خەرجی دابین كردنە - .

٢٢٩٢ - (صحيح) عن هشام بن عروة، عن أبيه، قال: لَقَدْ عَابَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَشَدَّ الْعَيْبِ يَعْنِي حَدِيثَ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، وَقَالَتْ: إِنَّ فَاطِمَةَ كَانَتْ فِي مَكَانٍ وَحْشٍ فَخِيفَ عَلَى نَاحِيَتِهَا، فَلِذَلِكَ رَخَّصَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە هیشامی كوڕی عوروەوە، لە باوكیەوە واتە عوروە، دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ نكولی زۆری كرد لە قسەكەی (فاطمة)ی كچی قەیس — كە وتی: ئافرەتی تەڵاق دراو بە یەكجاری بژێوی و ماڵی ناكەوێت - ، هەروەها عائیشە وتی: بێگومان (فاطمة) لە شوێنێكی چۆڵەوانیدا دەژیا، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی پێدا لە عیددەكەیدا لەماڵی مێردەكەی دەرچێ.

٢٢٩٣ - (صحيح) عن عروة بن الزبير: أَنَّهُ قِيلَ لِعَائِشَةَ: أَلَمْ تَرَىْ إِلَى قَوْلِ فَاطِمَةَ؟! قَالَتْ: أَمَا إِنَّهُ لاَ خَيْرَ لَهَا فِي ذِكْرِ ذَلِكَ.

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە بە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وترا: ئایا تۆ سەرنجی وتەکەی (فاطمة)ت نەداوە، عائیشە وتی: خێری تێدا نیە باسی شتی وەها بکات لەکاتێکدا کە ئایەتی قورئان بە پێچەوانەی قسەکەی ئەوەوە هاتوە.

٢٢٩٤ - (ضعيف) عن سليمان بن يسار: في خروج فاطمة قال: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنْ سُوءِ الْخُلُقِ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، کە سەبارەت بە دەرچوونی (فاطمة) لەماڵی مێردەکەی وتویەتی: لەبەر ئەوە بوو زمانی درێژ بوو بەرامبەر بە خێڵی خەزورانی و بە زمانی ئازاری دەدان بۆیە ڕێگەی پێدا لەماڵی مێردەکەی دەربچێت.

٢٢٩٥ - (صحيح) عن القاسم بن محمد وسليمان بن يسار أنه سمعهما يذكران، أَنَّ يَحْيَى بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ طَلَّقَ بِنْتَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَكَمِ الْبَتَّةَ، فَانْتَقَلَهَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ، فَأَرْسَلَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فَقَالَتْ لَهُ: اتَّقِ اللَّهَ وَارْدُدِ الْمَرْأَةَ إِلَى بَيْتِهَا، فَقَالَ مَرْوَانُ فِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ: إِنَّ عَبْدَ الرَّحْمَنِ غَلَبَنِي، وَقَالَ مَرْوَانُ فِي حَدِيثِ الْقَاسِمِ: أَوَمَا بَلَغَكِ شَأْنُ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: لاَ يَضُرُّكَ أَنْ لاَ تَذْكُرَ حَدِيثَ فَاطِمَةَ،

**فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنْ كَانَ بِكِ الشَّرُّ فَحَسْبُكِ مَا كَانَ بَيْنَ هَذَيْنِ مِنَ الشَّرِّ!.**

واتە: لە قاسمی کوڕی موحەممەد و سولەیمانی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، کە یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کچەکەی (عبد الرحمن)ی کوڕی حەکەمی تەلاقدا بە یەکجاری، (عبد الرحمن)ی باوکی لەماڵەکەی خۆی کە تێیدا تەڵاق درابوو گواستیەوە، عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ ناردی بۆلای مەروانی کوڕی حەکەم کە لەوکاتەدا کاربەدەستی مەدینە بوو- برای (عبد الرحمن)یش بوو - ، پێی وت: لە خوای گەورە بترسە ژنەکە بگێڕەرەوە بۆ ماڵەکەی خۆی! مەروان لە فەرمودەکەی سولەیماندا لەوەڵامی عائیشەدا وتی: (عبد الرحمن)ی برام بەگوێم ناکات و ناتوانم ڕێگری لێ بکەم، هەروەها مەروان لە فەرمودەکەی قاسمدا لەوەڵامی عائیشەدا وتی: ئایا بەسەرهاتەکەی (فاطمة)ی کچی قەیست نەبیستوە کە لەماڵی مێردەکەی عیددەی تەواو نەکرد، عائیشە بە مەروانی وت: زیانت پێ ناگا ئەگەر باسی بەسەرهاتەکەی (فاطمة)ی کچی قەیس نەکەیت، چونکە نابێتە بەڵگە بۆ دروستی گواستنەوەی تەڵاقدراو لەماڵەکەی خۆی بەبێ هۆکار، مەروان وتی: ئەگەر بەلای تۆوە وایە کە هۆکاری دەرچونی (فاطمة) لەماڵی مێردەکەی لەسەر زمان درێژی بووە بەرامبەر بە خێڵە خەزورانی کەواتە ئەوەندە بەسە بۆ دروستی گواستنەوەی کچەکەی (عبد الرحمن) برام چونکە هەمان هۆکار لەنیوان ئەو و مێردەکەیدا هەیە.

**٢٢٩٦ - (صحيح مقطوع) عن ميمون بن مهران، قال: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدُفِعْتُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ فَقُلْتُ: فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ طُلِّقَتْ فَخَرَجَتْ مِنْ بَيْتِهَا، فَقَالَ سَعِيدٌ: تِلْكَ امْرَأَةٌ فَتَنَتْ**

النَّاسَ، إِنَّهَا كَانَتْ لَسِنَةً فَوُضِعَتْ عَلَى يَدَيِ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى.

واتە: لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە گەیشتمە مەدینە نێردرام بۆلای سەعیدی کوڕی موسەییەب وتم: (فاطمة)ی کچی قەیس تەڵاقدرا لەماڵەکەی دەرچو، سەعید وتی: ئەو ئافرەتە بەو قسەیەی خەڵکی خستۆتە هەڵەوە، ئەوە بە زمانی ئازاری خەڵکی دەدا بۆیە درایە دەستی ئیبنو ئوممی مەکتوم کە پیاوێکی کوێر بوو هەتا عیددەی لەماڵی ئەودا تەواو بوو.

## باسی دەرچونی ئافرەتی تەڵاق دراو بە یەکجاری بەڕۆژدا.

## ٤١ – باب فِي الْمَبْتُوتَةِ تَخْرُجُ بِالنَّهَارِ.

٢٢٩٧ - (صحيح) عن جابر، قال: طُلِّقَتْ خَالَتِي ثَلاَثًا فَخَرَجَتْ تَجُدُّ نَخْلاً لَهَا، فَلَقِيَهَا رَجُلٌ، فَنَهَاهَا، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ لَهَا: (اخْرُجِي فَجُدِّي نَخْلَكِ لَعَلَّكِ أَنْ تَصَدَّقِي مِنْهُ أَوْ تَفْعَلِي خَيْرًا).

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پورم سێ تەڵاقەدرا بوو، جارێ چووە دەرەوە دار خورماکەی بڕنێ، پیاوێکی پێ گەیشت ڕێگری لێ کرد، ئەویش چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەسەرهاتەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەریش (صلی الله

علیه وسلم) پێی فەرموو: (بەڵێ، بڕۆ دار خورماکەت بڕنە بەڵکو خێرێکی لێ بکەیت یان چاکەیە بکەی).

## باسی ژنێ مێردەکەی بمرێ تا ماوەی ساڵێ دەرنەکرێ و هەر لەجێی خۆی بمێنێتەوەو خەرجی بدرێت، ئەمە بە ئایەتی میرات هەڵوەشایەوە.

## ٤٢ - باب نَسْخِ مَتَاعِ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا بِمَا فُرِضَ لَهَا مِنَ الْمِيرَاثِ.

**٢٣٩٨ - (حسن) عن ابن عباس: ( وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ). فَنُسِخَ ذَلِكَ بِآيَةِ الْمِيرَاثِ بِمَا فُرِضَ لَهُنَّ مِنَ الرُّبُعِ وَالثُّمُنِ، وَنُسِخَ أَجَلُ الْحَوْلِ بِأَنْ جُعِلَ أَجَلُهَا أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە: (وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ) سورة البقرة: ٢٤٠. واتە: ئەو کەسانەی لەئێوە لەسەرەمەرگدان و دەمرن ژنەکانیان دوای خۆیان بەجێ دێڵن، با پێش ئەوەی گیانیان دەرچێ ڕاسپێرن و وەسیەت بکەن - کە ژنەکانیان ئەگەر ویستیان — تا ماوەی ساڵێ دەرنەکرێن و هەر لەجێی خۆیان بمێننەوەو خەرجیان بدەن.

ئەمە بە ئایەتی میرات هەڵوەشایەوە بەوەی کە خوای گەورە چوار یەك و هەشت یەکی بۆ فەرزکردن، هەروەها تا ماوەی ساڵێ هەڵوەشایەوە کرا بە چوار مانگ و دە ڕۆژ بۆیان.

**٢٣٩٩ - (صحيح) عن حميد بن نافع، عن زينب بنت أبي سلمة: أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ بِهَذِهِ الأَحَادِيثِ الثَّلاَثَةِ قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُوهَا، أَبُو سُفْيَانَ، فَدَعَتْ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا). قَالَتْ زَيْنَبُ: وَدَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّيَ أَخُوهَا فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِي بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ (لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُحِدَّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا). قَالَتْ: زَيْنَبُ وَسَمِعْتُ أُمِّي أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَتِي تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنَهَا، أَفَنَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ).**

مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ (لاَ). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا هِيَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ). قَالَ: حُمَيْدٌ فَقُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِي بِالْبَعْرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّيَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا، وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلاَ شَيْئًا حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ، ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَائِرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَيْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ فَتُعْطَى بَعْرَةً فَتَرْمِي بِهَا، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْحِفْشُ: بَيْتٌ صَغِيرٌ.

واتە: حومەیدی کوڕی نافیع دەڵێت: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە ئەم سێ فەرموودەی بۆ گێڕامەوە، زەینەب وتی: چومە ژوورەوە بۆلای ئوممو حەبیبە کاتێ کە ئەبو سوفیانی باوکی مرد، جا ئوممو حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تێدا بوو. دەستی کرد بە ناویداو هێنای بە هەردوو لای ڕوومەتیدا، لە پاشدا وتی: سوێند بە (اللّه) هیچ پێویستم بە بۆنی خۆش نیە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە لە پێغەمبەری خودام (صلی الله علیه وسلم) بیستوە دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ کە باوەڕی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی قیامەت هەیە بۆی دروست نیە لە سێ شەو زیاتر ماتەم بگرێ بۆ مردو، مەگەر بۆ مێرد. کە دەبێ بۆ مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیە بگرێ).

زەینەب وتی: چومە ژوورەوە بۆلای زەینەی کچی جەحش کاتێ کە براکەی مرد، داوای بۆنی خۆشی کرد، بۆیان هێنا دای لە خۆی، لە پاشدا وتی: سوێند بە (اللّه) هیچ پێویستم بە بۆنی خۆش نیە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە لە پێغەمبەری خودام (صلی الله علیه وسلم)

بیستوە لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (هەر ئافرەتێ کە باوەڕی بە خوای گەورە و بە ڕۆژی قیامەت هەیە بۆی دروست نیە لە سێ شەو زیاتر ماتەم بگرێ بۆ مردو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبێ بۆ مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیە بگرێ).

زەینەب وتی: گوێم لە دایکم واتە ئەمو سەلەمە بوو وتی: ئافرەتێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کچەکەم مێردەکەی مردوەو چاوی دێشێت، چاوی بڕێژێ؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (نەخێر) دوو تا سێ جار بەو شێوەیە فەرمووی: (نەخێر، با چاوی نەڕێژێ) لە پاشدا فەرمووی: (خۆی تا چوار مانگ دە شەوە، کەچی ئێوە پەلەتانە، لەسەردەمی جاهیلی دا لەپاش ساڵێ ئینجا پشقلەکەیتان فڕێ دەدا). حومەید دەڵێت: بە زەینەبم وت: مەبەست لەپاش ساڵێ ئینجا پشقلەکەیتان فڕێ دەدا چی یە؟ زەینەب وتی: جاران ژن کە مێردەکەی دەمرد دەچوە ناو ماڵێکی زۆر بچوکەوە خراپترین جل و بەرگی خۆی ئەبەردەکرد، هیچ بۆنێکی خۆشی لەخۆی نەدەدا بەو شێوەیە دەبوو هەتا ماوەی ساڵێ تێدەپەڕی بەسەر مردنی مێردەکەیدا، ئینجا گوێ درێژێ یان مەڕێ یا باڵندەیەکیان بۆ دەهێنا خۆی پێ پاك دەکردەوە، بە هەرکامیان خۆی پاك بکردایەتەوە دەمرد لەبەر بۆنی ناخۆشی، جا ژنەکە لەماڵە بچوکەکەی دەهاتەدەرەوە پشقلێکیان دەدایە دەستی فڕێی دەدا، ئیتر عیددەی تەواو دەبوو، ئینجا ئەگەر ئارەزووی ببوایە بۆنی خۆش و جگە ئەویشی بەکاردەهێنا.

## باسی ژنێ مێردەكەی بمرێ: ئایا لەو ماڵە كە تێیدا تەڵاقدراوە بچێتە دەرەوە یان نا.

## ٤٤ – باب فِي الْمُتَوَفَّى عَنْهَا تَنْتَقِلُ.

٢٣٠٠ - (صحيح) عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ، أَنَّ الْفُرَيْعَةَ بِنْتَ مَالِكِ بْنِ سِنَانٍ - وَهِيَ أُخْتُ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ - أَخْبَرَتْهَا أَنَّهَا جَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، تَسْأَلُهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى أَهْلِهَا فِي بَنِي خُدْرَةَ، فَإِنَّ زَوْجَهَا خَرَجَ فِي طَلَبِ أَعْبُدٍ لَهُ أَبَقُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِطَرَفِ الْقَدُّومِ لَحِقَهُمْ فَقَتَلُوهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي، فَإِنِّي لَمْ يَتْرُكْنِي فِي مَسْكَنٍ يَمْلِكُهُ وَلاَ نَفَقَةٍ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَعَمْ). قَالَتْ: فَخَرَجْتُ حَتَّى إِذَا كُنْتُ فِي الْحُجْرَةِ أَوْ فِي الْمَسْجِدِ دَعَانِي، أَوْ أَمَرَ بِي فَدُعِيتُ لَهُ، فَقَالَ: (كَيْفَ قُلْتِ؟). فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ الَّتِي ذَكَرْتُ مِنْ شَأْنِ زَوْجِي، قَالَتْ: فَقَالَ: (امْكُثِي فِي بَيْتِكِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ). قَالَتْ: فَاعْتَدَدْتُ فِيهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَسَأَلَنِي عَنْ ذَلِكَ، فَأَخْبَرْتُهُ فَاتَّبَعَهُ وَقَضَى بِهِ.

واتە: زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجرە دەڵێت: فورەیعـەی کچـی مـالیکی کـوڕی سینان – کە خوشکی ئەبو سەعیدی خودری بوو – بۆ زەینەبی گێڕایەوە کە هـاتووە بـۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسـلم) داوای لـێ کـردوە کـە بگەڕێتـەوە بـۆ نـاو کەسوکاری لە بەنی خودرە، چونکە مێردەکەی چوو بوو بەشـوێن چـەند بەندەیەکیـدا کـە هاڵهاتبون، هەتا لەناوچەی قەدوم پێیان گەیشت ئـەوانیش کوشـتیان، پرسـیارم کـرد لـە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بگەڕێمەوە بۆ ناو کەسوکارم، چونکە مێردەکەم نـە خانوی خۆی بۆ بەجێ هێشتوم نە خەرجی؟ فورەیعە وتی: پێغەمبەری خوا (صـلى الله عليـه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ). فورەیعە وتی: کاتێ کە لە مزگەوت یـان لـە حـوجرە دەرچـووم بانگی کردم، یان فەرمانی دا بانگ کرام فەرمووی: (چیت وت؟) منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە دەربارەی مێردەکەم، فورەیعە وتی: فەرمووی: (هـەر لـەو ماڵـەی کـە هـەواڵ مێردەکەت پێ گەیشتوە بمێنەرەوە، هەتا عیددەت تـەواو دەبـێ). فورەیعـە وتـی: چـوار مانگ و دە شەو لەو شوێنەدا مامەوە عیددەم کێشا، فورەیعە وتی: کـاتێ کـە پێشـەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێ بێ بوو بـە خەلیفـەی موسـوڵمانان نـاردی بـە شوێنمدا لەوبارەوە پرسیاری لێ کردم، منیش بۆم گێڕایەوە، ئـەویش لەسـەری ڕۆیشـت و حوکمی پێ کرد.

# باسی ئەوەی پێی وایە ژن ئەگەر مێردەكەی مرد بۆی هەیە لەشوێنێكەوە بگوێزێتەوە بۆ شوێنێكی تر ماوە(عدە)كەی تەواو بكات.

## ٤٥ - باب مَنْ رَأَى التَّحَوُّلَ.

٢٣٠١ - (صحيح) عن ابن أبو نجيح قال: قال عطاء: قال ابن عباس: نَسَخَتْ هَذِهِ الآيَةُ عِدَّتَهَا عِنْدَ أَهْلِها، فَتَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ، وَهُوَ قَوْلُ اللَّهِ تَعالَى: (غَيْرَ إِخْرَاجٍ). قَالَ عَطَاءٌ: إِنْ شَاءَتِ اعْتَدَّتْ عِنْدَ أَهْلِهِ، وَسَكَنَتْ فِي وَصِيَّتِهَا، وَإِنْ شَاءَتْ خَرَجَتْ، لِقَوْلِ اللَّهِ تَعالَى: (فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ) قَالَ عَطَاءٌ: ثُمَّ جَاءَ الْمِيرَاثُ فَنَسَخَ السُّكْنَى تَعْتَدُّ حَيْثُ شَاءَتْ.

واتە: لە ئیبنو ئەبو نەجیحەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: (عطاء) وتی: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ وتی: ئەو ئایەتەی كە عیددەی ژنی لەناو كەسوكاریدا هەڵوەشاندۆتەوە، ژن بۆی هەیە لەهەر شوێنێك عیددە تەواو بكات، ئەم ئایەتەیە: (غَيْرَ إِخْرَاجٍ ...) سورة البقرة: ٢٤٠. واتە: تا ماوەی ساڵێ دەرنەكرێن و هەر لەجێی خۆیان بمێننەوەو خەرجیان بدەن...

(عطاء) وتی: ژن ئەگەر ئارەزووی لێ بوو دەتوانێ لەناو كەسوكاریدا عیددە تەواو بكات، وە بێدەنگ بووە لە وەسیەتەكەیدا ئەگەر ئارەزوو بكات بچێتەدەر بە پێی ئەم

ئایەتەی خوای گەورە: (فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ).سورة البقرة: ٢٤٠.
واتە: ئەگەر ژنان بەویستی خۆیان چوونەدەرەوە ئیتر هیچ گوناهتان لەسەر نیە (ئەی کەسوکاری مێرد) لەوەی کە ئەو ژنانە دەیکەن سەبارەت بە خۆیان بە باشی.
هەروەها (عطاء) وتی: لەپاشدا ئایەتی میرات هاتەخوارەوە و سوکنای هەڵوەشاندەوەو ژن بۆی هەبوو لەهەر شوێنێك بیەوێ عیددە تەواو بکات.

## باسی دەربارەی ئەوەی کە ئافرەت لە عیددەکەیدا لێی بەدور بێت.

## ٤٦ - باب فِيمَا تَجْتَنِبُهُ الْمُعْتَدَّةُ فِي عِدَّتِهَا.

**٢٣٠٢ - (صحيح) عن أم عطية: أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تُحِدُّ الْمَرْأَةُ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ، فَإِنَّهَا تُحِدُّ عَلَيْهِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، لاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلاَ تَكْتَحِلُ، وَلاَ تَمَسُّ طِيبًا، إِلاَّ أَدْنَى طُهْرَتِهَا إِذَا طَهُرَتْ مِنْ مَحِيضِهَا بِنُبْذَةٍ مِنْ قُسْطٍ أَوْ أَظْفَارٍ). قَالَ يَعْقُوبُ: مَكَانَ عَصْبٍ (إِلاَّ مَغْسُولاً). وَزَادَ يَعْقُوبُ (وَلاَ تَخْتَضِبُ).**

واتە: لە ئومو (عطیة)وە هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئافرەت بۆی نیە لە سێ شەو زیاتر ماتەم بگرێ بۆ مردو، مەگەر بۆ مێرد، دەبێ بۆ مێرد چوار مانگ و دە ڕۆژ تازیە بگرێ، جل و بەرگی ڕەنگ کراو لەبەر نەکات مەگەر

جل و بەرگی (عَصْب) کە جۆرێ جل و بەرگە پێش دورینی رەنگ دەکرا، نابێ چاو برێژێ و، بۆنی خۆش لە خۆی بدات مەگەر لە بێ نوێژی پاك بێتەوە ئەویش بە کەمێ لە بۆنی (قسط) یان (أظفار) کە دوو بۆنی خۆشی ئەو کاتە بوون. یەعقوب لە جیاتی (عَصْب) وتی: (إِلاَّ مَغْسُولاً). واتە مەگەر کاتێ کە خۆی بشوات لەدوای پاك بوونەوە، یەعقوب ئەمەی بۆ زیاد کرد: (وَلاَ تَخْتَضِبُ). واتە: بۆیە بەکار نەهێنێ.

**٢٣٠٣ - (صحيح) عن أم عطية: عن النبِى صلى الله عليه وسلم، بِهَذَا الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ فِى تَمَامِ حَدِيثِهِمَا. قَالَ الْمِسْمَعِىُّ: قَالَ يَزِيدُ: وَلاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ فِيهِ: (وَلاَ تَخْتَضِبُ). وَزَادَ فِيهِ هَارُونُ (وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ).**

واتە: ئومو (عطية)وە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموودەکەی وەك فەرمودەی پێشو گێڕایەوە، بەڵام بەتواوی وەك ئەو نا، میسمەعی وتی: یەزید وتی: نازانم تەنیا ئەوەندە نەبێ کە تێیدا وتی: (وَلاَ تَخْتَضِبُ). واتە: بۆیە بەکار نەهێنێ. هارون ئەمەی بۆ زیاد کرد: ( جل و بەرگی رەنگ کراو لەبەر نەکات مەگەر جل و بەرگی (عَصْب)).

**٢٣٠٤ - (صحيح) عن أم سلمة زوج النبِى صلى الله عليه و سلم: عن النبِى صلى الله عليه وسلم أنه قال: (الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا لاَ تَلْبَسُ الْمُعَصْفَرَ مِنَ الثِّيَابِ، وَلاَ الْمُمَشَّقَةَ، وَلاَ الْحُلِىَّ، وَلاَ تَخْتَضِبُ، وَلاَ تَكْتَحِلُ).**

واتە: لە ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەری خـواوە (صلى الله عليه وسلم) هـاتوە، کـە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر ئافرەتێ مێردەکـەی بمـرێ نـابێ جل و بەرگی رەنگ کراو لەبەر بکات، هەروەها گڵـی سـور(ممشـقة)ش بەکارنـەهێنێ، وە خشڵ و ئاڵتون نەکات بە خۆیا، وە خەنە بەکار نەهێنێ بۆ نمونە دەست و قاچـی نەگرێتـە خەنە، هەروەها چاوی نەڕژێ.

٢٣٠٥ – (ضعيف) عن أم حكيم بنت أسيد، عن أمها: أَنَّ زَوْجَهَا تُـوُفِّيَ وَكَانَتْ تَشْتَكِي عَيْنَيْهَا فَتَكْتَحِلُ بِـالْجَلاَءِ - قَـالَ أَحْمَـدُ: الصَّوَابُ: بِكُحْلِ الْجَلاَءِ - فَأَرْسَلَتْ مَوْلاَةً لَهَا إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَسَأَلَتْهَا عَنْ كُحْلِ الْجَلاَءِ، فَقَالَتْ: لاَ تَكْتَحِلِي بِهِ إِلاَّ مِـنْ أَمْرٍ لاَ بُدَّ مِنْهُ يَشْتَدُّ عَلَيْكِ فَتَكْتَحِلِينَ بِاللَّيْـلِ وَتَمْسَـحِينَهُ بِالنَّهَارِ. ثُمَّ قَالَتْ: عِنْدَ ذَلِكَ أُمُّ سَلَمَةَ دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَ أَبُو سَلَمَةَ، وَقَدْ جَعَلْتُ عَلَى عَيْنِي صَبِرًا، فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا أُمَّ سَلَمَةَ؟). فَقُلْتُ: إِنَّمَا هُوَ صَبِرٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ لَيْسَ فِيهِ طِيبٌ. قَالَ: (إِنَّهُ يَشُبُّ الْوَجْـهَ، فَلاَ تَجْعَلِيهِ إِلاَّ بِاللَّيْـلِ وَتَنْزِعِينَـهُ بِالنَّهَـارِ، وَلاَ تَمْتَشِـطِي بِالطِّيبِ وَلاَ بِالْحِنَّاءِ، فَإِنَّهُ خِضَابٌ). قَالَتْ: قُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ أَمْتَشِطُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (بِالسِّدْرِ تُغَلِّفِينَ بِهِ رَأْسَكِ).

واتە: لە ئوممو حەکیمی کچی ئوسەیدەوە، لە دایکیەوە هـاتوە، کـە مێردەکـەی مـرد چاوەکانی ئێشیان دەکرد ئەویش بە (جَلاَء) رشتنی، ئەحمەد دەڵێ راست تر وایە بوترێـت:

(بِكُحْلِ الْجَلاَءِ) - ، كەنیزەكێكی هەبوو ناردی بۆلای ئوممو سەلەمە تاكو دەربارەی (كحل جلاء) پرسیاری لێ بكات، ئوممو سەلەمە وتی: پێیان نەڕەژێ مەگەر بۆ كارێ كە زۆر پێویست بێ ئەویش بە شەو بیان ڕێژەو بە ڕۆژ لێی بكەرەوە، لەپاشدا لەوبارەوە وتی: كاتێ كە مێردەكەم مرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هات بۆلام لەوكاتەدا (صبر)م دابوو لەچاوم، فەرمووی: (ئەی ئوممو سەلەمە ئەمە چی یە؟). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە (صبر)ە بۆنی خۆشی تێدا نیە، فەرمووی: (ئەوە روخسار دەدرەوشێنێتەوە، بەكاری مەهێنە مەگەر بەشەودا بەلام بە ڕۆژدا لێی بكەرەوە، قژت شانە مەكە بە بۆنی خۆش و بە خەنە: چونكە ئەوە بۆیەكردنە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەی بە چی شانەی بكەم؟ فەرمووی: (سیدر بدە لەسەرت و شانەی بكە).

## باسی سەبارەت بە عیددەی ئافرەتی سك پڕ.

## ٤٧ – باب فِي عِدَّةِ الْحَامِلِ.

٢٣٠٦ - (صحيح) عن عبيد الله بن عبد الله بن عتبة: أَنَّ أَبَاهُ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الأَرْقَمِ الزُّهْرِيِّ يَأْمُرُهُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ الأَسْلَمِيَّةِ فَيَسْأَلَهَا عَنْ حَدِيثِهَا، وَعَمَّا قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ اسْتَفْتَتْهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ يُخْبِرُهُ، أَنَّ سُبَيْعَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ ابْنِ خَوْلَةَ - وَهُوَ مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ لُؤَيٍّ، وَهُوَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا -

فَتُوُفِّيَ عَنْهَا فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهِيَ حَامِلٌ، فَلَمْ تَنْشَبْ أَنْ وَضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ - رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ - فَقَالَ لَهَا: مَا لِي أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً لَعَلَّكِ تَرْتَجِينَ النِّكَاحَ؟ إِنَّكِ وَاللَّهِ مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِي ذَلِكَ جَمَعْتُ عَلَيَّ ثِيَابِي حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَأَفْتَانِي بِأَنِّي قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وَضَعْتُ حَمْلِي وَأَمَرَنِي بِالتَّزْوِيجِ إِنْ بَدَا لِي. قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَلاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ تَتَزَوَّجَ حِينَ وَضَعَتْ وَإِنْ كَانَتْ فِي دَمِهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَطْهُرَ.

واتە: (عبيد اللّه)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عوتبە دەڵێت: باوکم نامەی نوسی بۆ عومەری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئەرقەمی زوهری فەرمانی پێ دا کە بچێ بۆلای سوبەیعەی کچی (حارث)ی ئەسلەمی، کە لەبارەی دانانی سکەکەیەوە پرسیاری لێ بکات، لەپاش مردنی مێردەکەی، کاتێ کە ئەو پرسیاری کردوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی پێ فەرموەوە؟ عومەری کوڕی (عَبْدُ اللَّه) نامەی نوسیەوە بۆ باوکم و ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاند: سوبەیعە بۆی گێڕامەوە، کە هاوسەری سەعدی کوڕی خەولە بووە — لە بەنی عامیری کوڕی (لُؤَيّ)، یەکێ بوو لەوانەی بەشداری جەنگی بەدری کردبوو — لەحەجی ماڵئاوایدا مێردەکەی مردوە، ئەویش لەوکاتەدا سکی پڕ بووە، چەند شەوێ لەدوای مەرگی سەعد سکەکەی دانا، کاتێ کە لە خوێنی زەیسانی پاك دەبێتەوە خۆی دەرازێنێتەوە بۆ خوازبێنی کاران، ئەبو سەنابیلی کوڕی بەعکەك کە پیاوێ بوو لە بەنی

(عبد الدار) دەچێ بۆلای پێی دەڵێ: چیە دەتبینم خۆت رازاندۆتەوە دەڵێی دەتەوێ شو بکەی؟ سوێند بە (الله) تۆ ناتوانی شو بکەیت هەتا چوار مانگ و دە شەو بەسەر مردنی مێردەکەتدا تێپەڕ دەبێ، سوبەیعە وتی: کاتێ کە ئەوەی پێ گوتم ئێوارێ خۆمم کۆکردەوە بە جلەکانم، رۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی بەسەرهاتەکەی خۆم پرسیارم لێ کرد، فەتوای بۆ دام، کە لەدوای دانانی سکەکەم عیددەم تەواو بووە، فەرمانی پێ کردم ئەگەر ویستم شو بکەمەوە.

ئیبنو شیهاب راوی فەرموودەکە دەڵێ: قەیدی نیە کە ژنی سك پڕ ئیتر مێردەکەی مردبێ یان تەڵاقدراو بێ کە سکەکەی دانا شو بکاتەوە، با لەخوێنی زەیسانیش پاك نەبوبێتەوە، بەڵام مێردە تازەکەی نابێ بچێتە لای هەتا لە خوێنی زەیسانیەکەی پاك دەبێتەوە.

**٢٣٠٧ - (صحيح) عن عبد الله قال: مَنْ شَاءَ لاَعَنْتُهُ، لأُنْزِلَتْ سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى بَعْدَ الأَرْبَعَةِ الأَشْهُرِ وَعَشْرًا.**

واتە: (عَبْدُ اللَّه) دەڵێت: ئەوەندە دڵنیام لەسەر ئەوەی کە عیددەی ئافرەتی سك پڕ دانانی سکەکەیەتی، ئەوەی بیەوێ (موباهلە)ی لەگەڵ دەکەم - واتە نەفرەتی خوای گەورە لەو کەسەمان بێت کە هەڵەیکردوە - ، سوێند بە (الله) سورەتی (النِّسَاءِ الْقُصْرَى) واتە سورەتی (طلاق) ئەوەی سەرەوە دەسەلمێنێ ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ﴾ سورة الطلاق : ٥. لەدوای سورەتی (البقرە) وە هاتۆتەخوارەوە کە تێیدا عیددەی ئافرەتێ مێردەکەی بمرێت چوار مانگ و دە شەوە.

## باسی دەربارەی عیددەی کەنیزەکێ کە دایکی منداڵ بێ

## ٤٨ - باب فِي عِدَّةِ أُمِّ الْوَلَدِ.

**٢٣٠٨ - (صحيح) عن عمرو بن العاص، قال: لاَ تَلْبِسُوا عَلَيْنَا سُنَّتَهُ، قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: سُنَّةَ نَبِيِّنَا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عِدَّةُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. يَعْنِي أُمَّ الْوَلَدِ.**

واتە: عەمری کوڕی عاص دەڵێت: سوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لێ تێك مەدەن دەربارەی عیددەی کەنیزەکێ کە دایکی منداڵ بێ - واتە گەورەکەی بچێتە لای و سکی پڕ بێ لەپاشدا منداڵی ببێ ئەوە دەبێتە دایکی منداڵەکەی و ئیتر بۆی نیە بیفرۆشێ - ئیبنو (مثنى) وتویەتی: سوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئەمەیە ئەگەر ژنێ مێردەکەی بمرێت عیددەکەی چوار مانگ و دە شەوە. واتە کەنیزەکێ کە دایکی منداڵ بێ – ئەگەر گەورەکەی بمرێت عیددەکەی وەك ژنانی تر چوار مانگ و دە شەوە.

## باسی ژنی تەڵاقدراو بە یەكجاری ناگەڕێتەوە بۆلای مێردەكەی هەتا شو نەكات بە كەسێكی تر – جا ئەگەر مێردە تازەكەی مرد یان تەڵاقی دا ئەوكاتە بۆی هەیە مارەی بكاتەوە –

## ٤٩ – باب الْمَبْتُوتَةِ لاَ يَرْجِعُ إِلَيْهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ.

٢٣٠٩ - (صحيح) عن عائشة قالت: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ - يَعْنِى ثَلاَثًا - فَتَزَوَّجَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ، فَدَخَلَ بِهَا، ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يُوَاقِعَهَا، أَتَحِلُّ لِزَوْجِهَا الأَوَّلِ؟ قَالَتْ: قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَحِلُّ لِلأَوَّلِ حَتَّى تَذُوقَ عُسَيْلَةَ الآخَرِ وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پیرسیار كرا دەربارەی پیاوێ ژنەكەی تەڵا بدات – واتە سێ تەڵاقەی بدات – جا شو بكات بە كەسێكی تر، بە تەنیا لەگەڵی مایەوە، لەپاشدا ئەگەر مێردە تازەكەی تەڵاقی دا پێش ئەوەی لەگەڵی جوت بێ: ئایا بۆ مێردی یەكەم حەڵاڵە یان نا؟ عائیشە وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بۆ مێردی یەكەم حەڵاڵ نیە هەتا لەگەڵ مێردی دووەم شیرنی یەكتر نەچێژن واتە هەتا لەگەڵ یەك جوت نەبن بە شێوەیە كە خۆشتن واجب بكات).

## باسی دەربارەی زینا کە گەورەترین گوناهە.

## ٥٠ – باب فِي تَعْظِيمِ الزِّنَا.

٢٣١٠ - (صحيح) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: (أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ). قَالَ: فَقُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ). قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: (أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ). قَالَ: وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى تَصْدِيقَ قَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) - ی کوڕی مەسعود - ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چ گوناهێ گەورەترین گوناهە؟ فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار بدەیت لەکاتێکدا کە دروستی کردویت). وتی: وتم: ئەی لەدوای ئەوە؟ فەرمووی: (منداڵەکەت بکوژی لەترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوات). وتی: وتم: ئەی لەپاش ئەوە چی تر؟ فەرمووی: (زینا لەگەڵ هاوسەری دراوسێکەت بکەیت). وتی: خوای گەورە بۆ سەلماندنی راستی فەرموودەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ). واتە: وە کەسانێکن کەلەگەڵ خوادا ناپەرستن هیچ پەرستراوێکی تر و، ناکوژن هیچ کەسێ کەخوا کوشتنی ئەوی یاساغ(حەرام)کردووە بەهەقو ڕەوا نەبێ، وە زیناو داوێن پیسی ناکەن.

**٢٣١١ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله، قال: جَاءَتْ مُسَيْكَةُ لِبَعْضِ الأَنْصَارِ، فَقَالَتْ: إِنَّ سَيِّدِي يُكْرِهُنِي عَلَى الْبِغَاءِ، فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ: (وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: موسەیکە هاتە خزمەت هەندێ لە ئەنصار، وتی: گەورەکەم ناچارم دەکات لەسەر ئەوەی کە زینا بکەم، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ). سورة النور: ٣٣. واتە: وە کەنیزەکەکانتان زۆر لێ مەکەن (ناچاریان مەکەن) لەسەر زینا.

**٢٣١٢ - (صحيح مقطوع) عن معتمر: عن أبيه، (وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾). قَالَ: قَالَ سَعِيدُ بْنُ أَبِي الْحَسَنِ: غَفُورٌ لَهُنَّ: الْمُكْرَهَاتِ.**

واتە: لە لە موعتەمیرەوە، لە باوکیەوە هاتوە، سەبارەت بەم ئایەتە: (وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾). سورة النور: ٣٣. واتە: جا هەرکەس ناچاریان بکات (زۆریان لێ بکات)، ئینجا بەراستی خوا دوای ئەو زۆر لێ کردنەیان لێبووردەی میهرەبانە (بەو کەنیزەکانە کە بەزۆر زینایان پێ کراوە).

راوی وتویەتی: سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەن وتی: (غَفُورٌ لَهُنَّ). لەبەرئەوەیە کە ناچار دەکران داوێن پیسی بکەن بۆیە خوای گەورە لێبووردەی میهرەبانە بەرامبەریان.

## کۆتایی پەرتوکی تەلاق.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی ڕۆژوو

## ١٤ – أول كتاب الصيام.

## باسی دەستپێکردنی فەرزبوونی ڕۆژوو.

## ١ – باب مَبْدَإِ فَرْضِ الصِّيَامِ.

٢٣١٣ - (حسن صحيح) عـن ابـن عبـاس: ( يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ). فَكَانَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا صَلَّوُا الْعَتَمَةَ حَرُمَ عَلَيْهِمُ الطَّعَامُ وَالشَّرَابُ وَالنِّسَاءُ وَصَامُوا إِلَى الْقَابِلَةِ، فَاخْتَانَ رَجُلٌ نَفْسَهُ، فَجَامَعَ امْرَأَتَهُ وَقَدْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَلَمْ يُفْطِرْ فَأَرَادَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يَجْعَلَ ذَلِكَ يُسْرًا لِمَنْ بَقِيَ وَرُخْصَةً وَمَنْفَعَةً، فَقَالَ سُبْحَانَهُ: ( عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ ). وَكَانَ هَذَا مِمَّا نَفَعَ اللَّهُ بِهِ النَّاسَ وَرَخَّصَ لَهُمْ وَيَسَّرَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە سەبارەت بەم ئایەتە: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ).سورة البقرة: ١٨٣. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر نووسراوە، هەروەك نووسراوە لەسەر ئەوانەی لەپێش ئێوەدا بوون بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن.

وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لەپێشدا خەڵك نوێژی خەوتنانیان دەکرد ئیتر هەتا شەوی دواتر ژن و خواردن و خواردنەوەیان لێ حەرام دەبوو، هەتا پیاوێ ستەم و ناپاکی لەگەڵ خۆی دەکات و لەدوای نوێژی خەوتنان لەگەڵ ژنەکەی جوت دەبێت، جا خوای گەورە ویستی ئەمە بکات بەهۆی کارئاسانی و مۆڵەت و قازانج بۆ ئەم ئوممەتە، خوای گەورە فەرمووی: (عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَخۡتَانُونَ أَنفُسَكُمۡ). سورة البقرة: ١٨٧. واتە: خوای گەورە باش دەزانێ و ئاگادارە کە ئێوە لەم بارەوە ناپاکی و فێڵتان لە نەفسی خۆتان کردوە.

جا خوای گەورە ئەمەی کرد بەهۆی کارئاسانی و مۆڵەت و قازانج بۆیان.

٢٣١٤ - (صحيح) عن البرّاء قال: كَانَ الرَّجُلُ إِذَا صَامَ فَنَامَ، لَمْ يَأْكُلْ إِلَى مِثْلِهَا، وَإِنَّ صِرْمَةَ بْنَ قَيْسٍ الأَنْصَارِيَّ أَتَى امْرَأَتَهُ وَكَانَ صَائِمًا فَقَالَ: عِنْدَكِ شَيْءٌ؟ قَالَتْ: لاَ لَعَلِّي أَذْهَبُ فَأَطْلُبُ لَكَ شَيْئًا، فَذَهَبَتْ وَغَلَبَتْهُ عَيْنُهُ، فَجَاءَتْ فَقَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ، فَلَمْ يَنْتَصِفِ النَّهَارُ حَتَّى غُشِيَ عَلَيْهِ، وَكَانَ يَعْمَلُ يَوْمَهُ فِي أَرْضِهِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَنَزَلَتْ: (أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡ..) قَرَأَ إِلَى قَوْلِهِ (مِنَ ٱلۡفَجۡرِ).

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر پیاوێ بەرِۆژوو بوایە پێش ئەوەی بەربانگ بکاتەوە خەوی لێ بکەوتایە ئیتر دەبوو ئەو شەوەیش هەتا سبەی ئێوارێ بەرِۆژوو بوایەو هیچی نەخواردایەو رِۆژووی نەشکاندایە، رِۆژێ صیرمەی کوری قەیسی ئەنصاری بەرِۆژوو دەبێ ئەو رِۆژە لەناو زەویەکەیدا کار دەکات و شەکەت و ماندو دەبێ کاتێ کە دێتەوە بۆ ماڵەوە کە بەربانگ دەبێ بە ژنەکەی دەڵێ: هیچ شتێکت لە خواردن لەلا دەست دەکەوێت؟ وتی: نەخێر، دەرِۆم مشورێکت بۆ دەخۆم بەڵکو شتێکت بۆ پەیدا بکەم، لەبەر ماندوێتی و شەکەتی خەو زۆری بۆ دەهێنێ و خەوی لێ دەکەوێت، کاتێ کە ژنەکەی دێتەوە دەبینێ خەوتوە دەڵێ: داخ لەدەست تۆ، نائومێدی بۆ تۆ، لەکاتی نیوەرِۆدا صیرمە لە برسان دەبورێتەوە، جا ئەم باسەیان بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گێرایەوە، لەوبارەوە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ...) سورة البقرة: ١٨٧. واتە: چونە لای ژنانتان و تێکەڵاوی کردن لەگەڵیاندا لە شەوانی رەمەزاندا بۆتان حەلاڵ کرا ... هەتا گەیشتە: (مِنَ ٱلْفَجْرِ...). واتە: لە شەبەقدا...

## باسی هەڵوەشانەوەی ئایەتی:
## (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ).

## ٢ – باب نَسْخِ قَوْلِهِ (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ).

**٢٣١٥ - (صحيح) عن سلمة بن الأكوع قال: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ). كَانَ مَنْ أَرَادَ مِنَّا أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ فَعَلَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِى بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا.**

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ...) سورة البقرة: ١٨٤. واتە: ئەوانەی کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە — لەجیاتی ئەوە — خواردنی کەم دەستێك بدەن..

سەلەمە وتی: ئێمە بە ئارەزووی خۆمان بوو، ئەوەی ئارەزووی بوایە ڕۆژووی دەشکاند لەجیاتی ئەوە خواردنی کەم دەستێکی دەدا، هەتا ئایەتی دوای ئەو هاتەخوارەوەو هەڵیوەشاندەوە: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ...). سورة البقرة: ١٨٥. واتە: جا هەرکەسێ لەئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی با بەڕۆژوو بێت...

**٢٣١٦ - (حسن) عن ابن عباس: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ) فَكَانَ مَنْ شَاءَ مِنْهُمْ أَنْ يَفْتَدِيَ بِطَعَامِ مِسْكِينٍ افْتَدَى، وَتَمَّ لَهُ صَوْمُهُ فَقَالَ: (فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ) وَقَالَ: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە سەبارەت بەم ئایەتە وتویەتی: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ...) سورة البقرة: ١٨٤. واتە: ئەوانەی کە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە — لەجیاتی ئەوە — خواردنی کەم دەستێك بدەن...

وتویەتی: جا ئەوەی لەوان کە ویستی ڕۆژووەکەی بشکێنێ و لەجیاتی ئەوە خواردنی کەم دەستێك بدات ئەو کارەی کرد، ئەوە ڕۆژووەکەی تەواوەو پاداشتی بۆ هەیە، فەرمووی: (فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ...) سورة البقرة: ١٨٤. واتە: ئەگەر کەسێك بەپێخۆشبوونی خۆی خواردنی زیاتری دا، ئەوە بۆ خۆی باشەو

قازانجی بۆ خۆیەتی، بەجیا پاداشتی زیادەکەشی دەدرێتەوەو لای خوای گەورە ون نابێت، خۆ لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بە ڕۆژوو بوون ئەوە گەلێ چاکترە بۆتان...

هەروەها فەرمووی: (فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَ ...). سورة البقرة: ١٨٥. واتە: جا هەرکەسێکتان مانگی ڕەمەزانی بەسەرداهات، وە ڕێبوار و نەخۆش نەبوو، بڕو بیانوی شەرعیشی نەبوو، دەبێ بە ڕۆژوو بێت، ئینجا ئەو کەسەتان نەخۆش و لەش بەبارە، یان لەسەفەرەو ڕێبوارەو ڕۆژووەکەشی دەشکێنێ، دەبێ لە ڕۆژانی دیکەدا، چەند ڕۆژێکی تر بە قەزا بگرێتەوە...

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: فدیەدان و ڕۆژوو شکاندن جێگیرو دامەزراوە بۆ بەساڵاچوان و ئافرەتانی سك پڕ.

## ٣ - باب مَنْ قَالَ: هِيَ مُثْبَتَةٌ لِلشَّيْخِ وَالْحُبْلَى.

**٢٣١٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: أُثْبِتَتْ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: فدیەدان و ڕۆژوو شکاندن جێگیر و دامەزراوە بۆ ئافرەتانی سك پڕ و شیردەر.

**٢٣١٨ - (شاذ) عن ابن عباس: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖ) قَالَ: كَانَتْ رُخْصَةً لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْمَرْأَةِ الْكَبِيرَةِ**

وَهُمَا يُطِيقَانِ الصِّيَامَ أَنْ يُفْطِرَا وَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَالْحُبْلَى وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي عَلَى أَوْلاَدِهِمَا ﴿أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا﴾.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە سەبارەت بەم ئایەتە: (وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ...) سورة البقرة: ١٨٤. واتە: ئەوانەی كە توانای ڕۆژوو گرتنیان نیە — لەجیاتی ئەوە — خواردنی كەم دەستێك بدەن ...

وتویەتی: ئەمە مۆڵەت(روخسەت)ێ بوو بۆ پیرەمێرد و پیرەژن كە ناتوانن ڕۆژوو بگرن. ئەوە دەتوانن ڕۆژوو نەگرن، لەجیاتی هەر ڕۆژێك خواردنی كەم دەستێك بدەن، ئافرەتی سك پڕ و شیردەریش ئەگەر ترسیان هەبوو - واتە ئەگەر ترسی منداڵەكەیان هەبوو بە هەمان شێوە - . ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر ترسی منداڵەكەیان هەبێت ئەوە (ڕۆژوو نەگرن و لەجیاتیدا خواردن بدەن).

٢٣١٩ - (صحيح) عن أبن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لاَ نَكْتُبُ، وَلاَ نَحْسُبُ، الشَّهْرُ هَكَذَا، وَهَكَذَا، وَهَكَذَا). وَخَنَسَ سُلَيْمَانُ أُصْبَعَهُ فِي الثَّالِثَةِ، يَعْنِي: تِسْعًا وَعِشْرِينَ، وَثَلاَثِينَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئێمە گەلێكی نەخوێندەوارین نوسین و حساب نازانین، مانگ وا دەبێ ئەوەندەیەو، وا دەبێ ئەوەندەیەو، وە وا دەبێ ئەوەندەیە). - واتە بیستو نۆ ڕۆژە یان سی ڕۆژە، نە لە بیستو نۆ كەمترە وە نە لە سی ڕۆژیش زیاترە - .

سولەیمان راوی فەرموودەکە هەر دە پەنجەکانی کراوە بوون لەسێیەم جاردا پەنجەیەکی نوشتاندەوەو گرتی، واتە: بیستو نۆ، وە سی.

## باسی دەگونجیٚ مانگ بیستو نۆ ڕۆژ بێت.

## ٤ – باب الشَّهْرِ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ.

٢٣٢٠ - (صحيح) عن أبن عمر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ فَلاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلاَ تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ثَلاَثِينَ). قَالَ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا كَانَ شَعْبَانُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ: نُظِرَ لَهُ فَإِنْ رُؤِيَ فَذَاكَ، وَإِنْ لَمْ يُرَ وَلَمْ يَحُلْ دُونَ مَنْظَرِهِ سَحَابٌ وَلاَ قَتَرَةٌ: أَصْبَحَ مُفْطِرًا، فَإِنْ حَالَ دُونَ مَنْظَرِهِ سَحَابٌ أَوْ قَتَرَةٌ: أَصْبَحَ صَائِمًا، قَالَ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفْطِرُ مَعَ النَّاسِ وَلاَ يَأْخُذُ بِهَذَا الْحِسَابِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (مانگ بیستو نۆ ڕۆژە ڕۆژووی مانگی رەمەزان مەگرن هەتا مانگ دەبینن، هەروەها مەیشکێنن و مەیکەن بە جەژن هەتا مانگی شەوال دەبینن، ئەگەر هەور بوو مانگی شەعبان تەواو بکەن واتە بیکەن بە سی ڕۆژ). راوی وتی: ئیبنو عومەر فەرمانی دەدا کە بۆی سەیر بکەن ئەگەر مانگی رەمەزانیان بدیایە ئەوە بەڕۆژوو دەبوو، بەڵام ئەگەر هەور و تەم و مژ و غوبار بوایە بەڕۆژوو نەدەبوو مانگی شەعبانی تەواو دەکرد واتە دەیکرد بە

سی ڕۆژ، راوی وتی: ئیبنو عومەر لەگەڵ خەڵك ڕۆژووی دەشكاند گوێی نەدەدا بە حسابی مانگ كە بیستو نۆ ڕۆژە یان سی.

**٢٣٢١ - (صحيح مقطوع) عن أيوب قال: كَتَبَ عُمَرُ بْـنُ عَبْـدِ الْعَزِيـزِ إِلَى أَهْلِ الْبَصْرَةِ: بَلَغَنَا عَنْ رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، نَحْوَ حَدِيثِ ابْنِ عُمَرَ، عَنِ النَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، زَادَ: (وَإِنَّ أَحْسَنَ مَا يُقَدَّرُ لَهُ إِذَا رَأَيْنَا هِلاَلَ شَـعْبَانَ لِكَذَا وَكَذَا: فَالصَّوْمُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لِكَـذَا وَكَـذَا، إِلاَّ أَنْ تَـرَوُا الْهِلاَلَ قَبْلَ ذَلِكَ).**

واتە: لە ئەیوبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: عومەری كوڕی (عبد العزيز) نامەی نوسی بۆ خەڵكی بەصرە: لە پێغەمبەری خـواوە (صلى الله عليه وسلم) پێمـان گەیشـتوە، جـا راوی فەرمودەكەی گێڕایەوە وەك فەرمودەكەی پێشوی ئیبنو عومـەر رەزای خوایـان لـێ بـێ، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد كرد: (باشترین كاتێ كە مەزەندەی بكەین بۆ تـەواو كردنـی مـانگ ئەوەیە ئەگەر مانگی شەعبانمان دی ئەوە مانگی شەعبان سی ڕۆژە، لـەدوای ئـەوە ئـیتر بەویستی خوای گەورە ڕۆژووی مانگی رەمەزان دەست پێ دەكات، مەگـەر ڕۆژێ پێشـتر لەلایەن خەڵكەوە بینرا بێت ئەوكاتـە لـەدوای بیسـتو نـۆی مـانگی شـەعبانەوە ڕۆژووی رەمەزان دەست پێ دەكات).

**٢٣٢٢ - (صحيح) عن ابن مسعود قال: لَمَا صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا مَعَهُ ثَلاَثِينَ.**

واتە: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەڕۆژوو دەبوین بیستو نۆ ڕۆژ و سی ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوین، بەڵام زیاتر بیستو نۆ ڕۆژ لەگەڵی بەڕۆژوو دەبوین.

**٢٣٢٣ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي بكرة، عن أبيه، عن النبِي صلى الله عليه و سلم قال: (شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ: رَمَضَانُ، وَذُو الْحِجَّةِ).**

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی ئەبی بەکرەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (پاداشتی پەرستشی مانگی ڕەمەزان و، مانگی (ذي الحجة) وەك یەکەو کەم ناکات ئیتر مانگ بیستو نۆ ڕۆژ بێ یان سی ڕۆژ).

## باسی ئەگەر خەڵك لەبینینی مانگدا هەڵەیان کرد حوکمی چیە؟

## ٥ - باب إِذَا أَخْطَأَ الْقَوْمُ الْهِلاَلَ.

**٢٣٢٤ - (صحيح) عن أبي هريرة ذكر النبِي صلى الله عليه و سلم فيه قال: (وَفِطْرُكُمْ يَوْمَ تُفْطِرُونَ، وَأَضْحَاكُمْ يَوْمَ تُضَحُّونَ، وَكُلُّ عَرَفَةَ مَوْقِفٌ، وَكُلُّ مِنًى مَنْحَرٌ، وَكُلُّ فِجَاجِ مَكَّةَ مَنْحَرٌ، وَكُلُّ جَمْعٍ مَوْقِفٌ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ڕۆژوو شكاندن و كردن بە جەژن ئەو ڕۆژەیە كە خەڵك دەیكەن بە جەژن، قوربانی كردن لەو ڕۆژەدایە كە خەڵك قوربانی دەكەن، هەموو خاكی عەرەفە شوێنی راوەستانە لە ڕۆژی عەرەفەدا، هەموو خاكی مینا شوێنی سەربڕینی ئاژەڵە، هەموو رێگا فراوانەكانی شاری مەككە شوێنی سەربڕینی ئاژەڵە، هەموو خاكی موزدەلیفە شوێنی راوەستانە). — ئەگەر خەڵك هەڵەیان كرد لە بینینی مانگدا ئیتر ئەو پەرستش و مەناسكانە قەزاكردنەوەیان ناوێ - .

**٢٣٢٥ - (صحيح) عن عائيشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَحَفَّظُ مِنْ شَعْبَانَ مَا لاَ يَتَحَفَّظُ مِنْ غَيْرِهِ، ثُمَّ يَصُومُ لِرُؤْيَةِ رَمَضَانَ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْهِ عَدَّ ثَلاَثِينَ يَوْمًا ثُمَّ صَامَ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مانگەكانی تر زیاتر گرنگی دەدا بە حسابی مانگی شەعبان ، لەپاشدا ئەگەر مانگی رەمەزانی بدیایە بەڕۆژوو دەبوو، ئەگەر هەور بوایە مانگی نەدیایە ئەوە مانگی شەعبانی تەواو دەكرد واتە سی ڕۆژی لە مانگی شەعبان تەواو دەكرد، لەپاشدا بەڕۆژوو دەبوو.

## باسی ئەگەر مانگ نەبینرا.

## ٦ - باب إِذَا أُغْمِيَ الشَّهْرُ.

٢٣٢٦ - (صحيح) عن حذيفة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِـدَّةَ، ثُـمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلاَلَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ).

واتە: لە (حذيفة)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پێش کاتی مانگ مەکەون و بڕیاری ڕۆژووگرتن مەدەن هەتا مانگ دەبینن یان مانگ تەواو دەکەن واتە سی ڕۆژی تەواو، لەپاشدا بەڕۆژوو بن هەتا مانگ دەبینن یان مانگ تەواو دەکەن).

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەگەر مانگ نەبینرا سی ڕۆژی تەواو بەڕۆژوو بن.

## ٧ - باب مَنْ قَالَ: فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلاَثِينَ.

٢٣٢٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ بِصِيَامِ يَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، وَلاَ تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ حَالَ دُونَهُ غَمَامَةٌ فَأَتِمُّوا الْعِدَّةَ

ثَلاَثِينَ، ثُمَّ أَفْطِرُوا، وَ الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ). قَالَ أَبُــو دَاوُدَ: رَوَاهُ حَاتِمُ بْنُ أَبِي صَغِيرَةَ وَشُعْبَةُ وَالْحَسَــنُ بْــنُ صَــالِحٍ عَــنْ سِمَاكٍ بِمَعْنَاهُ، لَمْ يَقُولُوا: (ثُمَّ أَفْطِرُوا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویــەتی: پێغەمبــەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (پێش کاتی مانگی رەمەزان مەکەون بە رۆژێ یــان دوو رۆژ رۆژووگرتن، مەگەر رێك بکەوێ لەگەڵ رۆژووی کەسێ لە ئێوە کە عادەتی وابــێ لەو رۆژەدا بەرۆژوو بێت - بۆ نمونە کەسێ رۆژی نا رۆژێ بە رۆژوو بێ - ، بەرۆژوو مەبن هەتا مانگی رەمەزان دەبینن، لەپاشدا بەرۆژوو بن هەتا مانگی شــەوال دەبیــنن، ئەگــەر هەور بوو مانگ نەبینرا ئەوا مانگ تــەواو بکــەن واتــە ســی رۆژی تــەواو رۆژوو بگــرن، لەپاشدا رۆژوو بشکێنن و بیکەن بە جەژن، دەگونجێ مانگ بیستو نۆ بــێ بــەس هــەموو کاتێك نا).

ئەبو داود دەڵێت: حاتیمی کوڕی ئەبو (صغیره)و شوعبەو حەسەنی کــوڕی صــالّح لــە سیماکەوە بە هەمان مانا ئــەم فــەرمودەیان گێڕاوەتــەوە بــەلاّم باســی: (ثُمَّ أَفْطِرُوا)یــان نەکردوە.

## باسی دەربارەی پێشکەوتنی مانگی رەمەزان بە ڕۆژووگرتن لە مانگی شەعباندا.

## ٨ - باب فِي التَّقَدُّمِ.

٢٣٢٨ - (صحيح) عن عمران بن الحصين، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِرَجُلٍ: (هَلْ صُمْتَ مِنْ سَرَرِ شَعْبَانَ شَيْئًا). قَالَ: لاَ، قَالَ: (فَإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمًا). وَقَالَ: أَحَدُهُمَا: (يَوْمَيْنِ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە پیاوێکی فەرموو: (ئایا لە (سَرَر)ی مانگی شەعباندا هیچ بەڕۆژوو بویت؟). - (سَرَر) دەڵێن: سەرەتای مانگە، دەڵێن: ناوەڕاستی مانگە، دەڵێن: کۆتایی مانگە - ، وتی: نەخێر، فەرمووی: (دەی کاتێ ڕۆژووی مانگی رەمەزانت تەواو کرد ڕۆژێ بەڕۆژوو بە). یەکێ لە راویەکان وتی: فەرمووی: (دوو ڕۆژ بە ڕۆژوو بە).

٢٣٢٩ - (ضعيف) عن أبو الأزهر المغيرة بن فروة قال: قَامَ مُعَاوِيَةُ فِي النَّاسِ بِدَيْرِ مِسْحَلٍ الَّذِي عَلَى بَابِ حِمْصَ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا قَدْ رَأَيْنَا الْهِلاَلَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، وَأَنَا مُتَقَدِّمٌ بِالصِّيَامِ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَفْعَلَهُ فَلْيَفْعَلْهُ، قَالَ: فَقَامَ إِلَيْهِ مَالِكُ بْنُ هُبَيْرَةَ السَّبَئِيُّ فَقَالَ: يَا مُعَاوِيَةُ، أَشَيْءٌ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمْ شَيْءٌ مِنْ رَأْيِكَ؟

قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (صُومُوا الشَّهْرَ وَسِرَّهُ).

واتە: لە ئەبو ئەزهەری موغیرەی کوڕی فەروەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: موعاویە لە (دَيْر مِسْحَل) لە (باب حمص) وتاری دەدا، وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە مانگی شەعبانمان دیوە لەو ڕۆژەو لەو ڕۆژەدا، لەبەر ئەوە من لەپێش مانگی ڕەمەزانەوە بەڕۆژوو دەبم. ئەوەی دەیەوێت بە ڕۆژوو بێ با بەڕۆژوو بێت، ڕاوی وتی: مالیکی کوڕی هەبیرەی سەبەئی هاستایەوە وتی: ئەی موعاویە ئەوەی کە باست کرد شتێکە لە پێغەمبەری خوات (صلى الله عليه وسلم) بیستوە، یان ڕاو بۆچونی خۆتە؟ وتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو فەرمووی: (مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بن لەگەڵ کۆتایی مانگی شەعباندا).

٢٣٣٠ – (شاذ مقطوع) عن سليمان بن عبد الرحمن الدمشقي في هذا الحديث قال: قال الوليد: سَمِعْتُ أَبَا عَمْرٍو - يَعْنِي الأَوْزَاعِيَّ - يَقُولُ سِرُّهُ أَوَّلُهُ.

واتە: لە سولەیمانی کوڕی (عبد الرحمن)ی دیمەشقیەوە هاتوە، لەم فەرموودەدا وتویەتی: وەلید وتی: گوێم لە ئەبو عەمر بوو – واتە پێشەوا ئەوزاعی – دەیوت: (سِرُّه) سەرەتای مانگی شەعبانە.

٢٣٣١ - (شاذ أيضا) عن أبو مسهر قال: كَانَ سَعِيدٌ - يَعْنِي ابْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ - يَقُولُ سِرُّهُ أَوَّلُهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ بَعْضُهُمْ: سِرُّهُ وَسَطُهُ، وَقَالُوا: آخِرُهُ.

واتە: لە ئەبو موسهیرەوە هاتوە، کە وتویەتی: سەعید — واتە سەعیدی کوڕی عبد العزیز)— وتی: (سِرُّه) سەرەتای مانگی شەعبانە. ئەبو داود دەڵێت: هەندێ لە راویەکان دەڵێن: (سِرُّه) ناوەڕاستی مانگی شەعبانە. وە دەڵێن: کۆتایی مانگی شەعبانە.

## باسی ئەگەر شەوێ لەولاتێ لەپێش ولاتانی تردا مانگ بینرا حوکمی چیە؟

## ٩ - باب إِذَا رُؤِيَ الْهِلاَلُ فِي بَلَدٍ قَبْلَ الآخَرِينَ بِلَيْلَةٍ.

٢٣٣٢ - (صحيح) عن كريب: أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ ابْنَةَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ، قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، فَاسْتُهِلَّ رَمَضَانُ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْنَا الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلاَلَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ؟ قُلْتُ: رَأَيْتُهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، قَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ، وَصَامُوا وَصَامَ مُعَاوِيَةُ، قَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلاَ نَزَالُ نَصُومُهُ حَتَّى نُكْمِلَ الثَّلاَثِينَ أَوْ نَرَاهُ، فَقُلْتُ: أَفَلاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ قَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: لە کورەیبەوە دەگێرنەوە، کە (أُمَّ الْفَضْلِ)ی کچی (حارثة) ناردویەتی بۆلای

موعاويە لە شام - ئەو كاتە موعاويە فەرمانڕەوای شام بوو - كورەيب وتـی: كـاتێ كـە گەيشتمە شام كارەكانی (أُمَّ الْفَضْـل)م جێبەجێ كرد— واتـە نامەكـەيم گەيانـدە دەسـتی موعاويە - ، هەر لە شام بووم مانگ بينرا، شەوی هەينی مانگمان بينی، لەپاشـدا لـە كۆتايی مانگی رەمەزاندا هاتمەوە و گەيشتمەوە شاری مەدينە، ئيبنو عـەباس پرسـياری سەفەرەكەی لێ كردم، لەپاشدا باسی بينينی مانگی كرد، وتی: ئێوە كەی مانگتـان دی؟ وتم: شەوی هەينی مانگم دی، وتی: تۆ بەچاوی خۆت مانگت دی؟ وتم: بـەڵێ، خـەڵكيش بينيان و هەموو بەڕۆژوو بوون و موعاويەش بەڕۆژوو بوو، ئيبنو عەباس وتی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە مانگمان ديوە، بەردەوام بەڕۆژوو دەبين هـەتا سـی ڕۆژ تـەواو دەكـەين يـان خۆمان مانگ دەبينين، وتم: ئايا بينينی مانگ لەلايەن موعاويەوەو بەڕۆژوو بـوونی ئـەو بەس نيە؟ وتی: نا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوەها فەرمانی پێ كردوين.

**٢٣٣٣ - (صحيح مقطوع) عـن الحسـن، فِـي رَجُـلٍ كَـانَ بِمِصْـرٍ مِـنَ الأَمْصَارِ، فَصَامَ يَوْمَ الاِثْنَـيْنِ، وَشَـهِدَ رَجُـلاَنِ أَنَّهُمَـا رَأَيَـا الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الأَحَدِ، فَقَالَ: لاَ يَقْضِي ذَلِكَ الْيَـوْمَ الرَّجُـلُ وَلاَ أَهْلُ مِصْـرِهِ، إِلاَّ أَنْ يَعْلَمُـوا أَنَّ أَهْـلَ مِصْـرٍ مِـنْ أَمْصَـارِ الْمُسْلِمِينَ قَدْ صَامُوا يَوْمَ الأَحَدِ فَيَقْضُونَهُ.**

واتە: پرسيار كرا لـە حەسـەن - ی بەصـری - سـەبارەت بـە پيـاوێ لـە وڵاتـێ لـە وڵاتەكاندا، ڕۆژی دوو شەممە ڕۆژووی مانگی رەمەزان بگرێت خەڵكی ئـەو وڵاتـەش ڕۆژی دوو شەممە بەڕۆژوو بن، جا دوو پياو شايەتيان دا كە شەوی يەك شەممە مانگيـان ديـوە - واتە بە قسەی ئەوان بێ ئەمان ڕۆژێكيان فەوتاوە — : ئايا ئەو پياوەو خەڵكی وڵاتەكـەی ڕۆژی شەممە بگرنەوە يان نا؟ حەسەن وتی: ئەو پياوەو خەڵكی وڵاتەكەی لەسەريان نيە ئەو ڕۆژە واتە ڕۆژی شەممە بگێڕنەوە، مەگەر خەڵكی وڵاتێ لە وڵاتانی موسوڵمانان كە نزيكی وڵاتەكەی ئەوانە ڕۆژی شەممەيان گرتبێ ئەو كاتە دەبێ قەزای بكەنەوە.

## باسی ناپەسەندی ڕۆژوو گرتن لەو ڕۆژەدا کە گومانی تێدایە ڕەمەزانە یان نا.

## ١٠ - باب كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ الشَّكِّ.

**٢٣٣٤ - (صحيح) عن صلة قال: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَأُتِيَ بِشَاةٍ، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ هَذَا الْيَوْمَ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە (صِلَة) - ی کوڕی (زفر) - وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت عەممار‌دا بووین لەڕۆژێکدا گومانی تێدا هەبوو کە ڕەمەزانە یان نا، گۆشتی - برژاوی - مەڕیان بۆ هێنا، هەندێ لە خەڵکەکە چونە دواوەو لە گۆشتەکەیان نەخوارد چونکە بەڕۆژوو بوون، عەممار وتی: ئەوەی ئەمڕۆ بەڕۆژوو بێت بێگومان لە فەرمانی باوکی قاسم (صلی الله علیه وسلم) دەرچوە.

# باسی دەربارەی ئەوەی کە ڕۆژووی مانگی شەعبان دەداتە دەم ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

## ١١ – باب فِيمَنْ يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ.

**٢٣٣٥ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَقَدَّمُوا صَوْمَ رَمَضَانَ بِيَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ صَوْمًا يَصُومُهُ رَجُلٌ فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الصَّوْمَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پێش کاتی مانگی ڕەمەزان مەکەون بە ڕۆژێ یان دوو ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە کۆتایی مانگی شەعباندا، مەگەر ڕێك بکەوێ لەگەڵ ڕۆژووی کەسێ لە ئێوە کە عادەتی وابێ لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بێت - بۆ نمونە کەسێ ڕۆژی نا ڕۆژێ بە ڕۆژوو بێ یان دوو شەممان و پێنج شەممان - ).

**٢٣٣٦ - (صحيح) عن أم سلمة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَصُومُ مِنَ السَّنَةِ شَهْرًا تَامًّا، إِلاَّ شَعْبَانَ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ.**

واتە: لە ئومو سەلەمەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هیچ مانگێکی ساڵدا - سی ڕۆژەکە بەتەواوی بەڕۆژوو نەدەبوو جگە لە مانگی ڕەمەزان – زۆرترین ڕۆژی هیچ مانگێ بەڕۆژوو نەدەبوو مەگەر مانگی شەعبان کە دەیدایە دەم مانگی ڕەمەزان.

# باسی ناپەسەندی ڕۆژووی کۆتایی مانگی شەعبان

## ١٢ - باب فِي كَرَاهِيَةِ ذَلِكَ.

**٢٣٣٧ - (صحيح) عن عبد العزيز بن محمد قال: قَدِمَ عَبَّادُ بْنُ كَثِيرٍ الْمَدِينَةَ، فَمَالَ إِلَى مَجْلِسِ الْعَلاَءِ فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَأَقَامَهُ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّ هَذَا يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلاَ تَصُومُوا). فَقَالَ الْعَلاَءُ: اللَّهُمَّ إِنَّ أَبِي حَدَّثَنِي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِذَلِكَ.**

واتە: لە (عَبْدُ العزيز)ی کوڕی موحەممەدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: عەببادی کوڕی (کثیر) هاتە لامان لە مەدینە، چوو بۆ کۆڕو دانیشتنی (عَلاء) — ی کوڕی (عَبْد الرَّحْمَن) - دەستی (عَلاء)ی گرت و هەڵیساند - چونکە کاری پێی هەبوو - ، لەپاشدا وتی: (اللَّهُمَّ) ئەمە لە باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر مانگی شەعبان نیوە بوو ئەوە ڕۆژوو مەگرن). (عَلاء) وتی: (اللَّهُمَّ) باوکم، لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی بۆ گێڕاومەتەوە: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر مانگی شەعبان نیوە بوو ئەوە ڕۆژوو مەگرن).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَكَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ لاَ يُحَدِّثُ بِهِ، قُلْتُ لأَحْمَدَ: لِمَ؟ قَالَ: لأَنَّهُ كَانَ عِنْدَهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ، وَقَالَ: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خِلاَفَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَيْسَ هَذَا عِنْدِي خِلاَفَهُ وَلَمْ يَجِئْ بِهِ غَيْرُ الْعَلاَءِ عَنْ أَبِيهِ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ڕیوایەتێکی تردا (عَبْد الرَّحْمَن) واتە باوکی (عَلاء) ئەمەی نەگێڕاوەتەوە، بە ئەحمەدم وت: بۆچی؟ وتی: چونکە (عَبْد الرَّحْمَن) ئەو فەرموودەی لایە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مانگی شەعبانی دەدایە دەم مانگی ڕەمەزان. هەروەها وتی: لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) پێچەوانەی ئەمە هاتووە. ئەبو داود دەڵێت: پێچەوانەی ئەمە لەلای من نیە، جگە لە (عَلاء) ئەویش لە باوکیەوە، لە کەسی ترەوە ئەمە نەهاتووە.

## باسی دەربارەی شایەتی دوو پیاو کە مانگی شەوالیان دیوە.

## ١٣ – باب شَهَادَةِ رَجُلَيْنِ عَلَى رُؤْيَةِ هِلاَلِ شَوَّالٍ.

٢٣٣٨ – (صحيح) عن حسين بن الحارث الجدلي – من جديلة قيس – :

أَنَّ أَمِيرَ مَكَّةَ خَطَبَ ثُمَّ قَالَ: عَهِدَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَنْسُكَ لِلرُّؤْيَةِ، فَإِنْ لَمْ نَرَهُ وَشَهِدَ شَاهِدَا عَدْلٍ: نَسَكْنَا بِشَهَادَتِهِمَا، فَسَأَلْتُ الْحُسَيْنَ بْنَ الْحَارِثِ: مَنْ أَمِيرُ مَكَّةَ؟ قَالَ: لاَ أَدْرِي. ثُمَّ لَقِيَنِي بَعْدُ فَقَالَ: هُوَ الْحَارِثُ بْنُ حَاطِبٍ أَخُو مُحَمَّدِ بْنِ حَاطِبٍ. ثُمَّ قَالَ الأَمِيرُ: إِنَّ فِيكُمْ مَنْ

هُوَ أَعْلَمُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ مِنِّي، وَشَهِدَ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى رَجُلٍ، قَالَ الْحُسَيْنُ: فَقُلْتُ لِشَيْخٍ إِلَى جَنْبِي: مَنْ هَذَا الَّذِي أَوْمَأَ إِلَيْهِ الأَمِيرُ؟ قَالَ: هَذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، وَصَدَقَ كَانَ أَعْلَمَ بِاللَّهِ مِنْهُ، فَقَالَ: بِذَلِكَ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واته: لە حوسەینی كوڕی (حارث)ی جەدەلییەوە دەگێڕنەوە، كە فەرمانڕەوای مەدینە وتارێكی دا، لەپاشدا وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ كردین كە بە بینینی مانگی نوێی – (ذي الحِجة) دەست بكەین بە خواپەرستی واتە نوێژی جەژن و ئەنجامدانی مەناسكی حەج و قوربانی كردن، ئەگەر مانگمان نەدی دوو پیاوی عادل و دادپەروەر شایەتیان دا كە مانگیان دیوە ئەوە لەسەر شایەتیەكەی ئەوان دەست دەكەین بە پەرستش، لە حوسەینی كوڕی (حارث)م پرسی: فەرمانڕەوای مەدینە كێ بوو؟ وتی: نازانم، جا لەپاش ماوەیە پێم گەیشت وتی: (حارث)ی كوڕی (حاطِب) برای موحەممەدی كوڕی (حاطِب) بوو، لەپاشدا فەرمانڕەوای مەدینە وتی: ئێوە كەسی واتان تێدایە لەمن شارەزا ترە بە خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی، ئەمە شایەتی دا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە مانگی دیوە ئەویش شایەتیەكەی قبوڵ كرد، بە دەستی ئاماژەی كرد بۆ پیاوێ، حوسەین وتی: پیاوێكی بە تەمەن لە تەنیشتمەوە بوو پێم وت: ئەو پیاوە كێ یە كە فەرمانڕەوا ئاماژەی بۆ كرد، وتی: ئەوە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ، ڕاستی وت لەو شارەزا ترە، وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاوەها فەرمانی پێ كردوین.

**٢٣٣٩ - (صحيح) عن ربعي بن حراش، عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم قال: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ**

رَمَضَانَ، فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ فَشَهِدَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِاللَّهِ لأَهَلاَّ الْهِلاَلَ أَمْسِ عَشِيَّةً، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا، زَادَ خَلَفٌ فِي حَدِيثِهِ: وَأَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ.

واتە: لە ریبعی کوڕی حیراشەوە، لە پیاوێ لە یارانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ناکۆکی کەوتە ناو خەڵکەوە دەربارەی دواهەمین ڕۆژی مانگی ڕەمەزان و بەڕۆژووش بوون، دوو عەرەبی دەشتەکی هاتن لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) شایەتیان دا کە دوێنێ ئێوارە لەپێش خۆرئاوابووندا مانگیان دیوە. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا بە خەڵك کە ڕۆژووەکەیان بشکێنن. خەلەف راوی فەرموودەکە لە فەرموودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: بەیانی بڕۆن بۆ جێگا نوێژەکەیان بۆ ئەوەی نوێژی جەژن بکەن.

## باسی دەربارەی شایەتی یەك کەس کە مانگی دیوە

## ١٤ – باب فِي شَهَادَةِ الْوَاحِدِ عَلَى رُؤْيَةِ هِلاَلِ رَمَضَانَ.

٢٣٤٠ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُ الْهِلاَلَ - قَالَ الْحَسَنُ فِي حَدِيثِهِ: يَعْنِي رَمَضَانَ - فَقَالَ: (أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ

اللَّهُ؟). قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ؟).
قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (يَا بِلاَلُ أَذِّنْ فِي النَّاسِ فَلْيَصُومُوا غَدًا).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: مـن مـانگم دیـوە — حەسەن راوی فەرموودەکە لە فەرموودەکەیدا وتی: واتە مانگی ڕەمەزانم دیوە - پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)؟). وتی: بەڵێ، فـەرمووی: (ئایـا شـایەتی دەدەی کـە موحەممـەد پێغەمبـەری خوایە؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی بیلال جارِ بدە بە ناو خەڵکدا با سـبەینێ بـەڕۆژوو بن).

٢٣٤١ - (ضعيف) عن عكرمة: أَنَّهُمْ شَكُّوا فِي هِلاَلِ رَمَضَانَ مَرَّةً فَأَرَادُوا أَنْ لاَ يَقُومُوا وَلاَ يَصُومُوا، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ مِنَ الْحَرَّةِ، فَشَهِدَ أَنَّهُ رَأَى الْهِلاَلَ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟). قَالَ: نَعَمْ، وَشَهِدَ أَنَّهُ رَأَى الْهِلاَلَ، فَأَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى فِي النَّاسِ أَنْ يَقُومُوا وَأَنْ يَصُومُوا.

واتە: لە عیکریمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جارێ یـاران گومانیـان هـەبوو لەسـەر بینینی مانگی ڕەمەزان ویستیان نە شەو نوێژی تەراویح بکەن نە بۆ بەیانیش بـەڕۆژووش بن، عەرەبێکی دەشتەکی لە حەڕەوە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) شایەتی دا کە مانگی دیوە، هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسـلم) فـەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله) وە من پێغەمبـەری

خوام؟). وتی: بەڵێ، شایەتی دا كە مانگی دیوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا بە بیلال جارِ بدا بە ناو خەڵكدا كە نوێژی تەراویح بكەن و بەیانیش بەرِۆژوو بن.

٢٣٤٢ - (صحيح) عن ابن عمر، قال: تَرَاءَى النَّاسُ الْهِلاَلَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنِّي رَأَيْتُهُ، فَصَامَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: خەڵك تەماشایان دەكردو دەگەڕان بۆ ئەوەی مانگ - ی رەمەزان - ببینن، منیش بە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) راگەیاند: كە من مانگم دیوە، ئیتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رِۆژووی گرت و فەرمانیشی بە خەڵك كرد كە رِۆژوو بگرن.

## باسی سەبارەت بە جەختكردنەوە لەسەر پارشێوكردن.

## ١٥ - باب فِي تَوْكِيدِ السُّحُورِ.

٢٣٤٣ - (صحيح) عن عمرو بن العاص، قال: قال رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ فَصْلَ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ).

واتە: لە عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (جیاوازی ڕۆژووی ئێمە لەگەڵ ڕۆژووی خاوەن نامەکان، خواردنی پارشێوە).

## باسی دەربارەی ئەوانەی کە پارشێو بە سەرەتای ڕۆژ ناودەبەن

## ١٦ - باب مَنْ سَمَّى السَّحُورَ الْغَدَاءَ.

**٢٣٤٤ - (صحيح) عن العرباض بن سارية، قال: دَعَانِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى السَّحُورِ فِي رَمَضَانَ فَقَالَ: (هَلُمَّ إِلَى الْغَدَاءِ الْمُبَارَكِ).**

واتە: لە (عرباض)ی کوڕی ساریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مانگی ڕەمەزاندا بانگی کردم بۆ پارشێو کردن فەرمووی: (وەرن بۆ خواردنی پیت و بەرەکەت) واتە: پارشێو.

**٢٣٤٥ - عن أبي هريرة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (نِعْمَ سَحُورُ الْمُؤْمِنِ التَّمْرُ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (چاکترین پارشێوی باوەڕدار خواردنی خورمایە).

## باسی دەربارەی کاتی پارشێو.

## ١٧ – باب وَقْتِ السُّحُورِ.

٢٣٤٦ - (صحيح) عن عبد الله بن سوادة القشيري، عن أبيه قال: سمعت سمرة بن جندب يخطب وهو يقول: : قال رسول الله صلى الله عليه و سلم (لاَ يَمْنَعَنَّ مِنْ سَحُورِكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ، وَلاَ بَيَاضُ الأُفُقِ الَّذِي هَكَذَا حَتَّى يَسْتَطِيرَ).

واتە: لە (عبد للە)ی کوڕی سەوادەی قوشەیرییەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: سەمورەی کوڕی جوندوب وتاری دەدا گوێم لێ بوو دەیوت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (با بانگی بیلال و بەیانی درۆینە(فجر الكاذب) ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرن، چونکە ئەو کاتە هێشتا شەوی ماوە بخۆن و بخۆنەوە هەتا شەبەق دەدات و ڕووناکی بەیان بڵاودەبێتەوە).

٢٣٤٧ - (صحيح) عن عبد الله بن مسعود قال: قال رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ مِنْ سَحُورِهِ، فَإِنَّهُ يُؤَذِّنُ - أَوْ قَالَ: يُنَادِي - لِيَرْجِعَ قَائِمُكُمْ، وَيَنْتَبِهَ نَائِمُكُمْ، وَلَيْسَ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا). - قَالَ مُسَدَّدٌ: وَجمعَ يَحْيَى كَفَّيْهِ – (حَتَّى يَقُولَ: هَكَذَا) وَمَدَّ يَحْيَى بِأُصْبَعَيْهِ السَّبَّابَتَيْنِ.

واتە: لە (عبد للە)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (با بانگی یەکەم لەلایەن بیلالەوە ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرێت، چونکە ئەو (يُؤَذِّنُ) بانگ دەدات – یان وتی: (يُنَادِي) - بۆ ئەوەی کە هەستاوەکانتان بۆ شەو نوێژ بە ڕکاتێ وتر کۆتایی بە شەو نوێژەکەیان بێنن و کەمێ بحەوێنەوە، خەوتوەکانیشتان ئاگادار بکاتەوە کە نزیکی بەیانە، دەرکەوتنی بەیان بەم شێوەیە نیە). موسەددەد وتی: یەحیا بە دەستی ئاماژەی دا بە بەیانی درۆینە(فجر الکاذب)، - هەروەها یەحیا بە هەردوو پەنجە مژەی ئاماژەی دا بە بەیانی ڕاستگۆ(فجر الصادق) واتە بڵاوبوونەوەی ڕووناکی بەیان.

**٢٣٤٨ - (حسن صحيح) عن قيس بن طلق عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَلاَ يَهِيدَنَّكُمُ السَّاطِعُ الْمُصْعِدُ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الأَحْمَرُ).**

واتە: لە قەیسی کوڕی (طلق)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (بخۆن و بخۆنەوە، با بەیانی درۆینە(فجر الکاذب) ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرێت، بخۆن و بخۆنەوە هەتا شەبەق دەدات و ڕووناکی بەیان بڵاودەبێتەوە).

**٢٣٤٩ - (صحيح) عن عدي بن حاتم قال: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ). قَالَ: أَخَذْتُ عِقَالاً أَبْيَضَ وَعِقَالاً أَسْوَدَ، فَوَضَعْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَنَظَرْتُ فَلَمْ**

أَتَبَيَّنْ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَضَحِكَ فَقَالَ: (إِنَّ وِسَادَكَ لَعَرِيضٌ طَوِيلٌ إِنَّمَا هُوَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ). وَقَالَ عُثْمَانُ: (إِنَّمَا هُوَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ).

واتە: لە عەدی كوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: كاتێ كە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: (حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ). سورة البقرة: ١٨٤. واتە: بخۆن و بخۆنەوە تا هێڵی رەشی شەو لە هێڵی سپی ڕۆژ جیادەكەنەوە.

وتم: من بەشەو پەتێكی سپی و پەتێكی رەش دەخەمە ژێر سەرینەكەم بۆ ئەوەی بەو جۆرە شەو لە ڕۆژ جیابكەمەوە كەچی سەیرم دەكرد بۆم جیانەدەكرایەوە، جا ئەوەم باس كرد بۆ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویش پێكەنی و فەرمووی: (سەرینەكەت زۆر پان و درێژە مەبەست ئەوە نیە، بەڵكو مەبەست لە تاریكی شەو و روناكی ڕۆژە).

## باسی سەبارەت بە كەسێ دەنگی بانگی بەیانی بیست و پەرداخەكەی بەدەستەوە بوو.

## ١٨ – باب فِي الرَّجُلِ يَسْمَعُ النِّدَاءَ وَالإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ.

٢٣٥٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّدَاءَ وَالإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ فَلاَ يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان دەنگی بانگی بیست و پەرداخەکەی بەدەستەوە بوو، ئەوە با داینەنێ هەتا پێویستی خۆی بەجێدەهێنێت).

## باسی دەربارەی کاتی بەربانگی ڕۆژووەوان.

## ١٩ - باب وَقْتِ فِطْرِ الصَّائِمِ.

**٢٣٥١ - (صحيح) عن عاصم بن عمر عن أبيه قال: قال النبي صلى الله عليه و سلم: (إِذَا جَاءَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا، وَذَهَبَ النَّهَارُ مِنْ هَا هُنَا - زَادَ مُسَدَّدٌ: وَغَابَتِ الشَّمْسُ - فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ).**

واتە: لە عاصمی کوڕی عومەرەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر شەو لەوێوە داهات واتە لە خۆر هەڵاتەوە، ڕۆژیش لەوێوە داکەوت واتە لە خۆر ئاواوە — موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: وە خۆر ئاوا بوو - ئیتر ئەوە کاتی بەربانگی ڕۆژووەوانە).

**٢٣٥٢ - (صحيح) عن عبد الله بن أبي أوفى قال: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَمَّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قَالَ: (يَا بِلاَلُ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ أَمْسَيْتَ، قَالَ: (انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. قَالَ: (انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا). فَنَزَلَ فَجَدَحَ، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ**

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ قَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمُ اللَّيْلَ قَدْ أَقْبَلَ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ). وَأَشَارَ بِأُصْبُعِهِ قِبَلَ الْمَشْرِقِ.

واته: لە (عبد الله)ی کوڕی ئەبو ئەوفاوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە سەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دەڕۆیشتین بەڕۆژوو بوو، کاتێ کە خۆر ئاوا بوو فەرمووی: (ئەی بیلال دابەزە قاوت و ئاومان بۆ بکە). بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زووە با ئێوارە بێت، فەرمووی: (دابەزە قاوت و ئاومان بۆ بگرەوە). بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! هێشتا هەر ڕۆژە. فەرمووی: (دابەزە قاوت و ئاومان بۆ بگرەوە). بیلال دابەزی قاوت و ئاوی گرتەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خواردیەوە، لەپاشدا فەرمووی: ئەگەر شەوتان بینی لەوێوە واتە لە خۆر هەڵاتەوە داهات ئیتر کاتی بەربانگی ڕۆژووەوانە). بە پەنجەی ئاماژەی کرد بۆ خۆر هەڵات.

## باسی پەسەندی زوو بەربانگ کردنەوە.

## ٢٠ – باب مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ تَعْجِيلِ الْفِطْرِ.

٢٣٥٣ - (حسن) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَزَالُ الدِّينُ ظَاهِرًا مَا عَجَّلَ النَّاسُ الْفِطْرَ، لأَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى يُؤَخِّرُونَ).

واته: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەردەوام دین ئاشکراو سەرکەوتوە، مادەم خەڵك پەلە بکەن لە بەربانگ کردنەوەدا، چونکە جولەکەو گاورەکان درەنگ ڕۆژوو دەشکێنن).

**٢٣٥٤ - (صحيح) عن أبو عطية قال: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَا وَمَسْرُوقٌ فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلاَةَ وَالآخَرُ يُؤَخِّرُ الإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ الصَّلاَةَ، قَالَتْ: أَيُّهُمَا يُعَجِّلُ الإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ الصَّلاَةَ، قُلْنَا: عَبْدُ اللَّهِ، قَالَتْ: كَذَلِكَ كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: ئەبو (عطية) دەڵێ: من و مەسروق چوین بۆلای عائیشە پێمان وت: ئەی دایکی باوەڕداران دوو پیاو لە یارانی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) یەکێکیان زوو بەربانگ دەکاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەکات، ئەوی تریان درەنگ بەربانگ دەکاتەوەو درەنگیش نوێژی شێوان دەکات، کاری کامیان چاکە؟ عائیشە وتی: کامیان زوو بەربانگ دەکاتەوەو زوویش نوێژی شێوان دەکات، وتمان (عبد الله) ـی کوڕی مەسعود – وتی: پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) جاران ئاوەهای دەکرد.

## باسی ئەو خواردن و خواردنەوەیەی کە بەربانگی پێ دەکرێتەوە.

**٢٣٥٥ - (ضعيف) عن سلمان بن عامر قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِمًا فَلْيُفْطِرْ عَلَى التَّمْرِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدِ التَّمْرَ فَعَلَى الْمَاءِ، فَإِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ).**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی عامرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە بەرۆژوو بوو با بـە چـەند دەنکـە خورمایـە بەربانك بکاتەوە، جا ئەگەر خورمای دەست نەکەوت ئەوە بە ئاو ڕۆژووەکـەی بشـکێنێ. چونکە ئاو پاکەوەکەرە).

**٢٣٥٦ - (حسن صحيح) عن أنس بن مالك قال:كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَإِنْ لَـمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِـنْ مَاءٍ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صـلی الله علیه وسلم) پێش ئەوەی نوێژی شێوان بکات بـە چـەند دەنکـە خورمایـەکی تـەڕ ڕۆژووی دەشکاند، جا ئەگەر خورمای تەڕ نەبوایە ئەوە بە چەند خورمایە - لە جۆرەکانی تـر - ئەگەر ئەوەش نەبوایە ئەوە بە چەند قومێ ئاو ڕۆژووەکەی دەشکاند.

## باسی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگدا چی بڵێ.

## ٢٢ - باب الْقَوْلِ عِنْدَ الإِفْطَارِ.

**٢٣٥٧ - (حسن) عن مروان - يعني ابن سالم المقفع - قـال: رَأَيْـتُ ابْـنَ عُمَرَ يَقْبِضُ عَلَى لِحْيَتِهِ فَيَقْطَعُ مَا زَادَ عَلَى الْكَفِّ، وَقَـالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: (ذَهَـبَ الظَّمَأُ، وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ، وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ).**

واتە: لە مەروان — واتە: كوڕی سالم (الْمُقَفَّع) — ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویـەتی: ئیبنـو عومەرم دی رەزای خوایان لێ بێ پڕ بە مشتی ریشی خۆی گرت هەرچی زیاتر بوو بـڕی، جا وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كاتێ كـە بـەربانگی دەكـردەوە دەیفـەرموو: (ذَهَبَ الظَّمَأ، وَابْتَلَّتِ الْعُـرُوقُ، وَثَبَـتَ الأَجْـرُ إِنْ شَـاءَ اللَّـهُ). واتـە: تینـوێتی رۆشـت و، دەمارەكان تێرئاو بوون، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێ پاداشتیش جێگیر بوو).

**٢٣٥٨ - (ضعيف) عن معاذ بن زهرة: أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ إِذَا أَفْطَرَ قَالَ: (اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ، وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ).**

واتە: (معاذ)ی كوڕی زوهرە دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صـلى الله علیـه وسـلم) بەربانگی دەكردەوە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ، وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ). واتە: خودایە بۆ تۆ بەڕۆژوو دەبم و، بە رۆزی تۆش بەربانگ دەكەمەوە.

## باسی بەربانگ كردنەوە لەپێش خۆرئاوا بووندا.

## ٢٣ – باب الْفِطْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ.

**٢٣٥٩ - (صحيح) عن أسماء بنت أبي بكـر قالـت: أَفْطَرْنَـا يَوْمًـا فِـى رَمَضَانَ فِى غَيْمٍ فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. قَالَ أَبُو أُسَـامَةَ: قُلْـتُ لِهِشَـامٍ: أُمِـرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: وَبُدٌّ مِنْ ذَلِكَ؟!.**

واتە: لە ئەسمائی كچی ئەبو بەكرەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێ هەور بوو بەربانگمان كردەوە، لەپاشدا خۆر دەركەوت. ئەبو ئوسامە وتی: بە هیشامم وت: فەرمانتان پێ كرا بە گێڕانەوەی؟ وتی: لە حاڵەتی وەهادا گێڕانەوە پێویستە.

## باسی سەبارەت بە چەند ڕۆژێ ڕۆژوو دانە دەم یەك.

## ٢٤ - باب فِي الْوِصَالِ.

**٢٣٦٠ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ نَهَى عَنِ الْوِصَالِ، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: (إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێگەی نەدەدا كە یەكێ دوو ڕۆژر یان زیاتر شەو و ڕۆژ بەڕۆژوو بێ و ڕۆژووەكەی نەشكێنێ، وتیان: تۆ بەردەوام دەبیت ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: (من وەك ئێوە نیم، خوای گەورە تێرم دەكات و تینوێتیم دەشكێنێ).

**٢٣٦١ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري قال: قال رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ**

فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ). قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ، قَالَ: (إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنَّ لِي مُطْعِمًا يُطْعِمُنِي وَسَاقِيًا يَسْقِينِي).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەردەوام مەبن لەسەر ڕۆژوو گرتن بەبێ ئەوەی بەربانگ بکەنەوە — دوو ڕۆژ لەسەریەك یان زیاتر - ، ئەگەر یەکێکتان ویستی بەردەوام بێت با هەتا پارشێو بەردەوام بێ). وتیان: تۆ بەردەوام دەبیت؟ فەرمووی: (من وەك ئێوە نیم، خوای گەورە تێرم دەکات و تینوێتیم دەشکێنێ).

## باسی غەیبەت کردن لەلایەن ڕۆژووەوانەوە کە ئایا کاریگەری دەبێ بۆ سەر ڕۆژووەکەی یان نا؟

## ٢٥ – باب الْغِيبَةِ لِلصَّائِمِ.

٢٣٦٢ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ ﴿والجهل﴾ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێ وازنەهێنێ لە درۆ و وتەو کرداری خراپ و (کارو کردەوەی نەزانانە)، ئەوە خوای گەورە هیچ پێویستی بەوە نیە واز لە خواردن و خواردنەوە بهێنێت).

٢٣٦٣ - (صحيح) عن أبي هريرة، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (الصِّيَامُ جُنَّةٌ، إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِمًا فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَجْهَلْ، فَإِنِ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ، إِنِّي صَائِمٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ڕۆژوو خۆپارێزی و قەڵغانی گوناهو تاوانە، ئەگەر کەسێ لە ئێوە بەڕۆژوو بوو با قسەی ناشیرین و نابەجێ نەکات، هات و هاوار نەکات، کاری نەزانانە نەکات، ئەگەر کەسێ جنێوی پێ دا یان شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم).

## باسی سیواك کردن لەلایەن ڕۆژووەوانەوە.

## ٢٦ - باب السِّوَاكِ لِلصَّائِمِ.

٢٣٦٤ - (ضعيف) عن عبد الله بن عامر بن ربيعة، عن أبيه قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَاكُ وَهُوَ صَائِمٌ. زَادَ مُسَدَّدٌ: مَا لاَ أَعُدُّ وَلاَ أُحْصِي.

واتە: لە (عبید الله)ی کوڕی عامیری کوڕی ڕەبیعەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) دی بەڕۆژوو بوو سیواکی دەکرد. موسەددەد ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەوەندە سیواکی دەکرد لە ژمارە نەدەهات.

## باسی ڕۆژووەوان لەبەر تینوێتی ئاو بكات بەسەری خۆیدا، وە زێدەڕەوی بكات لەئاو رادانە دەم و لوتدا.

## ٢٧ - باب الصَّائِمِ يَصُبُّ عَلَيْهِ الْمَاءَ مِنَ الْعَطَشِ وَيُبَالِغُ فِي الاِسْتِنْشَاقِ.

**٢٣٦٥ - (صحيح) عن أبي بكر بن عبد الرحمن عن بعض أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم قال: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ النَّاسَ فِي سَفَرِهِ عَامَ الْفَتْحِ بِالْفِطْرِ، وَقَالَ: (تَقَوَّوْا لِعَدُوِّكُمْ). وَصَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ الَّذِي حَدَّثَنِي: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْعَرْجِ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ مِنَ الْعَطَشِ، أَوْ مِنَ الْحَرِّ.**

واتە: لە ئەبو بەكری كوڕی (عَبْد الرَّحْمَن)ەوە، لە هەندێ لە یارانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە سەفەری ساڵی رزگاركردنی مەككەدا پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) دی فەرمانی دا بە خەڵك ڕۆژووەكەیان بشكێنن و بخۆن و بخۆنەوە، وە فەرمووی: (خۆتان بە هێز بكەن بۆ دوژمنەكەتان). بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆی بەڕۆژوو بوو، ئەبو بەكر وتی: ئەوەی كە بۆی باس كردم وتی: لە عەرج پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) دی، بەڕۆژوو بوو. لەتاو گەرما یان لەبەر تینوێتی ئاوی دەكرد بە سەری خۆیدا.

٢٣٦٦ - (صحيح) عن أبيه لقيط بن صبرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (بَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ، إلاَّ أنْ تَكُونَ صَائِمًا).

واتە: لە (لقيط)ی کوڕی صەبرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بە توندی ئاو لەدەم و لوتت وەردە مەگەر بە ڕۆژوو بیت) - واتە ئەگەر بە ڕۆژوو بویت زێدەڕەوی مەکە نەوەك بچێتە قوڕگتەوە و ڕۆژووەکەت بەتاڵ بێتەوە - .

## باسی دەربارەی ڕۆژووەوان کەڵەشاخ بگرێت یان نا

## ٢٨ - باب فِي الصَّائِمِ يَحْتَجِمُ.

٢٣٦٧ - (صحيح) عن الثوبان، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ).

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەڵەشاخ گرو کەڵەشاخ لێ گیراو ڕۆژوویان دەشکێ ئەگەر بەڕۆژوو بوون).
- چونکە کەڵەشاخ گر بێ هێز دەکات، وە کەڵەشاخ لێ گریش جاران خوێنەکەی بە دەم هەڵدەمژی -

٢٣٦٨ - (صحيح) عن شداد بن أوس، بَيْنَمَا هُوَ يَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَ نَحْوَهُ.

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە هاتوە، کە جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕێی دەکرد، جا ڕاوی بە هەمان شێوە فەرموودەکەی گێڕایەوە.

**٢٣٦٩ - (صحيح) عن شداد بن أوس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَتَى عَلَى رَجُلٍ بِالْبَقِيعِ، وَهُوَ يَحْتَجِمُ، وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِي، لِثَمَانَ عَشْرَةَ خَلَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَالَ: (أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ).**

واتە: شەدادی کوڕی ئەوس وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە گۆڕستانی بەقیع دای بەلای پیاوێکدا کەڵەشاخی لەخۆی دەگرت، شەداد دەستی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گرتبو، هەژدە ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان تێپەڕی بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (کەڵەشاخ گرو کەڵەشاخ لێ گیراو ڕۆژوویان دەشکێ ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

**٢٣٧٠ - (صحيح) عن الثوبان مولى رسول الله صلى الله عليه وسلم: أن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ).**

واتە: لە (ثوبان)ی خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەڵەشاخ گرو کەڵەشاخ لێ گیراو ڕۆژوویان دەشکێ ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

٢٣٧١ - (صحيح) عن الثوبان، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ).

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (كەڵەشاخ گرو كەڵەشاخ لێ گیراو ڕۆژوویان دەشكێ ئەگەر بەڕۆژوو بوون).

## باسی روخسەت لەمەدا، كە ڕۆژووەوان كەڵەشاخ بگرێ.

## ٢٩ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٢٣٧٢ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كەڵەشاخی لەخۆی گرتوە لەكاتێكدا كە بە ڕۆژوو بووە.

٢٣٧٣ - (ضعيف) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ مُحْرِمٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كەڵەشاخی لەخۆی گرتوە لەكاتێكدا كە بە ڕۆژوو بووەو لە ئیحرامیشدا بووە.

٢٣٧٤ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن أبي ليلى قال حدثني رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْحِجَامَةِ وَالْمُوَاصَلَةِ، وَلَمْ يُحَرِّمْهُمَا إِبْقَاءً عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، فَقَالَ: (إِنِّي أُوَاصِلُ إِلَى السَّحَرِ، وَرَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي).

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئەبو لەیلاوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆی گێرامەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری كردوە لەوەی كەڵەشاخ لە ڕۆژووەوان بگیرێت، هەروەها بەردەوامبونیش لەسەر ڕۆژووگرتن بەبێ ئەوەی بەربانگ بكرێتەوە — دوو ڕۆژ لەسەریەك یان زیاتر - ، بەڵام حەرامی نەكرد لەبەر سۆز و بەزەیی بەرامبەر بە یارانی، تێگەیشتنی یارانیشی بەم شێوەیە بوو، پێی وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! تۆ بەردەوام دەبیت هەتا پارشێو، فەرمووی: (من هەتا پارشێو بەردەوام دەبم من وەك ئێوە نیم، خوای گەورە تێرم دەكات و تینوێتیشم دەشكێنێ).

٢٣٧٥ — عن أنس قال: مَا كُنَّا نَدَعُ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ إِلاَّ كَرَاهِيَةَ الْجَهْدِ.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئێمە لەكاتی بەڕۆژووبونندا بۆیە وازمان هێنا لە كەڵەشاخ گرتن، چونكە هیلاكی و ماندوبونمان پێ ناخۆش بوو بۆ ڕۆژووەوانان.

## باسی لەمانگی رەمەزاندا ڕۆژووەوان بە ڕۆژدا شەیتانی ببێ ئایا ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە یان نا؟

## ٣٠ – باب فِي الصَّائِمِ يَحْتَلِمُ نَهَارًا فِي شَهْرِ رَمَضَانَ.

٢٣٧٦ - (ضعيف) عن زيد بن أسلم، عن رجل من أصحابه، عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ يُفْطِرُ مَنْ قَاءَ، وَلاَ مَنِ احْتَلَمَ، وَلاَ مَنِ احْتَجَمَ).

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، لە یەکێ هاوڕێکانیەوە، لە یەکێ لەیارانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هاتوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ڕۆژووی ناشکێ ئەو کەسەی بڕشێتەوە ئەگەر بە ئەنقەست نەبێ، یان شەیتانی ببێ، یا کەڵەشاخ بگرێت).

# باسی دەربارەی چاو ڕشتنی ڕۆژووەوان لەکاتی خەوتندا

## ٣١ - باب فِي الْكَحْلِ عِنْدَ النَّوْمِ لِلصَّائِمِ.

٢٣٧٧ - (ضعيف) عبد الرحمن بن النعمان بن معبد بن هوذة، عن أبيه، عن جده: عن النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّهُ أَمَرَ بِالإِثْمِدِ الْمُرَوَّحِ عِنْدَ النَّوْمِ وَقَالَ: (لِيَتَّقِهِ الصَّائِمُ).

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی نوعمانی کوڕی مەعبەدی کوڕی (هوذة)ەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی داوە کە بەکلی (إِثْمِد) چاو بڕێژرێت لەکاتی خەوتندا، هەروەها فەرمووی: (بۆ ئەوەی چاوی ڕۆژووەوان بپارێزێ و بە هێزی بکات).

٢٣٧٨ - (حسن موقوف) عن أنس بن مالك: أَنَّهُ كَانَ يَكْتَحِلُ وَهُوَ صَائِمٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاوی ڕشتوە لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بووە.

٢٣٧٩ - (حسن) عن الأعمش قال: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِنَا يَكْرَهُ الْكَحْلَ لِلصَّائِمِ، وَكَانَ إِبْرَاهِيمُ يُرَخِّصُ أَنْ يَكْتَحِلَ الصَّائِمُ بِالصَّبِرِ.

واتە: ئەعمەش دەڵێ: لە هاوەڵانی خۆمان كەسم نەدیوە چاو رشتنی بۆ رۆژووەوان پێ ناخۆش بووبێ، ئیبراهیم رێگەی دەدا بە رۆژوەوان چاوی برەژێ بە (صَّبِر).

## باسی رۆژووەوان بەئەنقەست خۆی برشێنێتەوە.

## ٣٢ - باب الصَّائِمِ يَسْتَقِيءُ عَامِدًا.

**٢٣٨٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ ذَرَعَهُ قَيْءٌ وَهُوَ صَائِمٌ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَإِنِ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەركەسێ بەرۆژوو بوو رشانەوە زۆری بۆ هێنا ئەوە قەزای لەسەر نیە. بەڵام ئەگەر خۆی برشێنێتەوە ئەوە با قەزای بكاتەوە).

**٢٣٨١ – (صحيح) عن أبو الدرداء، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاءَ فَأَفْطَرَ، فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ فَقُلْتُ: إِنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ حَدَّثَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاءَ فَأَفْطَرَ، قَالَ: صَدَقَ، وَأَنَا صَبَبْتُ لَهُ وَضُوءَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە هۆی رشانەوەوە رۆژووەکەی شکاند — پێ دەچێت بە ئەنقەست کردبێتی - ، لە مزگەوتی دیمەشق گەیشتم بە (ثوبان)ی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێم وت: ئەبو دەردا بۆی گێرامەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە هۆی رشانەوەوە رۆژووەکەی شکاندوە، وتی: راست دەکات، بۆ دەستنوێژەکەی من ئاوم کرد بە دەستیدا. — ئەمەش بەلگەیە بۆ دەستنوێژگرتنەوە لەدوای رشانەوە - .

## باسی ماچکردن لەلایەن رۆژووەوانەوە.

## ٣٣ – باب الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ.

**٢٣٨٢ - (صحيح) عن عائشة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَكِنَّهُ كَانَ أَمْلَكَ لإِرْبِهِ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جاری وا دەبوو بەرۆژوو دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ماچ و موچ و یاری دەکرد لەگەڵ ژنەکانی خۆیدا، بەڵام ئەو لە هەمووتان زیاتر نەفسی خۆی پێ رادەگیرا. واتە ئەوەی توانای خۆڕاگرتنی نەبوو بۆی دروست نیە ئەو کارە بکات.

**٢٣٨٣ - (صحيح) عن عائشة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُ فِي شَهْرِ الصَّوْمِ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جاری وا دەبوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەمانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ژنەکانی خۆی ماچ دەکرد.

**٢٣٨٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَبِّلُنِي وَهُوَ صَائِمٌ وَأَنَا صَائِمَةٌ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جاری وا دەبوو ماچی دەکردم لەگەڵ ئەوەشدا بەڕۆژوو بوو، وە منیش هەر بەڕۆژوو بووم.

**٢٣٨٥ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال قال عمر بن الخطاب: هَشِشْتُ فَقَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ صَنَعْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا عَظِيمًا قَبَّلْتُ وَأَنَا صَائِمٌ! قَالَ: (أَرَأَيْتَ لَوْ مَضْمَضْتَ مِنَ الْمَاءِ وَأَنْتَ صَائِمٌ). قَالَ عِيسَى بْنُ حَمَّادٍ فِي حَدِيثِهِ: قُلْتُ: لاَ بَأْسَ بِهِ، ثُمَّ اتَّفَقَا: قَالَ: (فَمَهْ؟).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّهِ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بووم ئارەزووم جولاو ژنەکەی خۆم ماچم کرد، جا چومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمڕۆ کارێکی گەورەم کرد بە ڕۆژووبوم ژنەکەی خۆمم ماچ کرد، فەرمووی: (ئەی ئەگەر بەڕۆژوو بیت و ئاوت لە دەمت ڕادا هیچ دەبێت؟). عیسای کوڕی حەمماد لە فەرمودەکەیدا وتی: عومەر وتی: وتم: ئەوە هیچی تێدا نیە، لەپاشدا

هەردوو راوی رێکن لەسەرئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (دەی بێ دەنگ بە ئەوەش هیچی تێدا نیە).

## باسی لێو مژین لەلایەن ڕۆژووەوانەوە.

## ٣٤ – باب الصَّائِمِ يَبْلَعُ الرِّيقَ.

٢٣٨٦ - (ضعيف) عن عائشة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ وَيَمُصُّ لِسَانَهَا.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ماچی کردوەو لێوی مژیوە لەگەڵ ئەوەشدا بەڕۆژوو بووە.

## باسی ناپەسەندی یاری و دەستبازی بۆ گەنج

## ٣٥ – باب كَرَاهِيَتِهِ لِلشَّابِّ.

٢٣٨٧ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ فَرَخَّصَ لَهُ، وَأَتَاهُ آخَرُ فَسَأَلَهُ فَنَهَاهُ، فَإِذَا الَّذِي رَخَّصَ لَهُ شَيْخٌ، وَالَّذِي نَهَاهُ شَابٌّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پرسی: ئایا بۆ ڕۆژووەوان دروستە یاری لەگەڵ ژنی خۆیدا بکات؟ روخسەتی پێ دا،

یەكێكی تر هات لێی پرسی رێگری لێ كرد، ئەوەی كە مۆڵەتی پێ دا پیاوێكی پیر بـوو، ئەوەشی كە رێگری لێ كرد كوڕێكی گەنج بوو.

## باسی ئەوەی لەمانگی رەمەزاندا لەشی گران بێت هەتا ڕۆژی لیٚ دەبێتەوە.

## ٣٦ - باب فِيمَنْ أَصْبَحَ جُنُبًا فِي شَهْرِ رَمَضَانَ.

٢٣٨٨ - (صحيح) عن عائشة وأم سلمة زوجب النبي صلى الله عليـه و سلم أنهما قالتا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يُصْبِحُ جُنُبًا - قَالَ عَبْدُ اللَّـهِ الأَذْرَمِـيُّ فِـي حَدِيثِـهِ: فِـي رَمَضَانَ - مِنْ جِمَاعٍ غَيْرِ احْتِلاَمٍ، ثُمَّ يَصُومُ. قَالَ أَبُـو دَاوُدَ: وَمَا أَقَلَّ مَنْ يَقُولُ هَذِهِ الْكَلِمَـةَ، يَعْنِـي يُصْـبِحُ جُنُبًـا فِـي رَمَضَانَ، وَإِنَّمَا الْحَدِيثُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصْبِحُ جُنُبًا وَهُوَ صَائِمٌ.

واتە: لە عائیشەو ئومو سەلەمەوە كە هەردووكیان هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليـه وسلم) بوون دەگێرنەوە، كە وتویانە: جاری وا دەبوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليـه وسـلم) لەش گران دەبوو لە جووت بوون نەك لەشەیتانی بوون، بەو لەش گرانیەوە دەمایەوە هـەتا بەیانی دەدا، لەپاشدا خۆی دەشـت و، لـەكاتی ئاسـایی خۆیـدا نوێـژی بـەیانی دەكـردو بەڕۆژووش دەبوو، - (عَبْدُ اللَّه) كـوڕی (أَذْرَمِـيّ) لـە فەرمودەكەیـدا وتـی: لـە مـانگی

رەمەزانـدا - ، ئـەبو داود دەڵێـت: چـەندە کـەمی وتـوە ئـەوەی ئەمـە گێڕاوەتـەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە لەش گرانیەوە ڕۆژی دەکردەوەو بەڕۆژووش بوو.

**٢٣٨٩ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صـلى الله عليـه و سـلم: أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى الْبَابِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُصْبِحُ جُنُبًا، وَأَنَا أُرِيدُ الصِّـيَامَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَأَنَا أُصْـبِحُ جُنُبًـا وَأَنَا أُرِيدُ الصِّيَامَ، فَأَغْتَسِلُ وَأَصُومُ). فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ لَسْتَ مِثْلَنَا، قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ! فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ وَقَـالَ: (وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّبِعُ).**

واتە: لە عائیشـەی هاوسـەری پێغەمبەری خـواوە (صلى الله عليه وسـلم) دەگێڕنـەوە، کـە وتویەتی: پیاوێ لەبەر دەرگادا ڕاوەستا بوو بە پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسـلم) وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، من هەتا بەیانی دا لەش گران بـووم، دەمـەوێت بەڕۆژوو بم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (منیش هەتا بـەیانی دا لـەش گران بووم، دەمەوێ خۆم بشۆم و بەڕۆژوویش بم). پیاوەکە وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم)، تۆ وەك ئێمە نیت، تۆ خوای گەورە لـە گونـاهی رابـردوو داهاتوشـت خۆش بووە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تـوڕە بـوو فـەرمووی: (سـوێند بـە (الله) ئومێد دەکەم لەهەمووتان زیاتر لە خوا بترسم و لەهەمووتان زیاتر ئەرکـەکانی پەرسـتش ڕاپەڕێنم).

## باسی كەفارەتی ئەوەی لەمانگی رەمەزاندا بچێتە لای ژنەكەی.

## ٣٧ - باب كَفَّارَةِ مَنْ أَتَى أَهْلَهُ فِي رَمَضَانَ.

٢٣٩٠ - (صحيح) عن أبي هريرة، قال: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: هَلَكْتُ!! فَقَالَ: (مَا شَأْنُكَ؟). قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ، قَالَ: (فَهَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً؟). قَالَ: لاَ، قَالَ: (فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟). قَالَ: لاَ؟ قَالَ: (فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟). قَالَ: لاَ، قَالَ: (اجْلِسْ). فَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: (تَصَدَّقْ بِهِ). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرَ مِنَّا! فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى بَدَتْ ثَنَايَاهُ، قَالَ: (فَأَطْعِمْهُ إِيَّاهُمْ). وَقَالَ مُسَدَّدٌ: فِي مَوْضِعٍ آخَرَ: أَنْيَابُهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی: تیاچووم، فەرمووی: (چیتە؟). وتی: بەرۆژوو بووم و لەگەڵ ژنەكەمدا جوت بووم لە مانگی رەمەزاندا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هەتە كۆیلەیە رزگار بكەی؟). وتی: نەء فەرمووی: (ئەی دەتوانیت دوو مانگ بەسەر یەكەوە بەرۆژوو بیت؟ ). وتی: نەء فەرمووی: (ئەی دەتوانی خواردنی شەست هەژار و كەمدەست بدەیت؟). وتی: نەو، فەرمووی: (دانیشە). لەوكاتەدا سەبەتەیێك خورمایان هێنا بۆ

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: (ئەمە ببەو بڕۆ بیبەخشە). وتی: دەی سوێند بە (الله) لە نێوان هەردوو شیوی(حُرة)ی مەدینەدا ماڵێ نیە لەماڵی من هەژار تر بێت - (لاَبَتة) زەویەکی نزمە بەردەکانی رەشە - ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوت، جا فەرمووی: (باشە بڕۆ بیاندەرێ با بیخۆن). موسەددەد راوی فەرموودەکە لە شوێنێکی تردا لە جیاتی: (ثَنَايَاهُ) وتی: (أَنْيَابُهُ).

**٢٣٩١ - (صحيح) عن الزهري، بِهَذَا الْحَدِيثِ بِمَعْنَاهُ، زَادَ الزُّهْرِيُّ وَإِنَّمَا كَانَ هَذَا رُخْصَةً لَهُ خَاصَّةً فَلَوْ أَنَّ رَجُلاً فَعَلَ ذَلِكَ الْيَوْمَ لَمْ يَكُنْ لَهُ بُدٌّ مِنَ التَّكْفِيرِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: زَادَ الأَوْزَاعِيُّ (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ).**

واتە: لە زوهریەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: بێگومان ئەم روخسەتە تایبەت بووە بەوەوە، ئەگەر کەسێکی تر لەم رۆژگارەدا ئەو کارە بکات ئەوە کەفارەتی لەسەر پێویست دەبێت و پێویستە لەسەری کەفارەتەکەی بدات. ئەبو داود دەڵێت: ئەوزاعی (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ)ی بۆ زیاد کرد، واتە: (تەوبە بکەو پەشیمان بەرەوە لەو کارەی کە کردت).

**٢٣٩٢ - (صحيح) عن أبي هريرة: أَنَّ رَجُلاً أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُعْتِقَ رَقَبَةً، أَوْ يَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، أَوْ يُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا، قَالَ: لاَ أَجِدُ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْلِسْ). فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ فَقَالَ: (خُذْ هَذَا فَتَصَدَّقْ بِهِ). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَحَدٌ أَحْوَجَ مِنِّي،**

فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، وَقَالَ لَهُ: (كُلْهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ عَلَى لَفْظِ مَالِكٍ: أَنَّ رَجُلاً أَفْطَرَ، وَقَالَ فِيهِ: (أَوْ تُعْتِقَ رَقَبَةً، أَوْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ، أَوْ تُطْعِمَ سِتِّينَ مِسْكِينًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە مانگی رەمەزاندا رۆژووەکەی شکاند، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کرد کۆیلەیە رزگار بکات، یان دوو مانگ بەسەر یەکەوە بەڕۆژوو بێت، یا شەست هەژار تێر بکات، وتی: نیمە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (دانیشە). لەوکاتەدا سەبەتەیە(عَرَق)ێك خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: (ئەمە ببەو برۆ بیبەخشە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ کەس نیە ئەوەندەی من موحتاجی ئەو خێرە بێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە پێکەنی هەتا ددانەکانی پێشەوەی دەرکەوت، جا پێی فەرموو: (باشە برۆ خۆت و خانەوادەکەت بیخۆن).

٢٣٩٣ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قَالَ: فَأُتِيَ بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ قَدْرُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا، وَقَالَ فِيهِ: (كُلْهُ أَنْتَ وَأَهْلُ بَيْتِكَ، وَصُمْ يَوْمًا، وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە مانگی رەمەزاندا رۆژووەکەی شکاندبوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جا راوی بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، وتی: سەبەتەیە(عَرَق)ێك خورمایان هێنا بۆ

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە پانزە مەن(صاع) دەبوو، راوی لە فەرموودەکەیدا وتی: فەرمووی: (خۆت و کەسوکارەکەت لێی بخۆن، لەدوای مانگی رەمەزان لەجیاتی ئەو رۆژەدا رۆژێ رۆژوو بگرەوە، پەشیمان بەرەوە و تەوبە بکە لەو کارەی کە کردت).

**٢٣٩٤ - (صحيح) عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه و سلم قالت: أَتَى رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، احْتَرَقْتُ! فَسَأَلَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا شَأْنُهُ، قَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِي، قَالَ: (تَصَدَّقْ). قَالَ: وَاللَّهِ مَا لِي شَيْءٌ، وَلاَ أَقْدِرُ عَلَيْهِ، قَالَ: (اجْلِسْ). فَجَلَسَ، فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ أَقْبَلَ رَجُلٌ يَسُوقُ حِمَارًا عَلَيْهِ طَعَامٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَيْنَ الْمُحْتَرِقُ آنِفًا؟). فَقَامَ الرَّجُلُ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَصَدَّقْ بِهَذَا). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعَلَى غَيْرِنَا؟ فَوَاللَّهِ إِنَّا لَجِيَاعٌ مَا لَنَا شَيْءٌ!! قَالَ: (كُلُوهُ).**

واتە: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە مانگی رەمەزاندا پیاوێ لەمزگەوت هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەوتاوم کارێکی وەهام کردوە شایستەی ئەوەم بە ئاگر بسوتێم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لێی پرسی کە چیەتی، وتی: بەرۆژوو بووم و لەگەڵ ژنەکەمدا جوت بووم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (خێر بکە). وتی: سوێند بە (الله) هیچم نیە هەتا بیکەم بەخێر، توانام مالیم نیە، فەرمووی: (دانیشە). ئەویش دانیشت، لەوکاتەدا پیاوێ باری کەرێ خواردنی هێنا،

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: (کوا ئەو پیاوەی کە ئێستا هات). پیاوەکە هەستایەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: ( ئەمە ببەو برۆ بیبەخشە — بە شەست هەژار - ). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیکەم بە خێر و بیدەم بە خەڵکانی تر لەکاتێکدا کە خۆم و خانەوادەکەم زۆر موحتاج و هەژارین و هیچمان نیە بیخۆین، فەرمووی: (باشە برۆ بیبە خۆت و خانەوادەکەت بیخۆن).

**٢٣٩٥ - (منكر) عن عائشة رضي الله عنها، بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: فَأُتِيَ بِعَرَقٍ فِيهِ عِشْرُونَ صَاعًا.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هەمان بەسەرهات هاتوە، کە وتویەتی: سەبەتەیە(عَرَق)ێك خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە بیست مەن(صاع) خورمای تێدا بوو.

## باسی قورسکردن لەسەر ئەوانەی کە بە ئەنقەست ڕۆژوو دەشکێنن.

## ٣٨ – باب التَّغْلِيظِ فِي مَنْ أَفْطَرَ عَمْدًا.

**٢٣٩٦ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ أَفْطَرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَّصَهَا اللَّهُ لَهُ لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صِيَامُ الدَّهْرِ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەركەسێ ڕۆژێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بشكێنێ بە بێ ڕوخسەتێ لەو ڕوخسەتانەی كە خوای گەورە دایناوە — وەك نەخۆشی و سەفەر - ، ئەوە هەموو ساڵەكە بەڕۆژوو بێ جێگەی — خێر و پاداشتی - ئەو ڕۆژەی بۆ ناگرێتەوە.

**٢٣٩٧ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال النبِى صلى الله عليه وسلم، مِثْلَ حَدِيثِ ابْنِ كَثِيرٍ وَسُلَيْمَانَ.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی. جا راوی فەرمودەكەی وەك فەرمودەكەی پێشوی (ابْن كَثِير) و سولەیمان گێڕایەوە.

## باسی ئەوەی لە یادی چوو كە بەڕۆژووە خواردن بخوات

## ٣٩ – باب مَنْ أَكَلَ نَاسِيًا.

**٢٣٩٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال:جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَكَلْتُ وَشَرِبْتُ نَاسِيًا وَأَنَا صَائِمٌ. فَقَالَ: (أَطْعَمَكَ اللَّهُ وَسَقَاكَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەبیرم چوو كە بەڕۆژووم

خواردن و خواردنەوەم خوارد، فەرمووی: (هیچی تێدا نیە ئەوە خوای گەورە تێری كردویت و تینوێتی شكاندویت).

كەواتە ئەگەر كەسێ لەبیری چوو كە بەڕۆژووە خواردن و خواردنەوەی خوارد ڕۆژووەكەی دروست و تەواوە دەبێ بەردەوام بێت لەسەری، كەفارەت و قەزاكردنەوەشی لەسەر نیە - .

## باسی دواخستنی قەزاكردنەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان

## ٤٠ - باب تَأْخِيرِ قَضَاءِ رَمَضَانَ.

٢٣٩٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ حَتَّى يَأْتِيَ شَعْبَانُ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر بوایە، ئەوا نەم دەتوانی قەزای بكەمەوە هەتا مانگی شەعبان دەهات. - چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆربەی ڕۆژەكانی مانگی شەعبان بەڕۆژوو دەبوو-.

## باسی دەربارەی كەسێ بمرێ ڕۆژووی لەسەر بێ

## ٤١ – باب فِيمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ.

**٢٤٠٠ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ). ﴿قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا فِي النَّذْرِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ﴾.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (كەسێ بمرێ ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر بێ ئەوە كەسوكارەكەی بۆی بگرنەوە). ئەبو داود دەڵێت: ئەمە بۆ ڕۆژووی (نذر)ە، ئەمەش وتەی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە.

**٢٤٠١ - (صحيح) عن ابن عباس قال: إِذَا مَرِضَ الرَّجُلُ فِي رَمَضَانَ ثُمَّ مَاتَ وَلَمْ يَصُمْ: أُطْعِمَ عَنْهُ وَلَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَإِنْ كَانَ عَلَيْهِ نَذْرٌ قَضَى عَنْهُ وَلِيُّهُ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەگەر كەسێ لە مانگی ڕەمەزاندا نەخۆش بوو نەیتوانی بەڕۆژوو بێ لەپاشدا مرد، ئەوە لە كەفارەتی ڕۆژووەكەیدا دەبێ نان بدرێ، قەزای لەسەر نیە، ئەگەر ڕۆژووی (نذر)ی لەسەر بوو ئەوە دەبێ كەسوكارەكەی بۆی بگێڕنەوە.

## باسی دەربارەی حوکمی ڕۆژوو لەسەفەردا.

## ٤٢- الصوم في السفر.

٢٤٠٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ حَمْزَةَ الأَسْلَمِيَّ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَسْرُدُ الصَّوْمَ، أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ قَالَ: (صُمْ إِنْ شِئْتَ، وَأَفْطِرْ إِنْ شِئْتَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە حەمزەی ئەسلەمی لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پرسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم). من پیاوێکم زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ بەڕۆژوو دەبم، ئایا لەسەفەردا بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: (ئارەزووی خۆتە ئەگەر ویستت بەڕۆژوو بە، ئەگەر ئارەزوت لێی نەبوو بەڕۆژوو مەبە).

٢٤٠٣ - (ضعيف) عن حمزة بن محمد بن حمزة بن عمرو الأسلمي: أن أباه أخبره، عن جده قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي صَاحِبُ ظَهْرٍ أُعَالِجُهُ أُسَافِرُ عَلَيْهِ، وَأُكْرِيهِ، وَإِنَّهُ رُبَّمَا صَادَفَنِي هَذَا الشَّهْرُ - يَعْنِي رَمَضَانَ - وَأَنَا أَجِدُ الْقُوَّةَ، وَأَنَا شَابٌّ، وَأَجِدُ بِأَنْ أَصُومَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ أَنْ أُؤَخِّرَهُ فَيَكُونَ دَيْنًا، أَفَأَصُومُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْظَمُ لأَجْرِي أَوْ أُفْطِرُ؟ قَالَ: (أَيُّ ذَلِكَ شِئْتَ يَا حَمْزَةُ).

واتە: لە حەمزەی ئەسلەمییەوە هاتوە، کە باوکی لە باپیریەوە بۆی گێڕاوەتەوە، وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، من خاوەنی وڵاخی سواریم جاری وا هەیە سەفەری پێ دەکەم و، جاری واش هەیە دەیدەم بە کرێ، جا هەندێ جار رێك دەکەوێ سەفەرەکەم دەکەوێتە مانگی رەمەزانەوە، من کەسێکی بە توانام و گەنجم، پێم وایە بەرۆژوو بونم لەلا ئاسانترە وەك لەوەی کە دوایخەم و ببێتە قەرز بەسەرمەوە، ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئایا بەرۆژوو بم خێرم زیاتر دەگات یان بەرۆژوو نەبم؟ فەرمووی: (ئارەزووی خۆتە کامەیان دەکەی ئەی حەمزە).

**٢٤٠٤ - (صحيح) عن ابن عباس قال: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فَرَفَعَهُ إِلَى فِيهِ لِيُرِيَهُ النَّاسَ، وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ، فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: قَدْ صَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَفْطَرَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەدینەوە دەرچوو بەرەو مەککە بەرۆژوو بوو هەتا گەیشتە عوسفان، ئینجا داوای دەفرێ ئاوی کرد بۆیان هێنا بە بەرچاوی خەڵکەکەوە بەرزی کردەوە بۆ دەمی و ئاوەکەی خواردەوە بۆ ئەوەی ببینن و بزانن کە رۆژووەکەی شکاندوەو شوێنی بکەون، ئەم روداوەش لەمانگی رەمەزاندا بوو، ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەیوت: جاری وا دەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەفەردا بەرۆژوو دەبوو، جاری واش هەبوو بەرۆژوو نەدەبوو، جا کەواتە لەسەفەردا ئەوەی حەز دەکات بەرۆژوو بێ ئەوە با بەرۆژوو بێ، ئەوەشی حەز ناکات بەرۆژوو بێ ئەوە با بەرۆژوو نەبێ.

٢٤٠٥ - (صحيح) عن أنس قال: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ بَعْضُنَا، وَأَفْطَرَ بَعْضُنَا، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەمانگی رەمەزاندا لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بووین، هەندێکمان بەڕۆژوو بووین، هەندێکی ترمان بەڕۆژوو نەبووین، جا ئەو کەسەی کە بەڕۆژوو بوو رەخنەی نەدەگرت لەوەی کە بەڕۆژوو نەبوو، ئەوەشی کە بەڕۆژوو نەبوو رەخنەی نەدەگرت لەوەی کە بەڕۆژوو بوو.

٢٤٠٦ - (صحيح) عن قزعة قال: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ وَهُوَ يُفْتِي النَّاسَ وَهُمْ مُكِبُّونَ عَلَيْهِ، فَانْتَظَرْتُ خَلْوَتَهُ، فَلَمَّا خَلاَ سَأَلْتُهُ عَنْ صِيَامِ رَمَضَانَ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي رَمَضَانَ عَامَ الْفَتْحِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ وَنَصُومُ، حَتَّى بَلَغَ مَنْزِلاً مِنَ الْمَنَازِلِ فَقَالَ: (إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ). فَأَصْبَحْنَا: مِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، قَالَ: ثُمَّ سِرْنَا فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَقَالَ: (إِنَّكُمْ تُصَبِّحُونَ عَدُوَّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ فَأَفْطِرُوا). فَكَانَتْ عَزِيمَةً مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: ثُمَّ لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَصُومُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ ذَلِكَ وَبَعْدَ ذَلِكَ.

واتە: قەزەعە دەڵێت: چووم بۆلای ئەبو سەعیدی خودری لەوکاتـەدا خـەڵکێکی زۆری لەدەور بوو فەتوای بۆ دەدان، چاوەڕێم دەکرد هـەتا خەڵکەکـە چـۆڵی بکـەن، کـاتێ کـە خەڵکەکەی لێ نەما، سەبارەت بەڕۆژووی مانگی رەمەزان لەسەفەردا پرسیارم لـێ کـرد؟ ئەبو سەعید وتی: لەسـاڵی رزگـارکردنی مەککـە لـە مـانگی رەمەزانـدا لەسـەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دەرچووین بەرەو مەککە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بـەڕۆژوو بـوو ئێمـەش بـەڕۆژوو بـووین هـەتا گەیشـتینە مەنزڵگایـە فەرمووی: (ئێوە سبەینێ ڕوو بە ڕووی دوژمنی خۆتـان دەبنـەوە، ئەگـەر بـەڕۆژوو نـەبن بەهێز تر دەبن). بۆ بەیانی هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەشمان بوو بـەڕۆژوو نـەبوو، ئەمـە روخسەت بوو لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، راوی وتی: لەپاشدا رۆشـتین هـەتا گەیشتینە مەنزڵگایەکی تر لەوێش دابەزین بۆ حەوانەوە، فەرمووی: (ئەوا ئێوە بەرە بەرە نزیك دەبنەوە لە دوژمنی خۆتان، ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێز تـر دەبـن کەواتـە بـەڕۆژوو مەبن). ئەمەش عەزیمە بوو لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیـه وسـلم) لەسـەر بـەڕۆژوو نەبوون. ئەبو سەعید دەیوت: لە پێش ئەم سەفەرەو لەدوای ئەو سەفەرەش بە چـاوی خـۆم دیومە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەڕۆژوو دەبووین و رێگریشی لێ نەدەکردین.

## باسی هەڵبژاردنی بەڕۆژوو نەبوون.

## ٤٣ - باب اخْتِيَارِ الْفِطْرِ.

٢٤٠٧ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأَى رَجُلاً يُظَلَّلُ عَلَيْهِ وَالزِّحَامُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە سەفەرێکدا پیاوێکی بینــی قەرەباڵغیــەکی زۆری لــەدەور بــوو ســێبەریان بــۆ کردبــوو لەگەرمادا یان لە تینواندا، فەرمووی: (ڕۆژووگرتن لە سەفەردا لەکردەوە چاکەکان نیە).

٢٤٠٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك- رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبٍ إِخْوَةِ بَنِي قُشَيْرٍ - قال: أَغَارَتْ عَلَيْنَـا خَيْـلٌ لِرَسُـولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَانْتَهَيْتُ، أَوْ قَالَ: فَانْطَلَقْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَأْكُلُ، فَقَالَ: (اجْلِسْ فَأَصِبْ مِنْ طَعَامِنَا هَذَا). فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ، قَالَ: (اجْلِسْ أُحَدِّثْكَ عَنِ الصَّلاَةِ وَعَنِ الصِّيَامِ، إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَضَعَ شَطْرَ الصَّلاَةِ - أَوْ نِصْفَ الصَّلاَةِ - وَالصَّوْمَ عَنِ الْمُسَافِرِ، وَعَنِ الْمُرْضِعِ، أَوِ الْحُبْلَى). وَاللَّهِ لَقَدْ قَالَهُمَا جَمِيعًا أَوْ أَحَدَهُمَا، قَالَ: فَتَلَهَّفَتْ نَفْسِي أَنْ لاَ أَكُونَ أَكَلْتُ مِنْ طَعَامِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە — کە پیاوێ بوو لە بەنی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی کەعب برای بەنی قوشەیر (ئەمە ئەو ئەنەسە نیە کە خزمەتی پێغەمبــەری (صلی الله علیــه وســلم) دەکرد - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کۆمەڵێ ئەسپ سواری پێغەمبەری خــوا (صلی الله علیــه وسلم) دای بەسەرماندا، چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وســلم) لەوکاتــەدا خواردنی دەخوارد، فەرمووی: (دانیشە خواردنمان لەگەڵ نۆش بکە). وتم: مــن بــەڕۆژووم، فەرمووی: (دانیشە هەتا باسی نوێژ و ڕۆژووت بۆ بکەم، بەڕاســتی خــوای گــەورە لەســەر موسافیر نیوەی نوێژ و ڕۆژووی لاداوە، وە لەسەر ئافرەتی شــیردەر و سـك پــڕیش ڕۆژووی

هەڵگرتوە). سوێند بە (اللە) پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) (الْمُرْضِع) و (الْحُبْلى)ی فەرموو یان یەکێکیانی فەرموو، زۆر بەداخەوەم لە خواردنەکەی پێغەمبەری خوام (صلی اللە علیە وسلم) نەخوارد، خۆزگە لێم بخواردایە.

## باسی دەربارەی ئەوانەی کە لەسەفەردا بەڕۆژوو بوون هەڵدەبژێرن

## ٤٤ - باب فِيمَنِ اخْتَارَ الصِّيَامَ.

**٢٤٠٩ - (صحيح) عن أبي الدرداء قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ غَزَوَاتِهِ فِي حَرٍ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ - أَوْ كَفَّهُ عَلَى رَأْسِهِ - مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، مَا فِينَا صَائِمٌ، إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ.**

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی اللە علیە وسلم) دەردەچوین بۆ غەزا لە گەرمایەکی زۆردا، هەتا یەکێ لە ئێمە لەتاو زۆری گەرما دەستی لەسەر سەری دادەنا، هیچ کەسێ لە ئێمە بەڕۆژوو نەدەبوو جگە لە پێغەمبەری خوا (صلی اللە علیە وسلم) و (عبد اللە)ی کوڕی ڕەواحە.

٢٤١٠ - (ضعيف) عن سنان بن سلمة بن المحبق الهذلي، يحدث عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ كَانَتْ لَهُ حَمُولَةٌ تَأْوِي إِلَى شِبَعٍ فَلْيَصُمْ رَمَضَانَ حَيْثُ أَدْرَكَهُ).

واتە: سینانی کوڕی سەلەمەی کوڕی موحەببەقی (هُذَلِیّ)، لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە. کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لەسەفەردا وڵاخی سواری پێ بوو ئەو وڵاخە بیگەیەنێتە شوێنێ کە خواردن و خواردنەوەی لێ بێ ئەگەر لەو شوێنە تێر بێ و قورس نەبوو لەسەری با مانگی رەمەزان بەرِۆژوو بێت.

٢٤١١ - (ضعيف) عن سنان بن سلمة بن المحبق قال: (مَنْ أَدْرَكَهُ رَمَضَانُ فِي السَّفَرِ). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی موحەببەقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لە مانگی رەمەزاندا هەرکەسێ لەسەفەردا بوو وڵاخی سواری پێ بوو سەفەرەکەی قورس نەبوو لەسەری با بەرِۆژوو بێت). جا راوی فەرموودەکەی وەك فەرموودەی پێشو گێڕایەوە.

# باسی موسافیر ئەگەر دەرچوو بۆ سەفەرەکەی کەی ڕۆژووەکەی بشکێنی.

# ٤٥ - باب مَتَى يُفْطِرُ الْمُسَافِرُ إِذَا خَرَجَ.

٢٤١٢ - (صحيح) عن عبيد قال: كُنْتُ مَعَ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ صَاحِبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفِينَةٍ مِنَ الْفُسْطَاطِ فِي رَمَضَانَ، فَرُفِعَ، ثُمَّ قُرِّبَ غَدَاهُ - قَالَ جَعْفَرٌ: فِي حَدِيثِهِ - فَلَمْ يُجَاوِزِ الْبُيُوتَ حَتَّى دَعَا بِالسُّفْرَةِ - قَالَ: اقْتَرِبْ، قُلْتُ: أَلَسْتَ تَرَى الْبُيُوتَ؟ قَالَ أَبُو بَصْرَةَ: أَتَرْغَبُ عَنْ سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ جَعْفَرٌ فِي حَدِيثِهِ: فَأَكَلَ.

واتە: لە عوبەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە شاری (فُسْطَاط) — لە مصر - لەمانگی رەمەزاندا لەخزمەت ئەبو بەصرەی غیفاری هاوەڵی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووم سواری کەشتیەك بووین، پاڵی نا بە کەشتیەکەوە، لەپاشدا خواردنەکەی هێنا، - جەعفەر لە فەرمودەکەیدا وتی: هێشتا لە ماڵەکان دور نەکەوتوبوینەوە داوای سفرەی کرد - وتی: نزیك بەرەوە بخۆ، وتم: ئایا ماڵەکان نابینی؟ ئەبو بەصرە وتی: ئایا تۆ پشت دەکەیتە رێباز و سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جەعفەر لە فەرمودەکەیدا وتی: جا ئەبو بەصرە لە خواردنەکەی خوارد.

## باسی ئەندازەی دووری ئەو ماوەیەی کە موسافیر لەسەفەرەکەیدا ڕۆژووەکەی تێدا دەشکێنێ

## ٤٦ – باب قَدْرِ مَسِيرَةِ مَا يُفْطِرُ فِيهِ.

**٢٤١٣ - (ضعيف) عن منصور الكلبِي: أَنَّ دِحْيَةَ بْنَ خَلِيفَةَ خَرَجَ مِنْ قَرْيَةٍ مِنْ دِمَشْقَ مَرَّةً إِلَى قَدْرِ قَرْيَةِ عُقْبَةَ مِنَ الْفُسْطَاطِ، وَذَلِكَ ثَلاَثَةُ أَمْيَالٍ، فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ إِنَّهُ أَفْطَرَ وَأَفْطَرَ مَعَهُ نَاسٌ، وَكَرِهَ آخَرُونَ أَنْ يُفْطِرُوا، فَلَمَّا رَجَعَ إِلَى قَرْيَتِهِ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ الْيَوْمَ أَمْرًا مَا كُنْتُ أَظُنُّ أَنِّى أَرَاهُ! إِنَّ قَوْمًا رَغِبُوا عَنْ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ، يَقُولُ ذَلِكَ لِلَّذِينَ صَامُوا، ثُمَّ قَالَ عِنْدَ ذَلِكَ: اللَّهُمَّ اقْبِضْنِى إِلَيْكَ.**

واتە: لە مەنصوری کەلبییەوە دەگێرنەوە، کە جارێ دیحیەی کوڕی خەلیفە لەمانگی ڕەمەزاندا لە دێیەکی دیمەشق دەرچو بۆ شوێنێکی تر کە دووری بە ئەندازەی دووری نێوان شاری (فُسْطَاط) و دێی عوقبە دەبوو، کە سێ میل دوور بوو، لەپاشدا خۆی ڕۆژووەکەی شکاندو کۆمەڵێ لەگەڵی ڕۆژووەکەیان شکاند، بەلاّم کۆمەڵێکی تریان شکاندنی ڕۆژووەکەیان پێ ناخۆش بوو، کاتێ کە گەڕایەوە بۆ دێکەی خۆی وتی: سوێند بە (اللّه) ئەمڕۆ شتێکم دی باوەڕم نەدەکرد هەرگیز بیبینم، کۆمەڵێ پشتیان کردە ڕێباز و سوننەتی

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی، ئەمەی بەوانە وت كە بەڕۆژوو بوون و ڕۆژوەكەیان نەشكاند، ئینجا هەر لەو كاتەدا وتی: خودایە ڕۆحم بەرەوە بۆلای خۆت.

٢٤١٤ - (صحيح موقوف) عن نافع: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ كَانَ يَخْرُجُ إِلَى الْغَابَةِ فَلاَ يُفْطِرُ وَلاَ يَقْصُرُ.

واتە: لە نافیعەوە دەگێڕنەوە، كە ئیبنو عومەر دەردەچو بۆ (غابە) – شوێنێكە لە نزیك مەدینەوە - نە ڕۆژووی دەشكاندو نە نوێژیشی كورت دەكردەوە.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: سەرجەم مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم.

## ٤٧ – باب مَنْ يَقُولُ صُمْتُ رَمَضَانَ كُلَّهُ.

٢٤١٥ - (ضعيف) عن أبي بكرة قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ إِنِّي صُمْتُ رَمَضَانَ كُلَّهُ، ﴿وَ﴾ قُمْتُهُ كُلَّهُ). فَلاَ أَدْرِي أَكَرِهَ التَّزْكِيَةَ، أَوْ قَالَ: لاَ بُدَّ مِنْ نَوْمَةٍ أَوْ رَقْدَةٍ؟.

واتە: لە ئەبو بەكرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (با هیچ كەسێ لە ئێوە نەڵێ سەرجەم مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم و

شەونوێژم كردوە). راوی وتی: چونكە نازانیێ كە تەزكیەی نەفسی پێ ناخۆشە یان نا، یان وتی: هەر دەبێ راكشێ یان بخەوێ كە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە وتەكەی واقیعی نیە.

## باسی سەبارەت بە ڕۆژووی هەردوو جەژنەكە.

## ٤٨ – باب فِي صَوْمِ الْعِيدَيْنِ.

٢٤١٦ - (صحيح) عن أبي عبيد قال: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ: أَمَّا يَوْمُ الأَضْحَى فَتَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمِ نُسُكِكُمْ، وَأَمَّا يَوْمُ الْفِطْرِ فَفِطْرُكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ.

واتە: لە ئەبو عوبیدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەخزمەت پێشەوا عومەردا رەزای خوای لێ بێ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، لەپێشەوە دوو ركات نوێژی جەژنی كرد لەپاشدا وتاری خوێندەوەو وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژووی ڕۆژی هەردوو جەژنی رەمەزان و قوربانی قەدەغەكردوە: جەژنی قوربان لەگۆشتی قوربانیەكەتان بخۆن، جەژنی رەمەزانیش كۆتایی بەڕۆژوو گرتن بهێنن.

٢٤١٧ - (صحيح) عن أبي سعيد الخدري قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الْفِطْرِ، وَيَوْمِ الأَضْحَى، وَعَنْ لِبْسَتَيْنِ: الصَّمَّاءِ، وَأَنْ يَحْتَبِيَ الرَّجُلُ فِي الثَّوْبِ

الْوَاحِدِ، وَعَنِ الصَّلاَةِ فِـى سَـاعَتَيْنِ: بَعْـدَ الصُّبْحِ، وَبَعْـدَ الْعَصْرِ.

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبــەری خــوا (صـلى الله عليه وسلم) رێگری کردوە لە بـەڕۆژوو بـوونی دوو ڕۆژ: ڕۆژی جـەژنی رەمــەزان و جـەژنی قوربان، هەروەها دوو جۆر پۆشاکیشی قەدەغەکردوە: پارچە جلێ کـە خـۆی پـێ شـەتەك بدات نەتوانێ دەستی دەربێنێ، بە چیچکانەوە دانیشێ تەنیا کراسێکی لەبەردا بێ هیچی لە پێدا نەبێ، وە رێگری کردوە لەنوێژکردن لەدوو کاتدا: لەدوای نوێژی بە یانیــەوە هــەتا خۆر هەڵدێ و بەرزدەبێتەوە، لەدوای نوێژی عەسریش هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

## باسی ڕۆژووی سێ ڕۆژەی دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان کە پێیان دەوترێت: (أَيَّام التَّشْرِيق)

## ٤٩ – باب صِيَامِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ.

٢٤١٨ - (صحيح) عن أبي مرة مولى أم هانيء: أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَلَى أَبِيهِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ فَقَرَّبَ إِلَيْهِمَا طَعَامًا، فَقَالَ: كُلْ، قَالَ: إِنِّي صَائِمٌ، فَقَالَ عَمْرٌو: كُـلْ فَهَـذِهِ الأَيَّـامُ الَّتِـى كَـانَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَأْمُرُنَـا بِإِفْطَارِهَا، وَيَنْهَانَا عَنْ صِـيَامِهَا. قَـالَ مَالِـكٌ وَهِـىَ أَيَّـامُ التَّشْرِيقِ.

واتە: لە ئەبو مورەی بەندەی رزگارکراوی ئوممو هانیەوە دەگێرنەوە، کە لەگەڵ (عَبْـد اللّٰه)ی کوڕی عەمردا چونەژورەوە بۆلای باوکی واتە عەمری کوڕی عاص، جا خواردنی نی نزیك کردنەوە، وتی: بخۆن، وتی: من بەرۆژووم، عەمر وتی: بخۆ، ئەم ڕۆژانە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ دەکردین ڕۆژووی تێدا نەگرین، ڕێگری لێ دەکردین کە تێیاندا بەرۆژوو بین، مالیك وتی: ئەو ڕۆژانەش سێ ڕۆژەی دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانن کە پێیان دەوترێت: (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ).

**٢٤١٩ - (صحيح) عن عقبة بن عامر قال: قال رسول الله النبي صلى الله عليه وسلم: (يَوْمُ عَرَفَةَ وَيَوْمُ النَّحْرِ وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلاَمِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ).**

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەی ئەهلی ئیسلام ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی قوربانی کردن و سێ ڕۆژەی دوای یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان(أَيَّامِ التَّشْرِيقِ) ئەم ڕۆژانە جەژنی ئێمەن، ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن واتە تێیاندا بەرۆژوو مەبن).

## باسی ڕۆژی هەینی بە تەنیا تەرخان بکرێت بۆ بەڕۆژوو بوون ڕێگری لێ کراوە.

## ٥٠ - باب النَّهْيِ أَنْ يُخَصَّ يَوْمُ الْجُمُعَةِ بِصَوْمٍ.

٢٤٢٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ بِيَوْمٍ أَوْ بَعْدَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (با هیچ کەسێ لە ئێوە ڕۆژی هەینی بە تەنیا بەڕۆژوو نەبێ، مەگەر لە پێشیەوە یان لە پاشیەوە ڕۆژێکی تر بەڕۆژوو بێت).

## باسی ڕۆژی شەممە بە تەنیا تەرخان بکرێت بۆ بەڕۆژوو بوون ڕێگری لێ کراوە.

## ٥١ - باب النَّهْيِ أَنْ يُخَصَّ يَوْمُ السَّبْتِ بِصَوْمٍ.

٢٤٢١ - (صحيح) عن عبد الله بن بسر السلمي، عن أخته - وقال يزيد: الصماء - أن النبى صلى الله عليه و سلم قال: (لاَ تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلاَّ فِيمَا افْتُرِضَ عَلَيْكُمْ، وَإِنْ لَمْ يَجِدْ

أَحَدُكُمْ إِلاَّ لِحَاءَ عِنَبَةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا حَدِيثٌ مَنْسُوخٌ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بوسری سولەمییەوە، لە خوشکێکیەوە – یەزید وتی: کە ناوی (الصَّمَّاء) بوو - دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ڕۆژی شەممە بەڕۆژوو مەبن جگە لە ڕۆژووە فەرزەکان، ئەگەر هیچتان دەست نەکەوت بیخۆن جگە لە تلّپی دەنکە ترێیەك یان پەلکە دارێك ئەوا ئەوە بجون و بیخۆن و بەڕۆژوو مەبن). ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە نەسخ بۆتەوە.

## باسی ڕوخسەت لەمەدا واتە لە تەرخانکردنی ڕۆژی شەممە بۆ بەڕۆژوو بوون.

## ٥٢ - باب الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٢٤٢٢ - (صحيح) عن جويرية بنت الحارث: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَهِيَ صَائِمَةٌ، فَقَالَ: (أَصُمْتِ أَمْسِ؟). قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (تُرِيدِينَ أَنْ تَصُومِي غَدًا). قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (فَأَفْطِرِي).

واتە: لە جوەیریەی کچی (حارث)ی هاوسەری پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژی هەینی چوەژوورەوە بۆلای

بەرۆژوو بوو، فەرمووی: (ئایا دوێنێ بەرۆژوو بوویت؟). وتی: نەو، فەرمووی: (ئەی دەتەوێ سبەینێ بەرۆژوو بیت؟). وتی: نەء فەرمووی: (دەی رۆژووەکەت بشکێنە).

**٢٤٢٣ - (مقطوع) عن ابن شهاب: أَنَّهُ كَانَ إِذَا ذُكِرَ لَهُ أَنَّهُ نُهِيَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ السَّبْتِ، يَقُولُ ابْنُ شِهَابٍ: هَذَا حَدِيثٌ حِمْصِيٌّ.**

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە دەگێرنەوە، کاتێ کە بۆیان باسی بکردایە کە رێگری کراوە لە بەرۆژوو بوونی رۆژی شەممە، ئیبنو شیهاب دەیوت: ئەمە فەرموودەی حیمصیە واتە فەرموودەیەکی لاوازە.

**٢٤٢٤ - (صحيح مقطوع) عن الأوزاعي قال: مَا زِلْتُ لَهُ كَاتِمًا حَتَّى رَأَيْتُهُ انْتَشَرَ، يَعْنِي حَدِيثَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ هَذَا فِي صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ مَالِكٌ: هَذَا كَذِبٌ.**

واتە: لە پێشەوا ئەوزاعیەوە هاتوە، کەوتویەتی: بەردەوام دەمشاردەوە هەتا بینیم بڵاوبۆتەوە، واتە فەرموودەکەی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بوسر دەربارەی بەرۆژوو بوونی رۆژی شەممە. ئەبو داود دەڵێت: مالیك وتویەتی: ئەمە هەڵەیە.

## باسی سەبارەت بە کەسێ هەموو ڕۆژەکانی ساڵ بەڕۆژوو بێ.

## ٥٣ - باب فِي صَوْمِ الدَّهْرِ تَطَوُّعًا.

٢٤٢٥ - (صحيح) عن أبي قتادة: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ،كَيْفَ تَصُومُ؟ فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ قَوْلِهِ، فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ عُمَرُ قَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا، نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِ اللَّهِ، وَمِنْ غَضَبِ رَسُولِهِ! فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَدِّدُهَا حَتَّى سَكَنَ غَضَبُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الدَّهْرَ كُلَّهُ؟ قَالَ: (لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ). قَالَ مُسَدَّدٌ: (لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ، أَوْ: مَا صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ). شَكَّ غَيْلاَنُ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: (أَوَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا، وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: (ذَلِكَ صَوْمُ دَاوُدَ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: (وَدِدْتُ أَنِّي طُوِّقْتُ ذَلِكَ). ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ثَلاَثٌ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، فَهَذَا صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، وَصِيَامُ عَرَفَةَ

إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ، وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ، وَصَوْمُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ).

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆن ڕۆژووی سونەنەت بگرم؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە وتەكەی زۆر توڕە بوو، كاتێ كە عومەر ئەو حاڵەتەی دی وتی: ڕازین بەوەی كە (الله) پەروەردگارمان بێت، ئیسلام دینمان بێت، موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرمان بێت، پەنا دەگرین بە خوای گەورە لە توڕەیی خوای گەورەو پەروەردگار، وە لە توڕەیی پێغەمبەرەكەی، بەردەوام ئەمەی دەوتەوە هەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێواش بویەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەی بەلاتەوە چۆنە كەسێك هەموو ژیان بەڕۆژوو بێت؟ فەرمووی: (ئەوە نە بەڕۆژوو بووە، وە نە بەڕۆژوویش نەبووە). موسەددەد وتی: (لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ، أَوْ: مَا صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ). غەیلان گومانی هەبوو، كە كامیانی وت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلاتەوە چۆنە كەسێك دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بێ و ڕۆژێ بەڕۆژوو نەبێ؟ فەرمووی: (ئایا كەس توانای ئەوەی هەیە؟). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلاتەوە چۆنە كەسێك ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ و ڕۆژێ بەڕۆژوو نەبێ؟ فەرمووی: (ئەوە ڕۆژووی داود پەیامبەرە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەلاتەوە چۆنە كەسێك ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ و دوو ڕۆژ بەڕۆژوو نەبێ؟ فەرمووی: (خۆزگە توانای ئەوەم هەبوایە). لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لە مانگێكدا سێ ڕۆژ ڕۆژوو، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بۆ مانگی ڕەمەزان، ئەوە وەك ڕۆژووی هەموو ساڵەكە وەهایە، ئومێد دەكەم لە خوای گەورە كە ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە ببێتە كەفارەتی گوناهی ساڵی پێشو و ساڵی داهاتوو، وە ڕۆژووی ڕۆژی دەی مانگی موحەڕەم(عاشورا) ببێتە كەفارەتی گوناهی ساڵی پێشو.

٢٤٢٦ - (صحيح) عن أبي قتادة بهذا، الحديث، زاد، قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ صَوْمَ يَوْمِ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمِ الْخَمِيسِ؟ قَالَ: (فِيهِ وُلِدْتُ وَفِيهِ أُنْزِلَ عَلَيَّ الْقُرْآنُ).

واتە: لە قەتادەوە هەمان فەرموده دەگێڕنەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژووی دوو شەممان و پێنج شەممانت پێ چۆنە؟ فەرمووی: (لەو ڕۆژەدا لەدایك بووم و لەو ڕۆژەشدا وەحیم بۆ هات).

٢٤٢٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو بن العاص قال: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (أَلَمْ أُحَدَّثْ أَنَّكَ تَقُولُ: لأَقُومَنَّ اللَّيْلَ، وَلأَصُومَنَّ النَّهَارَ). قَالَ: أَحْسِبُهُ قَالَ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ قُلْتُ ذَاكَ، قَالَ: (قُمْ وَنَمْ، وَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، وَذَاكَ مِثْلُ صِيَامِ الدَّهْرِ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: (فَصُمْ يَوْمًا، وَأَفْطِرْ يَوْمَيْنِ). قَالَ: فَقُلْتُ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالَ: (فَصُمْ يَوْمًا، وَأَفْطِرْ يَوْمًا، وَهُوَ أَعْدَلُ الصِّيَامِ، وَهُوَ صِيَامُ دَاوُدَ). قُلْتُ إِنِّى أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێم گەیشت فەرمووی: (باسی تۆیان بۆ کردوم کە تۆ وتوتە هەتا ماوم بە شەو شەونوێژ دەکەم و بەڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبم؟). ڕاوی وتی: پێم وایە

(عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمر وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەم وتوە، فەرمووی: (شەونوێژ بکەو بشخەوە، ناو بەناو بەرۆژوو بەو ناو بەناویش بەرۆژوومەبە، لەمانگێکدا سێ رۆژ بەرۆژوو بە ئەوە وەك رۆژووی هەموو ساڵەکە وەهایە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) توانای لەوە باشترم هەیە، فەرمووی: (رۆژێ بەرۆژوو بەو دوو رۆژ بەرۆژوو مەبە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) توانای لەوە باشترم هەیە، فەرمووی: (دەی رۆژێ بەرۆژوو بەو رۆژێ بەرۆژوو مەبە، ئەمەش رەواترین رۆژووە، رۆژووی داود پەیامبەرە). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) توانای لەوە باشترم هەیە، فەرمووی: (دەی لەوە باشتر نیە).

## باسی دەربارەی ڕۆژووی مانگە حەرامەکان کە بریتین: لە مانگی (ذو القعيدة، ذو الحِجة، محرّم، رجب)

## ٥٤ – باب فِي صَوْمِ أَشْهُرِ الْحُرُمِ.

٢٤٢٨ - (ضعيف) عن مجيبة الباهلية، عن أبيها، أو عمها: أَنَّهُ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ انْطَلَقَ، فَأَتَاهُ بَعْدَ سَنَةٍ وَقَدْ تَغَيَّرَتْ حَالَتُهُ وَهَيْئَتُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَا تَعْرِفُنِي؟ قَالَ: (وَمَنْ أَنْتَ؟). قَالَ: أَنَا الْبَاهِلِيُّ الَّذِي جِئْتُكَ عَامَ الأَوَّلِ، قَالَ: (فَمَا غَيَّرَكَ وَقَدْ كُنْتَ حَسَنَ الْهَيْئَةِ؟). قَالَ: مَا أَكَلْتُ طَعَامًا إِلاَّ بِلَيْلٍ مُنْذُ فَارَقْتُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لِمَ عَذَّبْتَ نَفْسَكَ؟). ثُمَّ قَالَ: (صُمْ شَهْرَ الصَّبْرِ وَيَوْمًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ). قَالَ: زِدْنِي فَإِنَّ بِي قُوَّةً، قَالَ: (صُمْ يَوْمَيْنِ). قَالَ: زِدْنِي، قَالَ: (صُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ). قَالَ: زِدْنِي، قَالَ: (صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ، صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ، صُمْ مِنَ الْحُرُمِ وَاتْرُكْ). وَقَالَ: بِأَصَابِعِهِ الثَّلاَثَةِ فَضَمَّهَا ثُمَّ أَرْسَلَهَا.

واتە: موجیبەی باهیلی دەڵێ: ساڵێ باوکم یان مامم هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەپاشدا ڕۆشت، بۆ ساڵی ئایندە هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕەنگ و ڕووی گۆڕا بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە نامناسیتەوە؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (تۆ کێیت؟). وتی: من ئەو پیاوە باهلیەم کە ساڵی پار هاتمە خزمەتت، فەرمووی: (تۆ پیاوێکی قۆز بووی و شێوەت جوان بوو بۆچی وا گۆڕاوی؟). وتی: لەتۆ جیابومەتەوە هیچ خواردنێکم نەخواردوە بەشەو نەبێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بۆچی ئازاری خۆتت داوە؟). لەپاشدا فەرمووی: ( مانگی صەبرو ئارامگرتن بەڕۆژوو بە واتە مانگی ڕەمەزان، وە لە مانگێکدا ڕۆژێ بەڕۆژوو بە)، وتی: بۆم زیاد بکە چونکە توانای زیاترم هەیە، فەرمووی: (دەی لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە)، وتی: بۆم زیاد بکە چونکە توانای زیاترم هەیە، فەرمووی: (لە مانگە حەرامەکاندا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بەو واز بێنە، سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بەو واز بێنە، سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بەو واز بێنە — یان سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بەو سێ ڕۆژ بەڕۆژوو مەبە - ). لە هەموو جارێکدا سێ پەنجەی دەلکاندن بەیەکەوە ئینجا بڵاوی دەکردنەوە.

## باسی دەربارەی ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەم.

## ٥٤ – باب فِي صَوْمِ الْمُحَرَّمِ.

٢٤٢٩ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْمَفْرُوضَةِ صَلاَةٌ مِنَ اللَّيْلِ). لَمْ يَقُلْ قُتَيْبَةُ (شَهْرِ). قَالَ: (رَمَضَانَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (باشترین ڕۆژوو لەدوای ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەمە کە مانگی خوای گەورەیە، باشترین نوێژیش لەدوای نوێژە فەرزەکان نوێژی شەونوێژە)، قوتەیبە راوی فەرموودەکە نەیوت: (شَهْرِ) مانگ. بەڵکو وتی: (رَمَضَانَ) ڕەمەزان.

٢٤٣٠ – (صحيح) عن عثمان - يعني ابن حكيم - قال: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ عَنْ صِيَامِ رَجَبَ، فَقَالَ: أَخْبَرَنِى ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ.

واتە: لە (عُثْمَان) – واتە: ئیبنو حەکیم – ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە ڕۆژووی مانگی ڕەجەب لە سەعیدی کوڕی جوبەیرم پرسی، وتی: ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ پێی ڕاگەیاندم: کە جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو هەتا دەمانوت ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێت و هیچ ناخوات، جاری واش هەبوو بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانوت: ئیتر بەڕۆژوو نابێت.

## باسی دەربارەی ڕۆژووی مانگی شەعبان.

## ٥٦ – باب فِي صَوْمِ شَعْبَانَ.

**٢٤٣١ - (ضعيف) عن عائيشة رضي الله عنها قالت: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَصُومَهُ شَعْبَانُ، ثُمَّ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە مانگەکەکانی ساڵدا خۆشەویسترین مانگ بەلای پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) مانگی شەعبان بوو. زۆرترینی ڕۆژەکانی بەڕۆژوو دەبوو.

## باسی دەربارەی ڕۆژووی مانگی شەوال.

## ٥٧ – باب فِي صَوْمِ شَوَّالٍ.

**٢٤٣٢ - (ضعيف) عن عبيد الله بن مسلم القرشي، عن أبيه قال: سَأَلْتُ - أَوْ سُئِلَ - النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - عَنْ صِيَامِ الدَّهْرِ فَقَالَ: (إِنَّ لأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، صُمْ رَمَضَانَ وَالَّذِي يَلِيهِ، وَكُلَّ أَرْبِعَاءَ وَخَمِيسٍ، فَإِذَا أَنْتَ قَدْ صُمْتَ الدَّهْرَ).**

واتە: لە (عبيد الله)ی كوڕی موسلیمی قورەشییەوە ، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پرسیارم كرد - یان پرسیار كرا — لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی بەڕۆژوو بوونی دوانزە مانگەی ساڵ، فەرمووی: (خانەوادەكەت هەق و مافی لەسەرتە، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بە لەگەڵ ئەوەی بەدوایدا دێت - مەبەستی لە مانگی شەوال یان شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بوو، مانگی شەوال نەسەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵكو شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال فەرمودەی لەسەرە - ، هەموو چوار شەممەو پێنج شەممەیە بەڕۆژوو بە — چوار شەممە نەسەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام پێنج شەممە فەرمودەی زۆری لەسەرە - ، وەك ئەوە وایە دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بیت).

## باسی دەربارەی شەش ڕۆژ ڕۆژووی مانگی شەوال

## ٥٨ – باب فِي صَوْمِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ.

**٢٤٣٣ - (صحيح) عن أبي أيوب صاحب النبي صلى الله عليه و سلم، عن النبِي صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ بِسِتٍّ مِنْ شَوَّالٍ، فَكَأَنَّمَا صَامَ الدَّهْرَ).**

واتە: لە ئەیوبی هاوەڵی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەركەسێ ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ، لەپاشدا شەش ڕۆژی مانگی شەوال بەدوایدا بگرێت، وەك ئەوە وایە كە دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بوبێت).

# باسی چۆنیەتی ڕۆژووی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

# ٥٩ - باب كَيْفَ كَانَ يَصُومُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

٢٤٣٤ - (صحيح) عن عائشة زوج النبى صلى الله عليه و سلم قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لاَ يَصُومُ، وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَكْمَلَ صِيَامَ شَهْرٍ قَطُّ إِلاَّ رَمَضَانَ، وَمَا رَأَيْتُهُ فِى شَهْرٍ أَكْثَرَ صِيَامًا مِنْهُ فِى شَعْبَانَ.

واته: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرنەوە، كە وتویەتی: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو هەتا دەمانوت ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێت و هیچ ناخوات، جاری واش هەبوو بەڕۆژوو نەدەبوو هەتا دەمانوت: ئیتر بەڕۆژوو نابێت، هەرگیز نەمبینیوە ڕۆژووی هیچ مانگێ تەواو بكات جگە لەمانگی رەمەزان، وە نەمدیوە لەهیچ مانگێكدا زۆر تر تێیدا بەڕۆژوو بێت وەك مانگی شەعبان.

٢٤٣٥ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم، بِمَعْنَاهُ. زَادَ: كَانَ يَصُومُهُ إِلاَّ قَلِيلاً بَلْ كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ.

واتە: لە ئەبو هوردیرەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام راوی ئەمەی بۆ زیاد کرد: هەندێ جار کەمێ لە مانگی شەعبان بە ڕۆژوو دەبوو، هەندێ جاریش هەموو مانگەکە بەڕۆژوو دەبوو.

## باسی سەبارەت بە ڕۆژووی دوو شەممان و پێنج شەممان

## ٦٠ - باب فِي صَوْمِ الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ.

٢٤٣٦ - (صحيح) عن مولى أسامة بن زيد: أَنَّهُ انْطَلَقَ مَعَ أُسَامَةَ إِلَى وَادِي الْقُرَى فِي طَلَبِ مَالٍ لَهُ، فَكَانَ يَصُومُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَقَالَ لَهُ مَوْلاَهُ: لِمَ تَصُومُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ وَأَنْتَ شَيْخٌ كَبِيرٌ؟ فَقَالَ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَصُومُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، وَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ؟ فَقَالَ: (إِنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُعْرَضُ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ).

واتە: لە خزمەتکارێکی ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێرنەوە، کە لەگەڵ ئوسامەدا دەرچوون بۆ (وادی القرى) بەدوای ماڵ و سامانێکی ئوسامەدا، جا ئوسامە ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، خزمەتکارەکەی پێی وت: بۆچی ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبیت لەکاتێکدا کە تۆ پیاوێکی پیریت؟ وتی: چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو، لەوبارەوە لێیان پرسی فەرمووی: (لە ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممانداا کاروکردەوەکانی بەندەکان نمایش دەکرێن و نیشان دەدرێن).

**٢٤٣٧ - (صحيح) عن هنيدة بن خالد عن امرأته عن بعض أزواج النبى صلى الله عليه و سلم قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ: أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ، وَالْخَمِيسَ.**

واتە: لە هونەیدەی کوڕی خالیدەوە، لە هاوسەرەکەیەوە، لە هەندێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نۆ ڕۆژی (ذو الحجة) — نۆمینەی حاجیان - و ڕۆژی (عاشوراء) و سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا، یەکەم دوو شەممەی مانگ و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو.

# باسی دەربارەی ڕۆژووی دەی مانگی (ذو الحجة) نۆمینەی حاجیان.

## ٦١ – باب فِي صَوْمِ الْعَشْرِ.

٢٤٣٨ - (صحيح) عن أبن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهَا أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ). يَعْنِى أَيَّامَ الْعَشْرِ. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: (وَلاَ الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ). قَالَ: (إِلاَّ رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَىْءٍ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هیچ ڕۆژێ نیە وەك دە ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذو الحجة) – واتە نۆمینەی حاجیان - کردەوەی چاکیان تێدا خۆشەویست بێ بەلای خوای گەورەوە)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جیهادو تێکۆشانیش لەڕێگەی خوای گەورەدا؟ فەرمووی: (تەنانەت جیهادو تێکۆشانیش لەڕێگەی خوای گەورەدا). فەرمووی: (مەگەر کەسێ بە خۆی ماڵ و سامانیەوە بڕوات بۆ جیهادو خۆی بکوژرێت و ماڵ و سامانەکەی بڕوات).

## باسى دەربارەى بەڕۆژوو نەبوون لە دە ڕۆژى مانگى (ذو الحجة)– واتە لە نۆمینەى حاجیان– دا.

## ٦٢ – باب فِي فِطْرِ الْعَشْرِ.

٢٤٣٩ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَائِمًا الْعَشْرَ قَطُّ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هەرگیز نەمدیو: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە دە ڕۆژی یەکەمی مانگی (ذو الحجة)دا بەڕۆژوو بێت.

## باسى دەربارەى ڕۆژووى عەرەفە لەخاكى عەرەفاتدا

## ٦٣ – باب فِي صَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ.

٢٤٤٠ - (ضعيف) عن عكرمة قال: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي بَيْتِهِ فَحَدَّثَنَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ بِعَرَفَةَ.

واتە: لە عیکریمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە خزمەت ئـەبو هـورەیرەدا بـووین لەماڵەکەی خۆیدا باسی ئەوەی بۆ دەکردین کـە پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیـه وسـلم) ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەی لەخاکی عەرەفاتدا قەدەغەکردوە.

٢٤٤١ - (صحيح) عن أم الفضل بنت الحارث: أَنَّ نَاسًا تَمَـارَوْا عِنْـدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صَوْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَـالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ. فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ بِعَرَفَةَ فَشَرِبَ.

واتە: لە (أُمِّ الْفَضْل)ی کچی (حارث)ەوە دەگێرنەوە، کە لە ڕۆژی عەرەفەدا خـەڵکانێ لەلایدا دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە لەبارەی بەڕۆژووی بوونی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، هەندێکیان وتیان: بەڕۆژووە، هەندێکی تریان وتیان: بەڕۆژوو نیە، جـا منـیش پەرداخێ شیرم بۆ نارد لەو کاتـەدا بەسـەر وشـترەکەیەوە بـوو لـەخاکی عەرەفاتـدا لێـی خواردەوە.

## باسی سەبارەت بە ڕۆژووی ڕۆژی (عاشوراء).

## ٦٤ - باب فِي صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ.

٢٤٤٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّـهِ

**صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ هُوَ الْفَرِيضَةَ، وَتُرِكَ عَاشُورَاءُ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ.**

واتە: عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: لەسەردەمی نەفامی(جاهلی)دا قورەیشیەکان لە رۆژی عاشورادا بەرۆژوو دەبوون، هەروەها پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) بەرۆژوو دەبوو، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەیشتە مەدینە بەرۆژوو دەبوو فەرمانی بە خەڵکیش کرد کە بەرۆژوو بن، کاتێ کە رۆژووی مانگی رەمەزان فەرز کرا، وازی لێ هێنا واتە لە رۆژی عاشورادا بەرۆژوو نەدەبوو، ئیتر ئەوەی بیویستایە لە رۆژی عاشورادا بەرۆژوو دەبوو، ئەوەشی بیویستایە بەرۆژوو نەدەبوو.

**٢٤٤٣ - (صحيح) عن أبن عمر قال: كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْمًا نَصُومُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا نَزَلَ رَمَضَانُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذَا يَوْمٌ مِنْ أَيَّامِ اللَّهِ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ).**

واتە: ئیبنو عومەر رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: رۆژی عاشورا رۆژێ بوو ئێمە لەسەردەمی نەفامی(جاهلی)دا تێیدا بەرۆژوو دەبووین هەتا رۆژووی مانگی رەمەزان فەرز کرا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (رۆژی عاشورا رۆژێکە لە رۆژە شکۆمەندەکانی خوای گەورە، جا ئەوەی دەیەوێت با بەرۆژوو بێ، ئەوەشی دەیەوێ با بەرۆژوو نەبێ).

٢٤٤٤ - (صحيح) عن ابن عباس قال: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ وَجَدَ الْيَهُودَ يَصُومُونَ عَاشُورَاءَ، فَسُئِلُوا عَنْ ذَلِكَ، فَقَالُوا: هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي أَظْهَرَ اللَّهُ فِيهِ مُوسَى عَلَى فِرْعَوْنَ، وَنَحْنُ نَصُومُهُ تَعْظِيمًا لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَحْنُ أَوْلَى بِمُوسَى مِنْكُمْ). وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەیشتە مەدینە بینی جولەکەکان لە ڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو دەبن، لەوبارەیەوە لێی پرسین، وتیان: ئەمە ڕۆژێکە لەم ڕۆژەدا خوای گەورە موساو گەلەکەی لەدەست فیرعەون رزگار کرد، بۆیە ئێمەش ئەم ڕۆژە بە گەورە دەگرین و تێیدا بەڕۆژوو دەبین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئێمە لەپێش ترین بۆ موسا لە ئێوە). جا فەرمانی کرد بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی عاشورادا.

٢٤٤٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عباس قال: حِينَ صَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَنَا بِصِيَامِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ صُمْنَا يَوْمَ التَّاسِعِ). فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ .

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا

(صلی الله علیه وسلم) لە ڕۆژی عاشورادا بەڕۆژوو بوو، وە فەرمانی بە ئێمەش کرد کە تێیدا بەڕۆژوو بین، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمە ڕۆژێکە جولەکەو گاورەکان بە گەورەی دادەنێن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە بیەوێ ساڵی ئاینده ڕۆژی نۆهەمیش بەڕۆژوو دەبین)، ئەوەبو ساڵی ئاینده نەهات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدنیا دەرچو.

## باسی ئەوانەی دەگێڕنەوە کە ڕۆژی عاشورا نۆی مانگە

## ٦٥ - باب مَا رُوِيَ أَنَّ عَاشُورَاءَ الْيَوْمُ التَّاسِعُ.

٢٤٤٦ - (صحيح) عن الحكم بن الأعرج قال: أَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتَ هِلَالَ الْمُحَرَّمِ فَاعْدُدْ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ التَّاسِعِ فَأَصْبِحْ صَائِمًا، فَقُلْتُ: كَذَا كَانَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ؟ فَقَالَ: كَذَلِكَ كَانَ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ.

واتە: حەکەمی کوڕی ئەعرەج دەڵێت: لە مزگەوتی حەرام چومە خزمەت ئیبنو عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ لەسەر پۆشاکەکەی شانی دادابوو، دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی عاشورا پرسیارم لێ کرد، وتی: کاتێ کە مانگی یەك شەوەی مانگی موحەڕڕەمت دی: ڕۆژەکان بژمێرە، ڕۆژی نۆیەم بەڕۆژوو بە: وتم: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ئاوەها بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: بەڵێ.

## باسی سەبارەت بە فەزڵی ڕۆژی عاشورا.

## ٦٦ - باب فِي فَضْلِ صَوْمِهِ.

٢٤٤٧ - (ضعيف) عن عبد الرحمن بن مسلمة، عن عمه، أَنَّ أَسْلَمَ أَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (صُمْتُمْ يَوْمَكُمْ هَذَا). قَالُوا لاَ. قَالَ: (فَأَتِمُّوا بَقِيَّةَ يَوْمِكُمْ وَاقْضُوهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي يَوْمَ عَاشُورَاءَ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی مەسلەمەوە، لە مامیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ڕۆژی عاشورادا هۆزی ئەسلەم هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لەم ڕۆژەتاندا بەڕۆژوو بوون). وتیان: نەء فەرمووی: (دەی باقی ڕۆژەکە هیچ مەخۆن لەپاشدا لەجیاتی ئەم ڕۆژەدا ڕۆژێ بەڕۆژوو بن واتە: قەزای بکەنەوە). — ئەمە فەرز نیە - ئەبو داود دەڵێت: واتە ڕۆژی عاشورا.

## باسی سەبارەت بە سێ ڕۆژ ڕۆژوو لەمانگێکدا

## ٦٨ - باب فِي صَوْمِ الثَّلاَثِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ

٢٤٤٩ - (صحيح) عن ابن ملحان القيسي، عن أبيه قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا أَنْ نَصُومَ الْبِيضَ: ثَلاَثَ

عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ، قَالَ: وَقَالَ: (هُنَّ كَهَيْئَةِ الدَّهْرِ).

واتە: لە ئیبنو میلحانی قەیسیەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ دەکردین کە لە ڕۆژانی (أيام البيض)دا بەڕۆژوو بین: کە دەکاتە سیانزەو چواردەو پانزەی هەموو مانگێکی عەرەبی، راوی وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەوە وەك ڕۆژووی دوانزە مانگەی ساڵ وایە). - واتە: ئەگەر کەسێ لە سیانزەو چواردەو پانزەی مانگدا بەڕۆژوو بێت وەك ئەوە وایە دوانزە مانگەی ساڵ بەڕۆژوو بێت - .

٢٤٥٠ - (حسن) عن عبد الله قال:: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ - يَعْنِي مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ - ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژانی (أيام البيض)دا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو واتە: سیانزەو چواردەو پانزەی هەموو مانگێکی عەرەبی.

# باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو دەبوو.

## ٦٩ – باب مَنْ قَالَ: الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ.

٢٤٥١ - (حسن) عن حفصة قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنَ الشَّهْرِ: الاِثْنَيْنِ، وَالْخَمِيسِ، وَالاِثْنَيْنِ مِنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى.

واتە: حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو لە مانگێکدا: ڕۆژانی دوو شەممان و، پێنج شەممان و، دوو شەممەش لە هەفتەی داهاتوو.

٢٤٥٢ - (منكر) عن هنيدة الخزاعي عن أمه قال: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ فَسَأَلْتُهَا عَنِ الصِّيَامِ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنِي أَنْ أَصُومَ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، أَوَّلُهَا الاِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ.

واتە: لە هونەیدەی خوزاعیەوە، لە دایکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چومەژوورە بۆلای ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بە ڕۆژووی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پرسیارم لێ کرد، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ دەکردم لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بم سەرەتا ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: لەهەر ڕۆژێکی مانگدا بەڕۆژوو بوایە بەلایەوە ئاسایی بوو.

## ٧٠ - باب مَنْ قَالَ: لاَ يُبَالِي مِنْ أَيِّ الشَّهْرِ.

**٢٤٥٣ - (صحيح) عن معاذة قالت: قلت لعائشة: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قُلْتُ مِنْ أَيِّ شَهْرٍ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: مَا كَانَ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ.**

واتە: (مُعَاذَة) دەڵێت: بە عائیشەم ڕەزای خوای لێ بێ وت: ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: بەڵێ، وتم: لە چ ڕۆژێکی مانگدا بەڕۆژوو دەبوو؟ وتی: لەهەر ڕۆژێکی مانگدا بەڕۆژوو بوایە بەلایەوە ئاسایی بوو.

## باسی نیەتهێنان بۆ بەڕۆژوو بوون.

## ٧١ - باب النِّيَّةِ فِي الصِّيَامِ.

**٢٤٥٤ - (صحيح) عن حفصة زوج النبي صلى الله عليه و سلم: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ).**

واتە: لە حەفصەی هاوسەری پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەس لەپێش بەیان(فجری صادق)دا نیەتی بەڕۆژوو بوونی نەبێت و عەزمی لەسەری نەبێ ئەوە ڕۆژووەکەی دروست نیە).

**٢٤٥٥ - (حسن صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ عَلَيَّ قَالَ: (هَلْ عِنْدَكُمْ طَعَامٌ؟). فَإِذَا قُلْنَا: لاَ، قَالَ: (إِنِّي صَائِمٌ). زَادَ وَكِيعٌ: فَدَخَلَ عَلَيْنَا يَوْمًا آخَرَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُهْدِيَ لَنَا حَيْسٌ فَحَبَسْنَاهُ لَكَ، فَقَالَ: (أَدْنِيهِ). قَالَ طَلْحَةُ: فَأَصْبَحَ صَائِمًا وَأَفْطَرَ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بهاتایە بۆلام دەیفەرموو: (هیچ خوارنێکتان لەلا هەیە هەتا بیخۆم؟). ئەگەر بمان وتایە: نەء دەیفەرموو: (ئەوە ئەمڕۆ بەڕۆژوو دەبم). وەکیع راوی فەرمودەکە ئەمەی بۆ زیاد کرد: ڕۆژێکی تر هات بۆلامان وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (حیس)یان — تێکەڵەیە لە خورماو ڕۆن و کەشك — بەدیاری بۆ هێناوین پێمان وایە بۆ تۆیان هێناوە لێی ناخۆیت، فەرمووی: (نزیکی بکەنەوە لێم). (طَلْحَة) وتی: بەڕۆژوو بوو بەڵام ڕۆژووەکەی شکاندو لێی خوارد.

## باسی سەبارەت بە روخسەت لەمەدا واتە وازهێنان لە نیەتهێنان لەشەودا.

## ٧٢ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي ذَلِكَ.

٢٤٥٦ - (صحيح) عن أم هانيء قالت: لَمَّا كَانَ يَوْمُ الْفَتْحِ - فَتْحِ مَكَّةَ - جَاءَتْ فَاطِمَةُ فَجَلَسَتْ عَنْ يَسَارِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأُمُّ هَانِئٍ عَنْ يَمِينِهِ، قَالَتْ: فَجَاءَتِ الْوَلِيدَةُ بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَنَاوَلَتْهُ، فَشَرِبَ مِنْهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ أُمَّ هَانِئٍ، فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ أَفْطَرْتُ وَكُنْتُ صَائِمَةً! فَقَالَ لَهَا: (أَكُنْتِ تَقْضِينَ شَيْئًا؟). قَالَتْ: لاَ، قَالَ: (فَلاَ يَضُرُّكِ إِنْ كَانَ تَطَوُّعًا).

واتە: لە ئوممو هانیئەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا (فاطمة) هات لەلای چەپی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دانیشت، ئوممو هانیئیش لەلای راستیەوە، وتی: وەلیدە جامێ ئاوی هێنا منیش دامە دەست پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لێی خواردەوە، لەپاشدا دایەوە دەست ئوممو هانی، ئەویش لێی خواردەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مـن بەڕۆژوو بووم بەلاّم ڕۆژووەکەم شکاند، فەرمووی: (ڕۆژووی فەرز بوو؟ ئەگەر ڕۆژووی فەرز بوو ئەوە دەبێ لە جیاتیدا ڕۆژێکی تر بگریتەوە). وتی: نەء فەرمووی: (دەی هیچ کاریگەری نیە بۆت و زیانت پێ ناگەیەنێت چونکە ڕۆژووی سوننەت بووە).

## باسی ئەوانەی کە پێیان وایە ئەگەر ڕۆژووی سوننەت بوو شکاندی ئەوە دەبێ بیگرێتەوە.

## ٧٣ - باب مَنْ رَأَى عَلَيْهِ الْقَضَاءَ.

٢٤٥٧ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها قالت: أُهْدِيَ لِي وَلِحَفْصَةَ طَعَامٌ، وَكُنَّا صَائِمَتَيْنِ فَأَفْطَرْنَا، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْنَا لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ فَاشْتَهَيْنَاهَا فَأَفْطَرْنَا؟! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ عَلَيْكُمَا، صُومَا مَكَانَهُ يَوْمًا آخَرَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: خواردنێکیان بەدیاری هێنا بۆ من و حەفصە، لەوکاتەدا هەردووکمان بەڕۆژوو بووین - ڕۆژووی سوننەت - ڕۆژووەکەمان شکاندو لێمان خوارد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتەژوورەوە بۆلامان، پێمان وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خواردنێکیان بەدیاری هێنا بۆمان حەزمان لێ کرد ڕۆژووەکەمان شکاندو لێمان خوارد ؟! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هیچی تێدا نیە، ڕۆژێکی تر قەزای بکەنەوە).

# باسی ژن بەبێ پرس و ڕەزامەندی مێردەکەی ڕۆژووی سوننەت بگرێت.

## ٧٤ – باب الْمَرْأَةِ تَصُومُ بِغَيْرِ إِذْنِ زَوْجِهَا.

٢٤٥٨ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَصُومُ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ، غَيْرَ رَمَضَانَ، وَلاَ تَأْذَنُ فِي بَيْتِهِ وَهُوَ شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر ژن مێردەکەی لەماڵ بوو جگە لەڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، دروست نیە بەبێ پرس و ڕەزامەندی ئەو ڕۆژوو بگرێت، هەروەها نابێت ژن ڕێگەی کەس بدات بچێتە ماڵی و هاموشۆی بکات بەبێ پرس و ڕەزامەندی مێردەکە).

٢٤٥٩ - (صحيح) عن أبي سعيد قال: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَنَحْنُ عِنْدَهُ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ زَوْجِي صَفْوَانَ بْنَ الْمُعَطَّلِ يَضْرِبُنِي إِذَا صَلَّيْتُ، وَيُفَطِّرُنِي إِذَا صُمْتُ، وَلاَ يُصَلِّي صَلاَةَ الْفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ!! قَالَ: وَصَفْوَانُ عِنْدَهُ، قَالَ: فَسَأَلَهُ عَمَّا قَالَتْ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَّا قَوْلُهَا يَضْرِبُنِي إِذَا صَلَّيْتُ: فَإِنَّهَا تَقْرَأُ بِسُورَتَيْنِ وَقَدْ نَهَيْتُهَا، قَالَ: فَقَالَ: (لَوْ كَانَتْ سُورَةً وَاحِدَةً لَكَفَتِ النَّاسَ). وَأَمَّا قَوْلُهَا يُفَطِّرُنِي: فَإِنَّهَا تَنْطَلِقُ فَتَصُومُ، وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ

فَلاَ أَصْبِرُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَئِذٍ: (لاَ تَصُومُ امْرَأَةٌ إِلاَّ بِإِذْنِ زَوْجِهَا). وَأَمَّا قَوْلُهَا إِنِّى لاَ أُصَلِّى حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ: فَإِنَّا أَهْلُ بَيْتٍ قَدْ عُرِفَ لَنَا ذَاكَ لاَ نَكَادُ نَسْتَيْقِظُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، قَالَ: (فَإِذَا اسْتَيْقَظْتَ فَصَلِّ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووین ئافرەتێ هاتە خزمەتی سکالأی مێردەکەی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مێردەکەم کە صەفوانی کوڕی (معطل)ە کاتێ کە نوێژ دەکەم لێم دەدات، کاتێ کە بەڕۆژوو دەبم فەرمانم پێ دەکات بەوەی کە ڕۆژووەکەم بشکێنم، نوێژی بە یانیش ناکات هەتا خۆر هەڵدێ!! ئەبو سەعید وتی: صەفوان لەوێ ئامادە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی سکالأی ژنەکەی لێی پرسی، صەفوان وتی: دەربارەی ئەوەی کە دەڵێ: کاتێ کە نوێژ دەکەم لێم دەدات، ئەوە دوو سورەتی درێژ دەخوێنێ و درێژەی پێ دەدات منیش ڕێگری لێ دەکەم کە درێژەی پێ نەدات، ئەبو سەعید وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (سورەتێ بەسە کە خەڵك بیخوێنن پاداشت دەدرێنەوە لەسەری- واتە سورەتی فاتیحە لەگەڵ سورەتێکی تردا - ). صەفوان وتی: دەربارەی ئەوەی کە دەڵێ: کاتێ کە بەڕۆژوو دەبم فەرمانم پێ دەکات بەوەی کە ڕۆژووەکەم بشکێنم، ڕۆژووی سوننەت زۆر دەگرێت منیش پیاوێکی گەنجم و زەوقم هەیەو خۆم پێ ڕاناگیرێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (دروست نیە ژن بەبێ پرس و ڕەزامەندی مێردەکەی ڕۆژووی سوننەت بگرێت). وە دەربارەی ئەوەی کە من نوێژی بە یانی ناکەم هەتا خۆر هەڵدێ، ئێمە

خانەوادەیەکیین دەستورمان وایە بە شەو کاردەکەین بۆیە کەخەوتین هـەتا خـۆر هەڵنەیـە لەخەو هەڵناسین، فەرمووی: (دەی ئەگەر لەخەو هەڵیساندی نوێژی بەیانی بکە).

## باسی سەبارەت بە ڕۆژووەوانیْ ئەگەر بانگ کرا بۆ سەر نانخواردن چی بکات.

## ٧٥ – باب فِي الصَّائِمِ يُدْعَى إِلَى وَلِيمَةٍ.

٢٤٦٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صـلى الله عليـه وسلم: (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْـيَطْعَمْ، وَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ). قَالَ: هِشَامٌ وَالصَّلَاةُ الدُّعَاءُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ حَفْصُ بْنُ غِيَاثٍ أَيْضًا عَنْ هِشَامٍ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێ لەئێوە دەعوەت کرا بۆ نانخواردنێ، با وەڵام بداتـەوە، ئەگـەر بەڕۆژوو نەبوو با خواردن بخوات، ئەگەر بەڕۆژوویش بوو با دوعای خێر بکـات بـۆ خـاوەن خواردنەکە.

## باسی ئەگەر ڕۆژووەوانیٚ بانگ کرا بۆ نانخواردن چی بڵێت.

## ٧٦ – باب مَا يَقُولُ الصَّائِمُ إِذَا دُعِيَ إِلَى الطَّعَامِ.

٢٤٦١ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکیٚ لەئێوە بەڕۆژوو بوو دەعوەت کرا بۆ نانخواردنیٚ با بلێ: من بەڕۆژووم).

٢٤٦٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەتا لەدنیا دەرچوو لە دەی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافیان دەکرد، لەپاش وەفاتیشی هاوسەرەکانی ئیعتیکافیان دەکرد.

٢٤٦٣ - (صحيح) عن أبي بن كعب: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِـرَ مِـنْ رَمَضَـانَ، فَلَـمْ يَعْتَكِـفْ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ لَيْلَةً.

واتە: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لـە دەی کۆتایی رەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، ساڵێ ئیعتیکافی نەکرد، لە سـاڵی ئاینـدەدا بیسـت شەو ئیعتیکافی کرد.

## باسی (ئیعتیکاف) مانەوە لە مزگەوتدا.

## ٧٧ - باب الاعْتِكَافِ.

٢٤٦٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها، قالت: كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْـرَ ثُـمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ، قَالَتْ: وَإِنَّهُ أَرَادَ مَرَّةً أَنْ يَعْتَكِفَ فِي الْعَشْـرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، قَالَتْ: فَـأَمَرَ بِبِنَائِـهِ فَضُـرِبَ، فَلَمَّـا رَأَيْتُ ذَلِكَ أَمَرْتُ بِبِنَائِي فَضُرِبَ، قَالَتْ: وَأَمَرَ غَيْـرِي مِـنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ بِبِنَائِـهِ فَضُـرِبَ، فَلَمَّـا صَلَّى الْفَجْرَ نَظَرَ إِلَى الأَبْنِيَةِ فَقَالَ: (مَا هَذِهِ؟ آلْبِرَّ تُرِدْنَ؟). قَالَتْ: فَأَمَرَ بِبِنَائِهِ فَقُوِّضَ، وَأَمَرَ أَزْوَاجُهُ بِأَبْنِيَتِهِنَّ فَقُوِّضَتْ،

ثُمَّ أَخَّرَ الاِعْتِكَافَ إِلَى الْعَشْرِ الأُوَلِ. يَعْنِي مِنْ شَوَّالٍ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، قَالَ: اعْتَكَفَ عِشْرِينَ مِنْ شَوَّالٍ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێ کە دەیویست ئیعتیکاف بکات نوێژی بەیانی دەکردو، دەچوە ئەو شوێنەوە ئیعتیکافی تێدا دەکرد، وتی: جارێ لە دەی کۆتایی رەمەزاندا ویستی ئیعتیکاف بکات، وتی: فەرمانی کرد شوێنێکیان بۆ دروست کرد، وتی: کاتێ منیش ئەوەم دی داوام کرد شوێنێکیان بۆ منیش دروست کرد، هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوایان کردو بۆ هەر یەکەیان شوێنێکیان دروست کرد، کاتێ کە نوێژی بەیانی کرد ئەو شوێنانەی دی فەرمووی: (ئەوە چیە؟ ئایا داوای خێر دەکەن؟). وتی: جا فەرمانی دا شوێنەکەی خۆی لابرد، هەروەها فەرمانی دا بە هاوسەرەکانی شوێنەکانی خۆیان لابرد، لەپاشدا ئیعتیکافەکەی دواخست بۆ دە رۆژی سەرەتای مانگی شەوال. ئەبو داود دەڵێت: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیست رۆژ لە مانگی شەوال ئیعتیکافی کرد.

٢٤٦٥ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ. قَالَ نَافِعٌ: وَقَدْ أَرَانِي عَبْدُ اللَّهِ الْمَكَانَ الَّذِي يَعْتَكِفُ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْمَسْجِدِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە دەی کۆتایی ڕەمەزاندا ئیعتیکافی دەکرد، نافع وتی: (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ ئەو شوێنەی نیشاندام لە مزگەوتدا کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیعتیکافی تێدا دەکرد.

**٢٤٦٦ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال:كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْتَكِفُ كُلَّ رَمَضَانَ عَشَرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەهەموو مانگێکی ڕەمەزاندا دە ڕۆژ ئیعتیکافی دەکرد، لەو ساڵەدا کە وەفاتی کرد بیست ڕۆژ ئیعتیکافی کرد لە مانگی ڕەمەزاندا.

## باسی ئەو کەسەی کە ئیعتیکاف دەکات دروستە بۆ کاری پێویست بچێتەوە بۆ ماڵەوە.

## ٧٩ - باب الْمُعْتَكِفِ يَدْخُلُ الْبَيْتَ لِحَاجَتِهِ.

**٢٤٦٧ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا اعْتَكَفَ يُدْنِي إِلَيَّ رَأْسَهُ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لاَ يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلاَّ لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بچوایە ئیعتیکافەوە سەری دەهێنایە پێشەوە بۆم شانە دەکرد، نەدەهاتەوە بۆ ماڵەوە مەگەر بۆ کارێ کە ئادەمیزاد پێویستیەتی.

## باسی ئیعتیکاف لەکوێدا دەکرێت.

## ٧٨ – باب أَيْنَ يَكُونُ الاِعْتِكَافُ.

٢٤٦٨ – (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها، عن النبي صلى الله عليه وسلم، نَحْوَهُ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

٢٤٦٩ – (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها، قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكُونُ مُعْتَكِفًا فِي الْمَسْجِدِ فَيُنَاوِلُنِي رَأْسَهُ مِنْ خَلَلِ الْحُجْرَةِ فَأَغْسِلُ رَأْسَهُ. – وَقَالَ مُسَدَّدٌ: فَأُرَجِّلُهُ – وَأَنَا حَائِضٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مزگەوتدا ئیعتیکافی دەکرد لەپەنجەرەی ژوورەکەوە سەری دەهێنایە دەرەوە منیش سەریم بۆ دەشت. – موسەددەد دەڵێت: عائیشە وتویەتی: سەریم بۆ شانە دەکرد – لەو کاتەشدا بێ نوێژ بووم.

٢٤٧٠ - (صحيح) عن صفية قالت: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُعْتَكِفًا، فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلاً، فَحَدَّثْتُهُ، ثُمَّ قُمْتُ. فَانْقَلَبْتُ فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي، وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، فَمَرَّ رَجُلاَنِ مِنَ الأَنْصَارِ فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْرَعَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ). قَالاَ: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ!! قَالَ: (إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، فَخَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا). أَوْ قَالَ: (شَرًّا).

واتە: لە صەفیەی هاوسەری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ئیعتیکافدا بوو، شەوێ چووم بۆ سەردانی. گفتوگۆم لەگەڵ کرد، لەپاشدا کاتێ کە هەستام بێمەوە بۆ ماڵەوە ئەویش هەستا بۆ ئەوەی ڕەوانەم بکاتەوە، صەفیە لەو ماڵەدا دەژیا دواتر بوو بە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید، دوو پیاو لە ئەنصار بەلایاندا تێپەڕین کاتێ کە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دی پێیان هەڵگرت و بە پەلە ڕۆشتن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هێواش بن و پەلەمەکەن، ئەمە صەفیەی کچی حویەییە کە هاوسەری خۆمە). وتیان: (سبحان الله ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)!! — ئێمە چۆن گومان دەکەین لەتۆ - فەرمووی: (شەیتان لەناو جەستەی مرۆڤدا وەك خوێن هاتوچۆ دەکات، بۆیە ترسام گومانێ بخاتە دڵتانەوەو ببێتە هۆی تیاچوونتان). یان فەرمووی: (خراپەیە بخاتە دڵتانەوە).

٢٤٧١ - (صحيح) عن الزهري، بِإِسْنَادِهِ بِهَذَا، قَالَتْ: حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ بَابِ الْمَسْجِدِ الَّذِي عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ مَرَّ بِهِمَا رَجُلاَنِ. وَسَاقَ مَعْنَاهُ.

واتە: لە زوهرییەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە و سەنەد هاتوە، كە وتویەتی: رۆشتین هەتا گەیشتنە ئەو دەرگایەی مزگەوت كەوا لەلای دەرگای ماڵی ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، دوو پیاو بەلایاندا تێپەڕین. جا راوی فەرموودەكەی گێڕایەوە.

## باسی ئەو كەسەی كە لە ئیعتیكافدایە ئایا دروستە سەردانی نەخۆش بكات یان نا.

## ٨٠ - باب الْمُعْتَكِفِ يَعُودُ الْمَرِيضَ.

٢٤٧٢ - (ضعيف) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمُرُّ بِالْمَرِيضِ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ، فَيَمُرُّ كَمَا هُوَ، وَلاَ يُعَرِّجُ يَسْأَلُ عَنْهُ. وَقَالَ ابْنُ عِيسَى: قَالَتْ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُ الْمَرِيضَ وَهُوَ مُعْتَكِفٌ.

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەكاتی ئیعتیكافدا بەلای نەخۆشدا تێدەپەڕی هەواڵی دەپرسی و لەلای نەدەمایەوە. ئیبنو عیسا دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەكاتی ئیعتیكافدا سەردانی نەخۆشی دەكرد.

٢٤٧٣ - (حسن صحيح) عن عائيشة رضـي الله عنهـا قالـت: السُّنَّةُ عَلَى الْمُعْتَكِفِ أنْ لاَ يَعُودَ مَرِيضًا، وَلاَ يَشْهَدَ جَنَازَةً، وَلاَ يَمَسَّ امْرَأَةً، وَلاَ يُبَاشِرَهَا، وَلاَ يَخْرُجَ لِحَاجَةٍ إلاَّ لِمَا لاَ بُدَّ مِنْهُ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ بِصَوْمٍ، وَلاَ اعْتِكَافَ إِلاَّ فِي مَسْجِدٍ جَامِعٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کـە وتویـەتی: سـوننەت وایـە ئـەو کەسەی کە ئیعتیکاف دەکات سەردانی نـەخۆش نـەکات، بەشـداری لەناشـتنی مـردوو نەکات، نزیکی ژن نەکەوێتەوەو لەگەڵی جوت نەبێ، لەمزگـەوت دەرنەچـێت مەگـەر بـۆ پێویستیەکی ناچـاری، ئیعتیکـاف نـەکات بـەبێ ئـەوەی بـەڕۆژوو بـێ، لەمزگەوتێکـدا ئیعتیکاف نەکات کە نوێژی هەینی و جەماعەتی تێدا نەکرێت.

٢٤٧٤ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ جَعَلَ عَلَيْهِ أَنْ يَعْتَكِفَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَيْلَةً - أَوْ يَوْمًا - عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَسَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (اعْتَكِفْ وَصُمْ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کـە پێشـەوا عومـەر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی نەفامیدا نەزری کرد کە شـەوێ - یـان ڕۆژێ — لـە کەعبـەدا ئیعتیکاف بکات، لەوبارەوە پرسیاری کـرد لـە پێغەمبـەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویش فەرمووی: (ئیعتیکاف بکەو بەڕۆژوو بە).

٢٤٧٥ - (صحيح) عن عبد الله بن بديل: بِإِسْنَادِهِ، نَحْوَهُ، قَالَ: فَبَيْنَمَا هُوَ مُعْتَكِفٌ إِذْ كَبَّرَ النَّاسُ، فَقَالَ: مَا هَذَا يَا عَبْدَ اللَّهِ؟

قَالَ: سَبْيُ هَوَازِنَ أَعْتَقَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: وَتِلْكَ الْجَارِيَةُ فَأَرْسَلَهَا مَعَهُمْ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی بودەیلەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوەو سەنەد هاتوە، كە وتویەتی: جاریێ پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لیٚ بیٚ لە ئیعتیكافدا بوو خەڵك دەنگی (الله أكبر)ی خۆشی و شادیان لیٚ بەرزبویەوە، فەرمووی: (ئەوە چیە ئەی (عَبْدُ اللَّه)؟ وتی: سەبایای هەوازینن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕزگاری كردوون، وتی: ئەو كەنیزەش لەگەڵ ئەواندا بنێرە - كە یەكیٚ بوو لە ئافرەتە دیلەكانی هەوازن لەلای پێشەوا عومەر بوو، ئەویش ئازادی كرد - .

## باسی دەربارەی ئیعتیكافی ئافرەتانی بیٚ نوێژ.

## ٨١ - باب فِي الْمُسْتَحَاضَةِ تَعْتَكِفُ.

٢٤٧٦ - (صحيح) عن عائيشة رضي الله عنها قالت: اعْتَكَفَتْ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ، فَكَانَتْ تَرَى الصُّفْرَةَ وَالْحُمْرَةَ، فَرُبَّمَا وَضَعْنَا الطَّسْتَ تَحْتَهَا وَهِيَ تُصَلِّي.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: یەكیٚ لە هاوسەرەكانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئیعتیكافی كرد لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، خوێنی سور و زەردی بینی — بێگومان خوێنی بیٚ نوێژی نەبووە - ، هەندیٚ جار كە نوێژی دەكرد تەشتێكمان لەژێریدا دادەنا.

**كۆتایی پەرتوكی ئیعتیكاف و ڕۆژوو**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای پەرتوکی جیهاد و تێکۆشان لەرێی خوا.

# ٩- أول كتاب الجهاد.

## باسی ئەوەی کە سەبارەت بە کۆچکردن و ژیان بەسەربردن لە بیاباندا هاتوە

## ١ – باب مَا جَاءَ فِي الْهِجْرَةِ وَسُكْنَى الْبَدْوِ.

**٢٤٧٧ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري: أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْهِجْرَةِ، فَقَالَ: (وَيْحَكَ! إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَهَلْ تُؤَدِّي صَدَقَتَهَا؟). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە عەرەبێکی دەشتەکی سەبارەت بە کۆچکردن لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرسی؟ ئەویش بەزەیی بە هاتەوە پێیدا فەرمووی: ((وَيْحَكَ!)[١] هەستان بەکاروباری کۆچکردن کارێکی قورس و گرانە کەم کەس دەتوانێ هەقی خۆی بداتێ، ئایا تۆ وشترت هەیە؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (زەکاتەکەیان

[١] - ئسلوبێکە بۆ کەسێك بەکاردێت کە جێگەی بەزەیی بێت.

:::دی؟). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (لەدەورو بەری ئەو شار و ناوچانە ئەرکەکانت راپەڕێنەو کاری خۆت بکەو بەدەم ئاژەڵەکانتەوە بە هەموو ساڵێ زەکاتەکەیان دەربکە، ئەوە خوای گەورە بە ئەندازەی پاداشتی کۆچەرێکت بۆ دەنوسێ و هیچ لە پاداشتت کەم ناکاتەوە).

**٢٤٧٨ - (صحيح) عن المقدام بن شريح، عن أبيه قال: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا عَنِ الْبَدَاوَةِ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْدُو إِلَى هَذِهِ التِّلاَعِ، وَإِنَّهُ أَرَادَ الْبَدَاوَةَ مَرَّةً فَأَرْسَلَ إِلَيَّ نَاقَةً مُحَرَّمَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ لِي: (يَا عَائِشَةُ ارْفُقِي، فَإِنَّ الرِّفْقَ لَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ زَانَهُ، وَلاَ نُزِعَ مِنْ شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ شَانَهُ).**

واتە: لە میقدامی کوڕی شورەیحەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە رۆشتن بۆ بیابان لە عائیشەم رەزای خوای لێ بێ پرسی؟ وتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ شوێنێ لە بیابان ئاوێکی لێ بوو لەسەرەوە دەهاتە خوارەوە وەك تاڤگە، جا وشترێکی زەکاتی بۆ ناردم کە کەس سواری نەبوو بوو وە باری لێ نەنرا بوو، پێی فەرمووم: ئەی عائیشە نەرم و نیان و لەسەرخۆ بە، چونکە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی لە هەر شتێکدا بوو ئەوە بێگومان جوانی دەکات، لە هەر شتێکیشدا نەمێنێت ناشیرین و ناڕێکی دەکات.

## باسی دەربارەی ئایا کۆچکردن لەوڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام کۆتایی هاتوە یان نا؟

## ٢ - باب فِي الْهِجْرَةِ هَلِ انْقَطَعَتْ.

**٢٤٧٩ - (صحيح) عن معاوية قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلاَ تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا).**

واتە: لە موعاویەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) بوو فەرمووی: (کۆچکردن لەوڵاتی کوفرەوە بۆ وڵاتی ئیسلام نابڕێتەوە و کۆتایی نایەت هەتا دەرگای تەوبەو پەشیمانی دادەخرێت، دەرگای تەوبەو پەشیمانی داناخرێت هەتا خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت. - کەواتە کۆچکردن و تەوبەو پەشیمانی هەردوکیان بەردەوامن هەتا خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵنەیەت - .

**٢٤٨٠ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قال رسول الله النبِي صلى الله عليه وسلم يوم الفتح - فتح مكة -: (لاَ هِجْرَةَ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا فەرمووی: (لەدوای ڕزگارکردنی شاری مەککە ئیتر کۆچکردنی واجب لە مەککەوە بۆ مەدینە نیە، بەڵام کۆچکردن بۆ

جیهادکردن و کۆچکردن بەنیەتی جیهادکردن هەر دەمێنێ و بەردەوامە، هەرکاتێ فەرمانتان پێ درا لەلایەن فەرمانڕەوای موسوڵمانانەوە کە دەرچن بۆ جەنگ و غەزا و جیهاد بکەن ئێوەش دەرچن).

٢٤٨١ - (صحيح) عن عامر قال: أَتَى رَجُلٌ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو وَعِنْدَهُ الْقَوْمُ حَتَّى جَلَسَ عِنْدَهُ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ).

واتە: عامیر دەڵێ: پیاوێ هات بۆلای (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمر لەوکاتەدا قەومێ لەلای دانیشتبوون ئەویش هات لەلای (عَبْدُ اللَّه)دا دانیشت وتی: شتێکم بۆ باس بکە کە لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بیستبێتت، وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (موسوڵمان ئەو کەسەیە کە موسوڵمانان سەلامەتن لە زمان و دەستی، واتە ئەو کەسەی ئازاری موسڵمانان نادات بەگوفتارو بەکرداری، بۆیە ناوی دەستی هێناوە چونکە زۆرترین کردەوەی ئادەمیزاد بەدەست دەکرێت، کۆچکەر(مهاجر) کەسێکە کۆچ بکات لەوەی کە خوای گەورە قەدەغەیکردوە — واتە ئەو خراپەو تاوانانە ئەنجام نەدات کە خوای گەورە حەرامی کردون - ).

## باسی سەبارەت بە فەزڵی نیشتەجێ بوون لە شامدا.

## ٣ - باب فِي سُكْنَى الشَّامِ.

**٢٤٨٢ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (سَتَكُونُ هِجْرَةٌ بَعْدَ هِجْرَةٍ، فَخِيَارُ أَهْلِ الأَرْضِ أَلْزَمُهُمْ مُهَاجَرَ إِبْرَاهِيمَ، وَيَبْقَى فِى الأَرْضِ شِرَارُ أَهْلِهَا، تَلْفِظُهُمْ أَرَضُوهُمْ، تَقْذَرُهُمْ نَفْسُ اللَّهِ وَتَحْشُرُهُمُ النَّارُ مَعَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِيرِ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لەدوای ئەم کۆچکردنەوە کە لە مەککەوە کردتان بۆ مەدینە کۆچێکی تریش دەبێت، چاکترینی خەڵکانی سەر زەوی ئەوانەن کە کۆچ دەکەن بۆ شوێنی کۆچکردنی ئیبراهیم پێغەمبەر سەلامی خوای لەسەر بێ کە شامە، هەتا وای لێ تەنها خراپەکار و گەندەڵەکان دەمێننەوە لەسەر زەویدا، زەویش نایانگرێتە خۆی، زاتی خوای گەورە دەرچونیانی بۆ شام پێ ناخۆشە، خراپەکار و گەندەڵەکان ئاگرێ لەگەڵ مەیمون و بەرازدا کۆیان دەکاتەوە.

**٢٤٨٣ - (صحيح) عن ابن حوالة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (سَيَصِيرُ الأَمْرُ إِلَى أَنْ تَكُونُوا جُنُودًا مُجَنَّدَةً: جُنْدٌ بِالشَّامِ، وَجُنْدٌ بِالْيَمَنِ، وَجُنْدٌ بِالْعِرَاقِ). قَالَ ابْنُ حَوَالَةَ: خِرْ**

لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَدْرَكْتُ ذَلِكَ، فَقَالَ: (عَلَيْكَ بِالشَّامِ فَإِنَّهَا خِيَرَةُ اللَّهِ مِنْ أَرْضِهِ، يَجْتَبِي إِلَيْهَا خِيَرَتَهُ مِنْ عِبَادِهِ فَأَمَّا إِنْ أَبَيْتُمْ فَعَلَيْكُمْ بِيَمَنِكُمْ، وَاسْقُوا مِنْ غُدُرِكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ تَوَكَّلَ لِي بِالشَّامِ وَأَهْلِهِ).

واته: لە ئیبنو حەوالەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کار دەگاتە ئەوەی کە سوپاتان لێ دروست دەکرێت: سوپایە لە شام، سوپایە لە یەمەن، سوپایە لە عێراق). ئیبنو حەوالە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو سوپایەیانم بۆ دەست نیشان بکە هەتا ئەگەر کەوتمە ئەو ڕۆژگارەوە، پەیوەندیان پێوە بکەم، فەرمووی: (پەیوەندی بکە بە سوپای شامەوە چونکە خوای گەورە لەهەموو سەر زەوی خۆیدا ولاتی شامی هەڵبژاردووە بۆ نیشتەجێبوون لەکۆتایی جیهاندا، بەندە هەڵبژێردراوەکانی تێدا کۆدەکاتەوە، جا ئەگەر ڕێگریان لێکردن بچنە ولاتی شام، ئەوا بڕۆن بۆ ولاتی یەمەن، خۆتان و ماڵاتەکەتان لە ئاوی حەوزەکەتان بخۆنەوە، خوای گەورە بەڵێنی پێ داوم ولاتی شام خەڵکەکەی دەپارێزێت لە بەڵاو فیتنە بە تەواوی وێران نابێ).

## باسی دەربارەی بەردەوامی جیهاد.

## ٤ - باب فِي دَوَامِ الْجِهَادِ.

٢٤٨٤ - (صحيح) عن عمران بن الحصين قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ

ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ نَاوَأَهُمْ حَتَّى يُقَاتِلَ آخِرُهُمُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ).

واتە: لە عیمرانی كوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەردەوام دەستەیە لە ئوممەتەكەم لەسەر حەق دەجەنگن و سەردەكەون بەسەر دوژمنانیاندا هەتا دواهەمینیان دەجالی درۆزن دەكوژێت).

## باسی سەبارەت بە پاداشتی جیهاد.

## ٥ – باب فِي ثَوَابِ الْجِهَادِ.

٢٤٨٥ - (صحيح) عن أبي سعيد: عن النبي صلى الله عليه و سلمأَنَّهُ سُئِلَ: أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْمَلُ إِيمَانًا؟ قَالَ: (رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَرَجُلٌ يَعْبُدُ اللَّهَ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ قَدْ كُفِيَ النَّاسُ شَرَّهُ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، كە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرسیار كرا: كام لە ئیمانداران ئیمانەكەی باشترین و تەواوترینە؟ فەرمووی: (پیاوێكە بەماڵ و گیانی لەڕێی خوادا جیهاد دەكات، وە پیاوێكە لەشیوێك لەشیوەكان بەندایەتی خوا بكات و خەڵكی لەخراپەی پارێزراوكات).

## باسی سەبارەت بە ڕێگری لە چونەدەرەوەی وڵات و گەشتو گوزار.

## ٦ – باب فِي النَّهْيِ عَنِ السِّيَاحَةِ.

٢٤٨٦ - (حسن) عن أبي أمامة: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِي السِّيَاحَةِ، قَالَ: النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ سِيَاحَةَ أُمَّتِي الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى).

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مۆڵەتم بدە بۆ ئەوەی بچمە گەشتو گوزاری وڵاتان، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (گەشتو گوزاری ئوممەتی من جیهادە لەڕێی خوای گەورەدا).

## باسی دەربارەی فەزڵ و گەورەیی گەڕانەوە لەغەزا.

## ٧ – باب فِي فَضْلِ الْقَفْلِ فِي الْغَزْوِ.

٢٤٨٧ - (صحيح) عن عبد الله - هو ابن عمرو - : عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (قَفْلَةٌ كَغَزْوَةٍ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پاداشتی گەڕانەوە لەغەزا لەدوای تەواو بوونی وەك پاداشتی چوون بۆ غەزا وایە).

## باسی دەربارەی فەزڵ و گەورەیی جەنگ لەگەڵ ڕۆم بەسەر گەلانی تردا.

## ٨ – باب فَضْلِ قِتَالِ الرُّومِ عَلَى غَيْرِهِمْ مِنَ الأُمَمِ.

٢٤٨٨ - (ضعيف) عن عبد الخبير بن ثابت بن قيس بن شماس عن أبيه عن جده قال: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَالُ لَهَا أُمُّ خَلاَّدٍ، وَهِيَ مُنْتَقِبَةٌ، تَسْأَلُ عَنِ ابْنِهَا وَهُوَ مَقْتُولٌ، فَقَالَ لَهَا بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: جِئْتِ تَسْأَلِينَ عَنِ ابْنِكِ وَأَنْتِ مُنْتَقِبَةٌ؟ فَقَالَتْ: إِنْ أُرْزَإِ ابْنِي فَلَنْ أُرْزَأَ حَيَائِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ابْنُكِ لَهُ أَجْرُ شَهِيدَيْنِ). قَالَتْ: وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (لأَنَّهُ قَتَلَهُ أَهْلُ الْكِتَابِ).

واتە: لە (عبد الخبير)ی کوڕی (ثابت)ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئافرەتێ کە ناوی ئوممو خەللاد بوو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، دەربارەی کوڕەکەی پرسیاری کرد کە کوژرا بوو. هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێیان وت: هاتوی هەواڵی کوڕەکەت

دەپرسی لەكاتێكدا كە تۆ پەچەكەت لاداوە، ئافرەتەكە وتی: من توشی بـەلاو موسـیبەت بووم بەهۆی مردنی كوڕەكەمەوە، نەك بە هۆی لادانـی پەچـەكەمەوە، پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (كوڕكـەت پاداشـتی دوو شـەهیدی هەیـە). وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆچی؟ فەرمووی: (چونكە خاوەن نامە ئاسمانیـەكان كوشتویانە).

## باسی سەبارەت بە سوار بوونی پشتی دەریا لە غەزادا

## ٩ – باب فِي رُكُوبِ الْبَحْرِ فِي الْغَزْوِ.

**٢٤٨٩ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (لاَ يَرْكَبُ الْبَحْرَ إِلاَّ حَاجٌّ أَوْ مُعْتَمِرٌ أَوْ غَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَإِنَّ تَحْتَ الْبَحْرِ نَارًا، وَتَحْتَ النَّارِ بَحْرًا).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عـەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنـەوە، كـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: (سـواری پشـتی دەریـا نابێـت مەگـەر كەسێ كە حاجی بێت یان بچێ بۆ عومرە یا لەرێی خـوادا غـەزا بكـات، چـونكە لـەژێر دەریادا ئاگر هەیە، لەژێر ئاگریشدا دەریا).

## باسی فەزلْ و گەورەیی غەزا لە دەریادا.

## ١٠ – باب فَضْلِ الْغَزْوِ فِى الْبَحْرِ.

٢٤٩٠ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال:حَدَّثَتْنِى أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ أُخْتُ أُمِّ سُلَيْمٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ عِنْدَهُمْ، فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ. قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَضْحَكَكَ؟ قَالَ: (رَأَيْتُ قَوْمًا مِمَّنْ يَرْكَبُ ظَهْرَ هَذَا الْبَحْرِ كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ). قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِى مِنْهُمْ، قَالَ: (فَإِنَّكِ مِنْهُمْ). قَالَتْ: ثُمَّ نَامَ فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَضْحَكَكَ؟ فَقَالَ: مِثْلَ مَقَالَتِهِ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِى مِنْهُمْ، قَالَ: (أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ). قَالَ: فَتَزَوَّجَهَا عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ فَغَزَا فِى الْبَحْرِ فَحَمَلَهَا مَعَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ قُرِّبَتْ لَهَا بَغْلَةٌ لِتَرْكَبَهَا فَصَرَعَتْهَا فَانْدَقَّتْ عُنُقُهَا فَمَاتَتْ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە كە وتویەتی: ئوممو حەرامی كچی میلحان خوشكی ئوممو سولەیم بۆ گێڕامەوە، كە جارێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەماڵیان خەوتوە: كاتێ خەبەری بۆوە پێدەكەنی، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بۆچی پێدەكەنی؟ فەرمووی: (لە ئوممەتی خۆم كۆمەڵێكم دی سواری پشتی ئەم دەریایە بوو بوون ئەوەندە دڵیان خۆش بوو ئەت وت پاشان و لەسەر تەختی پاشایەتی دانیشتوون). وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، داوا لە خوای گەورە بكە كە

یەكێ بم لەوانە، فەرمووی: (تۆ یەكێكی لەوانە). وتی: لەپاشدا خەوتەوە، كە خەبەری بۆوە پێدەكەنی، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بۆچی پێدەكەنی؟ ئەویش وتەكەی پێشوی فەرمووەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، لە خوای گەورە بپارێرەوە كە یەكێ بم لەوانە، فەرمووی: (تۆ لە دەستەی یەكەمینیت). ئەنەس وتی: جا عوبادەی كوڕی صامیت مارەی كرد لە دەریاوە لەگەڵ خۆی بردی بۆ غەزا، كاتێ كە گەڕایەوە ئێسترێكیان لێ نزیك كردەوە كاتێ كە سواری بوو گلاندی و مرد.

**٢٤٩١ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ذَهَبَ إِلَى قُبَاءٍ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، وَكَانَتْ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا يَوْمًا ، فَأَطْعَمَتْهُ وَجَلَسَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، وَسَاقَ هَذَا الْحَدِيثَ.**
**قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَمَاتَتْ بِنْتُ مِلْحَانَ بِقُبْرُصَ.**

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك دەڵێت: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەچو بۆ (قوباء) سەردانی ماڵی ئومو حەرامی كچی میلحانی دەكرد — پێشەوا نەوەوی دەڵێ: بە یەكدەنگی زانایان ئومو حەرام یەكێ بوە لە مەحرەمەكانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) - ، ئومو حەرام هاوسەری عوبادەی كوڕی صامیت بوو، ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەردانی كرد، ئومو حەرامیش نانی دایەو سەری بۆ بژنی، جا راوی فەرمودەكەی گێڕایەوە. ئەبو داود دەڵێت: كچی میلحان لە قوبرص وەفاتی كرد.

**٢٤٩٢ - (صحيح) عن أخت أم سليم الرميصاء، قالت: نَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَيْقَظَ، وَكَانَتْ تَغْسِلُ رَأْسَهَا، فَاسْتَيْقَظَ**

وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَضْحَكُ مِنْ رَأْسِي؟ قَالَ: (لاَ). وَسَاقَ هَذَا الْخَبَرَ: يَزِيدُ وَيَنْقُصُ.

واتە: لە (رميصاء)ی خوشکی ئومو سولەیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خەوت و خەبەری بۆوە، لەوکاتەدا (رميصاء) سەری دەشت. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەبەری بۆوە پێدەکەنی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە سەرم پێدەکەنیت؟ فەرمووی: (نەء). جا راوی فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە: بەڵام لێی زیادو کەم دەکرد.

٢٤٩٣ - (حسن) عن أم حرام، عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (الْمَائِدُ فِي الْبَحْرِ الَّذِي يُصِيبُهُ الْقَيْءُ لَهُ أَجْرُ شَهِيدٍ، وَالْغَرِقُ لَهُ أَجْرُ شَهِيدَيْنِ).

واتە: لە ئومو حەرامەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی لەدەریادا بجەنگێ توشی سەرەخولێ دەبێ و دەرشێتەوە - بەهۆی باوە یان بەهۆی مەوجی دەریاکەوە کە کەشتیەکە دێنێ و دەبات - پاداشتی شەهیدێکی هەیە، ئەو کەسەش کە دەخنکێ پاداشتی دوو شەهیدی هەیە).

٢٤٩٤ - (صحيح) عن أبي أمامة الباهلي، عن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (ثَلاَثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: رَجُلٌ خَرَجَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ، وَرَجُلٌ رَاحَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ

حَتَّى يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ، وَرَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلاَمٍ، فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خوای گەورە کەفیلی سێ کەس دەکات: کەسێ لە ماڵ دەرچێ بۆ غەزاو جیهاد لە ڕێی خوادا، ئەگەر مرد دەیخاتە بەهەشتەوە، ئەگەر ژیاش ئەوە بەدەستکەوت و پاداشتی قیامەتەوە دەگەڕێتەوە، کەسێ لە ماڵ دەرچێ بەرەو مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، ئەگەر مرد دەیخاتە بەهەشتەوە چونکە لەپێناوی خوای گەورەدا چوە بۆ پەرستش و یادی خوای گەورە، ئەگەر ژیاش ئەوە بەدەستکەوت و پاداشتی قیامەتەوە دەگەڕێتەوە، یەکێ بڕواتەوە بۆ ماڵەوەو سڵاو بکات لەخاوو خێزانەکەی ئەوە خوای گەورە کەفیلی ئەو کەسەش دەکات).

## باسی دەربارەی فەزڵ و گەورەیی ئەو کەسەی کە کافرێکی جەنگاوەر دەکوژێ.

## ١١ - باب فِي فَضْلِ مَنْ قَتَلَ كَافِرًا.

٢٤٩٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَجْتَمِعُ فِي النَّارِ كَافِرٌ وَقَاتِلُهُ أَبَدًا).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کافر و ئەوەی کە دەیکوژێ هەرگیز لە ئاگردا کۆنابنەوە — بەمەرجێ دەبێت ئەو کەسە موسوڵمان بێ و لە جیهاددا لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بیکوژێ - ).

# باسی دەربارەی ڕێزو حورمەتی ژنی پیاوانی تێكۆشەر(موجاهید) لەسەر ئەو پیاوانەی كە ناچن بۆ غەزا

## ١٢ - باب فِي حُرْمَةِ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ.

٢٤٩٦ - (صحيح) عن ابن بريدة عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ إِلاَّ نُصِبَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا قَدْ خَلَفَكَ فِي أَهْلِكَ فَخُذْ مِنْ حَسَنَاتِهِ مَا شِئْتَ). فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (مَا ظَنُّكُمْ؟).

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ قَعْنَبٌ رَجُلاً صَالِحًا، وَكَانَ ابْنُ أَبِي لَيْلَى أَرَادَ قَعْنَبًا عَلَى الْقَضَاءِ فَأَبَى عَلَيْهِ، وَقَالَ: أَنَا أُرِيدُ الْحَاجَةَ بِدِرْهَمٍ فَأَسْتَعِينُ عَلَيْهَا بِرَجُلٍ، قَالَ: وَأَيُّنَا لاَ يَسْتَعِينُ فِي حَاجَتِهِ، قَالَ: أَخْرِجُونِي حَتَّى أَنْظُرَ، فَأُخْرِجَ، فَتَوَارَى، قَالَ سُفْيَانُ: بَيْنَمَا هُوَ مُتَوَارٍ إِذْ وَقَعَ عَلَيْهِ الْبَيْتُ فَمَاتَ.

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا

(صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ڕێزو حورمەتی ژنی پیاوانی تێكۆشەر(موجاهید) لەسەر ئەو پیاوانەی لەماڵەوە دەمێننەوەو ناچن بۆ غەزا وەك ڕێزو حورمەتی دایكی خۆیان وایە، هەر كەسێ كە لەماڵەوە دەمێنێتەوە سەرەوكاری كەسوكاری موجاهیدێك بكات، بەڵام لەهەمان كاتدا ناپاكیان لەگەڵدا بكات ئەوە لەرۆژی قیامەتدا ڕایدەگرن و بە موجاهیدەكە دەوترێت: ئەمە ناپاكی لەگەڵ كەسوكارەكەت كردوە لەبەر ئەوە بە ئارەزووی خۆت لەكردەوە چاكەكانی بەرە بۆ خۆت. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاوڕی دایەوە بەلاماندا فەرمووی: (ئایا ئێوە پێتان وایە ئەو تێكۆشەرە چی دەكات هەموو كردەوە چاكەكانی دەبات بۆ خۆی یان نا؟).

ئەبو داود دەڵێت: قەعنەب پیاوێكی چاك و بۆ خوا سوڵحاو بوو، ئیبنو ئەبو لەیلا داوای لێ كرد كە دادوەری بكات بەڵام ئەو داواكەی قبوڵ نەدەكرد، دەیوت: چۆن دادوەری بكەم لەكاتێكدا كە مەحتاجی خەڵكم و پێویستیم پێیانە، ئیبنو ئەبو لەیلا وتی: كێ لە ئێمە پێویستی بە خەڵك نیە واتە ئەوە بەهانە نیە بۆت، وتی: كەمێ مۆڵەتم بدەرێ هەتا سەرنجێ بدەم و بیرێكی لێ بكەمەوە، جا دەرچو، خۆی شاردەوە، سوفیان وتی: لەكاتێكدا كە لە ماڵەكەی خۆیدا خۆی حەشاردابو ماڵەكەی روخا بەسەریاو وەفاتی كرد.

## باسی دەربارەی كۆمەڵێ غەزا بكەن و دەستكەوتیان نەبێ.

## ١٣ - باب فِي السَّرِيَّةِ تَخْفِقُ.

٢٤٩٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُصِيبُونَ

غَنِيمَةً إِلاَّ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ مِنَ الآخِرَةِ، وَيَبْقَى لَهُمُ الثُّلُثُ، فَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر كۆمەڵە موسوڵمانێ لەپێناوی خوای گەورەدا بڕۆن بۆ غەزایە بەبێ زیان و بەسەلامەتی بگەڕێنەوەو دەستكەوتیان دەستكەوێت، ئەوە پێشەكی دوو سێیەكی پاداشتی خۆیان وەرگرتوە لەدنیادا، سێیەكیان بۆ دەمێنێتەوە لە قیامەتدا، خۆ ئەگەر دەستكەوتیان نەبوو ئەوە لە قیامەتدا پاداشتی تەواویان هەیە.

## باسی دەربارەی چەند قاتی پاداشتی زیكر و یادی خوا بەسەر جیهاددا لەڕێی خوای گەورەدا

## ١٤ - باب فِي تَضْعِيفِ الذِّكْرِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى

٢٤٩٨ - (ضعيف) عن سهل بن معاذ عن أبيه قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِنَّ الصَّلاَةَ وَالصِّيَامَ وَالذِّكْرَ تُضَاعَفُ عَلَى النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِسَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ).

واتە: لە سەهلی كوڕی (معاذ)ەوە، لەباوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نوێژ و ڕۆژوو قورئان خوێندن و زیكر و یادی خوای گەورە پاداشتەكەی حەوت سەد قاتی پاداشتی بەخشینە بۆ جیهاد لەڕێی خوای گەورەدا).

## باسی ئەوەی لەغەزادا بمرێت.

## ١٥ – باب فِيمَنْ مَاتَ غَازِيًا.

٢٤٩٩ - (ضعيف) عن أبو مالك الأشعري قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (مَنْ فَصَلَ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَمَاتَ أَوْ قُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ، أَوْ وَقَصَهُ فَرَسُهُ أَوْ بَعِيرُهُ، أَوْ لَدَغَتْهُ هَامَّةٌ، أَوْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ، أَوْ بِأَىِّ حَتْفٍ شَاءَ اللَّهُ فَإِنَّهُ شَهِيدٌ وَإِنَّ لَهُ الْجَنَّةَ).

واتە: لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی لەماڵ دەرچێ بۆ غەزا لەرێی خوای گەورەدا بمرێت یان بکوژرێت ئەوە شەهیدە، یا ئەسپەکەی یا وشترەکەی بیخاتەخوارەوەو ملی بشکێنێت، یان مارێ یا دوپشکێ پێوەی بدات، یان لەسەر جێگاکەی خۆی بمرێت، یا بەهەر شێوەیە کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت بمرێت ئەوە شەهیدەو بەهەشتی بۆ هەیە).

## باسى دەربارەى فەزڵ و گەورەيى سەنگەرنشينى

## ١٦ - باب فِي فَضْلِ الرِّبَاطِ.

٢٥٠٠ - (صحيح) عن فضالة بن عبيد: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (كُلُّ الْمَيِّتِ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلاَّ الْمُرَابِطَ، فَإِنَّهُ يَنْمُو لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَيُؤَمَّنُ مِنْ فَتَّانِ الْقَبْرِ).

واتە: لە (فضَالَة)ى كورِى عوبەيدەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەرى خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتى: (هەموو مردويەك مۆرى كۆتايى دەنرێت بەسەر كردەوەكانيدا تەنها كەسى سەنگەرنشين(مورابط) نەبێ، چونكە ئەو بەردەوام كردەوەكانى بۆى لەزيادبون و گەشەكردندا دەبێ هەتا رۆژى قيامەت، وە لە فيتنەو ئازارى گۆڕ پارێزراو دەبێ).

## باسى دەربارەى فەزڵ و گەورەيى پاسەوانى لەڕێى خواى گەورەدا.

## ١٧ - باب فِي فَضْلِ الْحَرْسِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى.

٢٥٠١ - (ضعيف) عن سهل بن الحنظلية: أَنَّهُمْ سَارُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ حُنَيْنٍ فَأَطْنَبُوا السَّيْرَ حَتَّى كَانَتْ عَشِيَّةً، فَحَضَرْتُ الصَّلاَةَ، عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَارِسٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي انْطَلَقْتُ

بَيْنَ أَيْدِيكُمْ حَتَّى طَلَعْتُ جَبَلَ كَذَا وَكَذَا، فَـإِذَا أَنَـا بِهَـوَازِنَ عَلَى بَكْرَةِ آبَائِهِمْ بِظُعُنِهِمْ وَنَعَمِهِـمْ وَشَـائِهِمْ اجْتَمَعُـوا إِلَـى حُنَيْنٍ، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (تِلْكَ غَنِيمَةُ الْمُسْلِمِينَ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ). ثُمَّ قَالَ: (مَنْ يَحْرُسُـنَا اللَّيْلَةَ؟). قَالَ أَنَسُ بْنُ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيُّ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: (فَارْكَبْ). فَرَكِبَ فَرَسًا لَهُ، فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ: (اسْتَقْبِلْ هَذَا الشِّعْبَ حَتَّى تَكُونَ فِي أَعْلاَهُ وَلاَ نُغَـرَّنَّ مِـنْ قِبَلِكَ اللَّيْلَةَ). فَلَمَّا أَصْبَحْنَا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مُصَلاَّهُ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَـالَ: (هَـلْ أَحْسَسْـتُمْ فَارِسَكُمْ؟). قَالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ مَـا أَحْسَسْـنَاهُ! فَثُـوِّبَ بِالصَّلاَةِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يُصَـلِّي وَهُوَ يَلْتَفِتُ إِلَى الشِّعْبِ حَتَّى إِذَا قَضَى صَلاَتَهُ وَسَلَّمَ، قَـالَ: (أَبْشِرُوا فَقَدْ جَاءَكُمْ فَارِسُكُمْ). فَجَعَلْنَـا نَنْظُـرُ إِلَـى خِـلاَلِ الشَّجَرِ فِي الشِّعْبِ، فَإِذَا هُوَ قَدْ جَاءَ حَتَّى وَقَفَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنِّـي انْطَلَقْـتُ حَتَّـى كُنْتُ فِي أَعْلَى هَذَا الشِّعْبِ حَيْثُ أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا أَصْبَحْتُ اطَّلَعْتُ الشِّـعْبَيْنِ كِلَيْهِمَـا، فَنَظَرْتُ فَلَمْ أَرَ أَحَدًا، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ

وَسَلَّمَ: (هَلْ نَزَلْتَ اللَّيْلَةَ؟). قَالَ: لاَ، إِلاَّ مُصَلِّيًا أَوْ قَاضِيًا حَاجَةً، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ أَوْجَبْتَ فَلاَ عَلَيْكَ أَنْ لاَ تَعْمَلَ بَعْدَهَا).

واتە: لە سەهلی کوڕی (حنضليَّة)ەوە دەگێڕنەوە، کە لەڕۆژی جەنگی حونەین هاوەڵان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بە پەلە ڕێیان دەکرد، هەتا کاتی نوێژ هاتەپێشەوە، یەکێ لەسوارەکان هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرکەوتم بۆ سەر فلان کێو و فلانە کێو بینیم سەرجەم هۆزی هەوازن بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکیان لێ دوابکەوێت بە ژنەکانیان و بە وشترەکانیان و بە مەڕو ماڵاتەکانیانەوە هاتوون و لەحونەین کۆبونەتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە بیەوێت سبەینێ ئەوانە هەموو دەستکەوتی موسوڵمانان دەبن). لەپاشدا فەرمووی: (ئەمشەو کێ پاسەوانیمان دەکات؟). ئەنەسی کوڕی ئەبو (مرثد)ی غەنەوی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) من پاسەوانیتان دەکەم. فەرمووی: (سواربە) ئەویش سواری وشترەکەی بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆئەوەی ڕێی نیشان بدات، پێی فەرمووی: (ڕێگەی نێوان ئەو دوو کێوە بگرە هەتا دەگەیتە سەر بەرزایی شیوەکە، ئاگاداربە نەخەویت یان کەمتەرخەمی نەکەیت نەوەکا دوژمن بدات بەسەرماندا لەکاتێکدا کە ئێمە ئاگامان لەخۆمان نیە بە هۆی تۆوە). کاتێ کە ڕۆژمان لێ بویەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆشت بۆ جێگا نوێژەکەی دوو ڕکات نوێژی کرد، لەپاشدا فەرمووی: (ئایا سوارەکەتان نەبینی ئاگاتان لێی هەیە؟) وتیان: نەماندیوەو ئاگاشمان لێی نیە، قامەتی بۆ کرا بۆ نوێژ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد ئاوڕی دەدایەوە بەلای شیوەکەدا هەتا نوێژەکەی تەواو کردو سەلامی دایەوە، فەرمووی: (موژدەتان لێ بێ ئەوا سوارەکەتان گەڕایەوە ئیتر مەترسیتان لەسەر نەما). ئێمەش لەنێوان درەختەکانەوە سەیری شیوەکەمان دەکرد هەتا هات لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ڕاوەستا سەلامی لێ کردو وتی: دەرچووم

حەتا گەیشتمە سەر بەرزایی ئەم شیوە هەروەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردم، کاتێ کە ڕۆژ بویەوە چومەسەر بەرزایی هەردوو شیوەکەو سەیرم کرد کەسم نەبینی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (ئایا لەسواری ئەسپەکەت دابەزیت ئەم شەو ؟) وتی: نەء مەگەر بۆ نوێژ کردن یان بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (تۆ بە هەشتت بۆ مسۆگەر بوە ئیتر لە ئەمڕۆ بەدواوە — واتە لەدوای ئەم پاسەوانیەوە - تۆ سوننەتت لەسەر نیە کە بیکەیت).

## باسی ناپەسەندی وازهێنان لەغەزا.

## ١٨ – باب كَرَاهِيَةِ تَرْكِ الْغَزْوِ.

**٢٥٠٢ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِالْغَزْوِ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك بمرێ و غەزای نەکردبێ و لەدڵیشەوە بە تەمای غەزا نەبووبێ ئەوە لەسەر بەشێ لە دووڕوویی(نیفاق) مردوە).

**٢٥٠٣ - (حسن) عن أبو أمامة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ لَمْ يَغْزُ أَوْ يُجَهِّزْ غَازِيًا أَوْ يَخْلُفْ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ: أَصَابَهُ اللَّهُ بِقَارِعَةٍ). قَالَ يَزِيدُ بْنُ عَبْدِ رَبِّهِ فِي حَدِيثِهِ: (قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ).**

واتە: لە ئەبو ئومامە - ی باهیلیەوە - دەگێرنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك جیهاد نەکات، یان موجاهیدێك سازو رێکنەخات بۆ جیهاد، یان بەباشی شوێنی موجاهیدێك بومالّو منداڵەکەی نەگرێتەوە. خوای گەورە بەر لەرۆژی قیامەت دووچاری بەلاو موصیبەتێکی تیابەرو دەردێکی یەکخەری دەکاتەوە).

٢٥٠٤ - (صحيح) عن أنس: أن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ).

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بە ماڵ و سامان و بە نەفس و بە زمانتان جیهادی هاوەڵ بۆ بڕیاردەرەکان بکەن).

## باسی دەربارەی نەسخ بونەوەی دەرچونی سەرجەم باوەڕداران بۆ جیهاد، بەوەی کە تەنیا کۆمەڵێکیان دەرچن

## ١٩ - باب فِي نَسْخِ نَفِيرِ الْعَامَّةِ بِالْخَاصَّةِ.

٢٥٠٥ - (حسن) عن ابن عباس قال: (إِلَّا تَنفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا) وَ (مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ) إلى قوله: (يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾) نَسَخَتْهَا الآيَةُ الَّتِي تَلِيهَا: (وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەم دوو ئایەتە: (إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ) التوبة: ٣٩. ( مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ...) هەتا دەگاتە: (يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾). التوبة:١٢٠. نەسخ بونەتەوە بەم ئایەتە: (وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً...) سورة التوبة: ١٢٢. واتە: نەدەبوو باوەڕداران تێکڕا هەموو دەرچن و بڕۆن (بۆ جیهاد).

**٢٥٠٦ - (ضعيف) عن نجدة بن نفيع قال: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ) قَالَ: فَأُمْسِكَ عَنْهُمُ الْمَطَرُ، وَكَانَ عَذَابَهُمْ.**

واتە: لە نەجدەی کوڕی نوفەیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ئیبنو عەباسم ڕەزای خوایان لێ بێ پرسی سەبارەت بە ئایەتی: (إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ) التوبة: ٣٩. واتە: ئەگەر گشت بە جارێ بەرەو مەیدانی جیهاد لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەرنەچن، خوای گەورە سزایەکی ئێش پێگەیەنەرتان ئەدات.

ئیبنو عەباس وتی: بارانیان لێ دەگرێتەوە، ئەوەش سزاکەیانە.

## باسى سەبارەت بە روخسەتى نەچون بۆ غەزا لەبەر پاساو(عذر)ێكى شەرعى.

## ٢٠ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي الْقُعُودِ مِنَ الْعُذْرِ.

٢٥٠٧ - (حسن صحيح) عن زيد بن ثابت قال: كُنْتُ إِلَى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَغَشِيَتْهُ السَّكِينَةُ، فَوَقَعَتْ فَخِذُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى فَخِذِي، فَمَا وَجَدْتُ ثِقَلَ شَيْءٍ أَثْقَلَ مِنْ فَخِذِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَقَالَ: (اكْتُبْ). فَكَتَبْتُ فِي كَتِفٍ: (لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ). إِلَى آخِرِ الآيَةِ، فَقَامَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ - وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى - لَمَّا سَمِعَ فَضِيلَةَ الْمُجَاهِدِينَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَيْفَ بِمَنْ لاَ يَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ، فَلَمَّا قَضَى كَلاَمَهُ غَشِيَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السَّكِينَةُ فَوَقَعَتْ فَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، وَوَجَدْتُ مِنْ ثِقَلِهَا فِي الْمَرَّةِ الثَّانِيَةِ كَمَا وَجَدْتُ فِي الْمَرَّةِ الأُولَى، ثُمَّ سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: (اقْرَأْ يَا زَيْدُ). فَقَرَأْتُ: (لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ: (غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ) الآيَةَ كُلَّهَا، قَالَ زَيْدٌ: فَأَنْزَلَهَا اللَّهُ وَحْدَهَا، فَأَلْحَقْتُهَا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى مُلْحَقِهَا عِنْدَ صَدْعٍ فِي كَتِفٍ.

واتە: لە زەیدی کوڕی (ثابت)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەتەنیشت پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بووم ئارامی باڵی کێشا بەسەریا، ڕانی کەوتە سەر ڕانم هیچ شتێکم نەدیوە ئەوەندەی ڕانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قورس بێت — لەوکاتەدا وەحی بۆ هاتوە لەبەر ئەوە ڕانی قورس بووە — لەپاشدا کە وەحی تەواو بوو هاتەوە سەرخۆ، فەرمووی: (ئەی زەید بنوسە). لەسەر ئێسکی شانی وشترێ نوسیم: (لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ... وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ...).النساء: ٩٥. هەتا کۆتایی ئایەتکە. واتە: یەکسان نین دانیشتوان (لە جیهادی ڕێی خودا) لە باوەڕداران لەگەڵ تێکۆشەرانی ڕێگەی خوادا بەماڵ و گیانیان. بەڵام بەبێ : (غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ). واتە: جگە لە خاوەن عوزرەکان (نەخۆش، کوێر، شەل).

ئیبنو ئومی مەکتوم کە پیاوێکی نابینا بوو کاتێ کە فەزڵ و گەورەیی خێر و پاداشتی تێکۆشەرانی(موجایدین)ی بیست وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەی حاڵی ئەو باوەڕدارانە چۆنە کە ناتوانن جیهاد بکەن؟ کاتێ کە قسەکەی تەواو کرد، جارێکی تر ئارامی باڵی کێشا بەسەر پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ڕانی کەوتەوە سەر ڕانم، وەك جاری پێشو هەستم بە قورسایی ڕانی کرد، لەپاشدا کە وەحی تەواو بوو هاتەوە سەرخۆ،، فەرمووی: (ئەی زەید ئەوەی نوسیوتە بیخوێنەوە). منیش ئایەتەکەم بۆ خوێندەوە: (لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ...). فەرمووی: (غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ)ی بۆ زیاد بکە. زەید وتی: (غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ) بەجیا دابەزی منیش لەلای درزی

ئێسکەکەدا نوسیم، سوێند بە (الله) دەڵێی ئێستا چاوم لـە شـوێنەکەیەتی لـەلای درزی ئێسکەکەدا.

**٢٥٠٨ – (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَقَدْ تَرَكْتُمْ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا، وَلاَ أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ، وَلاَ قَطَعْتُمْ مِنْ وَادٍ، إِلاَّ وَهُمْ مَعَكُمْ فِيهِ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ يَكُونُونَ مَعَنَا وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ فَقَالَ: (حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ).**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (لەشاری مەدینە پیاوانێ بەجێماون و نـەهاتوون، ، ئێـوە هـەر ڕێیـە دەبڕن، هەر جیهادێ کە دەیکەن هەر خێر و خێراتێ کە دەیکەن، هەرشیو و دۆڵێك دەبڕن. ئەوانیش بەنیەت و بە دڵ و بە گیان لەگەڵتانن). وتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن لەگەڵمانان لەکاتێکدا کە ئەوان لە مەدینەن؟ فەرمووی: (پاساو(عـذر)ی شەرعی گیریداون و ڕێگری دەرچونی لێ کردون).

# باسی چ کردەوەیە بەسە بۆ ئەو کەسەی کە جەنگاوەرێ ساز و رێکدەخات بۆ غەزا هەتا ئەوەندەی ئەو کەسە خێر و پاداشت بەدەست بهێنێت.

## ٢١ - باب مَا يُجْزِئُ مِنَ الْغَزْوِ.

**٢٥٠٩ - (صحيح) عن زيد بن خالد الجهني: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا).**

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی جەنگاوەرێك سازو رێکبخات بۆ جیهاد لەرێی خوادا ئەوە جیهادی کردوە، وە ئەوەی شیوێن موجاهیدێك بگرێتەوە بۆ ماڵو منداڵەکەی بەچاکە ئەوەش هەر جیهادی کردوە).

**٢٥١٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ إِلَى بَنِي لِحْيَانَ وَقَالَ: (لِيَخْرُجْ مِنْ كُلِّ رَجُلَيْنِ رَجُلٌ). ثُمَّ قَالَ لِلْقَاعِدِينَ: (أَيُّكُمْ خَلَفَ الْخَارِجَ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ بِخَيْرٍ: كَانَ لَهُ مِثْلُ نِصْفِ أَجْرِ الْخَارِجِ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردویەتی بۆ ناو هۆزی بەنی لەحیان و فەرمووی: (با لەهەر دوو پیاوێ پیاوێکیان دەرچێ بۆ غەزا)، لەپاشدا بەوانەیان کە لەماڵەوە دەمێننەوە فەرمووی: (هەر یەکێ لەئێوە

یارمەتی خانەوادەی ئەو کەسە بدات کە دەرچوە بۆ غـەزا، ئـەوە نیـوەی پاداشـتی ئـەو کەسەی بۆ هەیە کە دەرچوە بۆ غەزا).

## باسی سەبارەت بە بوێری و ئازایەتی و ترسنۆکی

## ٢٢ - باب فِي الْجُرْأَةِ وَالْجُبْنِ.

٢٥١١ - (صحيح) عن أبو هريرة قال، سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (شَرُّ مَا فِي رَجُلٍ شُحٌّ هَالِعٌ وَجُبْنٌ خَالِعٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليه وسـلم) دەیفەرموو: (خراپترین شتێ لەپیاودا رژدیەکە کە لەماڵ و سامانەکەی لـەرێی خوای گەورەدا نابەخشێ لەترسی ئەوەی نـەوەکا هـەژار بکـەوێت، یـان ترسـنۆکیەك وەك ئەوەی کە دڵی دەربهێنن لەترساندا رێگری ئەوەی لێ دەکات کە دەرچێت بۆ غەزا. - واتە رژدیە ببێتە هۆی ئەوەی کە بە ماڵ و سامانی جیهاد نەکات، ترسنۆکیەکیش ببێتە هـۆی ئەوەی کە بە نەفسی جیهاد نەکات - ).

## باسی دەربارەی ئەم ئایەتە: (وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ).

## ٢٣ - باب فِى قَوْلِهِ تَعَالَى (وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ).

٢٥١٢ - (صحيح) عن أسلم أبي عمران قال: غَزَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ نُرِيدُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةَ، وَعَلَى الْجَمَاعَةِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، وَالرُّومُ مُلْصِقُو ظُهُورِهِمْ بِحَائِطِ الْمَدِينَةِ، فَحَمَلَ رَجُلٌ عَلَى الْعَدُوِّ، فَقَالَ النَّاسُ: مَهْ مَهْ! لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ! يُلْقِى بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ!! فَقَالَ أَبُو أَيُّوبَ: إِنَّمَا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ: لَمَّا نَصَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ، وَأَظْهَرَ الإِسْلاَمَ، قُلْنَا: هَلُمَّ نُقِيمُ فِى أَمْوَالِنَا وَنُصْلِحُهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ). فَالإِلْقَاءُ بِالأَيْدِى إِلَى التَّهْلُكَةِ: أَنْ نُقِيمَ فِى أَمْوَالِنَا وَنُصْلِحَهَا وَنَدَعَ الْجِهَادَ. قَالَ أَبُو عِمْرَانَ: فَلَمْ يَزَلْ أَبُو أَيُّوبَ يُجَاهِدُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى دُفِنَ بِالْقُسْطَنْطِينِيَّةِ.

واتە: ئەسلەمی ئەبو عیمران دەڵێ: بەنیازی جیهادی ڕۆمەکان لە مەدینەوە بەرەو قوستەنتینیە بەڕێ کەوتین، عەبدوڕەحمانی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید سەرکردەی سوپاکەمان بوو، ڕۆمەکان پشتیان بەدیواری شاری قوستەنتینیەوە قایمکردبوو، پیاوێك لە

ریزی موسوڵمانان خۆی هاوێشتە ناویانەوەو بەتەنها هێرشی کردەسەریان، خەڵکانێت وتیان: (مەه مەه) [1] هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لە (اللە)، بەدەستی خۆی خۆی خستە تەهلوکەو تیاچونەوە. ئەبو ئەیوب-ی ئەنصاری رەزای خوای لێ بێ - وتی: خەڵکی ئەنصار ئەو ئایەتە لەبارەی ئێمەوە هاتوتەخوارەوە، لەکاتێکدا کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی سەرخستو دینی ئیسلامی بالاکرد ئێمەش وتمان: ئیدی وەرن با بڕۆین بەدەم ماڵو کاروبارمانەوە چاکی بکەینو پەرەی پێبدەین، خوای گەورەش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ). البقرة: ١٩٥. واتە: ببەخشن لەڕێی خوای گەورەدا، بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تەهلوکەو تیاچونەوە.

خۆخستنە ناو تەهلوکەو خۆتیابردنمان بەوە دەبێت کە لەناو ماڵو سامانەکەماندا بمێنینەوەو هەوڵی پەرەپێدانی بدەینو واز لەجیهادی ڕێگەی خوا بێنین.

ئەبو عیمران دەڵێ: ئەبو ئەیوب هەتا لەژیاندابوو بەردەوام لە جیهاددا بوو هەتا دواجار لە قوستەنینیە بەخاکیان سپارد.

## باسی سەبارەت بە رەمی و تیرهاوێژی.

## ٢٤ - باب فِي الرَّمْيِ.

**٢٥١٣ - (ضعيف) عن عقبة بن عامر قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُدْخِلُ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ ثَلَاثَةَ نَفَرٍ الْجَنَّةَ: صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صَنْعَتِهِ الْخَيْرَ، وَالرَّامِيَ بِهِ، وَمُنْبِلَهُ، وَارْمُوا وَارْكَبُوا، وَأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ**

---

[1] - ئسلوبێکە بۆ ئەوە بەکاردێت کە کەسێك کارێکی نەشیاو نەنجامبداتو بتەوێت ڕێگری لێبکەیت.

مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا، لَيْسَ مِنَ اللَّهْوِ إِلاَّ ثَلاَثٌ: تَأْدِيبُ الرَّجُلِ فَرَسَهُ، وَمُلاَعَبَتُهُ أَهْلَهُ، وَرَمْيُهُ بِقَوْسِهِ وَنَبْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ الرَّمْيَ بَعْدَ مَا عَلِمَهُ رَغْبَةً عَنْهُ، فَإِنَّهَا نِعْمَةٌ تَرَكَهَا). أَوْ قَالَ: (كَفَرَهَا).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (خوای گەورە بە یەك تیرهاوێژتن بۆ کافران سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە: ئەوەی کە دروستی دەکات بە مەرجێ لەدروستکرنەکەیدا مەبەستی ئەوە بێ کە موسوڵمانان لەغەزادا بەکاری بهێنن واتە خێر و پاداشتی جیهاد، وە ئەوەی کە دەیهاوێژێت، هەروەها ئەو کەسەی کە یارمەتی تیرهاوێژەکە دەدات و تیرەکانی بۆ ئامادە دەکات، تیرهاوێژی و ئەسپ سواری بکەن، کەمتەرخەمی مەکەن بەسواری بە پیادە تیرهاوێژی بکەن من تیرهاوێژیم پێخۆشترە لە ئەسپ سواری، لە (لهو)دا تەنها سێ شت رێ پێ دراوەو راوەیە: پیاوێ ئەسپەکەی رابێنێ و ئامادەی بکات بۆ جیهاد، وە گەمەوگاڵتە لەگەڵ هاوسەرەکەی بکات، هەروەها تیرهاوێژی بکات و خۆی رابێنێ لەسەری، ئەوەی بە ئارەزووی خۆی وازبهێنێت لە رەمی و تیرهاوێژی لەدوای ئەوەی کە فێری بووە، ئەوە وازیهێناوە لە نازو نیعمەتێکی گەورە کە پێشتر دەستی کەوتوە) یان (سوپاسگوزاری لەسەر ئەو نیعمەمەتە نەکردوە).

٢٥١٤ - (صحيح) عن عقبة بن عامر الجهني قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم وهو على المنبر يقول: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ). أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ).

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەر مینبەر دەیفەرموو: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٍ). الأنفال: ٦٠. واتە: ئەی ئیمانداران ئامادەی بکەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێز و، ئەسپی دامەزراو.

ئاگاداربن کە بێگومان ئەو هێزە - ی کە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا داوای دەکات - تیرهاویشتنە، ئاگاداربن کە بێگومان ئەو هێزە تیرهاویشتنە، ئاگاداربن کە بێگومان ئەو هێزە تیرهاویشتنە. - ئەمە بۆ ئەو سەردەمە، بێگومان ئەو هێزە بەپێی کات و سەردەم دەگۆڕێت، بۆ سەردەمێکی وەك ئێستا هەموو جۆرە کەرەسەیەکی جەنگی دەگرێتەوە وەك تۆپ و تەیارەو..-.

## باسی دەربارەی ئەوەی کە غەزا بکات و مەبەستی دونیا بێت.

## ٢٥ - باب فِي مَنْ يَغْزُو وَيَلْتَمِسُ الدُّنْيَا.

**٢٥١٥ - (صحيح) عن معاذ بن جبل: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم أنه قال: (الْغَزْوُ غَزْوَانِ: فَأَمَّا مَنِ ابْتَغَى وَجْهَ اللَّهِ، وَأَطَاعَ الإِمَامَ، وَأَنْفَقَ الْكَرِيمَةَ، وَيَاسَرَ الشَّرِيكَ، وَاجْتَنَبَ الْفَسَادَ، فَإِنَّ نَوْمَهُ وَنَبْهَهُ أَجْرٌ كُلُّهُ. وَأَمَّا مَنْ غَزَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَسُمْعَةً، وَعَصَى الإِمَامَ، وَأَفْسَدَ فِي الأَرْضِ، فَإِنَّهُ لَمْ يَرْجِعْ بِالْكَفَافِ).**

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (غەزا دوو جۆرە: هەرکەس لەچون بۆ غەزاکەی مەبەستی ڕازامەندی خوای گەورە بێت و، گوێڕایەڵی پێشەواکەی بێت و، لەبەنرخترینی ماڵ و سامانە خۆشەویستەکەی ببەخشێت و، کارئاسان بێت لەگەڵ هاوەڵەکەیداو، لە ئاژاوەو خراپەکاری دورکەوێتەوە، ئەوە خەوتن و بە ئاگابوونی هەر هەمووی خێرو پاداشتە بۆی، بەڵام ئەگەر کەسێك مەبەستی لەغەزاکردنەکەی فەخر و شانازی و خۆهەڵکێشان و ڕیایی و خۆدەرخستن بێ و بۆ دونیا بێت، لە فەرمانی پێشەواو فەرمانڕەوا یاخی بێ و، لەسەر زەویدا خراپەکاری بکات، بێگومان ئەوە بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێتەوە بگرە بە تاوان و خراپەشەوە.

**٢٥١٦ - (حسن) عن أبو هريرة: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجُلٌ يُرِيدُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَهُوَ يَبْتَغِي عَرَضًا مِنْ عَرَضِ الدُّنْيَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ أَجْرَ لَهُ). فَأَعْظَمَ ذَلِكَ النَّاسُ، وَقَالُوا لِلرَّجُلِ: عُدْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَعَلَّكَ لَمْ تُفَهِّمْهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَجُلٌ يُرِيدُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَهُوَ يَبْتَغِي عَرَضًا مِنْ عَرَضِ الدُّنْيَا، فَقَالَ: (لاَ أَجْرَ لَهُ). فَقَالُوا لِلرَّجُلِ: عُدْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُ الثَّالِثَةَ: فَقَالَ لَهُ: (لاَ أَجْرَ لَهُ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەسێ بۆ شتێکی دونیایی دەچێت بۆ جیهاد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هیچ پاداشتێکی بۆ نیە). خەڵکەکە لەلایان زۆر قورس و گران بوو، بۆیە بە

پیاوەكەیان وت: دووبارەی بكەرەوە بەڵكو لە پرسیارەكەت تێ نەگەیشتبێ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كەسێ بۆ شتێكی دونیایی دەچێت بۆ جیهاد. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هیچ پاداشتێكی بۆ نیە). خەڵكەكە بە پیاوەكەیان وت: دووبارەی بكەرەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش بۆ سێیەم جار پرسیارەكەی لێ كردەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: (هیچ پاداشتێكی بۆ نیە).

## باسی ئەوەی بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرزبێتەوە.

## ٢٦ – باب مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا.

٢٥١٧ - (صحيح) عن أبو موسى: أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ، وَيُقَاتِلُ لِيُحْمَدَ، وَيُقَاتِلُ لِيَغْنَمَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَنْ قَاتَلَ حَتَّى تَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ أَعْلَى فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، كە عەرەبێكی دەشتەكی هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: كەسێك لەبەر ئەوەی باسی بكەن و بۆ ناوبانگ و شوهرەت دەجەنگێت، كەسێك لەبەر ئەوەی وەسفی بكەن و بڵێن كەسێكی ئازاو قارەمانە دەجەنگێت، كەسێك لەبەر دەستكەوتی دەجەنگێت، كەسێك لەبەر ئەوەی شوێنی دیار

بێت دەجەنگێت، ئەمانە كامیان لەپێناوی خوای گەورەدایە؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرزبێتەوە ئەوە لـەپێناوی خـوای گەورەدایە).

**٢٥١٨ - (صحيح) عن عمرو قال: سَمِعْتُ مِنْ أَبِى وَائِلٍ حَدِيثًا أَعْجَبَنِى، فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.**

واتە: عەمر دەڵێت: فەرموودەیەكم لە ئەبو وائیل بیستوە سەرم سورِ دەمێنێ، جا راوی فەرموودەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە.

**٢٥١٩ - (ضعيف) قال عبد الله بن عمرو: يَا رَسُولَ اللَّـهِ، أَخْبِرْنِـى عَـنِ الْجِهَادِ وَالْغَزْوِ، فَقَالَ: (يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْـرٍو، إِنْ قَاتَلْـتَ صَابِرًا مُحْتَسِبًا، بَعَثَكَ اللَّهُ صَـابِرًا مُحْتَسِـبًا، وَإِنْ قَاتَلْـتَ مُرَائِيًا مُكَاثِرًا بَعَثَكَ اللَّهُ مُرَائِيًا مُكَاثِرًا، يَا عَبْدَ اللَّـهِ بْـنَ عَمْرٍو، عَلَى أَيِّ حَالٍ قَاتَلْتَ أَوْ قُتِلْتَ بَعَثَكَ اللَّهُ عَلَى تِيلْـكَ الْحَالِ).**

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمر ڕەزای خوایان لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆنیەتی جیهادو غەزام پێ رابگەیەنە، فەرمووی: (ئەی (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمر، ئەگەر بە پاكی و بە خۆراگریەوە لەرێی خوای گەورەدا بجەنگیت بە هیوای پاداشت بووی، ئەوە خوای گەورە بەو شێوەیە زینـدوت دەكاتـەوە، بـەڵام ئەگـەر لەبـەر ریـایی و كۆكردنەوەی ماڵ و سامان بجەنگیت و شانازی بە زۆریەوە بكەیت، ئەوە خوای گەورە بـەو شێوەیە زیندوت دەكاتەوە، ئەی (عَبْدُ اللّـه)ی كوڕی عەمر، بەهەرحاڵ لەسەر هەر حاڵەتێ بجەنگیت و بكوژرێیت لەسەر ئەو حاڵەتە زیندو دەكرێیتەوەو حەشر دەكرێیت).

## باسی دەربارەی فەزڵ و گەورەیی شەهیدی.

## ٢٧ - باب فِي فَضْلِ الشَّهَادَةِ.

٢٥٢٠ - (حسن) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَمَّا أُصِيبَ إِخْوَانُكُمْ بِأُحُدٍ جَعَلَ اللَّهُ أَرْوَاحَهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ تَرِدُ أَنْهَارَ الْجَنَّةِ: تَأْكُلُ مِنْ ثِمَارِهَا، وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مِنْ ذَهَبٍ مُعَلَّقَةٍ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ، فَلَمَّا وَجَدُوا طِيبَ مَأْكَلِهِمْ وَمَشْرَبِهِمْ وَمَقِيلِهِمْ قَالُوا: مَنْ يُبَلِّغُ إِخْوَانَنَا عَنَّا أَنَّا أَحْيَاءٌ فِي الْجَنَّةِ نُرْزَقُ، لِئَلاَّ يَزْهَدُوا فِي الْجِهَادِ وَلاَ يَنْكُلُوا عِنْدَ الْحَرْبِ، فَقَالَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ: أَنَا أُبَلِّغُهُمْ عَنْكُمْ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ( وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًا ). إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (كاتیّ كە برا موجاهیدەكانتان لە جەنگی ئوحوددا پێكران و شەهید بوون خوای گەورە رۆحی ئەوانی كردە بەری پەلەوەری سەوز ئەچون بۆ سەر روبارەكانی بەهەشت و، لە بەری میوەكانیان دەخواردو، دەگەڕانەوە لەناو چرای ئاڵتونیدا دەحەوانەوە كە هەڵواسراون بە ژێر عەرشەوە، كاتیّ ئەو خواردن و خوارنەوەو شوێنی حەوانەوە خۆشەیان بینی وتیان: كیّ بە برا موسوڵمانەكانمان رابگەیەنیّ كە ئێمە زیندوین و خوای گەورە رۆزیمان دەدات، نەوەكا لە جەنگ و جیهادكردندا تەمەڵی بكەن و لەترساندا گرنگی پیّ نەدەن، خوای گەورە فەرمووی: من پێیان رادەگەیەنم، جا ئەم

ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾﴾. سورة آل عمران: ١٦٩. واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژران لەرێ ی خوادا مردوون، (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان رۆزی دەدرێن.

**٢٥٢١ - (صحيح) عن حسناء بنت معاوية الصريمية قالت: حدثنا عمي قال: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ فِي الْجَنَّةِ؟ قَالَ: (النَّبِيُّ فِي الْجَنَّةِ، وَالشَّهِيدُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْمَوْلُودُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْوَئِيدُ فِي الْجَنَّةِ).**

واتە: لە حەسنائی کچی موعاویەی صەریمییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: مامم بۆی گێڕاینەوە وتی: وتم بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم): کێ بەهەشتیە؟ فەرمووی: (پێغەمبەران بەهەشتین، شەهید بەهەشتیە، منداڵی ناباڵغ بەهەشتیە، زیندە بەچاڵ کراو بەهەشتیە).

## باسی دەربارەی شەفاعەتکردن لەلایەن شەهیدەوە

## ٢٨ - باب فِي الشَّهِيدِ يُشَفَّعُ.

**٢٥٢٢ - (صحيح) عن نمران بن عتبة الذماري قال: دَخَلْنَا عَلَى أُمِّ الدَّرْدَاءِ وَنَحْنُ أَيْتَامٌ فَقَالَتْ: أَبْشِرُوا فَإِنِّي سَمِعْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يُشَفَّعُ الشَّهِيدُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ).**

واتە: لە نەمرانی کوڕی عوتبەی (ذمـاريّ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویـەتی: ئێمـە کۆمـەڵێ هەتیو بوین چوین بۆلای (أُمِّ الدَّرْدَاء) وتی: موژدەتان لـێ بـێ بیسـتم لـە ئـەبو (درداء) دەیوت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (شەهید شەفاعەت دەکـات بـۆ حەفتا کەس لەکەسوکارەکەی).

## باسی دەربارەی بینینی نور لە گۆڕی هەندێ شەهید ئیتر بەهەر شێوەیە لەشێوەکان شەهید بوبێت.

## ٢٩ - باب فِي النُّورِ يُرَى عِنْدَ قَبْرِ الشَّهِيدِ.

**٢٥٢٣ - (ضعيف) عـن عائشـة رضـي الله عنهـا، قالـت: لَمَّـا مَـاتَ النَّجَاشِيُّ كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ لاَ يَزَالُ يُرَى عَلَى قَبْرِهِ نُورٌ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کـە وتویـەتی: کـاتێ کـە نەجاشـی پاشای حەبەشە مرد، ئێمە باسمان دەکرد کە بەردەوام لەسەر گۆڕەکەی نور دەبینرێت.

**٢٥٢٤ - (صحيح) عن عبيد بن خالد السلمي قـال: آخَـى رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ رَجُلَيْنِ، فَقُتِـلَ أَحَـدُهُمَا، وَمَـاتَ الآخَرُ بَعْدَهُ بِجُمُعَةٍ أَوْ نَحْوِهَا، فَصَلَّيْنَا عَلَيْـهِ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا قُلْتُمْ؟). فَقُلْنَا: دَعَوْنَـا لَـهُ،**

وَقُلْنَا: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَأَلْحِقْهُ بِصَاحِبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (فَأَيْنَ صَلاَتُهُ بَعْدَ صَلاَتِهِ، وَصَوْمُهُ بَعْدَ صَوْمِهِ). شَكَّ شُعْبَةُ فِي صَوْمِهِ: (وَعَمَلُهُ بَعْدَ عَمَلِهِ، إِنَّ بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ).

واتە: لە عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوو پیاوی کردە برا، یەکێکیان کوژرا، ئەوی تریشیان هەفتەیە لەدوای ئەو وەفاتی کرد، نوێژمان لەسەر کردو پاڕاینەوە بۆی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (چیتان وت کە بۆی پاڕانەوە؟) وتمان: پاڕاینەوە بۆی وتمان: خودایە لێی خۆش ببەو بیگەیەنە بە هاوەڵەکەی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (نوێژ و ڕۆژوو کاروکردەوەی ئەو لەکوێ کە مردوە هی ئەم لەکوێ دوای ئەوەی کە ماوەیە ژیاوە لەدوای ئەو کاروکردەوەی چاکی ئەنجامداوە، نێوانیان وەك نیوان زەوی و ئاسمانە). شوعبە راوی فەرموودەکە لە باسی (صَوْمِهِ)ڕۆژووەکەیدا گومانی هەبوو.

## باسی دەربارەی ئەو کرێیەی کە دەدرێت بە غەزاکەر بەرامبەر بە غەزاکردنەکەی.

## ٣٠ – باب فِي الْجَعَائِلِ فِي الْغَزْوِ.

٢٥٢٥ – (ضعيف) عن أبي أيوب الأنصاري قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمُ الأَمْصَارُ، وَسَتَكُونُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ تُقْطَعُ عَلَيْكُمْ فِيهَا بُعُوثاً، فَيَكْرَهُ الرَّجُلُ مِنْكُمُ

الْبَعْثَ فِيهَا، فَيَتَخَلَّصُ مِنْ قَوْمِهِ، ثُمَّ يَتَصَفَّحُ الْقَبَائِلَ يَعْرِضُ نَفْسَهُ عَلَيْهِمْ، يَقُولُ: مَنْ أَكْفِيهِ بَعْثَ كَذَا، مَنْ أَكْفِيهِ بَعْثَ كَذَا؟ أَلاَ وَذَلِكَ الأَجِيرُ إِلَى آخِرِ قَطْرَةٍ مِنْ دَمِهِ).

واتە: لە ئەبو ئەیوبی ئەنصارییەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئێوە لەمەولا شار و ولاتی زۆر رزگاردەکەن فەرمانڕەواکانیش ناچار دەبن سەربازو سوپاو لەشکری زۆر لەهۆزەکان رەوانەی ئەو شوێنانە بکەن بۆ پاراستنی. جا کەسێ لەئێوە حەز ناکات بەبێ کرێ بڕوات خۆی لەهۆزەکەی دەدزێتەوەو دەڕوات بۆلای هۆزەکانی ترو دەڵێ: کێ دەیەوێ لەجیاتی ئەو بەکرێ بچم بۆ ئەو سەربازی یە، کێ دەیەوێ لەجیاتی ئەو بەکرێ بچم بۆ ئەو سەربازی یە، ئا ئەمە هەتا دوا دڵۆپی خوێنی بەکرێ غەزای کردوە).

## باسی روخسەت لەو کرێیەدا کە دەدرێت بە غەزاکەر بەرامبەر بە غەزاکردنەکەی.

## ٣١ – باب الرُّخْصَةِ فِي أَخْذِ الْجَعَائِلِ.

٢٥٢٦ - (صحيح) عن عابد الله بن عمرو قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لِلْغَازِي أَجْرُهُ، وَلِلْجَاعِلِ أَجْرُهُ وَأَجْرُ الْغَازِي).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (غەزاکەر ئەگەر بەکرێ بچێ بۆ غەزایەك خێری

دوارِۆژی بۆ هەیە — ئەمە ئەگەر حەزی لێ بکات بەڵام توانای ماڵی نەبێ دەرچێ بۆ غەزا ئەگەر یەکێ سازی بکات و بچێ واتە ئەسپ و کەرەسەی جەنگی بۆ ئامادەبکات ئەو کاتە خێری دەگات - ، بەڵام غەزا سازکەر دوو خێری بۆ هەیە: خێری خۆی و، خێری ئەو کەسەی کە سازی دەکات بۆ ئەوەی بچێت بۆ غەزا).

## باسی دەربارەی غەزاکەرێ یەکێ بەکرێ بگرێ بۆ ئەوەی خزمەتی بکات.

## ٣٢ – باب فِي الرَّجُلِ يَغْزُو بِأَجِيرٍ لِيَخْدُمَ.

٢٥٢٧ - (صحيح) عن عبد الله بن الديلمي أن يعلى بن منية قال: آذَنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْغَزْوِ وَأَنَا شَيْخٌ كَبِيرٌ، لَيْسَ لِي خَادِمٌ، فَالْتَمَسْتُ أَجِيرًا يَكْفِينِي وَأُجْرِي لَهُ سَهْمَهُ، فَوَجَدْتُ رَجُلاً، فَلَمَّا دَنَا الرَّحِيلُ أَتَانِي، فَقَالَ: مَا أَدْرِي مَا السُّهْمَانُ، وَمَا يَبْلُغُ سَهْمِي؟ فَسَمِّ لِي شَيْئًا، كَانَ السَّهْمُ أَوْ لَمْ يَكُنْ، فَسَمَّيْتُ لَهُ ثَلاَثَةَ دَنَانِيرَ. فَلَمَّا حَضَرَتْ غَنِيمَتُهُ أَرَدْتُ أَنْ أُجْرِيَ لَهُ سَهْمَهُ، فَذَكَرْتُ الدَّنَانِيرَ، فَجِئْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَذَكَرْتُ لَهُ أَمْرَهُ فَقَالَ: (مَا أَجِدُ لَهُ فِي غَزْوَتِهِ هَذِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ دَنَانِيرَهُ الَّتِي سَمَّى).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی دەیلەمییەوە دەگێڕنەوە، کە یەعلای کوڕی مونیە وتویەتی: لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) جاڕدرا بۆ غەزا لەوکاتەدا منیش

پیاوێکی بە تەمەن بووم، خزمەتکارم نەبوو، پێویستم بە کەسێ هەبوو بیبەم لەگەڵ خۆم هەتا خزمەتم بکات منیش لە غەنیمەتی جەنگەگە بەشێکی بدەمێ وەك غەزاکەرەکانی تر، پیاوێکم دۆزیەوە، کاتی رۆشتن نزیك بوەوە پیاوەکە هات وتی: نازانم بەشەکەی من - بە درهەم و دینار - چەندە؟ بۆم دیاری بکە، من دەمەوێت لەسەر کرێکە لەسەرەتاوە لەگەڵت رێك بکەوم، جا لەسەر سێ دینار ریك کەوتن، کاتێ کە غەنیمەتەکە ئامادەبوو ویستم بەشێ لە غەنیمەتەکەی بدەمێ وەك غەزاکەرەکانی تر، باسی سێ دینارەکەم کرد. چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بەسەرهاتەکەیم بۆ گێڕایەوە فەرمووی: (لە غەنیمەتەکە هیچی نادرێتێ، لەدونیاو لەدوارۆژدا جگە لەو سێ دینارە کە بۆی دیاریکراوە هیچی تری نادرێتێ، چونکە لەرێی خوای گەورەدا جیهادی نەکردوە. بەڵکو لەپێناوی کرێدا دەرچوە).

## باسی دەربارەی کەسێ بیەوێ دەرچێ بۆ غەزا بەڵام دایك و باوکی پێیان ناخۆش بێت.

## ٣٣ - باب فِي الرَّجُلِ يَغْزُو وَأَبَوَاهُ كَارِهَانِ.

٢٥٢٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَتَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ، فَقَالَ: (ارْجِعْ عَلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) وتی: هاتووم پەیمانت پێ دەدەم لەسەر

کۆچکردن، بەڵام کاتێ کە باوك و دایکمم بەجێهێشت دەگریان، فەرمووی: (بچۆرەوە بۆ لایان بیانخەرە پێکەنین وەك چۆن خستنتە گریانەوە).

**٢٥٢٩ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُجَاهِدُ قَالَ: (أَلَكَ أَبَوَانِ). قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: (فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەمەوێ جیهاد بکەم، فەرمووی: (باوك و دایکت هەیە -واتە لەژیاندا ماون - ). وتی: بەڵێ، فەرمووی: (دەی بچۆ بەخزمەتکردنی ئەوان جیهاد بکە). — ئەمە لەکاتێکدایە کە جیهادەکە فەرزی (عین) نەبێت، بەڵام ئەگەر فەرزی (عین) بوو ئەوە ڕەزامەندی ئەوانی ناوێت - .

**٢٥٣٠ - (صحيح) عن أبو سعيد الخدري، أَنَّ رَجُلاً هَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الْيَمَنِ، فَقَالَ: (هَلْ لَكَ أَحَدٌ بِالْيَمَنِ؟). قَالَ: أَبَوَايَ، قَالَ: (أَذِنَا لَكَ). قَالَ: لاَ، قَالَ: (ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَاسْتَأْذِنْهُمَا، فَإِنْ أَذِنَا لَكَ فَجَاهِدْ، وَإِلاَّ فَبِرَّهُمَا).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێك لەیەمەنەوە کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی جیهاد بکات، فەرمووی: (کەست هەیە لەیەمەن؟). وتی: بەڵێ باوك و دایکم لەوێن، فەرمووی: (ڕێگەیان دای و ڕازی بوون؟).

وتی: نەء فەرمووی: (دەی بگەڕێرەوە بۆلایان مۆڵەتیان لیَ وەربگرە، ئەگەر مۆڵەتیان دای ئەوە جیهاد بکە ئەگینا گوێڕایەڵیان بکەو خزمەتیان بکە).

## باسی سەبارەت بە بردنی ئافرەتان بۆ غەزا بۆ یارمەتیدان و تیمار(تەداوی)کردنی برینداره‌کان.

## ٣٤ – باب فِي النِّسَاءِ يَغْزُونَ.

٢٥٣١ - (صحيح) عن أنس قال:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَغْزُو بِأُمِّ سُلَيْمٍ، وَنِسْوَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ لِيَسْقِينَ الْمَاءَ وَيُدَاوِينَ الْجَرْحَى.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئوممو سولەیم و چەند ژنێکی ئەنصاری لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ غەزا، کاریان ئەوە بوو ئاویان دەگێڕاو بریندارەکانیان تیمار دەکرد.

# باسی دەربارەی غەزاکردن لەگەڵ فەرمانڕەوا خراپەکارەکاندا.

# ٣٥ - باب فِي الْغَزْوِ مَعَ أَئِمَّةِ الْجَوْرِ.

٢٥٣٢ - (ضعيف) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (ثَلاَثَةٌ مِنْ أَصْلِ الإِيمَانِ: الْكَفُّ عَمَّنْ قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَلاَ تُكَفِّـرْهُ بِـذَنْبٍ، وَلاَ تُخْرِجْـهُ مِـنَ الإِسْـلاَمِ بِعَمَـلٍ" وَالْجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَنِىَ اللَّهُ إِلَى أَنْ يُقَاتِـلَ آخِـرُ أُمَّتِـى الدَّجَّالَ، لاَ يُبْطِلُهُ جَـوْرُ جَـائِرٍ، وَلاَ عَـدْلُ عَـادِلٍ، وَالإِيمَـانُ بِالأَقْدَارِ).

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سێ شت لە بنچینەو بنەڕەتی ئیمانـەوەن: یەکـەم: لـەکاتی جـەنگ لەگەڵ کافراندا ئەگەر کەسێ وتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ئیتر دەستی بۆ نابرێت و سەرو مـاڵ و ناموسی پارێزراوە، لەسەر گوناهو تاوان تـەکفیر ناکرێـت واتـە بـە کـافر دانانرێـت، بـە کردەوەی خراپیش لە ئیسلام ناکرێتـە دەرەوە بـا لـە تاوانـە گـەورەکانیش بێـت" دووەم: لەوکاتەوە کە خوای گەورە منی ڕاوانەکردوەو فەرمانی پێ کردم بە جیهادو تێکۆشان ئیتر جیهادو تێکۆشان بەردەوامە هەتا دواهەمین کەس لە ئوممەتی من کە دەججـال دەکـوژێ، ئیتر لەگەڵ فەرمانڕەوای ستەمکاردا بێت یان لەگەڵ فـەرمانڕەوای دادپـەروەردا، سـێیەم: باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەری خوای گەورە).

٢٥٣٣ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (الْجِهَادُ وَاجِبٌ عَلَيْكُمْ مَعَ كُلِّ أَمِيرٍ، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا، وَالصَّلاَةُ وَاجِبَةٌ عَلَيْكُمْ خَلْفَ كُلِّ مُسْلِمٍ، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا، وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ، وَالصَّلاَةُ وَاجِبَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا، وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (جیهادو تێكۆشان واجبە لەسەرتان لەدوای هەموو پێشەوایەكی موسوڵمانەوە بكرێت ئیتر چاكەكار بێ یان خراپەكار، نوێژە فەرزەكان واجبە لەسەرتان لەدوای هەموو موسوڵمانێكەوە بكرێن ئیتر چاكەكار بێ یان خراپەكار، ئەگەر تاوانە گەورەكانیش بكات، هەروەها واجبە (فەرزی كیفایەیە) نوێژی مردو لەسەر هەموو موسوڵمانێك بكرێت ئیتر چاكەكار بێ یان خراپەكار، ئەگەر لەژیاندا تاوانە گەورەكانیش بكات).

## باسی ئەگەر پیاوێ بیەوێت غەزا بكات بۆی هەیە سود لەماڵ و سامانی خەڵك وەربگرێ و خەڵكیش سود لەماڵ و سامانی ئەو وەربگرن.

## ٣٦ – باب الرَّجُلِ يَتَحَمَّلُ بِمَالِ غَيْرِهِ يَغْزُو.

٢٥٣٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله، عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: أَنَّهُ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ، فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ، إِنَّ مِنْ إِخْوَانِكُمْ قَوْمًا لَيْسَ لَهُمْ مَالٌ وَلاَ عَشِيرَةٌ، فَلْيَضُمَّ أَحَدُكُمْ إِلَيْهِ الرَّجُلَيْنِ أَوِ الثَّلاَثَةَ)، فَمَا لأَحَدِنَا مِنْ ظَهْرٍ يَحْمِلُهُ إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ، يَعْنِي أَحَدِهِمْ، فَضَمَمْتُ إِلَىَّ اثْنَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةً، قَالَ: مَا لِي إِلاَّ عُقْبَةٌ كَعُقْبَةِ أَحَدِهِمْ مِنْ جَمَلِي.

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)ەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو كاتێك كە دەیویست غەزا بكات، دەیفەرموو: (ئەی دەستەی موهاجیرین و ئەنصار: لە نێو برایانتان خەڵكانێك هەن كە ماڵ و كەس‌و هۆزییان نیە، با هەریەكێك لەئێوە دوان یان سیان لەوانە بگرێتە لای خۆی). جابر دەڵێ: ئەوكات هیچ یەكێك لەئێمە ولآخێكی تایبەتی بۆ سواربوون نەبوو تەنها نۆبەیەكی سواربوون نەبێ وەك نۆبەی هەریەك لەوان، وە من دوان یان سیان لەوانم لەئەستۆ گرتبو، وتی: منیش وەك نۆبەكانی ئەوان نۆبەیەكی سواربونم هەبوو.

## باسی دەربارەی پیاوێ بچێ بۆ غەزا مەبەستی پاداشت و دەستکەوت بێ.

## ٣٧ - باب فِي الرَّجُلِ يَغْزُو يَلْتَمِسُ الأَجْرَ وَالْغَنِيمَةَ.

٢٥٣٥ - (صحيح) عن ضمرة: أن ابن زغب الإيادي حدثه قال: نَزَلَ عَلَيَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حَوَالَةَ الأَزْدِيُّ، فَقَالَ لِي: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، لِنَغْنَمَ، عَلَى أَقْدَامِنَا فَرَجَعْنَا، فَلَمْ نَغْنَمْ شَيْئًا، وَعَرَفَ الْجُهْدَ فِي وُجُوهِنَا، فَقَامَ فِينَا فَقَالَ: (اللَّهُمَّ لاَ تَكِلْهُمْ إِلَيَّ فَأَضْعُفَ عَنْهُمْ، وَلاَ تَكِلْهُمْ إِلَى أَنْفُسِهِمْ فَيَعْجِزُوا عَنْهَا، وَلاَ تَكِلْهُمْ إِلَى النَّاسِ فَيَسْتَأْثِرُوا عَلَيْهِمْ). ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَى رَأْسِي - أَوْ قَالَ: عَلَى هَامَتِي - ثُمَّ قَالَ: (يَا ابْنَ حَوَالَةَ، إِذَا رَأَيْتَ الْخِلاَفَةَ قَدْ نَزَلَتْ أَرْضَ الْمُقَدَّسَةِ فَقَدْ دَنَتِ الزَّلاَزِلُ وَالْبَلاَبِلُ وَالأُمُورُ الْعِظَامُ، وَالسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنَ النَّاسِ مِنْ يَدِي هَذِهِ مِنْ رَأْسِكَ).

واتە: لە (ضمرة)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو زوغبی ئەییادی بۆی باس کردوە وتویەتی: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی حەوالەی ئەزدی لەلام دابەزی پێی وتم: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردینی بۆ غەزای کافران بۆ ئەوەی دەستکەوتی جەنگیمان دەستکەوێت. ئێمەش وڵاخی سواریمان نەبوو بە پێی خۆمان ڕۆشتین بۆ غەزا بەبێ هیچ دەستکەوتێکی جەنگی گەڕاینەوە، کاتێ کە بە نێوچاومانەوە ماندوێتی و بێ تاقەتی بینی، هەستا فەرمووی: (خودایە بە منیان مەسپێرە من ناتوانم یارمەتیان بدەم، بۆ خۆت ڕۆزییان پێ

ببەخشیت و لە فەزڵی خۆت بێ بەشیان نەکەیت، بە خۆشیان مەسپێرە خۆشیان ناتوانن بژێوی بۆ خۆیان دابین بکەن، بە خەڵکیشیان مەسپێرە چونکە خەڵك خۆیان پێش دەخەن بە سەریاندا). لەپاشدا دەستی خستەسەر سەرم ئینجا فەرمووی: (ئەی کوڕی حەوالە، کاتێ بینیت کە خەلافەت لە مەدینەوە گوێزرایەوە بۆ سەر زەوی شام، بومەلەرزە، نائارامی و خەم و پەژارەو ترس و، بەلاو فیتنەو کارەساتی گەورە نزیك بویەوە، ئەوکاتە ڕۆژی قیامەت - واتە نیشانەکانی - نزیك دەبێتەوە وەك چۆن دەستی من لەسەری تۆوە نزیکە).

## باسی دەربارەی کەسێ ڕۆحی خۆی دەفرۆشێ بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە.

## ٣٨ - باب فِي الرَّجُلِ الَّذِي يَشْرِي نَفْسَهُ.

**٢٥٣٦ - (حسن) عن عبد الله بن مسعود قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (عَجِبَ رَبُّنَا مِنْ رَجُلٍ غَزَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَانْهَزَمَ). يَعْنِي أَصْحَابَهُ: (فَعَلِمَ مَا عَلَيْهِ، فَرَجَعَ حَتَّى أُهْرِيقَ دَمُهُ، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى لِمَلاَئِكَتِهِ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي! رَجَعَ رَغْبَةً فِيمَا عِنْدِي، وَشَفَقَةً مِمَّا عِنْدِي، حَتَّى أُهْرِيقَ دَمُهُ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعودەوە (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پیاوێ دەڕوا بۆ غەزا هاوڕێکانی دەشکێن و هەڵدێن، بەڵام ئەو دەزانێ چ ئەرکێکی لەسەرە دەگەڕێتەوە جەنگ دەکات

هەتا خوێنی دەڕژێت، خوای گەورە بە مەلائیكەكانی دەفەرموێت: (سەیری ئەم بەندەیەی من بكەن، چۆن گەڕایەوە بۆ جەنگ، بە هیوای ئەو پاداشتەی كە لەلای منە. وە لەترسی ئەو سزاو تۆڵەیەیەی كە لەلای منە، هەتا خوێنی ڕژا).

## باسی دەربارەی كەسێ موسوڵمان ببێ و هەر لەوكاتەدا دەست بكات بە جیهادو لە جێگای خۆیدا بكوژرێت لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا.

## ٣٩ - باب فِيمَنْ يُسْلِمُ وَيُقْتَلُ مَكَانَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ.

**٢٥٣٧ - (حسن) عن أبي هريرة، أَنَّ عَمْرَو بْنَ أُقَيْشٍ كَانَ لَهُ رِبًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَكَرِهَ أَنْ يُسْلِمَ حَتَّى يَأْخُذَهُ، فَجَاءَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقَالَ: أَيْنَ بَنُو عَمِّي؟ قَالُوا: بِأُحُدٍ، قَالَ: أَيْنَ فُلاَنٌ؟ قَالُوا: بِأُحُدٍ، قَالَ: أَيْنَ فُلاَنٌ؟ قَالُوا: بِأُحُدٍ، فَلَبِسَ لأْمَتَهُ، وَرَكِبَ فَرَسَهُ، ثُمَّ تَوَجَّهَ قِبَلَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُ الْمُسْلِمُونَ قَالُوا: إِلَيْكَ عَنَّا يَا عَمْرُو، قَالَ: إِنِّي قَدْ آمَنْتُ، فَقَاتَلَ حَتَّى جُرِحَ، فَحُمِلَ إِلَى أَهْلِهِ جَرِيحًا، فَجَاءَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ لأُخْتِهِ: سَلِيهِ حَمِيَّةً لِقَوْمِكَ، أَوْ غَضَبًا لَهُمْ، أَمْ غَضَبًا لِلَّهِ؟ فَقَالَ: بَلْ غَضَبًا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ، فَمَاتَ فَدَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَا صَلَّى لِلَّهِ صَلاَةً.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە عەمری کوڕی ئوقەیش سود(ربا)یەکی سەردەمی نەفامی هەبوو، پێی ناخۆش بوو پێش ئەوەی بیداتەوە موسولمان ببێ، بۆیە ڕۆژی جەنگی ئوحود هات وتی: کوڕە مامەکەم لەکوێیە؟ وتیان: لە ئوحودە، وتی: فلان کەس لەکوێیە؟ وتیان: لە ئوحودە، وتی: فلان کەس لەکوێیە؟ وتیان: لە ئوحودە، ئەویش زرێکەی پۆشی و سواری ئەسپەکەی بوو کەرەسەی جەنگی لەگەڵ خۆی برد، بەرەو لایان ڕۆشت، کاتێ کە موسولمانان بینیان وتیان: ئەی عەمر تۆ لایەکی تر بگرە چونکە تۆ کافری، وتی: من باوەڕم هێناوەو موسوسولمان بووم، بەرامبەر بە کافران جەنگا هەتا بریندار بوو، بە برینداری هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆناو کەسوکاری، سەعدی کوڕ (مُعَاذ) هات بۆ سەردانی بە خوشکەکەی وت: لێی بپرسە کە ئایا لەپێناوی دەمارگیری هۆزەکەیدا جەنگی کردوە، یان رق و قین و توڕەبوونەکەی لەکافران لەبەر هۆزەکەی بووە، یا رق و قین و توڕەبوونەکەی لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا بووە؟ وتی: بەڵکو لە پێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیدا بووە، جا مردو ڕۆشتە بەهەشتەوە، نوێژێکیشی نەکرد بۆ خوای گەورە.

## باسی دەربارەی پیاوێ بەهۆی چەکەکەی خۆیەوە بریندار ببێ و بمرێت.

## ٤٠ - باب فِي الرَّجُلِ يَمُوتُ بِسِلاَحِهِ.

٢٥٣٨ - (صحيح) عن سلمة بن الأكوع قال: لَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ قَاتَلَ أَخِي قِتَالاً شَدِيدًا، فَارْتَدَّ عَلَيْهِ سَيْفُهُ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي ذَلِكَ، وَشَكُّوا فِيهِ: رَجُلٌ

مَاتَ بِسِلاَحِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَاتَ جَاهِدًا مُجَاهِدًا). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: ثُمَّ سَأَلْتُ ابْنًا لِسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ، فَحَدَّثَنِي عَنْ أَبِيهِ بِمِثْلِ ذَلِكَ، غَيْرَ أَنَّهُ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَذَبُوا، مَاتَ جَاهِدًا مُجَاهِدًا، فَلَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ).

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: براکەم لەڕۆژی غەزای خەیبەردا قارەمانانەوە جەنگاو جەنگێکی زۆری کرد، شمشێرەکەی وەرگەڕایەوە بەر خۆی کەوت و کوشتی، هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی حوکمی مردنەکەی قسەیان کرد وتیان: پیاوێ بە چەکەکەی خۆی کوژرا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (وەك جەنگاوەرێك و تێکۆشەرێك لەڕێگەی خوای گەورەدا جەنگی کردو مرد). ئیبنو شیهاب وتی: لەپاشدا لە کوڕێکی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع پرسیارم کرد، ئەویش لەباوکیەوە بەهەمان شێوە بۆی گێڕامەوە، جگە لەوەش لە فەرموودەکەیدا وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (هەڵەیان کرد وەك جەنگاوەرێك و تێکۆشەرێك لەڕێگەی خوای گەورەدا جەنگی کردو مرد، دووجار پاداشتی بۆ هەیە).

٢٥٣٩ - (ضعيف) عن أبي سلام، عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم قال: أَغَرْنَا عَلَى حَيٍّ مِنْ جُهَيْنَةَ، فَطَلَبَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ رَجُلاً مِنْهُمْ، فَضَرَبَهُ فَأَخْطَأَهُ، وَأَصَابَ نَفْسَهُ بِالسَّيْفِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَخُوكُمْ يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ!). فَابْتَدَرَهُ النَّاسُ فَوَجَدُوهُ قَدْ مَاتَ، فَلَفَّهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِثِيَابِهِ وَدِمَائِهِ وَصَلَّى عَلَيْهِ

وَدَفَنَهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَشَهِيدٌ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَأَنَا لَهُ شَهِيدٌ).

واتە: لە ئەبو سەلامەوە، لەپیاوێ لەهاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەبەرەبەیاندا دامان بەسەر هۆزێ لە جوهەینەدا، پیاوێ لە موسوڵمانان ویستی پیاوێ لەکافران بکوژێت لێی دا هەڵەی کرد بە شمشێرەکەی خۆی خۆی بریندار کرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوە براتانە فریای براکەتان بکەون ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان!). خەڵکەکە بە پەلە بەرەوپیری رۆشتن بینیان مردوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە خوێن و جل و بەرگەکەی خۆی پێچایەوەو نوێژی لەسەر کردو ناشتی – واتە نەیشۆری - ، جا وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە شەهیدە؟ فەرمووی: (من شایەتی بۆ دەدەم).

## باسی پاڕانەوە لەکاتی جەنگ و گەیشتن بە سوپای دوژمن.

## ٤١ – باب الدُّعَاءِ عِنْدَ اللِّقَاءِ.

٢٥٤٠ - (صحيح) عن سهل بن سعد قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (ثِنْتَانِ لاَ تُرَدَّانِ، - أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ - : الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا).

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (دوو پاڕانەوە گیرادەبن و گەڕانەوەیان نیە، - یان کەم جار

رەتدەکرێنەوە - پاڕانەوەی کاتی بانگدان، وە پاڕانەوەی کاتی جەنگ و تێك رژانی موسوڵمانان و کافران).

(ضعيف) قال موسى: وحدثني رزق بن سعيد بن عبد الرحمن، عن أبي حازم، عن سهل بن سعد، عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (وَوَقْتَ الْمَطَرِ).

موسا وتی: ریزقی کوڕی سەعیدی کوڕی (عبدالرحمن) لە ئەبو حازمەوە، لە سەهلی کوڕی سەعدەوە بۆی گێڕامەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (و: پاڕانەوەی کاتی باران بارین).

## باسی دەربارەی کەسێ لەخوای گەورە داوای شەهیدی بکات.

## ٤٢ - باب فِيمَنْ سَأَلَ اللَّهَ تَعَالَى الشَّهَادَةَ.

**٢٥٤١ - (صحيح) عن معاذ بن جبل: أنه سمع رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُوَاقَ نَاقَةٍ فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْقَتْلَ مِنْ نَفْسِهِ صَادِقًا، ثُمَّ مَاتَ أَوْ قُتِلَ فَإِنَّ لَهُ أَجْرَ شَهِيدٍ). زَادَ ابْنُ الْمُصَفَّى مِنْ هُنَا: (وَمَنْ جُرِحَ جُرْحًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ نُكِبَ نَكْبَةً فَإِنَّهَا تَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَغْزَرِ مَا كَانَتْ: لَوْنُهَا لَوْنُ الزَّعْفَرَانِ، وَرِيحُهَا رِيحُ الْمِسْكِ، وَمَنْ خَرَجَ بِهِ خُرَاجٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَإِنَّ عَلَيْهِ طَابَعَ الشُّهَدَاءِ).**

واتە: لە (معاذ)ی کوڕی جەبەلەوە هاتوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووە فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەوەندەی دۆشینی وشترێ لەپێناوی خوای گەورەدا بجەنگێت بە هەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، وە هەرکەسێ لەدڵەوە بەڕاستی داوای شەهیدی بکات لە خوای گەورە، لەپاشدا لەسەر جێگاکەی خۆی یان لەهەر شوێنێ بمرێ یان بکوژرێت ئەوە پاداشتی شەهیدێکی بۆ هەیە). (ابْنُ الْمُصَفَّى) لێرەدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئەوەی بریندار ببێ یان توشی لێقەومانێ ببێ لەرێگەی خوای گەورەدا، ئەوە لەرۆژی قیامەتدا کەهات برینەکەی خوێنی لێ دەتکێ رەنگەکەی وەك زەعفەران زەردە، بەلاَم بۆنەکەی وەك بۆنی میسك وایە، هەرکەسێ دومەڵێ لەسەر جەستەی دەرچێت شوێنەوارێ بە جەستەیەوە جێبهێڵێت لەرێگەی خوای گەورەدا ئەوە نیشانەی شەهیدیە بە جەستەیەوە).

## باسی دەربارەی کەراهەتی بڕینی توکی کلك و یاڵی ئەسپ.

## ٤٣ - باب فِي كَرَاهَةِ جَزِّ نَوَاصِي الْخَيْلِ وَأَذْنَابِهَا.

**٢٥٤٢ - (صحيح) عن عتبة بن عبد السلمي وهذا لفظه: أنه سمع رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (لاَ تَقُصُّوا نَوَاصِيَ الْخَيْلِ، وَلاَ مَعَارِفَهَا، وَلاَ أَذْنَابَهَا، فَإِنَّ أَذْنَابَهَا مَذَابُّهَا، وَمَعَارِفَهَا دِفَاؤُهَا، وَنَوَاصِيهَا مَعْقُودٌ فِيهَا الْخَيْرُ).**

واتە: لە عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (توکی یاڵ و لامل و کلکی ئەسپ کورت مەکەنەوە،

چونكە بە كلكی مێش و مەگەز لەخۆی دووردەخاتەوە، توكی لاملی هۆی گەرمیە بۆ مل و گەردنی، یاڵەكانیشی خێرو خۆشیە – هی ئەو ئەسپەی كە ئامادەكراوە بۆ جیهاد – ).

## باسی رەنگی كام ئەسپ خۆشەویسترە.

## ٤٤ – باب فِيمَا يُسْتَحَبُّ مِنْ أَلْوَانِ الْخَيْلِ.

**٢٥٤٣ - (ضعيف) عن أبو وهب الجشمي - وكانت له صحبة - قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (عَلَيْكُمْ بِكُلِّ كُمَيْتٍ أغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ أَشْقَرَ أغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ أَدْهَمَ أغَرَّ مُحَجَّلٍ).**

واتە: لە ئەبو وەهبی جوشەمییەوە – كە یەكێ بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) - دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (ئەسپی كە رەنگەكەی لەنێوان سور و رەشدایەو ناوچاوانی سپییەو چوارپەلی سپییە ئەو ئەسپە رابگرن، یان ئەسپی سوری ناوچاو سپی چوارپەل سپی رابگرن، یا رەشتاڵەی ناوچاو سپی چوارپەل سپی رابگرن).

**٢٥٤٤ - (ضعيف) عن أبي وهب قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (عَلَيْكُمْ بِكُلِّ أَشْقَرَ أغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ كُمَيْتٍ أغَرَّ). فَذَكَرَ نَحْوَهُ. قَالَ مُحَمَّدٌ - يَعْنِي ابْنَ مُهَاجِرٍ - سَأَلْتُهُ: لِمَ فَضَّلَ الأَشْقَرَ؟ قَالَ: لأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً فَكَانَ أَوَّلَ مَنْ جَاءَ بِالْفَتْحِ صَاحِبُ أَشْقَرَ.**

واتە: لە ئەبو وەهەبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (ئەسپی سوری ناوچاو سپی چوارپەل سپی رابگرن، یان ئەسپێ کە رەنگەکەی لەنێوان سور و رەشدایەو ناوچاوانی سپییەو چوارپەلی سپییە ئەو ئەسپە رابگرن). جا راوی بەهەمان شێوە فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە. موحەممەد - واتە: ئیبنو موهاجیر - وتی: لە عەقیل راوی فەرمودەکەم پرسی: فەزڵی وشتری سور بۆ؟ وتی: چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کۆمەڵێکی نارد بۆ غەزا یەکەم کەسێ کە هەواڵی سەرکەوتنی هێنایەوە بەسەر ئەسپێکی سوردوە بوو.

**٢٥٤٥ - (حسن) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يُمْنُ الْخَيْلِ فِي شُقْرِهَا).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (فەڕو بەرەکەت لە ئەسپی سوردایە).

## باسی ئایا دەگونجێ بە مێیەکەی بوترێ (فرس)

## ٤٥ - باب هَلْ تُسَمَّى الأُنْثَى مِنَ الْخَيْلِ فَرَسًا.

**٢٥٤٦ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُسَمِّي الأُنْثَى مِنَ الْخَيْلِ: فَرَسًا.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە مێیەکەشی دەفەرموو: (فرس)[1].

## باسی سیفاتی ئەو ئەسپەی کە حەزیان لێی نەبوو

## ٤٦ – باب مَا يُكْرَهُ مِنَ الْخَيْلِ.

**٢٥٤٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال:كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ. وَالشِّكَالُ: يَكُونُ الْفَرَسُ فِي رِجْلِهِ الْيُمْنَى بَيَاضٌ وَفِي يَدِهِ الْيُسْرَى بَيَاضٌ، أَوْ فِي يَدِهِ الْيُمْنَى وَفِي رِجْلِهِ الْيُسْرَى. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَيْ مُخَالِفٌ.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەزی لە ئەسپی (شِّكَال) نەبوو - (شِّكَال) ئەسپێکە کە قاچی راستی و دەستی چەپی سپی پێوە بێ، یان دەستی راستی و قاچی چەپی سپی پێوە بێ، ئەبو داود دەڵێت: واتە بە پێچەوانەوە.

---

[1] - (فرس): لە زمانی عەرەبیدا بە نێر و بە مێش دەوترێت.

## باسی ئەوەی کە فەرمانی پێکراوە دەربارەی چاودێریکردنی ئاژەڵان و هەڵسوکەوتی چاك نواندن بەرامبەریان و زیان پێ نەگەیاندنیان و ئازارنەدانیان.

## ٤٧ – باب مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْقِيَامِ عَلَى الدَّوَابِّ وَالْبَهَائِمِ.

**٢٥٤٨ - (صحيح) عن سهل بن الحنظلية قال: مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِبَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ، فَقَالَ: (اتَّقُوا اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ، فَارْكَبُوهَا، وَكُلُوهَا صَالِحَةً).**

واتە: لە سەهلی کوڕی (حَنْظَلِيَّة)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەلای وشترێکدا تێپەڕی سکی نوسابوو بە پشتیەوە ئەوەندە لاواز بوو، فەرمووی: (لەبارەی ئەم ئاژەڵە بێ زمانانەوە لە خوای گەورە بترسن و ستەمیان لێ مەکەن برسی و تینویان مەکەن، کاتێ سواریان بن کە بەهێز بن و بەکەڵکی سواری بێن، کاتێ گۆشتیان بخۆن کە قەڵەو بن و گۆشتەکەیان بە کەڵکی خواردن بێت).

**٢٥٤٩ - (صحيح) عن عبد الله بن جعفر قال: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَلْفَهُ ذَاتَ يَوْمٍ، فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، وَكَانَ أَحَبُّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِحَاجَتِهِ هَدَفًا أَوْ حَائِشَ نَخْلٍ. قَالَ: فَدَخَلَ حَائِطًا لِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَإِذَا جَمَلٌ، فَلَمَّا رَأَى**

النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَنَّ وَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَمَسَحَ ذِفْرَاهُ فَسَكَتَ، فَقَالَ: (مَنْ رَبُّ هَذَا الْجَمَلِ؟ لِمَنْ هَذَا الْجَمَلُ؟). فَجَاءَ فَتًى مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: (أَفَلاَ تَتَّقِي اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهِيمَةِ الَّتِي مَلَّكَكَ اللَّهُ إِيَّاهَا؟ فَإِنَّهُ شَكَى إِلَيَّ أَنَّكَ تُجِيعُهُ وَتُدْئِبُهُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی جەعفەرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەپشكۆی خۆیەوە سواری كردم، بە نهێنی فەرمودەیەكی بۆ باس كردم بۆ كەسی نەگێڕمەوە، باشترین شتێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەكاتی دەست بەئاو گەیاندندا خۆی لەپاڵدا حەشار بدایە بەرزایی و شورەی باخەخورما بوو، جارێ چووە ناو حەساری باخە خورمای پیاوێ لە ئەنصار، وشترێكی لێ بوو، كاتێ كە وشترەكە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دی گریاو فرمێسك بە چاویدا هاتەخوارەوە. پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆلای و دەستی هێنا بە بناگوێیدا ئیتر ئەهوەن بودەوەو بێ دەنگ بوو، فەرمووی: (خاوەنی ئەم وشترە كێیە، ئەم وشترە هی كێیە؟). لاوێ لە ئەنصار هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە هی منە. فەرمووی: (ئەوە بۆ لە خوای گەورە ناترسی لەبارەی ئەم ئاژەڵە بەستەزمانەوە كە تۆی كردوە بە خاوەنی؟ ئەوەتا لەلای من لەدەستت سكاڵا دەكات كە تۆ برسی دەكەیت و بەردەوام كاری پێ دەكەیت و هیلاك و ماندوی دەكەیت).

٢٥٥٠ - (صحيح) عن أبي هريرة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْرًا، فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ

يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِى كَانَ بَلَغَنِى، فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّيْهِ فَأَمْسَكَهُ بِفِيهِ حَتَّى رَقِا، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ). فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّ لَنَا فِى الْبَهَائِمِ لأَجْرًا، فَقَالَ: (فِى كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (جارێ پیاوێ بە ڕێگایەدا دەڕۆیشت، تینوێتی زۆری بۆ هێنا، بیرێکی دۆزیەوە، دابەزیە ناوی تێر ئاوی خواردەوە لەپاشدا هاتەدەرەوە، بینی سەگێك زمانی دەرهێناوە لەتینواندا خۆڵی شێدار دەخوات، پیاوەکە وتی: بەڕاستی ئەو سەگە لەتینواندا وەك منی لێ هاتوە، دابەزیە ناو بیرەکە، خوفەکانی پڕ کرد لەئاو گرتنی بەدەمیەوە هەتا سەرکەوتە سەرەوە، جا سەگەکە ئاوەکەی خواردەوە، خوای گەورەی لەسەر ئەو کارە چاکەی سوپاسی کردو، لێی خۆش بوو). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئایا لەسەر ئاژەڵان پاداشتمان بۆ هەیە ئەگەر خزمەتیان بکەین و چاك بین لەگەڵیان؟ فەرمووی: (لەسەر هەموو خاوەن روحێ کە تەڕایی ژیانی تێدا بێت پاداشتتان بۆ هەیە ئەگەر خزمەتیان بکەن و چاکە بکەن لەگەڵیان).

## باسی دەربارەی دابەزین لە مەنزڵگایە

## ٤٨ – باب فِي نُزُولِ الْمَنَازِلِ.

٢٥٥١ - (صحيح) عن أنس بن مالك، قال: كُنَّا إِذَا نَزَلْنَا مَنْزِلاً لاَ نُسَبِّحُ حَتَّى نَحُلَّ الرِّحَالَ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئێمە كاتێ كە لە مەنزڵگایە لاماندایە نوێژمان سوننەتمان نەدەكرد هەتا بارمان نەخستایەو ولاخەكانمان نەحەواندایەتەوە.

## باسی دەربارەی ملوانكەی ژێی كەوان كردنە ملی ئەسپ بەمەبەستی چاوەزار.

## ٤٩ – باب فِي تَقْلِيدِ الْخَيْلِ بِالأَوْتَارِ.

٢٥٥٢ – (صحيح) عن عباد بن تميم: أن أبا بشير الأنصاري أخبره:أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَسُولاً - قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ: وَالنَّاسُ فِي مَبِيتِهِمْ - : (لاَ يُبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ وَلاَ قِلاَدَةٌ إِلاَّ قُطِعَتْ). قَالَ مَالِكٌ: أَرَى أَنَّ ذَلِكَ مِنْ أَجْلِ الْعَيْنِ.

واتە: لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە دەگێڕنەوە، کە ئەبو بەشیری ئەنصاری پێی ڕاگەیاندوە کە لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فروستادەیەکی نارد بۆلایان کە پێیان ڕابگەیەنێ، - (عَبْدُ اللَّه)کوڕی ئەبو بەکر وتی: پێم وایە وتی: خەڵك شوێنی شەویان گرتبو - : (کە هەر وشترێ ملوانکەی ژێی کەوانی لەملدایە یان هەر ملوانکەیەکی تری لەملدایە ئەوە بیپچڕێنن یان لە ملی داکەنن)[1]. مالیك وتی: پێم وایە ئەوانەی کە بە مەبەستی چاوەزار بەکار هێنراون.

## باسی ڕاگیرکردنی ئەسپ و ڕێزگرتنی واتە تێرکردنی و ئازارنەدانی و دەستهێنان بە پشتی و بەشی دواوەی پشتیدا.

## ٥٠ - باب إِكْرَامِ الْخَيْلِ وَارْتِبَاطِهَا وَالْمَسْحِ عَلَى أَكْفَالِهَا.

**٢٥٥٣ - (حسن) عن أبي وهب الجشمي - وكانت له صحبة - قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (ارْتَبِطُوا الْخَيْلَ، وَامْسَحُوا**

[1] - ئیبنو نوحاس لە کتێبی (مشاريع الأشواق)دا دەڵێ: دەوترێت: بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگریکردووە لە ژێی کەوان: بۆئەوەی لەملی نەئاڵێتو بەهۆیەوە بخنکێت. وە دەوترێت: چونکە لە پێشدا ژێی کەوانیان بەمەبەستی بەرگریکردن لەچاو لەمل دەکردو بەچاوەزاریان دەزانی، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەم کارە ڕێگریکردن -.

بِنَوَاصِيهَا وَأَعْجَازِهَا - أَوْ قَالَ: أَكْفَالِهَا - وَقَلِّدُوهَا وَلاَ تُقَلِّدُوهَا الأَوْتَارَ).

واتە: لە ئەبو وەهەبی جومەحییەوە — کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) - دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (ئەسپ راگیربکەن، وە دەست بە نێوچاوانو سمتیدا بهێنن، وە رەشوەی بکەن، بەلاّم ژێی کەوانی پێوە مەکەن).

## باسی دەربارەی هەڵواسینی زەنگ واتە زەنگ کردنە ملی ئاژەڵان.

## ٥١ – باب فِي تَعْلِيقِ الأَجْرَاسِ.

٢٥٥٤ - (صحيح) عن أم حبيبة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا جَرَسٌ).

واتە: لە ئومو حەبیبەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مەلائیکە هاورێیەتی ئەو کاروانی و کۆمەلاّنە ناکەن کە زەنگیان پێ بێت.

٢٥٥٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تَصْحَبُ الْمَلاَئِكَةُ رُفْقَةً فِيهَا كَلْبٌ أَوْ جَرَسٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (مەلائیکە هاوڕێیەتی ئەو کاروانی و کۆمەڵانە ناکەن کە زەنگ یان سەگیان پێ بێت).

**٢٥٥٦ - (صحيح) عن أبي هريرة، أن النبي صلى الله عليه و سلم قال في الجرس: (مِزْمَارُ الشَّيْطَانِ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی زەنگ فەرموویەتی: (بالۆرەی شەیتانە).

## باسی سواربونی وڵاخێ کە پیسایی بخوات.

## ٥٢ - باب فِى رُكُوبِ الْجَلاَّلَةِ.

**٢٥٥٧ - (صحيح) عن ابن عمر قال: نُهِىَ عَنْ رُكُوبِ الْجَلاَّلَةِ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: رێگری کراوە لەسواربونی وڵاخێ کە پیسایی بخوات.

**٢٥٥٨ - (حسن صحيح) عن ابن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْجَلاَّلَةِ فِى الإِبِلِ أَنْ يُرْكَبَ عَلَيْهَا.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەهی کردوە لە وشترێ کە پیسایی بخوات هەروەها لەسواربونیشی.

## باسی دەربارەی کەسێ کە وڵاخەکەی ناوبنێ.

## ٥٣ – باب فِي الرَّجُلِ يُسَمِّي دَابَّتَهُ.

| |
|---|
| ٢٥٥٩ - (صحيح لكن ذكر الحمار شاذ) عن معاذ قال: كُنْتُ رِدْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ: عُفَيْرٌ. |

واتە: لە (مُعاذ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەپاشــکۆی پێغەمبــەری خــواوە (صـلى الله عليه وسلم) سواری گوێدرێژێ بووم ناوی (عُفَيْر) بوو.

## باسی سەبارەت بە بانگەوازی پێشەواو فەرمانڕەوا لەکاتی دەرچوونی گشتیدا بۆ غەزا: ئەی سوارچاکانی ڕێگەی خوا سەرکەون و بڕۆن!

## ٥٤ – باب فِي النِّدَاءِ عِنْدَ النَّفِيرِ: يَا خَيْلَ اللَّهِ ارْكَبِي!

| |
|---|
| ٢٥٦٠ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب، أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَمَّى خَيْلَنَا خَيْلَ اللَّهِ، إِذَا فَزِعْنَا، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْمُرُنَا إِذَا فَزِعْنَا بِالْجَمَاعَةِ وَالصَّبْرِ وَالسَّكِينَةِ، وَإِذَا قَاتَلْنَا. |

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، لەدوایدا: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی دەرچوونی گشتی بۆ غەزاو لەکاتی جەنگ و ترسدا ئەسپەکانمانی ناو نابوو (خیل الله)، وە فەرمانی پێ دەکردین بەوەی کە کۆبین و پەرت و بڵاونەبین وە خۆڕاگر و هێمن و ئارام بین.

## باسی قەدەغەکردنی نەفرینکردن لە ئاژەڵ.

## ٥٥ – باب النَّهْيِ عَنْ لَعْنِ الْبَهِيمَةِ.

٢٥٦١ -(صحيح) عن عمران بن حصين، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي سَفَرٍ فَسَمِعَ لَعْنَةً، فَقَالَ: (مَا هَذِهِ؟). قَالُوا" هَذِهِ فُلاَنَةُ لَعَنَتْ رَاحِلَتَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ضَعُوا عَنْهَا فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ). فَوَضَعُوا عَنْهَا. قَالَ عِمْرَانُ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهَا نَاقَةً وَرْقَاءَ.

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، لەسەفەرێکدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گوێی لە نەفرەتێ بوو، فەرمووی: (ئەوە چییە؟). وتیان: ئەوە فلانە ئافرەتە نەفرینی کرد لەوڵاخەکەی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (کورتان و کەل و پەلەکەی لێ بکەنەوەو بەرەڵای بکەن چونکە ئەوە نەفرینی لێ کراوە). جا ئەوانیش کورتان و کەل و پەلەکەیان لێ کردەوەو بەرەڵایان کرد - ئەمەش تۆڵەیە بوو بۆئەوەی خاوەنەکەی سودی لێ وەرنەگرێت -، عیمران وتی: ئێستاکەیش دەڵێی سەیری ئەو وشترە دەکەم کە وشترێکی رەشتاڵە بوو.

## باسی سەبارەت بە بەشەڕدانی ئاژەڵان.

## ٥٦ - باب فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَ الْبَهَائِمِ.

٢٥٦٢ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ التَّحْرِيشِ بَيْنَ الْبَهَائِمِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەیکردوە ئاژەڵان بدرێن بەشەڕ.

## باسی دەربارەی نیشانەکردنی سەروچاوی ئاژەڵان بە داخکردن.

## ٥٧ - باب فِي وَسْمِ الدَّوَابِّ.

٢٥٦٣ - (صحيح) عن أنس بن مالك، قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِأَخٍ لِي حِينَ وُلِدَ لِيُحَنِّكَهُ، فَإِذَا هُوَ فِي مِرْبَدٍ يَسِمُ غَنَمًا، أَحْسِبُهُ قَالَ: فِي آذَانِهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: برایەکم تازە لەدایك بوو بوو چووم بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆئەوەی دەمی شیرین بکات، لەوکاتەدا

ـە پەچەیەکدا بەداخکردن مەڕی نیشانەدەکرد، راوی دەڵێ: پێم وایە وتی: گوێکانی مەڕی نیشانەدەکرد بەداخکردن.

## باسی قەدەغەکردنی داخکردنی سەروچاوی ئاژەڵان و دان لەسەروچاویان.

## ٥٨ - باب النَّهْيِ عَنِ الْوَسْمِ فِي الْوَجْهِ وَالضَّرْبِ فِي الْوَجْهِ.

**٢٥٦٤ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُرَّ عَلَيْهِ بِحِمَارٍ قَدْ وُسِمَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: (أَمَا بَلَغَكُمْ أَنِّي قَدْ لَعَنْتُ مَنْ وَسَمَ الْبَهِيمَةَ فِي وَجْهِهَا، أَوْ ضَرَبَهَا فِي وَجْهِهَا). فَنَهَى عَنْ ذَلِكَ.**

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوێدرێژێ بەلایدا تێپەڕی نێوچاوانی داخ کرابوو، فەرمووی: (ئایا پێتان نەگەیشتوە کە من نەفرینم کردوە لەو کەسەی سەروچاوی ولاخ داخ دەکات یان لە سەروچاوی ولاخ دەدات).

## باسی دەربارەی قەدەغەكردنی گوێدرێژ نان لە ماین بە مەبەستی كەڵگرتن.

## ٥٩ – باب فِي كَرَاهِيَةِ الْحُمُرِ تُنْزَى عَلَى الْخَيْلِ.

٢٥٦٥ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: أُهْدِيَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَغْلَةٌ فَرَكِبَهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لَوْ حَمَلْنَا الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ فَكَانَتْ لَنَا مِثْلُ هَذِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ).

واتە: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أَبِـی طَالِـب)ەوە ڕەزای خـوای لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە وتویەتی: جارێ ئێسترێكیان بە دیاری هێنا بـۆ پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) ئەویش سواری بوو، عەلی وتی: ئەگـەر ئێمـەش كـەر بنـێین لـە مـاین شـتی وەهامـان دەستدەكەوێت واتە ئێستری دەبێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئـەم كارە كەسانێ ئەنجامی دەدەن كە ئەحكامی شەریعەت نازانن - چونكە ئەسپ لەپێشـتر و چاكتر و بەسود ترە بۆیان - ).

## باسی دەربارەی دەگونجێ سێ کەس سواری وڵاخێ بن بەمەرجێ توانای هەبێ و زیانی پێ نەگەیەنن.

## ٦٠ – باب فِي رُكُوبِ ثَلاَثَةٍ عَلَى دَابَّةٍ.

**٢٥٦٦ - (صحيح) عن عبد الله بن جعفر قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ اسْتُقْبِلَ بِنَا، فَأَيُّنَا اسْتُقْبِلَ أَوَّلاً جَعَلَهُ أَمَامَهُ، فَاسْتُقْبِلَ بِي فَحَمَلَنِي أَمَامَهُ، ثُمَّ اسْتُقْبِلَ بِحَسَنٍ - أَوْ حُسَيْنٍ - فَجَعَلَهُ خَلْفَهُ، فَدَخَلْنَا الْمَدِينَةَ وَإِنَّا لَكَذَلِكَ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی جەعفەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەفەر دەگەڕایەوە نزیکی مەدینە دبوەوە گەورەکان دەچوون بۆ پێشوازی، ئێمەش کە منداڵانی کەسوکاری بووین لەگەڵ خۆیان دەیانبردین بۆ پێشوازی، جا کامان لەپێشەوە ببراینایە ئەوەمانی دەخستە بەردەمی خۆی، جارێ من یەکەم کەس بووم خستمیە بەردەمی خۆی، لەپاشدا حەسەن – یان حوسەینیان هێنا بۆ پێشوازی - ئەویشی خستە پاشکۆی خۆی، ئیتر هەتا چووینە ناو شاری مەدینە بەوشێوەیە بووین.

## باسی دەربارەی راوەستان بەسەر ولاَخەوە.

## ٦١ – باب فِي الْوُقُوفِ عَلَى الدَّابَّةِ.

**٢٥٦٧ - (صحيح) عن أبو هريرة، عن النبِي صلى الله عليه وسلم قال: (إِيَّاكُمْ أَنْ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوَابِّكُمْ مَنَابِرَ، فَإِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُبَلِّغَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ، وَجَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ، فَعَلَيْهَا فَاقْضُوا حَاجَتَكُمْ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هۆشیاربن پشتی ولاَخەکانتان مەکەن بە مینبەر، چونکە خوای گەورە ئەو مالاَتانەی بۆ ئێوە رامهێناوە، هەندێ لەو مالاَتانە خۆتان و بارەکانتان هەلّدەگرن و دەیبەن بۆ شارو جێگایە کەئێوە پێی نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بەنارِەحەتی، وە زەوی بۆ راخستون، دەی لەسەر زەوی دانیشن و کاروبارەکانتان راپەرێنن و قسەی خۆتان بکەن نەك بەسەر پشتی ولاَخەکەوە).

# باسی دەربارەی ئەو وشتر و ولاخە باریانەی كە قەڵەو دەكرێن كاتێ كە پێویستیان پێی هەبوو سودیان لێ وەرناگرن.

# ٦٢ – باب فِي الْجَنَائِبِ.

٢٥٦٨ - (ضعيف) عن أبو هريرة قال: قال رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم: (تَكُونُ إِبِلٌ لِلشَّيَاطِينِ، وَبُيُوتٌ لِلشَّيَاطِينِ، فَأَمَّا إِبِـلُ الشَّيَاطِينِ فَقَدْ رَأَيْتُهَا، يَخْرُجُ أَحَـدُكُمْ بِجَنِيبَـاتٍ مَعَـهُ قَـدْ أَسْمَنَهَا، فَلاَ يَعْلُو بَعِيرًا مِنْهَا، وَيَمُرُّ بِأَخِيهِ قَدِ انْقَطَعَ بِهِ فَـلاَ يَحْمِلُهُ، وَأَمَّا بُيُوتُ الشَّيَاطِينِ فَلَمْ أَرَهَا). كَانَ سَعِيدٌ يَقُـولُ: لاَ أُرَاهَا إِلاَّ هَذِهِ الأَقْفَاصَ الَّتِى يَسْتُرُ النَّاسُ بِالدِّيبَاجِ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (وشتری وا هەیە هی شەیتانە، شوێن و ماڵی وایش هەیە هەر هی شەیتانە، جا ئەوەی كە وشتری شەیتانە بەچاوی خـۆم دیومـە، ئـەو وشـتر و ولاخـە باریانەیـە كـە قەڵەویان دەكەن بۆ فیز و دەعیە نـە خۆیـان سـواریان دەبـن نـە برایـەكی پەككەوتـەیان سواردەكەن لەكاتی پێویستدا، بەڵام شوێن و ماڵی شەیتانم هەتا ئێستا نەدیوە). سـەعید وتی: وا بزانم جگە لەم كەژاوانە كە پەردەی ئاوریشم و دیباجیان بۆ دەكەن هیچ شتێكی تر نیە كە بە تایبەتی ئافرەتان دەچنە ناوی لەگەڵ پیاوە گەورەكان.

## باسی سەبارەت بە پەلە رۆشتن لەسەفەرداو، قەدەغەکردنی لەشەودا لەسەر چەقی رێگادا لادان بۆ حەوانەوە.

## ٦٣ – باب فِي سُرْعَةِ السَّيْرِ وَالنَّهْيِ عَنِ التَّعْرِيسِ فِي الطَّرِيقِ.

٢٥٦٩ - (صحيح) عن أبي هريرة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:: (إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَقَّهَا، وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْجَدْبِ فَأَسْرِعُوا السَّيْرَ، فَإِذَا أَرَدْتُمُ التَّعْرِيسَ فَتَنَكَّبُوا عَنِ الطَّرِيقِ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر لەکاتی لەوەڕدا سەفەرتان کرد مافی وشتر بدەن واتە ماوەی بدەن با بۆ خۆی بلەوەڕێ، خۆ ئەگەر لەوەڕ نەبوو زوو لێخۆڕن هەتا دەگەنە شوێنێ رێتان دەکەوێ لە لەوەڕ، یان دەگەنە مەنزڵ و لەوێ ئالفیان دەدەنێ و دەیانحەوێننەوە، خۆ ئەگەر شەویش داهات ویستان لادەن بۆ حەوانەوە لەچەقی رێگادا لامەدەن بەڵکو دورکەونەوە لەچەقی رێگا، چونکە بەشەو رێگە دەبێ بەجێگەی مار و مێرو جرو‌جانەوەر.

**٢٥٧٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله، عن النبي صلى الله عليه وسلم، نحو هذا، قال بعد قوله: (حَقَّهَا) :(وَلاَ تَعْدُوا الْمَنَازِلَ).**

واته: له جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّه)وه فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوه هاتوه، بەڵام لەدوای (مافی وشتر بدەن) فەرموویەتی: (لەو قۆناغە ڕێیەكەوه پەلە مەكەن بۆ قۆناغە ڕێیەكی تر - بۆ نمونه بەینی مەككەو مەدینە هەشت قۆناغە مەیكەن بە حەوت قۆناغ بۆ ئەوەی خۆشتان و وڵاخەكانتان هیلاك و ماندو نەبن -).

## باسی سەبارەت بە سەفەركردن لەشەودا.

## ٦٤ - باب فِي الدُّلْجَةِ.

**٢٥٧١ - (صحيح) عن أنس قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم:(عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ فَإِنَّ الأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ).**

واته: له ئەنەسەوه دەگێرنەوه، كه وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بۆ سەفەركردن شەوی بمێنێ بكەونە ڕێ، چونكە شەو فێنكەو ڕێكردن بەشەو ئاسانەو ماوەی زۆرتر دەبڕێت).

# باسی خاوەن وڵاخ لەپێشترە کە لەپێشەوە سواری وڵاخەکەی ببێ هەتا کەسێکی تر.

## ٦٥ - باب رَبُّ الدَّابَّةِ أَحَقُّ بِصَدْرِهَا.

٢٥٧٢ - (صحيح) عن أبي بريدة قال: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي جَاءَ رَجُلٌ وَمَعَهُ حِمَارٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ارْكَبْ - وَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ أَنْتَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِكَ مِنِّى، إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ لِي). قَالَ: فَإِنِّى قَدْ جَعَلْتُهُ لَكَ، فَرَكِبَ.

واتە: لە ئەبو بورەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەپێ دەڕۆیشت پیاوێ هات گوێدرێژێکی پێ بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سواربە - خۆی چووە دواوە بۆ ئەوەی لەپاشکۆی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) سواربێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (نابێ تۆ لەپێشتری کە لەپێشەوە سوار بیت هەتا من، مەگەر خۆت بیبەخشی بە من). ئەویش وتی: ئەوا بەخشیم بەتۆ، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەپێشەوە سوار بوو.

## باسی دەربارەی وڵاخ کە دەمارە گەورەی پاژنە پێی ببڕێت لە جەنگدا.

## ٦٦ - باب فِي الدَّابَّةِ تُعَرْقَبُ فِي الْحَرْبِ.

**٢٥٧٣** - (حسن) عن ابن عباد، عن أبيه عباد بن عبد الله بن الزبير، - ﴿قال أبو داود هو يحيى بن عباد﴾ - حدثني أبي الذي أرضعني - وهو أحد بني مرة بن عوف وكان في تلك الغزاة غزاة مؤتة قال: وَاللَّهِ لَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى جَعْفَرٍ حِينَ اقْتَحَمَ عَنْ فَرَسٍ لَهُ شَقْرَاءَ، فَعَقَرَهَا، ثُمَّ قَاتَلَ الْقَوْمَ حَتَّى قُتِلَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا الْحَدِيثُ لَيْسَ بِالْقَوِيِّ.

واتە: لە ئیبنو عەبادەوە، لە باوکیەوە عەببادی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی زوبێرەوە هاتوە، ﴿ئەبو داود دەڵێت: یەحیای کوڕی عەباد﴾ — باوکم بۆی گێڕامەوە — ئەوەی کە ژنەکەی بە شیری خۆی بەخێوی کردوم واتە باوکی شیری - ، کە یەکێکە لە هۆزی موڕڕەی کوڕی عەوف، ئەم روداوەش لە غەزای موئتەدا بوو- ، وتی: سوێند بە (الله) ئێستاکەیش دەڵێی سەیری جەعفەر — ی کوڕی (أَبِی طَالِب) - دەکەم کە چۆن لەسەر ئەسپە سورەکەی خۆی هەڵدایە خوارەوە لەکاتێکدا کە بە شمشێر دەمارە گەورەی پاژنە پێی ئەسپەکەیان بڕی بۆئەوەی کەڵکی جەنگی پێوە نەمێنێ، لەپاشدا جەعفەر دەستی کرد بە کوشتاری گەلی رۆم هەتا کوژرا. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموده بەهێز نیە.

# باسی سەبارەت بە پێشبڕكێ.

# ٦٧ - باب فِي السَّبْقِ.

**٢٥٧٤ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ سَبْقَ إِلاَّ فِي خُفٍّ أَوْ فِي حَافِرٍ أَوْ نَصْلٍ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پێشبڕكێ تەنها لەمانەدا هەیە: ئەوەی خوڤی هەیە - مەبەستی وشترە - . یان ئەوەی سمی هەیە وەك ئەسپ و ئەوانەی وەك ئەون، یا رم و تیر و شمشێر و هاوشێوەیان).

**٢٥٧٥ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي قَدْ ضُمِّرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِي زُرَيْقٍ، وَإِنَّ عَبْدَ اللَّهِ كَانَ مِمَّنْ سَابَقَ بِهَا.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێشبڕكێی كردوە لەنێوان ئەو ئەسپانەی كە دابەستەبوون لە (حَفْيَاء)وە هەتا (ثَنِيَّة الْوَدَاع). هەروەها پێشبڕكێی كردوە لەنێوان ئەو ئەسپانەی كە دابەستە نەبوون لە (الثَّنِيَّة)وە بۆ مزگەوتی زورەیق. بێگومان (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عومەر

یەکێك بووە لەوانەی کە پێشبڕکێکەی پێ کرد. (حَفْيَاء) شوێنێکە لەنزیك مەدینە، (ثَنِيَّة الْوَدَاع)یش هەر لە مەدینەیە.

**٢٥٧٦ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُضَمِّرُ الْخَيْلَ يُسَابِقُ بِهَا.**

واتە: لە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەسپی دابەستوەو پێشبڕکێی پێ کردوە.

**٢٥٧٧ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبَّقَ بَيْنَ الْخَيْلِ، وَفَضَّلَ الْقُرَّحَ فِي الْغَايَةِ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێشبڕکێی بە وڵاخی بەرزە سازدا، لەنێوان ئەسپدا، ئەو ئەسپانەی کە پێیان نابێتە تەمەنی پێنج ساڵیەوە ماوەی نێوان پێشبڕکێکەی دورتر بۆ دانان.

## باسی دەربارەی پێشبڕکێ بەپێ.

## ٦٨ - باب فِي السَّبْقِ عَلَى الرِّجْلِ.

**٢٥٧٨ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أنها كانت مع النبي صلى الله عليه و سلم في سفر قالت: فَسَابَقْتُهُ فَسَبَقْتُهُ عَلَى رِجْلَيَّ، فَلَمَّا حَمَلْتُ اللَّحْمَ سَابَقْتُهُ فَسَبَقَنِي، فَقَالَ: (هَذِهِ بِتِلْكَ السَّبْقَةِ).**

واتە: لە عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووە، وتی: بەپێ نەك بەسواری پێشبڕکێم لەگەڵدا کرد من پێشی کەوتم، بەڵام دوای ماوەیەك کە گۆشتم گرت پێشبڕکێم لەگەڵدا کردەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشم کەوت فەرمووی: (ئەم پێشکەوتنە لەجیاتی پێشکەوتنەکەی پێشو).

## باسی دەربارەی ئەگەر سواری سێیەم هاوبەشی پێشبڕکێی نێوانی دوو سواری تری کرد.

## ٦٩ - باب فِي الْمُحَلِّلِ.

**٢٥٧٩ - (ضعيف) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَدْخَلَ فَرَسًا بَيْنَ فَرَسَيْنِ). يَعْنِي وَهُوَ لاَ يُؤْمَنُ أَنْ يُسْبَقَ (فَلَيْسَ بِقِمَارٍ، وَمَنْ أَدْخَلَ فَرَسًا بَيْنَ فَرَسَيْنِ وَقَدْ أَمِنَ أَنْ يُسْبَقَ فَهُوَ قِمَارٌ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر سواری سێیەم هاوبەشی پێشبڕکێی نێوانی دوو سواری تری کرد). واتە: ئەگەر دڵنیا نەبوو لەوەی کە کەس پێشی نەکەوێ ئەوە دروستەو (قومار نیە، بەڵام ئەگەر سواری سێیەم دڵنیا بوو لەوەی کە کەس لەو پێشبڕکێیەدا پێشی ناکەوێ ئەوە دروست نیە چونکە قومارە).

٢٥٨٠ - (ضعيف) عن الزهري، بِإِسْنَادِ عَبَّادٍ وَمَعْنَاهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رَوَاهُ مَعْمَرٌ وَشُعَيْبٌ وَعَقِيلٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ رِجَالٍ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَهَذَا أَصَحُّ عِنْدَنَا.

واتە: لە زوهریەوە فەرمودەی پێشو بەهەمان سەنەدو مانای فەرمودەکەی عەبباد هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: مەعمەر و شوعەیب و عەقیل لە زوهریەوە، لە هەندێ لە پیاوانی خاوەن زانست و زانیاریەوە گێڕاویانەتەوە — بەرزیان نەکردۆتەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) - ، ئەمەش لەلای ئێمە راسترینە.

## باسی دەربارەی (جلب) لە پێشبڕکێدا.

## ٧٠ - باب فِي الْجَلَبِ عَلَى الْخَيْلِ فِي السِّبَاقِ.

٢٥٨١ - (صحيح) عن عمران بن حصين، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ جَلَبَ وَلاَ جَنَبَ). زَادَ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ: (فِي الرِّهَانِ).

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نە(جلب) و نە(جنب) هیچیان دروست نین) یەحیا لەفەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (لەگرەوی پێشبڕکێدا).

- (جلب) ئەوەیە کەسێك دوای ئەسپەکەی بخات بۆ ئەوەی هانی بدات و پێش بکەوێت، (جنب)یش ئەوەیە کە ئەسپێکی تری بێت سوار لەگەڵ خۆیدا بەرێت کاتێ کە ئەسپەکەی ماندو بوو سواری ئەوەی تریان ببێت - .

٢٥٨٢ - (صحيح مقطوع) عن قتادة، قال: الْجَلَبُ وَالْجَنَبُ فِي الرِّهَانِ.

واتە: قەتادە دەڵێت: (جلب) و (جنب) لەگرەوی پێشبڕكێدا قەدەغەكراوەو دروست نیە.

## باسی دەربارەی رازاندنەوەی شمشێر.

## ٧١ - باب فِي السَّيْفِ يُحَلَّى.

٢٥٨٣ - (صحيح) عن أنس، قال:كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِضَّةً.

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: مشتی شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زیوی تێ گیرابوو.

٢٥٨٤ - (صحيح بما قبله) عن سعيد بن أبي الحسن، قال: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِضَّةً. قَالَ قَتَادَةُ: وَمَا عَلِمْتُ أَحَدًا تَابَعَهُ عَلَى ذَلِكَ.

واتە: لە سەعیدی كوڕی ئەبو حەسەنەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: مشتی شمشێرەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زیوی تێ گیرابوو. قەتادە دەڵێت: پێ نازانم لەمەدا كەس شوێنی سەعیدی كوڕی ئەبو حەسەن كەوتبێ.

٢٥٨٥ - (صحيح بما قبله) عن أنس بن مالك قال:كَانَ، فَذَكَرَ مِثْلَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَقْوَى هَذِهِ الأَحَادِيثِ حَدِيثُ سَعِيدِ بْنِ أَبِى الْحَسَنِ وَالْبَاقِيَةُ ضِعَافٌ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە. ئەبو داود دەڵێت: بەهێزترینی ئەم فەرمودانە فەرمودەکەی سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەنە ئەوانی تر هەر هەموویان لاوازن.

## باسی سەبارەت بە تیر بردنە ناو مزگەوتەوە.

## ٧٢ - باب فِى النَّبْلِ يُدْخَلُ بِهِ الْمَسْجِدُ.

٢٥٨٦ - (صحيح) عن جابر، عن رسول الله صلى الله عليه و سلم: أَنَّهُ أَمَرَ رَجُلاً كَانَ يَتَصَدَّقُ بِالنَّبْلِ فِى الْمَسْجِدِ أَنْ لاَ يَمُرَّ بِهَا إِلاَّ وَهُوَ آخِذٌ بِنُصُولِهَا.

واتە: جابر دەڵێت: جارێ پیاوێ لەناو مزگەوتدا دەمە تیری دەبەخشیەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کرد دەست بگرێت بە نوکەکانیەوە.

٢٥٨٧ - (صحيح) عن أبو موسى، عن النبى صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا مَرَّ أَحَدُكُمْ فِى مَسْجِدِنَا، أَوْ فِى سُوقِنَا، وَمَعَهُ نَبْلٌ،

فَلْيُمْسِكْ عَلَى نِصَالِهَا). أَوْ قَالَ: (فَلْيَقْبِضْ كَفَّهُ). أَوْ قَالَ: (فَلْيَقْبِضْ بِكَفِّهِ أَنْ يُصِيبَ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ).

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە بەناو مزگەوتەکەماندا یان بەناو بازاڕەکەماندا تێپەڕی تیری پێ بوو – یان رم و نێزەی پێ بوو – ، با دەست بگرێت بە نوکەکانیانەوە). یان فەرمووی: (بە سەری تیرەکە بە مشتی بگرێ). یا فەرمووی: (با سەری تیرەکە بە مشتی بگرێ، نەوەک زیان بگەیەنێت بە موسوڵمانان).

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی شمشێر بە رووتی

## ٧٣ – باب فِي النَّهْيِ أَنْ يُتَعَاطَى السَّيْفُ مَسْلُولاً.

٢٥٨٨ - (صحيح) عن جابر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُتَعَاطَى السَّيْفُ مَسْلُولاً.

واتە: جابر دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەیکردوە شمشێر بەرووتی بگیرێ بەدەستەوە یان رووت بێ، دەبێ لەکالاندا هەڵگیرێ .

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی بڕینی پارچە پێستە لەنێوان دوو پەنجەدا.

## ٧٤ - باب فِي النَّهْيِ أَنْ يُقَدَّ السَّيْرُ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ.

**٢٥٨٩ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُقَدَّ السَّيْرُ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ.**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قەدەغەیکردو پارچە پێستە لەنێوان دوو پەنجەدا ببڕرێت یان لەتکرێ و بکرێت بەدوو بەشەوە - بۆ ئەوەی پەنجەکانی دەستی نەبڕرێن - .

## باسی دەربارەی پۆشینی زرێ.

## ٧٥ - باب فِي لِبْسِ الدُّرُوعِ.

**٢٥٩٠ - (صحيح) عن السائب بن يزيد عن رجل قد سماه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ظَاهَرَ يَوْمَ أُحُدٍ بَيْنَ دِرْعَيْنِ، أَوْ لَبِسَ دِرْعَيْنِ.**

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە، لە پیاوێکەوە کە ناوی برد، دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا دوو زرێی پێکەوە کۆکردبوەوەو یەکێکیانی کردبوو بەسەر ئەوی تریاندا بۆ یارمەتیدانی یەکتر، یان دوو زرێی پۆشی بوو.

## باسی سەبارەت بە ئاڵاو بەیداخ لەکاتی غەزادا

## ٧٦ - باب فِي الرَّايَاتِ وَالأَلْوِيَةِ.

٢٥٩١ - (صحيح دون قوله (مُرَبَّعَةً) ) عن يونس بن عبيد مولى محمد بن القاسم قال: بَعَثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ الْقَاسِمِ، إِلَى الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ يَسْأَلُهُ عَنْ رَايَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كَانَتْ؟ فَقَالَ: كَانَتْ سَوْدَاءَ مُرَبَّعَةً مِنْ نَمِرَةٍ.

واتە: لە یونوسی کوڕی عوبەید بەندەی رزگارکراوی موحەممەدی کوڕی قاسمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: موحەممەدی کوڕی قاسم ناردمی بۆلای بەڕائی کوڕی عازیب هەتا دەربارەی ئاڵاکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پرسیاری لێ بکەم کە چۆن بووە؟ ئەویش وتی: ئاڵاکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پارچە شاڵێکی چوارگۆشەبوو هێڵی رەش و سپی تێدا بوو.

٢٥٩٢ - (صحيح)عن جابر: يَرْفَعُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ لِوَاؤُهُ يَوْمَ دَخَلَ مَكَّةَ أَبْيَضَ.

واتە: لە جابرەوە هاتوە، فەرموودەکەی بەرزکردەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لەساڵی رزگارکردنی شاری مەککەدا کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چووە ناو شاری مەککەوە رەنگی بەیداخەکەی سپی بوو.

**٢٥٩٣ - (ضعيف) عن سماك، عن رجل من قومه، عن آخر منهم قال: رَأَيْتُ رَايَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَفْرَاءَ.**

واتە: لە سیماکەوە، لە پیاوێکی هۆزەکەیەوە، لەیەکێکی تر لە هۆزەکەیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بەیداخەکەی پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بینی رەنگی زەرد بوو.

## باسی سەبارەت بە داواکردنی سەرکەوتن لەخوای گەورە بە ئەسپی بێ هێز و کەسە هەژار و لاوازەکان.

## ٧٧ - باب فِي الانْتِصَارِ بِرَذْلِ الْخَيْلِ وَالضَّعَفَةِ.

**٢٥٩٤ - (صحيح) عَن أبو الدرداء قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (ابْغُونِي الضُّعَفَاءَ، فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ).**

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو فەرمووی: (هەوڵم بۆ بدەن لەناو هەژار و لاوازەکان، چونکە خوای گەورە بەهۆی پەرستش و تەقواو پاڕانەوەی ئەوانەوە رۆزیتان پێ دەبەخشێ و سەرتان دەخات بەسەر دوژمندا).

# باسی دەربارەی کەسێ لەکاتی جەنگدا بەدروشم و ناوی نهێنی بانگ بکات.

## ٧٨ - باب فِي الرَّجُلِ يُنَادِي بِالشِّعَارِ.

**٢٥٩٥ - (ضعيف) عن سمورة بن الجندوب قال: كَان شِعار الأنصَار: عبد الله، وشِعار المُهاجِرين: عبد الرحمن.**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دروشمی یاریدەدەران لەکاتی جەنگدا: (عبد الله) بوو، دروشمی موهاجرینیش: (عبد الرحمن) بوو.

**٢٥٩٦ - (ضعيف) عن إياس بن سلمة، عن أبيه قال: غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ زَمَنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكَانَ شِعَارُنَا: أَمِتْ أَمِتْ.**

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەبو بەکردا غەزامان کرد دروشم و ناوی نهێنیمان بریتی بوو لە: بیمرێنە بیمرێنە.

**٢٥٩٧ - (صحيح) عن المهلب بن أبي صفرة قال: أخبرني من سمع النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (إِنْ بُيِّتُّمْ فَلْيَكُنْ شِعَارُكُمْ: حم لاَ يُنْصَرُونَ).**

واتە: لە موهەللەبی کوڕی ئەبو صوفرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کەسێ کە لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بیستبو بۆی گێڕامەوە وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه

وسلم) فەرمووی: (ئەگەر دوژمن بەشەو دای بەسەرتاندا با دروشم و نهێنی شەوتان (حم لاَ يُنْصَرُون) بێت.

## باسی پیاو کاتێ کەویستی سەفەر بکات چی بڵێت

## ٧٩ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا سَافَرَ.

٢٥٩٨ - (حسن صحيح) عن أبو هريرة قال:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَافَرَ قَالَ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِى السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِى الأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِى الأَهْلِ وَالْمَالِ، اللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەفەری دەکرد دەیفەرموو: (خوایە تۆ ئاگات لێمانە لەم سەفەرەماندا تۆ پارێزەری کەسوکار و ماڵ و منداڵیشمانی، خوایە پەنادەگرین بە تۆ لە نارەحەتی و ناسۆری سەفەر و غەمباری دیمەن و رواڵەت و شتێك کە غەمبارم بکات و خراپ گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و خێزان بەوەی کە شتێکیان لێ ببینم غەمبارم بکات، خوایە رێگەمان بۆ نزیك بکەیتەوەو ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکەیت)

٢٥٩٩ - (صحيح دون قوله: (فوُضِعَت...) ) عن أبـو الـزبير، أن عليـا الأزدي أخبره أن ابن عمر علمه: أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّـرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: (سُبْحَانَ الَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـذَا وَمَـا كُنَّـا لَـهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُـونَ، اللَّهُـمَّ إِنِّـى أَسْـأَلُكَ فِـى سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَـلِ مَـا تَرْضَـى، اللَّهُـمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا، اللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الْبُعْـدَ، اللَّهُـمَّ أَنْـتَ الصَّاحِبُ فِى السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِى الأَهْلِ وَالْمَالِ). وَإِذَا رَجَـعَ قَالَهُنَّ، وَزَادَ فِيهِنَّ: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ). وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجُيُوشُهُ إِذَا عَلَوُا الثَّنَايَا كَبَّرُوا، وَإِذَا هَبَطُوا سَبَّحُوا، فَوُضِعَتِ الصَّلاَةُ عَلَى ذَلِكَ.

واتە: لە ئەبو زوبەیرەوە دەگێڕنەوە، عەلی ئەزدیی بۆی گێڕاوەتەوە، کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ فێری ئەمەی دەکرد: بێگومان پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێ کە دەردەچو بۆ سەفەر، کە لەسەر پشتی وشترەکەی ڕێك دادەنیشت، سێ جـار (الله أكبر)ی دەکرد، لەپاشدا دەیفەرموو: (پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمـەی بـۆ ڕام هێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو. وە بەڕاسـتی ئێمـە بـۆ لای پـەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، خودایە ئێمە لەم سـەفەرەماندا داوای کـردەوەی چـاك و ڕەفتـاری جـوان و تەقوات لێ دەکەین، داوای کارێکت لێ دەکەین کە پێی ڕازی بیت، خوایە ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکـەیت و دوریەکـەیان بـۆ نزیـك بکەیتـەوە، خوایـە تـۆ ئاگـات لێمانـە لـەم سەفەرەماندا تۆ پارێزەری کەسوکار و ماڵ و منداڵیشمانی). کاتێ کـە دەگەڕایـەوە هـەر ئەمانەی دەخوێند، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (گەڕاینەوە لەبێ ئاگایی، بە تەوبـەکردن و

پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەکەین). بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆی و سوپاکەی کاتێ کە سەردەکەوتن (الله أكبر)یان دەکرد، کاتێ کە سەربەرەو خوار دەبونەوە (سبحان الله)یان دەکرد، نوێژیش بەو شێوەیە دانراوە لەچونە رکوع و چونە سەجدەدا (سبحان الله) دەکرێت، لەکاتی بەرزبونەوەشدا(الله أكبر) دەکرێت.

## باسی سەبارەت بە پاڕانەوەی بەڕێ کردنی کەسێك کە بچێت بۆ سەفەر.

## ٨٠ - باب فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ الْوَدَاعِ.

**٢٦٠٠ - (صحيح) عن قزعة قال: قال لي ابن عمر: هَلُمَّ أُوَدِّعْكَ كَمَا وَدَّعَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ).**

واتە: قەزەعە دەڵێت: ئیبنو عومەر پێی وتم: وەرە با بەڕێت بکەم وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) منی بەڕێ کرد: (دین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەکانت دەسپێرم بە خوای گەورە).

**٢٦٠١ - (صحيح) عن عبد الله الخطمي قال: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْتَوْدِعَ الْجَيْشَ قَالَ: (أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكُمْ وَأَمَانَتَكُمْ وَخَوَاتِيمَ أَعْمَالِكُمْ).**

واتە: (عَبْدُ اللَّه الْخَطْمِيّ ) دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم دەیویست لەشکر بەرێ بکات دەیفـەرموو: (دیـن و ئەمانـەت و کۆتـایی کردەوەکانتـان دەسپێرم بە خوای گەورە).

## باسی کەسێ لەکاتی سواربونی وڵاخەکەیدا چی بڵێ

## ٨١ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا ركِبَ.

٢٦٠٢ - (صحيح) عن علي بن ربيعة قال: شَـهِدْتُ عَلِيًّـا وَأُتِـيَ بِدَابَّـةٍ لِيَرْكَبَهَا، فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الرِّكَابِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، فَلَمَّـا اسْتَوَى عَلَى ظَهْرِهَا قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، ثُمَّ قَالَ: (سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ). ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ، ثَـلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الـذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْـتَ، ثُـمَّ ضَـحِكَ، فَقِيـلَ: يَـا أَمِـيرَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَلَ كَمَا فَعَلْتُ، ثُمَّ ضَحِكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ؟ قَالَ: (إِنَّ رَبَّكَ يَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قَالَ: اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرِي).

واتە: لە عەلی کوڕی ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِی طَالِب)م ڕەزای خوای لێ بێ دی کاتێ کە ولآخەکەیان بۆ هێنا، لەکاتی سواربوندا کە قاچی نایە ناو ئاوزەنگیەوە سێ جار وتی: (بِسْمِ اللَّـهِ) واتە: بەناوی خوای گەورەوە سوار دەبم، کاتێ کە لەسەر پشتی ڕێك دانیشت سێ جار وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ) واتە: سوپاس بۆ خوای گەورە، لەپاشدا وتی: (پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو. وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە). لەپاشدا سێ جار وتی: (الْحَمْدُ لِلَّهِ)، ئینجا سێ جار وتی: (الله أكبر)، لەپاشدا وتی: (خوایە پاك و بێگەردی بۆ تۆ من زوڵم و ستەمم لەنەفسی خۆم کردوە تۆ لێم خۆشبە، چونکە تۆ نەبێ کەس لەتاوان خۆش نابێت، ئینجا پێکەنی، پێی وترا: ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران ئەوە لەبەرچی پێدەکەنی؟ وتی: جارێ پێغەمبەری خودام (صلى الله عليه وسلم) دی بەم شێوەیەی کرد کە من کردم، لەپاشدا پێکەنی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە لەبەرچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: (پەروەردگاری تۆ زۆر خۆشی دێ لەوە کە بەندەی خۆی کاتێ کە دەڵێ: پەروەردگار لێم خۆشبە، دەزانێ کە کەس لەتاوان خۆش نابێ جگە لەخۆم).

## باسی کەسێ کاتێ کە لەمەنزڵگایەکدا دابەزی چی بڵێ

## ٨٢ - باب مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا نَزَلَ الْمَنْزِلَ.

**٢٦٠٣ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا سَافَرَ فَأَقْبَلَ اللَّيْلُ قَالَ: (يَا أَرْضُ، رَبِّي وَرَبُّكِ**

اللَّهُ، أعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّكِ، وَشَرِّ مَا فِيكِ، وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ، وَمِنْ شَرِّ مَا يَدِبُّ عَلَيْكِ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ، وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ، وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ، وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێ کە دەچوو بۆ سەفەر دەیفەرموو: ئەی زەوی، پەروەردگاری من و تۆ (الله)یە، پەنادەگرم بەخوای گەورە لە خراپەو زیانی تۆ، لە خراپەو زیانی ئەوەی لەناو تۆدایە لە زیانبەخشەکان، لە خراپەی ئەوەی لەناو تۆدا دروستکراوە لە زیانبەخشەکان، لە خراپەی ئەوەی لەسەر پشتی تۆ دەخشێ و دەڕوا، پەنادەگرم بەخوای گەورە لە زیانی شێر و مارو دوپشك، وە لەشەیاتینی مرۆڤ و جنۆکەی ولات، وە لە شەیتان و نەوەی شەیتان.

## باسی دەربارەی ڕۆشتن بۆ سەفەر لەسەرەتای شەوەوە

## ٨٣ - باب فِي كَرَاهِيَةِ السَّيْرِ فِي أَوَّلِ اللَّيْلِ.

٢٦٠٤ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ تُرْسِلُوا فَوَاشِيَكُمْ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذْهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ، فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَعِيثُ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ حَتَّى تَذْهَبَ فَحْمَةُ الْعِشَاءِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (کاتیێ کە خۆر ئاوا بوو ئاژەڵەکانتان دەرمەکەن هەتا تاریکایی سەردتای شەو دەڕوات، چونکە شەیتانەکان کاتیێ کە خۆر ئاوا بوو هەتا تاریکایی سەردتای شەو دەڕوات زیان دەگەیەنن).

## باسی دەربارەی لە چی ڕۆژێکدا سەفەرکردن باش و رەوایە.

## ٨٤ - باب فِي أَيِّ يَوْمٍ يُسْتَحَبُّ السَّفَرُ.

**٢٦٠٥ - (صحيح) عن كعب بن مالك قال: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْرُجُ فِي سَفَرٍ إِلاَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ.**

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکەم ڕۆژدا دەردەچو بۆ سەفەر جگە لەڕۆژانی پێنج شەمان.

## باسی سەبارەت بە سەر لەبەیانی دەرچون بۆ سەفەر

## ٨٥ - باب فِي الابْتِكَارِ فِي السَّفَرِ.

**٢٦٠٦ - (صحيح) عن صخر الغامدي، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا). وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ. وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلاً تَاجِرًا، وَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ.**

واته: لە صەخری کوڕی غامیدیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (واتە: خودایە! فەڕو بەرەکەت بخەرە ئیش و کاری ئوممەتم سەر لەبەیانی). پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێ سوپایە یان لەشکرێکی بناردایە سەر لەبەیانی رەوانەی دەکرد، صەخر خۆی پیاوێکی بازرگان بوو، سەر لەبەیانی بازرگانیەکەی دەخستەڕێ لەبەرئەوە دەوڵەمەند بوو سامان و دارایی زۆر بوو بوو.

## باسی دەربارەی کەسێ بە تەنیا سەفەر بکات.

## ٨٦ – باب فِي الرَّجُلِ يُسَافِرُ وَحْدَهُ.

٢٦٠٧ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم:(الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ، وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ، وَالثَّلاَثَةُ رَكْبٌ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سوارێ شەیتانێکە، دوو سوار دوو شەیتانن، کە بوون بەسیان ئەو کاتە دەبن بەکۆمەڵ - ئەوە باشە، واتە بە تەنیا یان دوان پێکەوە سەفەر بکەن باش نیە ئەگەر زیاتربن چاکترە - ).

## باسی دەربارەی کۆمەڵێ سەفەر بکەن یەکێ بکەنە ئەمیر و براگەورەی خۆیان و بەگوێی بکەن.

## ٨٧ – باب فِي الْقَوْمِ يُسَافِرُونَ يُؤَمِّرُونَ أَحَدَهُمْ.

٢٦٠٨ - (حسن صحيح) عن أبي سعيد الخدري، أن قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا خَرَجَ ثَلاَثَةٌ فِى سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ).

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

فەرموویەتی: (کاتێ سێ کەس پێکەوە دەرچون بۆ سەفەر با یەکێکیان بکەنە ئەمیر براگەورەی خۆیان و بەگوێی بکەن).

٢٦٠٩ - (حسن صحيح) عن أبي هريرة، أن قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا كَانَ ثَلاَثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ). قَالَ نَافِعٌ: فَقُلْنَا لأَبِي سَلَمَةَ: فَأَنْتَ أَمِيرُنَا.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (ئەگەر سێ کەس پێکەوە ڕۆشتن بۆ سەفەر با یەکێکیان بکەنە ئەمیر و براگەورەی خۆیان و بەگوێی بکەن). نافیع وتی: بە ئەبو سەلەمەمان وت: تۆ ئەمیر و براگەورەمان بە.

## باسی سەبارەت بە بردنی قورئان بۆ خاکی دوژمن

## ٨٨ - باب فِي الْمُصْحَفِ يُسَافَرُ بِهِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ.

٢٦١٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ. قَالَ مَالِكٌ: أُرَاهُ مَخَافَةَ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەیکردوە لەکاتی سەفەردا قورئان ببرێ بۆ خاکی

دوژمن. مالیك وتی: لەترسی ئەوەی نەوەكا بكەوێتە بەرچنگی دوژمن و سوكایەتی پێ بكەن.

## باسی ئەوەی باشە لەژمارەی لەشكر و سوپا.

## ٨٩ - باب فِيمَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الْجُيُوشِ وَالرُّفَقَاءِ وَالسَّرَايَا.

**٢٦١١ - (صحيح) عن أبن عباس، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (خَيْرُ الصَّحَابَةِ أَرْبَعَةٌ، وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُمِائَةٍ، وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلاَفٍ، وَلَنْ يُغْلَبَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ مُرْسَلٌ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (باشترین هاورێی كاروانی چوار كەسە، باشترین سوپای جیهادی چوارسەد كەسە، وە باشترین لەشكریش چوار هەزار كەسە، دوانزە هەزار كەس لەبەر كەمی شكست ناهێنن). ئەبو داود دەڵێت: راستتر ئەوەیە كە ئەم فەرمودە (مرسل)ە.

## باسی دەربارەی بانگەوازی هاوبەش بۆ خوا دانەران بۆ سەر دینی ئیسلام.

## ٩٠ - باب فِي دُعَاءِ الْمُشْرِكِينَ.

٢٦١٢ - (صحيح) عن سليمان بن بريدة، عن أبيه قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَعَثَ أَمِيرًا عَلَى سَرِيَّةٍ أَوْ جَيْشٍ أَوْصَاهُ بِتَقْوَى اللَّهِ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ وَبِمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، وَقَالَ: (إِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى إِحْدَى ثَلاَثِ خِصَالٍ - أَوْ خِلاَلٍ - فَأَيَّتُهَا أَجَابُوكَ إِلَيْهَا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ: ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ، فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَعْلِمْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَأَنَّ عَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ أَبَوْا وَاخْتَارُوا دَارَهُمْ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يُجْرَى عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْفَيْءِ وَالْغَنِيمَةِ نَصِيبٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَادْعُهُمْ إِلَى إِعْطَاءِ الْجِزْيَةِ، فَإِنْ أَجَابُوا فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، فَإِنْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ تَعَالَى وَقَاتِلْهُمْ، وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ

**تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ تَعَالَى، فَلاَ تُنْزِلْهُمْ فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ مَا يَحْكُمُ اللَّهُ فِيهِمْ وَلَكِنْ أَنْزِلُوهُمْ عَلَى حُكْمِكُمْ، ثُمَّ اقْضُوا فِيهِمْ بَعْدُ مَا شِئْتُمْ).**

واتە: لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەسێکی بەسەر سوپایەکەوە یان بەسەر لەشکرێکەوە دابنایە، ئامۆژگاری دەکرد بەوەی کە لەخوای گەورە بترسێ و بەچاکی لەگەڵ هاوڕێکانی رەفتار بکات، جا دەیفەرموو: (ئەگەر گەیشتی بە دوژمنەکەت لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەکان ئەوە بانگیان بکە بۆ سێ خاڵ: جا وەڵامی کامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، بانگیان بکە بۆ سەر دینی ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، لەپاشدا بانگیان بکە بۆ ئەوەی لەوڵاتی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ وڵاتی کۆچەران، پێیان رابگەیەنەو حاڵییان بکە ئەگەر ئەو کارە بکەن ئەوە ئەوەیان بۆ هەیە کە بۆ کۆچەران هەیە، وە ئەوەشیان لەسەرە کە لەسەر ئەوانە، ئەگەر رازی نەبوون پێیان رابگەیەنەو حاڵیان بکە کە ئەوان وەك موسوڵمانە دەشتەکیەکانن، ئەو حوکم و بڕیارەی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە بەسەر باوەڕدارانـدا جێبەجێ دەکرێت، هیچ لە دەستکەوتی جەنگی و تالانیان بۆ نیە مەگەر لەگەڵ موسوڵمانانـدا خەبات و تێکۆشان بکەن، ئەگەر رازی نەبوون ئەوە بانگیان بکە بۆ ئەوەی سەرانە(جزیە) بدەن، ئەگەر وەڵامیان دایەوە ئەوە لێیان وەربگرەو وازیان لێ بێنە، ئەگەر بەوەش رازی نەبوون ئەوە پشت بە خوای گەورە ببەستەو داوای یارمەتی لێ بکەو لەگەڵیان بجەنگە، ئەگەر چواردەوری قەڵایەکت گرت ئەوان ویستیان خۆیان بدەن بەدەستەوە بەمەرجێ بە حوکم و بڕیاری خوای گەورە رەفتاریان لەگەڵ بکەیت، ئەوە تۆ دایان نەبەزێنی لەسەر حوکم و بڕیاری خوای گەورە، بەڵکو لەسەر حوکم و بڕیاری خۆت دایان بەزێنە، چونکە تۆ نازانی ئەو بڕیارەی کە دەیدەیت رێکە لەگەڵ حوکم و بڕیاری خوای گەورەدا، یان نا، ئینجا لەداوی دابەزاندنیان بە ئارەزووی خۆت حوکم و بڕیار بدە بەسەریاندا).

٢٦١٣ - (صحيح) عن سليمان بن بريدة، عن أبيه قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَقَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَلاَ تَغْدِرُوا، وَلاَ تَغُلُّوا، وَلاَ تُمَثِّلُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا).

واتە: لە سولەیمانی كوڕی بورەیدەوە، لەباوكیەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەناوی خواوە غەزا بكەن، لەپێناوی خوای گەورەدا، بجەنگن لەگەڵ كافراندا ئەوانەی كە باوەڕیان نیە بە خوای گەورە، غەزا بكەن غەدر و ناپاكی مەكەن، لە دەستكەوت دەرمەكەن هەتا دابەش دەكرێت، لوت و گوێی كەس مەبڕن و (تمپیل)یان پێ نەكەن، منداڵ مەكوژن.

٢٦١٤ - (ضعيف) عن أنس بن مالك: أن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (انْطَلِقُوا بِاسْمِ اللَّهِ وَبِاللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ، وَلاَ تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا، وَلاَ طِفْلاً، وَلاَ صَغِيرًا، وَلاَ امْرَأَةً، وَلاَ تَغُلُّوا، وَضُمُّوا غَنَائِمَكُمْ، وَأَصْلِحُوا، وَأَحْسِنُوا: (إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)).

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بەناوی خوای گەورەوە بكەونەڕێ، لەڕێگەی خواو، لەسەر دینی پێغەمبەری خوا، منداڵی بچوك و ئافرەت و پیری پەككەوتە مەكوژن، لە دەستكەوت دەرمەكەن و ناپاكی لێ مەكەن، دەستكەوتەكانتان كۆبكەنەوە، چاكسازی بكەن و حاڵی خۆتان چاك بكەن، چاكەكار بن چونكە: (خوای گەورە چاكەكارانی خۆشدەوێت).

## باسی دەربارەی سوتاندن لەوڵاتی دوژمن.

## ٩١ - باب فِي الْحَرْقِ فِي بِلاَدِ الْعَدُوِّ.

**٢٦١٥ - (صحيح) عن ابن عمر، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَرَّقَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ - وَهِيَ الْبُوَيْرَةُ - فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دارخورماکانی (بنی نضیر)ی بڕی و سوتاند – شوێنی دارخورما – ، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ). سورة الحشر: ٥. واتە: ئەوی بڕیتان لە دارخورما یا لێی گەڕان بە وێستاوی لەسەر بنەکانیان ئەوە بە فەرمانی خوا بووە.

**٢٦١٦ - (ضعيف) عن أسامة، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عَهِدَ إِلَيْهِ فَقَالَ: (أَغِرْ عَلَى أُبْنَى صَبَاحًا وَحَرِّقْ).**

واتە: لە ئوسامەوە هاتوە: کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕایسپارد سەرلەبەیانیە لەناکاودا بدات بەسەر (أُبْنَى)یەداو بیسوتێنێ – (أُبْنَى)ە شوێنێکە لە فەلەستین- .

**٢٦١٧ - (مقطوع) عن عبد الله بن عمرو الغزي قال، سَمِعْتُ أَبَا مُسْهِرٍ قِيلَ لَهُ: أُبْنَى. قَالَ: نَحْنُ أَعْلَمُ، هِيَ يُبْنَى فِلَسْطِينَ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمری غەزییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: گوێم لە ئەبو میسهیر بوو پێی وترا: (أُبْنَى). راوی وتی: ئێمە دەزانین ئەوە (يُبْنَى)ە لە فەلەستین.

## باسی ناردنی جاسوس بۆ زانینی هەواڵی دوژمن

## ٩٢ - باب بَعْثِ الْعُيُونِ.

**٢٦١٨ - (صحيح) عن أنس قال: بَعَثَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - بُسَيسَةَ عَيْنًا يَنْظُرُ مَا صَنَعَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ.**

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە نهێنی بوسەیسەی نارد بۆئەوەی چاودێری کاروانەکەی ئەبو سوفیان بکات کە لەشام گەڕابوەوە بزانێ چی دەکەن و هەواڵەکەی بۆ بێنێتەوە.

## باسی دەربارەی خواردنی خورماو شیر خواردنەوە لەلایەن ڕێبوارەوە ئەگەر دای بەلایاندا.

## ٩٣ - باب فِي ابْنِ السَّبِيلِ يَأْكُلُ مِنَ التَّمْرِ وَيَشْرَبُ مِنَ اللَّبَنِ إِذَا مَرَّ بِهِ.

**٢٦١٩ - (صحيح) عن سمرة بن جندب، أن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ عَلَى مَاشِيَةٍ: فَإِنْ كَانَ فِيهَا صَاحِبُهَا فَلْيَسْتَأْذِنْهُ، فَإِنْ أَذِنَ لَهُ فَلْيَحْلِبْ وَلْيَشْرَبْ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ**

فِيهَا فَلْيُصَوِّتْ ثَلاَثًا، فَإِنْ أَجَابَهُ فَلْيَسْتَأْذِنْهُ، وَإِلاَّ فَلْيَحْتَلِبْ وَلْيَشْرَبْ وَلاَ يَحْمِلْ).

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکاتێ کەسێ لەئێوە چوە ناو مەڕ و ماڵاتێکەوە: ئەگەر خاوەنەکەی لەوێ بوو با مۆڵەتی لێ بخوازێت، ئەگەر رێی دا با بیدۆشێت و بیخواتەوە، ئەگەر لەوێش نەبوو با سێ جار بانگی خاوەن ماڵەکە بکات، ئەگەر وەڵامی دایەوە داوای مۆڵەتی لێ بکات، ئەگەر کەس وەڵامی نەدایەوە ئەوە با بیدۆشێت و بیخواتەوە بەڵام هەڵی نەگرێت واتە ئەوەندەی کە پێویستی بێت).

٢٦٢٠ - (صحيح) عن عباد بن شرحبيل قال: أَصَابَتْنِي سَنَةٌ فَدَخَلْتُ حَائِطًا مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ فَفَرَكْتُ سُنْبُلاً، فَأَكَلْتُ وَحَمَلْتُ فِي ثَوْبِي، فَجَاءَ صَاحِبُهُ فَضَرَبَنِي وَأَخَذَ ثَوْبِي، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ: (مَا عَلَّمْتَ إِذْ كَانَ جَاهِلاً، وَلاَ أَطْعَمْتَ إِذْ كَانَ جَائِعًا). أَوْ قَالَ: (سَاغِبًا). وَأَمَرَهُ فَرَدَّ عَلَيَّ ثَوْبِي، وَأَعْطَانِي وَسْقًا أَوْ نِصْفَ وَسْقٍ مِنْ طَعَامٍ.

واتە: لە عەببادی کوڕی شەرحەبیلەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی:ساڵێ قات و قڕی بوو برسێتی زۆری بۆ هێنام چومە ناو باخێ لە باخەکانی مەدینە چەند گوڵە گەنمێکم لێ کردەوەو پرواندم هەندێکم لێ خواردو هەندێکیشم کردە ناو پۆشاکەکەمەوە، خاوەنەکەی هات لێی دام و پۆشاکەکەمی لێ سەندم، چومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سکاڵام کرد لەدەستی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە خاوەنی باخەکەی

فەرمووو: (ئەگەر نەزان بوو فێرت نەکرد، ئەگەر برسیش بوو تێرت نەکرد). فـەرمانی پـێ کرد پۆشاکەکەی بۆ گێڕامەوەو، وەسەقێ یـان نیـو وەسـەق خـواردنی دامـێ – وەسـەق پێوانەیەکە سەدو چل گرام دەبێت -.

٢٦٢١ - (صحيح) عن أبي بشر قال: سَمِعْتُ عَبَّادَ بْنَ شُرَحْبِيلَ - رَجُـلاً مِنَّا مِنْ بَنِي غُبَرَ - بِمَعْنَاهُ.

واتە: ئەبو بیشر دەڵێت: بیستم لە عەببادی کوڕی شەرحەبیل – کە پیاوێکە لە خۆمان لە بەنی غوبەر - بە هەمان مانا فەرموودەی پێشوی گێرایەوە.

## باسی ئەوانەی کە دەڵێن: ئەوە بخوات کە کەوتۆتەخوارەوە.

## ٩٤ – باب مَنْ قَالَ إِنَّهُ يَأْكُلُ مِمَّا سَقَطَ.

٢٦٢٢ - (ضعيف) عن معتمر بن سليمان قال: سَـمِعْتُ ابْـنَ أَبِـى حَكَـمٍ الْغِفَارِيَّ يَقُولُ حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي عَنْ عَمِّ أَبِي رَافِعِ بْـنِ عَمْـرٍو الْغِفَارِيِّ قَالَ: كُنْتُ غُلاَمًا أَرْمِي نَخْلَ الأَنْصَارِ، فَـأُتِيَ بِـى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَـالَ: (يَـا غُـلاَمُ لِـمَ تَرْمِـى النَّخْلَ؟). قَالَ آكُلُ، قَالَ: (فَلاَ تَرْمِ النَّخْلَ، وَكُلْ مِمَّا يَسْقُطُ فِي أَسْفَلِهَا). ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ فَقَالَ: (اللَّهُمَّ أَشْبِعْ بَطْنَهُ).

واتە: لە موعتەمیری كوڕی سەلەیمانەوە دەگێڕنەوە، كـە وتویـەتی: بیسـتم لـە ئیبنـو حەكەمی غیفاری دەیوت: داپیرەم بۆی باس كردم لە مامێكی ئەبو رافیعی كوڕی عەمری غیفارییەوە وتی: غولاَمێ بووم خورمای ئەنصارم دەخستەخوارەوەو دەمخوارد، شكاتیان لێ كردم و بردمیان بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی غـولاَم بۆچـی بـەرد دەهاوێژی بۆ دارخورماكان و خورما دەخەیتەخوارەوە؟). وتی: دەیخۆم، فـەرمووی: (بـەرد مەهاوێژە بۆ دارخورماكان، ئەوە بخۆ كە لەبن دارخورماكاندایە). لەپاشـدا دەسـتی هێنـا بەسەریاو فەرمووی: (خودایە سكی تێر بكەی).

## باسی دەربارەی ئەوانەی كە دەڵێن: نەیدۆشێت.

## ٩٥ - باب فِيمَنْ قَالَ لاَ يَحْلِبُ.

**٢٦٢٣ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرَبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ فَيُنْتَثَلَ طَعَامُهُ؟ فَإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَتَهُمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِهِ).**

واتە: لـە (عَبْـدُ اللَّـه)ی كـوڕی عومـەرەوە ڕەزای خوایـان لـێ بـێ دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هیچ كەسـێ ئـاژەڵ و مـەڕ و مـاڵاَتی كەسێكی تر نەدۆشێت بەبێ ڕازامەندی ئەو كەسە، ئایا چ كەسێ لەئێوە حەزدەكات ئـەو

ژورە بەرزەی کە خۆراك و هەر شێکی تری تێدا هەڵدەگرێت بچنە ناویەوە گەنجینەکەی بیشکێنن و خواردنەکەی بڵاوبکەنەوەو هەندێکی لیٚ ببەن؟ دە بێگومان ئەو خەڵکەش گوانی ئاژەڵەکانیان خۆراکەکەیانە، کەواتە باکەس ئاژەڵی کەسێکی تر نەدۆشێت بەبیٚ رازامەندی ئەو کەسە.

## باسی سەبارەت بە ملکەچی و گوێڕایەڵی ئەمیر

## ٩٦ - باب فِي الطَّاعَةِ.

**٢٦٢٤ - (صحيح) عن ابن جريج قال: ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ). فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَدِيٍّ، بَعَثَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ.**

واتە: لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئایەتی (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ). سورة النساء: ٥٩. واتە: ئەی کەسانێك کەباوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن، وە پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە دادپەروەر(عادیلە)کانی خۆتان بن.

ئیبنو جورەیج دەڵێت ئەم ئایەتەی سەرەوە دەربارەی (عَبْدُ اللّـه)ی کوڕی قەیسی کوڕی عەدی هاتەخوارەوە، لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە فەماندەیی سوپایە یان لەشکریٚ رەوانەی کرد بۆ غەزا — کە دەبیٚ گوێڕایەڵی بن و ملکەچی بن.

**٢٦٢٥ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْمَعُوا لَهُ وَيُطِيعُوا، فَأَجَّجَ نَارًا وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَقْتَحِمُوا فِيهَا، فَأَبَى قَوْمٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالُوا: إِنَّمَا فَرَرْنَا مِنَ النَّارِ، وَأَرَادَ قَوْمٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لَوْ دَخَلُوهَا - أَوْ دَخَلُوا فِيهَا - لَمْ يَزَالُوا فِيهَا). وَقَالَ: (لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّـهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ).**

واتە: لە پێشەوا عەلی - کوڕی (أَبِي طَالِب) - ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشکرێکی نارد بۆ غەزا، پیاوێکی کردە سەرکردەیان و فەرمانی پێ کردن کە گوێڕایەڵی بکەن و ملکەچی بن، جا سەرکردەکە ئاگرێکی کردەوەو فەرمانی پێ کردن کە بچنە ناویەوە، کۆمەڵێکیان فەرمانەکەیان شکاندو نەچونە ناو ئاگرەکەوە، وتیان: ئێمە لەئاگر هەڵهاتوین واتە بۆیە باوەڕمان هێناوە بەخواو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا نەچینە ناو ئاگرەوە، کۆمەڵێکیان ویستیان بچنە ناو ئاگرەکەوە، ئەو بەسەرهاتە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر بچونایەتە ناو ئەو ئاگرەوە، هەرگیز لێی نەدەهاتنەدەرەوەو بەردەوام لەناو ئاگردا دەبوون). هەروەها فەرمووی: (گوێڕایەڵی نیە بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانی خوای گەورە، بەڵکو گوێڕایەڵی تەنها بۆ چاکەیە).

**٢٦٢٦ - (صحيح) عن عبد الله، عن رسول الله صلى الله عليه و سلم أنه قال: (السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ**

وَكَرِهَ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەسی دەبێت ملکەچ و گوێڕایەڵ بێت لەو شتەی پێی خۆشەو لەوەش کە پێی ناخۆشە. مەگەر فەرمانی بە گوناه پێ بکرێت، ئەگەر فەرمانی بە گوناه پێ کرا، ئەوە نەملکەچ دەبێت و نە گوێڕایەڵ).

٢٦٢٧ - (حسن) عن عن عقبة بن مالك - من رهطه - قال: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً فَسَلَحْتُ رَجُلاً مِنْهُمْ سَيْفًا، فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: لَوْ رَأَيْتَ مَا لاَمَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ! قَالَ: (أَعَجَزْتُمْ إِذْ بَعَثْتُ رَجُلاً مِنْكُمْ، فَلَمْ يَمْضِ لأَمْرِي، أَنْ تَجْعَلُوا مَكَانَهُ مَنْ يَمْضِي لأَمْرِي؟!).

واتە: لە عوقبەی کوڕی مالیکەوە — لە هۆزەکەیەوە - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشکرێکی نارد بۆ غەزا، منیش شمشێرێکم دایە دەست پیاوێکیان، کاتێ کە پیاوەکە گەڕایەوە وتی: ئەگەر دەتبینی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چۆن سەرزەنشتی دەکردین! فەرمووی: (کاتێ کەسێ لە ئێوەم نارد فەرمانی من جێبەجێ بکات، بەڵام جێبەجێ نەکرد، نەتانتوانی یەکێ بخەنە جێگاکەی کە فەرمانی من جێبەجێ بکات؟!).

## باسی ئەوەی فەرمانی پێ کراوە لە کۆبونەوەی سەربازەکان لەپاڵ یەکتردا.

## ٩٧ – باب مَا يُؤْمَرُ مِنَ انْضِمَامِ الْعَسْكَرِ وَسِعَتِهِ.

٢٦٢٨ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني قال: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلُوا مَنْزِلاً - قَالَ عَمْرٌو: كَانَ النَّاسُ إِذَا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْزِلاً - تَفَرَّقُوا فِي الشِّعَابِ وَالأَوْدِيَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ تَفَرُّقَكُمْ فِي هَذِهِ الشِّعَابِ وَالأَوْدِيَةِ إِنَّمَا ذَلِكُمْ مِنَ الشَّيْطَانِ). فَلَمْ يَنْزِلْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنْزِلاً إِلاَّ انْضَمَّ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ حَتَّى يُقَالُ: لَوْ بُسِطَ عَلَيْهِمْ ثَوْبٌ لَعَمَّهُمْ.

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خەڵك لە مەنزڵگایە دادەبەزین – عەمر وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەنزڵگایە دادەبەزی – بەناو دۆڵ و شیوەکاندا بڵاودەبونەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بڵاوبونەوەتان بەناو ئەم دۆڵ و شیوانەدا لە شەیتانەوەیە). ئیتر لەهەرلایەك لایان بدایە کۆدەبونەوەو پاڵیان دەدا بەیەکترەوە هەتا دەیانوت: ئەگەر پۆشاکێ بدەن بەسەریاندا دایان دەپۆشێت.

٢٦٢٩ - (حسن) عن سهل بن معاذ بن أنس الجهني، عن أبيه قال: غَزَوْتُ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزْوَةَ كَذَا وَكَذَا،

فَضَيَّقَ النَّاسُ الْمَنَازِلَ، وَقَطَعُوا الطَّرِيقَ، فَبَعَثَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنَادِيًا يُنَادِي فِي النَّاسِ: أَنَّ مَنْ ضَيَّقَ مَنْزِلاً أَوْ قَطَعَ طَرِيقًا فَلاَ جِهَادَ لَهُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ی کوڕی ئەنەسی جوهەنییەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە. کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) فلانە غەزاو فلانە غەزاء کردوە، جارێ خەڵك مەنزڵگاکەیان تەنگەبەر کردو رێگەیان بڕی لە خەڵك، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جارچیەکی نارد کە جاڕبدات بەناو خەڵکدا بڵێ: هەرکەسێ مەنزڵگایە تەنگەبەر بکات و رێگەیە ببڕێت لە خەڵك ئەوە جیهادی بۆ نیە.

٢٦٣٠ - (حسن) عن سهل بن معاذ، عن أبيه قال: غَزَوْنَا مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە سەهلی کوڕی (معاذ)ەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) غەزامان کردوە، جا راوی بەهەمان مانا فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە.

# باسی دەربارەی ناپەسەندی ئاوات خواستن بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن.

## ٩٨ – باب فِي كَرَاهِيَةِ تَمَنِّي لِقَاءِ الْعَدُوِّ.

**٢٦٣١ - (صحيح) عن سالم أبي النضر مولى عمر بن عبيد الله - يعني ابن معمر وكان كاتبا له - قال: كَتَبَ إِلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى حِينَ خَرَجَ إِلَى الْحَرُورِيَّةِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ قَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللَّهَ تَعَالَى الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ). ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِيَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ).**

واتە: لە سالم ئەبو (نضر) بەندەی رزگارکراوی عومەری کوڕی (عبيد الله) — واتە ئیبنو عومەر کە نوسەری بوو - وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە عومەری کوڕی (عبيد الله) بەخۆی و لەشکرەکەیەوە کەوتنەڕێ بۆسەر حەروریەکان، (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئەبو ئوفا - کە یەکێ بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) — نامەیەکی نوسی بۆ عومەری کوڕی (عبيد الله): لەیەکێ لەو ڕۆژانەدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) توشی دوژمن بوو فەرمووی: (ئاوات مەخوازن بۆ روبەڕوبونەوەی دوژمن، وە لەخوای گەورە داوای ئاسودەیی و سەلامەتی بکەن، کاتێ کە لەگەڵ دوژمن روبەڕوبونەوە خۆڕاگر و دامەزراو بن و بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکاندایە). لەپاشدا

فەرمووی: (خودایە! ئەی دابەزێنەری قورئان، بە هەڵدەکەیت و بەهەموو لایەک دەیخەیتەڕێ، ئەی تێك شکێنەری هەموو کۆمەڵ و حیزبە کافرەکان، ئەم دوژمنەمان بۆ تێك بشکێنەو سەرمان بخە بەسەریاندا).

## باسی پاڕانەوەی کاتی بەرەنگاربونەوەی دوژمن.

## ٩٩ - باب مَا يُدْعَى عِنْدَ اللِّقَاءِ.

**٢٦٣٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال:كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا غَزَا قَالَ: (اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ، وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ).**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێ کە غەزای بکردایە دەیفەرموو: (خودایە! تۆ کۆمەك تۆ پشتیوان و سەرخەرمی، بە تۆوە دەجولێم و پەلاماری دوژمن دەدەم و هەڵدەکوتمە سەریان، بە تۆوە دەجەنگم و کوشتار دەکەم).

# باسی سەبارەت بە بانگەوازكردنی هاوبەش بۆ خوا دانەران پێش دەستپێكردنی جەنگ.

## ١٠٠ – باب فِي دُعَاءِ الْمُشْرِكِينَ.

٢٦٣٣ - (صحيح) عن ابن عون قال: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنْ دُعَاءِ الْمُشْرِكِينَ عِنْدَ الْقِتَالِ، فَكَتَبَ إِلَيَّ: أَنَّ ذَلِكَ كَانَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ وَقَدْ أَغَارَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ وَهُمْ غَارُّونَ، وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ، وَسَبَى سَبْيَهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ. حَدَّثَنِي بِذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ وَكَانَ فِي ذَلِكَ الْجَيْشِ.

واتە: لە ئیبنو عەونەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: نامەم نوسی بۆ نافیع پرسیارم لێ كرد دەربارەی بانگەوازی هاوبەش بۆ خوا دانەران پێش دەستپێكردنی جەنگ، ئەویش نامەی بۆ من نوسیمەوەو لەوەڵامدا وتی: ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەوە بەم شێوەیە بوو، هەتا بانگیان نەكردنایە بۆ ئیسلام و ئاگاداریان نەكردنایەتەوە پەلاماریان نەدەدان، بەڵام دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەخۆی و لەشكرەوە لەناكاو دای بەسەر (بَنِي الْمُصْطَلِقِ)دا، بەبێ ئەوەی ئاگایان لەخۆیان بێت، لەوكاتەدا ئاژەڵەكانیان لەسەر ئاو بوون و ئاویان دەدان، شەڕكەرەكانیان كوشتن و، ژن و منداڵەكانیان بردن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو جەنگەدا جوەیریەی كچی (حارث)ی دەستكەوت – جوەیریە بوو بە دایكی باوەڕداران - ، ئەمەش (عَبْدُ اللَّه) – ی كوڕی عەمەر - بۆی باس كردم كە خۆی ئامادەی جەنگەكە بوو.

٢٦٣٤ - (صحيح) عن أنس، أَنَّ النَّبِىَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُغِيرُ عِنْدَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَكَانَ يَتَسَمَّعُ، فَإِذَا سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ. وَإِلاَّ أَغَارَ.

واتە: ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عادەتی وابوو کە دەچوو بۆ غەزا لەگەڵ شەبەقی بەیاندا دەیدا بەسەریاندا، لەپێشدا لەدەوروبەری ئەو شوێنەدا گوێی هەڵدەخست بزانێ بانگی بەیانی دەدەن یان نا، جا ئەگەر بانگیان بدایە هێرشی نەدەکردە سەریان، بەڵام ئەگەر بانگیان نەدایە ئەوا هێرشی دەکردە سەریان و لەناکاو دەیدا بەسەریاندا.

٢٦٣٥ - (ضعيف) عن ابن عصام المزني، عن أبيه قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِى سَرِيَّةٍ فَقَالَ: (إِذَا رَأَيْتُمْ مَسْجِدًا أَوْ سَمِعْتُمْ مُؤَذِّنًا فَلاَ تَقْتُلُوا أَحَدًا).

واتە: لە ئیبنو عیصامی موزەنییەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ لەشکرێکدا رەوانەی کردین بۆ غەزا فەرمووی: (ئەگەر مزگەوتێکتان بینی یان گوێتان لە بانگبێژ بوو بانگی دەدا ئەوە پەلاماریان مەدەن و هیچ کەس مەکوژن).

## باسی فێڵ کردن لەجەنگدا.

## ١٠١ - باب الْمَكْرِ فِي الْحَرْبِ.

**٢٦٣٦ - (صحيح) عن جابر، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْحَرْبُ خُدْعَةٌ).**

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (جەنگ فێڵ کردنە).

**٢٦٣٧ - (صحيح) عن كعب بن مالك، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ غَزْوَةً وَرَّى غَيْرَهَا، وَكَانَ يَقُولُ: (الْحَرْبُ خُدْعَةٌ). قَالَ أَبو دَاوُدَ لَمْ يَجِئْ بِهِ إِلاَّ مَعْمَرٌ يُرِيدُ قَوْلَهُ: (الْحَرْبُ خُدْعَةٌ).**

واتە: لە کەعبی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بیویستایە غەزایە بکات لەلای سەروەوە بوایە هەواڵی لای خوارووی دەپرسی، دەیفەرموو: (جەنگ فێڵ کردنە). ئەبو داود دەڵێت: ئەمە جگە لە مەعمەر لەکەسی ترەوە نەهاتوە، مەبەستی: (جەنگ فێڵ کردنە).

## باسی دەربارەی لەشەودا لەناکاو پەلاماردانی دوژن

## ١٠٢ – باب فِي الْبَيَاتِ.

٢٦٣٨ - (صحيح) عن إياس بن سلمة، عن أبيه قال: أَمَّـرَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْنَا أَبَا بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فَغَزَوْنَا نَاسًا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَبَيَّتْنَاهُمْ نَقْتُلُهُمْ، وَكَانَ شِـعَارُنَا تِلْـكَ اللَّيْلَةَ: أَمِتْ، أَمِتْ. قَالَ سَلَمَةُ: فَقَتَلْـتُ بِيَـدِي تِلْـكَ اللَّيْلَـةَ سَبْعَةَ أَهْلِ أَبْيَاتٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ.

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کـە وتویـەتی: لەیـەکێ لـە غەزاکاندا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ ببێتە سەرکردەمان، غەزای هەندێ لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانمان کرد، لەشـەودا لـەناکاو پەلامارماندان، لەو شەوەدا دروشمان: بمرێنە، بمرێنە بـوو. سـەلەمە وتـی: لـەو شـەوەدا حەوت کەسی عەشایەرم لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بەدەستی خۆم کوشت.

# باسی دەربارەی خۆخستنەدواوە لەکاتی ڕۆشتن لەگەڵ لەشکردا.

## ١٠٣ – باب فِي لُزُومِ السَّاقَةِ.

٢٦٣٩ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَلَّفُ فِي الْمَسِيرِ، فَيُزْجِي الضَّعِيفَ، وَيُرْدِفُ، وَيَدْعُو لَهُمْ.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّـه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی ڕۆیشتن لەگەڵ لەشکردا خۆی دوادەخست و لەدوای خەڵکەوە دەڕۆیشت، لاوازەکانی دەخستەڕێ و کەل و پەلی بۆ هەڵدەگرتن و، لەگەڵ خۆیدا سواری دەکردن و، بۆیان دەپاڕایەوە.

# باسی جەنگ کردن لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران لەسەرچی.

## ١٠٤ – باب عَلَى مَا يُقَاتَلُ الْمُشْرِكُونَ

٢٦٤٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ،

**فَإِذَا قَالُوهَا مَنَعُوا مِنِّى دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: (لا إله إلا الله)، ئەگەر وتیان، ئەوە خوێن و ماڵیان دەپارێزن بەحەقی ئیسلام نەبێت. دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەلای خوایە).

**٢٦٤١ - (صحيح) عن أنس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنْ يَسْتَقْبِلُوا قِبْلَتَنَا، وَأَنْ يَأْكُلُوا ذَبِيحَتَنَا، وَأَنْ يُصَلُّوا صَلاَتَنَا، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ حَرُمَتْ عَلَيْنَا دِمَاؤُهُمْ وَأَمْوَالُهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ).**

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: (أشهد أن لا إله إلا الله، و أن محمدا رسول الله)، رودەکەنە قیبلەکەمان و، لە گۆشتی سەربڕاوەکانمان دەخۆن و، ئەو نوێژانە دەکەن کە فەرزن لەسەر موسوڵمانان بە رێکوپێکی، ئەگەر ئەوانە ئەوەیان کرد خوێن و ماڵیان دەپارێزن لێیە بەحەقی ئیسلام نەبێت، ئەوەی بۆ موسوڵمانان هەیە بۆ ئەوانیش هەیە لە مافەکان و ئەرکەکان).

٢٦٤٢ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الْمُشْرِكِينَ). بِمَعْنَاهُ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (من فەرمانم پێكراوە لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەران بجەنگم). جا راوی بەهەمان مانا فەرموده‌كەی پێشوی گێڕایەوە.

٢٦٤٣ - (صحيح دون جملة عقل) عن أسامة بن زيد قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً إِلَى الْحُرَقَاتِ، فَنَذِرُوا بِنَا، فَهَرَبُوا، فَأَدْرَكْنَا رَجُلاً، فَلَمَّا غَشَيْنَاهُ، قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَضَرَبْنَاهُ، حَتَّى قَتَلْنَاهُ، فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَنْ لَكَ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟!). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا قَالَهَا مَخَافَةَ السِّلاَحِ، قَالَ: (أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَالَهَا أَمْ لاَ؟ مَنْ لَكَ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟). فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أُسْلِمْ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ.

واتە: لە ئوسامەی كوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناردینی بۆ غەزای خێڵی حروقات، كاتێ كە زانیان غەزایان دەكەین، هەڵهاتن، نیشتینە سەر پیاوێ، كاتێ كە دەرفەتی راكردنی نەما وتی: (لا إلـه إلا الله)، لێمان دا، هەتا كوشتمان، ئەو باسەم بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە، فەرمووی: (لەڕۆژی قیامەتدا كێ یارمەتیت بدات لەكاتێكدا كە دەڵێ: (لا إله إلا الله؟)، وتم: ئەی

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەترسی شمشێر وتی: (لا إله إلا الله)، فەرمووی: (نەدەبوو دڵی لەت بکەیت هەتا بزانی لەترسی شمشێر وای وتوە یان نا؟ لەرۆژی قیامەتدا کێ یارمەتیت بدات لەکاتێکدا کە دەڵێ: (لا إله إلا الله؟)، بەردەوام ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە هەتا ئاواتم خواست لەو رۆژەدا موسوڵمان بومایە.

**٢٦٤٤ - (صحيح) عن المقداد بن الأسود أنه قال: يَا رَسُولَ اللَّـهِ أَرَأَيْـتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلاً مِنَ الْكُفَّارِ فَقَـاتَلَنِي، فَضَـرَبَ إِحْـدَى يَـدَيَّ بِالسَّيْفِ، ثُمَّ لاَذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ، فَقَالَ: أَسْلَمْتُ لِلَّهِ، أَفَأَقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَقْتُلْهُ). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَطَعَ يَـدِي! قَـالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لاَ تَقْتُلْهُ، فَإِنْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ، وَأَنْتَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَـهُ الَّتِي قَالَ).**

واتە: لە میقدادی ئوسامەی کوڕی ئەسوەدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەگەر لەگەڵ پیاوێکی کافردا بەرەنگاری یەك بوینەوە، بە شمشێر دای لەدەستێکم و دەستی پەڕاندم، لەپاشدا رای کردو خۆی دایە پاڵ قەدی درەختێك، کە زانی زۆرم بۆ هێناوە بلێ: ئەوا موسوڵمان بووم و باوەڕم هێنا بە خوای گەورە، ئایا ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیکوژم یان نا؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (مەیکوژە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو دەستێکی پەڕاندوم! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (مەیکوژە، ئەگەر بیکوژیت ئەو دەچێتە پایەی تۆ پێش ئەوەی کە ئەو بکوژیت واتە خوێنی حەرام

دەبێت چونکە موسوڵمان بووە، تۆش دەچیتە پایەی ئەو پێش ئەوەی کە موسوڵمان ببێت، واتە خوێن رشتنت حەڵاڵ دەبێت).

## باسی قەدەغەکردنی کوشتنی کەسێ پەنا بباتە بەر سەجدەبردن.

## ١٠٥ - باب النَّهْيِ عَنْ قَتْلِ مَنِ اعْتَصَمَ بِالسُّجُودِ.

٢٦٤٥ - (صحيح) عن جرير بن عبد الله قال: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً إِلَى خَثْعَمٍ، فَاعْتَصَمَ نَاسٌ مِنْهُمْ بِالسُّجُودِ، فَأَسْرَعَ فِيهِمُ الْقَتْلُ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ لَهُمْ بِنِصْفِ الْعَقْلِ، وَقَالَ: (أَنَا بَرِيءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لِمَ؟ قَالَ: (لاَ تَرَاءَى نَارَاهُمَا).

واتە: لە جەریری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەشکرێکی نارد بۆسەر هۆزی (خثعم)، چەند کەسێ لەوان پەنایان برد بۆ سەجدەبردن و سەجدەیان برد، بۆ ئەوەی نەیانکوژن، بەڵام لە پەلە پەلیدا کوژران، راوی وتی: هەواڵەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەویش فەرمانی پێ کردن بەوەی کە نیوە خوێنەکەیان بدەن، وە فەرمووی: (من بەریم لەهەر موسوڵمانێ کە لەناو هاوبەش بڕیاردەراندا دادەنیشێ و نیشتەجێ دەبێت). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆچی، فەرمووی: (پێویستە لەسەر موسوڵمان لەگەڵ کافردا نەبێت، بەڵکو

دەبێ ماڵی دور بێت لە ماڵیان بەشێوەیە ئەگەر هەر یەکەیان ئاگری کردەوە ئەوی تریان نەیبینێت، ئەمەش ئاماژەیە بۆ دوری نێوان موسوڵمانان و کافران).

## باسی دەربارەی پشت هەڵکردن و راکردن لە جەنگ بەرامبەر بە دوژمن.

## ١٠٦ - باب فِي التَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ.

**٢٦٤٦ - (صحيح) عن ابن عباس قال: نَزَلَتْ (إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ) فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حِينَ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ أَنْ لاَ يَفِرَّ وَاحِدٌ مِنْ عَشَرَةٍ، ثُمَّ إِنَّهُ جَاءَ تَخْفِيفٌ، فَقَالَ: (ٱلْـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمْ) قَرَأَ أَبُو تَوْبَةَ إِلَى قَوْلِهِ: (يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ). قَالَ: فَلَمَّا خَفَّفَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمْ مِنَ الْعِدَّةِ نَقَصَ مِنَ الصَّبْرِ بِقَدْرِ مَا خَفَّفَ عَنْهُمْ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە دابەزی: (إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ). سورة الأنفال: ٦٥. واتە: (ئەگەر لەئێوەدا ببێ بیست کەسی خۆڕاگر زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەس(ی بێ باوەڕ)دا).

زۆر قورس و گران بوو لەسەر موسوڵمانان کە خوای گەورە فەرزی کرد لەسەریان یەك کەس لەبەرامبەر دە کەسدا هەڵنەیەت، لەپاشدا خوای گەورە سوکی کرد لەسەریان،

فەرمووی: ( ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ ). ئەبو تەوبە ئایەتەکەی خوێندەوە هەتا گەیشتە: (يَغۡلِبُوٓاْ مِاْئَتَيۡنِ ). واتە: ئێستا خوای گەورە فەرمانەکەی سووك كرد لەسەرتان، وەزانی كەلاوازیتان تێدایە، جا ئەگەر لەئێوەدا ببێ سەد كەسی خۆڕاگر زاڵ دەبن بەسەر دووسەد كەس(ی بێ باوەڕ)دا.

راوی وتی: كاتێ كە ژمارەكە كەم بویەوە خۆڕاگریش بە ئەندازەی ژمارەكە كەم بویەوە، واتە جاران دەبوو یەك كەس لەبەرامبەر دە كەس هەڵنەیەت، بەڵام ئێستا دەبێ یەك كەس لەبەرامبەر دوو كەس هەڵنەیەت.

**٢٦٤٧ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر: أَنَّهُ كَانَ فِي سَرِيَّةٍ مِنْ سَرَايَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَحَاصَ النَّاسُ حَيْصَةً، فَكُنْتُ فِيمَنْ حَاصَ، قَالَ: فَلَمَّا بَرَزْنَا، قُلْنَا: كَيْفَ نَصْنَعُ وَقَدْ فَرَرْنَا مِنَ الزَّحْفِ، وَبُؤْنَا بِالْغَضَبِ، فَقُلْنَا: نَدْخُلُ الْمَدِينَةَ، فَنَتَثَبَّتُ فِيهَا، وَنَذْهَبُ، وَلاَ يَرَانَا أَحَدٌ، قَالَ: فَدَخَلْنَا، فَقُلْنَا: لَوْ عَرَضْنَا أَنْفُسَنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَإِنْ كَانَتْ لَنَا تَوْبَةٌ أَقَمْنَا، وَإِنْ كَانَ غَيْرَ ذَلِكَ ذَهَبْنَا، قَالَ: فَجَلَسْنَا لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، فَلَمَّا خَرَجَ قُمْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا: نَحْنُ الْفَرَّارُونَ، فَأَقْبَلَ إِلَيْنَا فَقَالَ: (لاَ، بَلْ أَنْتُمُ الْعَكَّارُونَ). قَالَ: فَدَنَوْنَا فَقَبَّلْنَا يَدَهُ، فَقَالَ: (أَنَا فِئَةُ الْمُسْلِمِينَ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللّـه)ی كوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە لە یەكێ لە لەشكرەكانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووە، وتی: خەڵك تێكشكان و

هەڵهاتن، منیش یەکێك بووم لەوانە، وتی: کاتێ کە ڕۆیشتین و دورکەوتینەوە لەدوژمن یان لە گۆڕەپانی جەنگەکە، پەشیمان بوینەوەو وتمان: چیمان کرد بەخۆمان بێگومان ئێمە لەجەنگ هەڵهاتوین، بە رق و خەشمی خوای گەورەوە گەڕاینەوە، وتمان: بەشەو دەچینە ناو شاری مەدینەوەو دەمێنینەوە، بەنهێنی دەچینەوە بۆ ماڵەوەو، جا دەچین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە شێوەیە کە کەس نەمانبینێ، وتی: جا چوینە ناو شاری مەدینەوە، لەنێوان خۆماندا وتمان: خۆمان نیشانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بدەین چاکە، ئەگەر تەوبەو پەشیمانی لێ وەرگرتین لە مەدینە دەمێنینەوە ئەگینا دەگەڕێینەوە، ئیبنو عومەر وتی: لەپێش نوێژی بەیانیدا دانیشتین چاوەڕێی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دەکرد هەتا بێت بۆ مزگەوت، کاتێ کە لەماڵ هاتەدەرەوە بۆ نوێژی بەیانی، وتمان: ئێمە لەجەنگ هەڵهاتوین، فەرمووی: (نەخێر، بەڵکو ئێوە دەتانەوێ هێرش ببەنەوە سەر دوژمنەکەتان). لێی نزیك بوینەوەو دەستمان ماچ کرد، فەرمووی: (من کۆمەڵی موسوڵمانانم). - ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەم ئایەتە: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾. واتە: وە هەر کەس لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ بکات و هەڵبێت مەگەر (مەبەستی ئەوەبێت) بۆ هێرش کردن بگەڕێتەوە یان بڕوات بۆ لای کۆمەڵێکی تر (و یارمەتیان بدات)، ئەوە بێ گومان بەرق و خەشمی خواوە دەگەڕێتەوە، وە جێگای دۆزەخ دەبێت کە جێگایەکی زۆر خراپ و بەدە.

**٢٦٤٨ - (صحيح) عن أبو سعيد قال: نَزَلَتْ فِي يَوْمِ بَدْرٍ: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ ﴾.**

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێرنەوە، کەوتویەتی: ڕۆژی بەدر ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ

ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾). واتە: وە هەر کەس لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ بکات و هەڵبێت مەگەر (مەبەستی ئەوەبێت) بۆ هێرش کردن بگەڕێتەوە یان بڕوات بۆ لای کۆمەڵێکی تر (و یارمەتیان بدات).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## باسی دەربارەی زۆرکردن لە دیل بۆ ئەوەی کە کافر بێت.

## ١٠٧ - باب فِي الأَسِيرِ يُكْرَهُ عَلَى الْكُفْرِ.

٢٦٤٩ - (صحيح) عن خباب قال: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ بُرْدَةً فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ فَقُلْنَا: أَلاَ تَسْتَنْصِرْ لَنَا، أَلاَ تَدْعُو اللَّهَ لَنَا، فَجَلَسَ مُحْمَرًّا وَجْهُهُ فَقَالَ: (قَدْ كَانَ مَنْ قَبْلَكُمْ يُؤْخَذُ الرَّجُلُ فَيُحْفَرُ لَهُ فِي الأَرْضِ، ثُمَّ يُؤْتَى بِالْمِنْشَارِ فَيُجْعَلُ عَلَى رَأْسِهِ فَيُجْعَلُ فِرْقَتَيْنِ، مَا يَصْرِفُهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ، وَيُمْشَطُ بِأَمْشَاطِ الْحَدِيدِ مَا دُونَ عَظْمِهِ مِنْ لَحْمٍ وَعَصَبٍ، مَا يَصْرِفُهُ ذَلِكَ عَنْ دِينِهِ وَاللَّهِ لَيُتِمَّنَّ اللَّهُ هَذَا الأَمْرَ حَتَّى يَسِيرَ الرَّاكِبُ مَا بَيْنَ صَنْعَاءَ وَحَضْرَمَوْتَ، مَا يَخَافُ إِلاَّ اللَّهَ تَعَالَى، وَالذِّئْبَ عَلَى غَنَمِهِ، وَلَكِنَّكُمْ تَعْجَلُونَ).

واتە: لە خەبابەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوینە لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، شانی دادابو لەسێبەری کەعبەدا، شکاتی حاڵی خۆمان لەلا کرد وتمان: بۆ داوای سەرکەوتنمان بۆناکەیت لە خوای گەورە، ناپارێیتەوە بۆمان لە سزاو ئازاری هاوەڵ بۆ خو دانەران رزگارمان بێت؟ ئەویش رۆخساری سورهەڵگەڕاو دانیشت فەرمووی: (پیاوی و هەبوە لە گەلانی پێش ئێوە، چاڵیان بۆ هەڵکەندوەو خستویانەتە ناو چاڵەکەوەو، مشاریان هێناوە لەسەر سەری دایان ناوە کردویانە بە دوو لەتەوە، ئەمە پاشگەزی نەکردۆتەوە لەدینەکەی، بە شانەی ئاسن دایانهێناوە گۆشت و ئێسك و رەگی لەیەك جیابوەتەوە. ئەمە پاشگەزی نەکردۆتەوە لەدینەکەی، سوێند بە (الله) ئەم دینە وا تەواو دەبێت و جێگیر دەبێت کە سوار لە (صنعا)وە هەتا (حضرموت) دەڕوات، تەنها لە خوای گەورە دەترسێت، یان گورك کە بکەوێتە ناو مەڕەکانی، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن).

## باسی سەبارەت بە حوکمی سیخوڕ(جاسوس) ئەگەر موسوڵمان بوو.

## ١٠٨ - باب فِي حُكْمِ الْجَاسُوسِ إِذَا كَانَ مُسْلِمًا.

٢٦٥٠ - (صحيح) عن علي قال: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ، فَقَالَ: (انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً مَعَهَا كِتَابٌ فَخُذُوهُ مِنْهَا). فَانْطَلَقْنَا تَتَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ، فَقُلْنَا: هَلُمِّي الْكِتَابَ، فَقَالَتْ: مَا عِنْدِي مِنْ كِتَابٍ، فَقُلْتُ: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ، أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، قَالَ: فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ

**عِقَاصِهَا، فَأَتَيْنَا بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى نَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَقَالَ: (مَا هَذَا يَا حَاطِبُ؟). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ، فَإِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا، وَإِنَّ قُرَيْشًا لَهُمْ بِهَا قَرَابَاتٌ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ بِمَكَّةَ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ أَنْ أَتَّخِذَ فِيهِمْ يَدًا يَحْمُونَ قَرَابَتِي بِهَا، وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كَانَ بِي مِنْ كُفْرٍ وَلاَ ارْتِدَادٍ، فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (صَدَقَكُمْ). فَقَالَ عُمَرُ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ؟!).**

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من و زوبێر و میقدادی نارد، فەرمووی: (بڕۆن هەتا دەگەنە (رَوْضَة خَاخ)[1] لەوێ ئافرەتێکی لێیە نامەیەکی پێیە نامەکەی لێی بسێنن). ئێمەش ئەسپەکانمان تاوداو بە پەلە ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە (رَوْضَة خَاخ)، لەوێ گەیشتین بە ئافرەتەکە، وتمان: نامەکەمان بدەرێ، وتی: نامەم پێ نیە، وتم: نامەکەم دەدەیتێ یان جل و بەرگەکەت لەبەر دارنم و دەتپشکنم و نامەکە دەدۆزمەوە، وتی: جا کە ئافرەتەکە زانی سورن لەسەر نامەکە نامەکەی لەناو گرێی پرچەکەیدا دەرهێنا، ئەوانیش

[1] - شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا.

نامەكەیان برد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، نامەكە لەلایەن (حَاطِب)ی كوڕی ئەبو بەلتەعەوە نوسرابوو بۆ كۆمەڵێ لە هاوەبەش بۆ خوا دانەران، هەواڵی هەندێ كاروباری پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) بۆ ناردبون، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەم نامەیە چیەو بۆچی ناردوتە ئەی(حَاطِب)؟ )، (حَاطِب) وتی: پەلەم لێ مەكەو گوێ بۆ بەهانەكەم بگرە، من كەسێكی بێگانەم و لە هۆزی قورەیش نیم. كەسوكارو منداڵەكانم لەناویاندان، كەسێكم نیە پەنایان بدات و بیانپارێزێت لەدەست قورەیش، ئەوانی تر كە لەگەڵتان لە قورەیشیەكان لە هاوەڵانی تۆ كە كۆچیان كردوە كەسوكاریان هەیەو دەیانپارێزن، جا بۆیە ئەو كارەم كرد دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بكەن، سوێند بە (اللّه) ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باوەڕم بە خواو بە پێغەمبەرەكەی هەیەو نە هەڵگەڕاومەتەوەو نە دڵم گۆڕاوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ڕاست دەكات). پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگەم بدە با بدەم لەملی ئەم دووڕوە! پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (وازبێنە ئەی عومەر ئەمە جەنگی بەدری دیوەو بەشداری جەنگەكەی كردوە، تۆ نازانی لەوانەیە خوای گەورە لوتفی لەگەڵ ئەهلی بەدر كردبێ و فەرمویێتی: (چی دەكەن بیكەن ئەوا من لێتان خۆش بووم).

**٢٦٥١ - (صحيح) عن علي، بهذه القصة، قال: انْطَلَقَ حَاطِبٌ فَكَتَبَ إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ أَنَّ مُحَمَّدًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ سَارَ إِلَيْكُمْ، وَقَالَ فِيهِ: قَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ، فَانْتَحَيْنَاهَا فَمَا وَجَدْنَا مَعَهَا كِتَابًا، فَقَالَ عَلِيٌّ: وَالَّذِي يُحْلَفُ بِهِ لأَقْتُلَنَّكِ أَوْ لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ، وَسَاقَ الْحَدِيثَ.**

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێ بەسەرهاتی پێشو هاتوە، وتی: (حَاطِب) نوسی بۆ خەڵكی مەككە، لە نامەكەیدا ڕوگەی كەوتنەڕێی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه

وسلم) پێ ڕاگەیاندبوون، لە فەرموودەکەیدا وتی: ئافرەتەکە وتی: هیچ نامەیەکم پێ نیە، ئێمەش پشکنیمان نامەکەمان نەدۆزیەوە، پێشەوا عەلی وتی: سوێند بە (الله) یان دەتکوژم یان ئەوەتا نامەکە دەردێنی و دەیدەیتە دەستمان. جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

## باسی سەبارەت بە حوکمی جاسوسی خاوەن پەیمان(ئەهلی (ذمة).

## ١٠٩ - باب فِي الْجَاسُوسِ الذِّمِّيِّ.

٢٦٥٢ - (صحيح) عن فرات بن حيان: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِقَتْلِهِ، وَكَانَ عَيْنًا لأَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَ حَلِيفًا لِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَمَرَّ بِحَلْقَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: إِنِّي مُسْلِمٌ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ يَقُولُ: إِنِّي مُسْلِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ مِنْكُمْ رِجَالاً نَكِلُهُمْ إِلَى إِيمَانِهِمْ مِنْهُمْ فُرَاتُ بْنُ حَيَّانَ).

واتە: لە فوراتی کوڕی حەییانەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد بە کوشتنی، چونکە جاسوسی بۆ ئەبو سوفیان دەکرد، هاوپەیمان(سوێندخوار)ی پیاوێکی ئەنصاری بوو، دای بەلای کۆڕێکی ئەنصارەکاندا وتی: من موسوڵمانم، پیاوێکی ئەنصاری وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەڵێ: من موسوڵمانم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هەندێ پیاوتان لەناودایە

حەواڵەی دینی خۆیانیان ناکەین هەر بەوەی کە بەدەم بڵێن ئێمە موسوڵمانین باوەڕیان پێ ناکەین، مەگەر شایەت و بەڵگەیان هەبێ، یەکێ لەوانە فوراتی کوڕی حەییانە).

## باسی سەبارەت بە حوکمی جاسوسی داڵدەدراو.

## ١١٠ - باب فِي الْجَاسُوسِ الْمُسْتَأْمَنِ[1].

**٢٦٥٣ - (صحيح) عن ابن سلمة بن الأكوع، عن أبيه قال: أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَيْنٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَهُوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ عِنْدَ أَصْحَابِهِ ثُمَّ انْسَلَّ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اطْلُبُوهُ فَاقْتُلُوهُ). قَالَ: فَسَبَقْتُهُمْ إِلَيْهِ فَقَتَلْتُهُ، وَأَخَذْتُ سَلَبَهُ، فَنَفَّلَنِي إِيَّاهُ.**

واتە: لە ئیبنو سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا جاسوسێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ماوەیە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشت لەپاشدا دیارنەماو بۆی دەرچو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بگەڕێن بەدوایاو بیکوژن). سەلەمە وتی: جا من لەپێش ئەوانەوە کوشتم، چەك و کەل و پەلی کوژراوەکەم وەرگرت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەرێگەی دەستکەوتی جەنگی پێی بەخشیم.

[1] - (مستأمن) کەسێکە داڵدەدرابێ، ئەو کەسەی کە دەچێتە ناو وڵاتی موسوڵمانانەوە لەوماوەیەدا کە دەمێنێتەوە خۆی و ماڵ و سامانی دەپارێزرێت.

٢٦٥٤ - (حسن) إياس بن سلمة قال: حدثني أبي قال: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَوَازِنَ، قَالَ: فَبَيْنَمَا نَحْنُ نَتَضَحَّى وَعَامَّتُنَا مُشَاةٌ وَفِينَا ضَعَفَةٌ، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ أَحْمَرَ، فَانْتَزَعَ طَلَقًا مِنْ حِقْوِ الْبَعِيرِ فَقَيَّدَ بِهِ جَمَلَهُ، ثُمَّ جَاءَ يَتَغَدَّى مَعَ الْقَوْمِ، فَلَمَّا رَأَى ضَعَفَتَهُمْ وَرِقَّةَ ظَهْرِهِمْ خَرَجَ يَعْدُو إِلَى جَمَلِهِ فَأَطْلَقَهُ، ثُمَّ أَنَاخَهُ فَقَعَدَ عَلَيْهِ، ثُمَّ خَرَجَ يَرْكُضُهُ مِنْ أَسْلَمَ عَلَى نَاقَةٍ وَرْقَاءَ هِيَ أَمْثَلُ ظَهْرِ الْقَوْمِ، قَالَ: فَخَرَجْتُ أَعْدُو فَأَدْرَكْتُهُ وَرَأْسُ النَّاقَةِ عِنْدَ وَرِكِ الْجَمَلِ، وَكُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ النَّاقَةِ، ثُمَّ تَقَدَّمْتُ حَتَّى كُنْتُ عِنْدَ وَرِكِ الْجَمَلِ، ثُمَّ تَقَدَّمْتُ حَتَّى أَخَذْتُ بِخِطَامِ الْجَمَلِ فَأَنَخْتُهُ، فَلَمَّا وَضَعَ رُكْبَتَهُ بِالأَرْضِ اخْتَرَطْتُ سَيْفِي فَأَضْرِبَ رَأْسَهُ، فَنَدَرَ، فَجِئْتُ بِرَاحِلَتِهِ وَمَا عَلَيْهَا أَقُودُهَا، فَاسْتَقْبَلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي النَّاسِ مُقْبِلاً، فَقَالَ: (مَنْ قَتَلَ الرَّجُلَ؟). فَقَالُوا: سَلَمَةُ بْنُ الأَكْوَعِ. قَالَ: (لَهُ سَلَبُهُ أَجْمَعُ).

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە، دەگێرنەوە، کە وتویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بەشداری غەزای هۆزی هەوازنم کرد، وتی: ڕۆژێ لەکاتی چێشتەنگاودا نانمان دەخوارد، زۆربەمان پیادە بووین، هەمان بوو بێ هێز و لاواز بوو، لەوکاتەدا پیاوێکی جاسوس بە سواری وشترێکی سورەوە پەیدا بوو، قایشێکی چەرمینی لەژێر تەنگەی وشترەکەی دەرهێناو وشترەکەی پێ بەستەوە، لەپاشدا هات لەگەڵ خەڵکەکە دەستی کرد بە نان خواردن و قسەکردن، بینی بێ هێز و لاوازین و وڵاخی

سواریمان کەمە، کابرا چوو بۆ لای وشترەکەی و گرێی پەتەکەی کردەوەو وشترەکەی یخ داو سواری بوو، غاریدا، پیاوێ لە هۆزی ئەسلەم بەسواری وشترێکی ڕەشتاڵەوە دوای کەوت و نیشتەسەری، ئەو وشترە چاکترین ولاخی سواری ئێمە بوو، منیش بەڕاکردن نیشتمەسەری هەتا وشتری کابرای جاسوسم گرتەوەو گەیشتمە لای سمتی، لەپاشدا پێشی کەوتم و پێشم لێ گرت، ڕەشمەی وشترەکەم گرت و یخم دا، کاتێ کە وشترەکە ئەژنۆی نایە سەر زەوی شمشێرەکەم لەکێلان دەرکێشاو دام لەملی پیاوە جاسوسەکە سەری پەڕی و کەوت، ئینجا وشترەکەم ڕاکێشا بەبارەکەیەوە هێنامەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و خەڵکەکە هاتن بە پیرمەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (کێ ئەو پیاوەی کوشت؟)، وتیان: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع، فەرمووی: (هەموو کەل و پەل و شتەکانی بۆ ئەو واتە بۆ سەلەمە).

## باسی دەربارەی چ کاتێك باشە بۆ بەرەنگاربونەوەی دوژمن.

## ١١١ - باب فِي أَيِّ وَقْتٍ يُسْتَحَبُّ اللِّقَاءُ.

**٢٦٥٥ - (صحيح) عن معقل بن يسار: أن النعمان يعني - ابن مقرن - قال: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ، أَخَّرَ الْقِتَالَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَتَهُبَّ الرِّيَاحُ، وَيَنْزِلَ النَّصْرُ.**

واتە: لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، - کە نوعمان — واتە: ئیبنو موقەڕەن - وتویەتی: لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لە هەندێ لە غەزاكان

بەشداربووم، ئەگەر لەسەرەتای ڕۆژەوە جەنگی دەست پێ نەکردایە، ئـەوا دوای دەخست هەتا خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لایدەدا، کە کاتی هەڵکردنی بایەو فێنك دەکات، دیارە ئەو کاتەش کاتی وەرگرتنی پاڕانەوەیەو دەبێت بەهۆی سەرکەوتن.

## باسی ئەوەی کە فەرمانی پێ کراوە لە بێدەنگی لەکاتی بەرەنگاربونەوەی دوژمندا.

## ١١٢ – باب فِيمَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الصَّمْتِ عِنْدَ اللِّقَاءِ.

**٢٦٥٦ - (صحيح موقوف) عن قيس بن عباد قال: كَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْرَهُونَ الصَّوْتَ عِنْدَ الْقِتَالِ.**

واتە: لە قەیسی کوڕی عوبادەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) هات و هاوارو دەنگ بەرزکردنەوەیان پێ ناخۆش بووە لەکاتی جەنگ و بەرەنگاربونەوەدا.

**٢٦٥٧ - (ضعيف) عن أبو بردة، عن أبيه، عن النبي صلى الله عليـه و سلم، بمثل ذلك، بِمِثْلِ ذَلِكَ.**

واتە: لە ئەبو بوردەوە، لە باوکیەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

## باسی دەربارەی بەپێ ڕۆیشتنی کەسێ لەکاتی بەرەنگاربونەوەی دوژمندا.

## ١١٣ – باب فِي الرَّجُلِ يَتَرَجَّلُ عِنْدَ اللِّقَاءِ.

**٢٦٥٨ - (صحيح) عن البرّاء قال: لَمَّا لَقِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ حُنَيْنٍ فَانْكَشَفُوا نَزَلَ عَنْ بَغْلَتِهِ فَتَرَجَّلَ.**

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە جەنگی حونەیندا کاتێ کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەرەنگاری هاوبەش بۆ خوا دانەران بویەوە، هەوەڵانی لە جەنگەکەدا شکان، لەسەر ئێسترەکەی دابەزی و بە پێ دەڕۆیشت. - ئەمەش ئەوپەڕی هوردبەرزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگەیەنێ - .

## باسی سەبارەت بە لەخۆبایی بوون لە جەنگدا.

## ١١٤ – باب فِي الْخُيَلاَءِ فِي الْحَرْبِ.

**٢٦٥٩ - (حسن) عن جابر بن عتيك: أن نبي الله صلى الله عليه و سلم كان يقول: (مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللَّهُ، وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللَّهُ: فَأَمَّا الَّتِي يُحِبُّهَا اللَّهُ فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِي يُبْغِضُهَا اللَّهُ فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ. وَإِنَّ مِنَ الْخُيَلاَءِ مَا يُبْغِضُ اللَّهُ، وَمِنْهَا مَا يُحِبُّ اللَّهُ: فَأَمَّا الْخُيَلاَءُ الَّتِي**

**يُحِبُّ اللَّهُ فَاخْتِيَالُ الرَّجُلِ نَفْسَهُ عِنْدَ الْقِتَالِ، وَاخْتِيَالُهُ عِنْدَ الصَّدَقَةِ، وَأَمَّا الَّتِي يُبْغِضُ اللَّهُ فَاخْتِيَالُهُ فِي الْبَغْيِ). قَالَ مُوسَى: (وَالْفَخْرِ).**

واتە: لە جابری کوڕی عەتیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (غیرەت و شەهامەت دوو جۆرە: جۆرێکیان خوای گەورە پێی خۆشە، ئەوەیە کە لەسەر شتێ بێ گومانی خراپی لێ بکرێت – وەك ئەوە کەسێکی بێگانە بچێتە ماڵەکەی و لەگەڵ خێزانەکەی گاڵتەو گەپ بکات - ، جۆرەکەی تریشیان کە خوای گەورە پێی ناخۆشەو رقی لێیەتی ئەوەیە لەسەر شتێ بێ گومانی خراپی لێ نەکرێت، هەروەها لەخۆبایی بوون دوو جۆرە: جۆرێکیان خوای گەورە پێی خۆشە، ئەوەیە کە پیاوی ئازا لەکاتی جەنگدا خۆی بنوێنێ و بە لەخۆبایی بوونەوە بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە، یان لەکاتی خێرکردندا خۆی بنوێنێ هەتا خەڵك چاوی لێ بکەن، جۆرەکەی تریشیان کە خوای گەورە پێی ناخۆشەو رقی لێیەتی ئەوەیە دەعیەو کەش و فش بکات لەسەر زوڵم و زۆر کردن و کوشتنی کەسی بێ تاوان)، موسا وتی: (شانازی بکات بە رەچەڵەك و ماڵ و سامانەوەو خەڵك بەکەم بزانێت).

## باسی سەبارەت بەکەسێ داوای لێ بکەن خۆی بدات بەدەستەوەو دیل بکرێت، ئایا خۆی بدات بەدەستەوە یان نا؟

## ١١٥ - باب فِي الرَّجُلِ يُسْتَأْسَرُ.

٢٦٦٠ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةً عَيْنًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ، فَنَفَرُوا لَهُمْ هُذَيْلٌ بِقَرِيبٍ مِنْ مِائَةِ رَجُلٍ رَامٍ، فَلَمَّا أَحَسَّ بِهِمْ عَاصِمٌ لَجَئُوا إِلَى قَرْدَدٍ، فَقَالُوا لَهُمْ: انْزِلُوا فَأَعْطُوا بِأَيْدِيكُمْ وَلَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ أَنْ لاَ نَقْتُلَ مِنْكُمْ أَحَدًا! فَقَالَ عَاصِمٌ: أَمَّا أَنَا فَلاَ أَنْزِلُ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ! فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ، فَقَتَلُوا عَاصِمًا فِي سَبْعَةِ نَفَرٍ، وَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ عَلَى الْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ وَزَيْدُ بْنُ الدَّثِنَةِ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَرَبَطُوهُمْ بِهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللَّهِ لاَ أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ لِي بِهَؤُلاَءِ لأُسْوَةً، فَجَرُّوهُ، فَأَبَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ، فَقَتَلُوهُ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ أَسِيرًا حَتَّى أَجْمَعُوا قَتْلَهُ، فَاسْتَعَارَ مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا، فَلَمَّا خَرَجُوا بِهِ لِيَقْتُلُوهُ، قَالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ: دَعُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ: ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَوْلاَ أَنْ تَحْسِبُوا مَا بِي جَزَعًا لَزِدْتُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) دە کەسی نارد بۆ جاسی و هەواڵ زانینی دوژمن عاصیمی کوڕی (ثابت)ی کردە ئـەمیر و سەرکردەیان، نزیکەی دوو سەد پیاوی تیرئەنداز لە هۆزی هوزەیل بۆیان دەرچون، کاتێ کە عاصیم بەوەی زانی و چاویان پێیان کەوت چـوونە سـەر بەرزاییـەك، چـواردەوریان دان و پێیان وتن: وەرنە خوارەوەو خۆتان بدەن بەدەستەوە ئەوەی پێتانە بماندەنێ بـەڵێنتان پـێ دەدەین و سوێندتان بۆ دەخۆین کە کەستان ناکوژین! عاصیم وتی: مـن لەسـەر بـەڵێن و سوێندی کافر دانابەزم و خۆم نادەم بەدەستەوە، جا تیربارانیان کردن، حەوت کەسیان لـێ کوشتن کە عاصیم یەکێك بوو لەوانـە، سـیانەکەی تریـان لەسـەر بـەڵێن و سـوێندەکانی کافرەکان دابـەزین و خۆیـان دا بەدەسـتەوە، لەوانـە خوبـەیب و زەیـدی کـوڕی (دَّثِنَـة)و کەسێکی تر بوون، کاتێ کە گرتنیان و زاڵ بـوون بەسـەریاندا بـەنی تـیرو کەوانـەکانیان کردنەوەو دەسـتیان پـێ بەسـتنەوە، پیـاوی سـێیەمیان وتـی: ئەمـە یەکـەم خیانـەت و ناپاکیانە، سوێند بە (الله) من نایەم لەگەڵتان، ئەوانەی کە کوژران سەرمەشق و پێشەنگن بۆ من کە چاویان لێ بکەم، رایانکێشا لەگەڵ خۆیان بیبەن بەڵام ئەو بەرهەڵستی کـردن و نەچوو لەگەڵیان، جا کوشتیان، خوبەیب بەدیلی مایەوە لەلایان هەتا هەموویان هاتنە سەر ئەوەی کە بیکوژن، داوای تیغێکی کرد هەتا مووی شـەرمگەی پـێ لابـات، کـاتێ کـە بردیانە دەرەوە بۆئەوەی بیکوژن: خوبەیب پێی وتن: وازم لـێ بێـنن بـا دوو رکـات نوێـژ بکەم، لەپاشدا وتی: سوێن بە (الله) ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە بڵێن: لەمردن دەترسێت نوێژی زیاترم دەکرد.

**٢٦٦١ - (صحيح) عن الزهري، قال: أَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ أَبِي سُفْيَانَ بْنِ أَسِيدِ بْنِ جَارِيَةَ الثَّقَفِيُّ - وَهُوَ حَلِيفٌ لِبَنِي زُهْرَةَ - وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ.**

واتە: ئەبو داود ئەم فەرموودەی لەڕێگەیـەکی تـرەوە لـە زوهریـەوە گێڕاوەتـەوە، وەك فەرموودەکەی پێشو.

## باسی سەبارەت بە دانانی کەمین.

## ١١٦ - باب فِي الْكُمَنَاءِ.

٢٦٦٢ - (صحيح) عن البرّاء قال: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الرُّمَاةِ يَوْمَ أُحُدٍ - وَكَانُوا خَمْسِينَ رَجُلاً - عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جُبَيْرٍ، وَقَالَ: (إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخَطَّفُنَا الطَّيْرُ فَلاَ تَبْرَحُوا مِنْ مَكَانِكُمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ، وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا الْقَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ فَلاَ تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ). قَالَ: فَهَزَمَهُمُ اللَّهُ، قَالَ: فَأَنَا وَاللَّهِ رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ عَلَى الْجَبَلِ، فَقَالَ أَصْحَابُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جُبَيْرٍ: الْغَنِيمَةَ، أَيْ قَوْمِ، الْغَنِيمَةَ!! ظَهَرَ أَصْحَابُكُمْ فَمَا تَنْتَظِرُونَ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جُبَيْرٍ: أَنَسِيتُمْ مَا قَالَ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالُوا: وَاللَّهِ لَنَأْتِيَنَّ النَّاسَ فَلَنُصِيبَنَّ مِنَ الْغَنِيمَةِ، فَأَتَوْهُمْ، فَصُرِفَتْ وُجُوهُهُمْ، وَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ.

واتە: لە برائەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا پەنجا کەسی تیرئەندازی لەسەر کێوێ دانا (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی جوبەیری کردە ئەمیر و فەرماندەیان، پێی فەرموون: (ئەگەر بینیتان باڵندە بە پەلە ئێمەی فڕاند واتە لەجەنگدا شکاین بە هیچ شێوەیە شوێنەکەتان چۆڵ نەکەن و پشتمان بەرنەدەن هەتا هەواڵتان دەدەمێ کە چی بکەن، هەروەها ئەگەر ئەوان شکان و ئێمە سەرکەوتین بەسەریاندا بە هیچ شێوەیە شوێنەکەتان چۆڵ نەکەن هەتا هەواڵتان دەدەمێ کە چی

بکەن). برّاء وتی: خوای گەورە کافرەکانی شکاند، برّاء وتی: سوێند بە (الله) من بە چاوی خۆم بینیم ئافرەتانی کافرەکان هەڵهاتن و بە پەلە سەردەکەوتن بەسەر کێوەکەدا بۆئەوەی خۆیان دەرباز بکەن، هاورێکانی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی جوبەیر وتیان: دەستکەوتی جەنگی، واتە ئەی قەومەکە فریاکەون بگەنە دەستکەوتەکە، موسوڵمانەکان سەرکەوتن ئیتر چاوەڕێی چی دەکەن؟ (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی جوبەیر پێی وتن: لەیادتان چو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی پێ فەرموون؟ وتیان: سوێند بە (الله) دەڕۆین بۆلای خەڵکەکە بۆئەوەی غەنیمەتمان دەستکەوێت، جا هاتن بۆلای خەڵکەکەو شوێنەکەی خۆیان چۆڵ کرد - (عَبْدُ اللَّە)ی کوڕی جوبەیر و چەند کەسێ نەبێ کە ئەوانیش کوژران - ، کاتێ کە دوژمن زانی شوێنەکەیان چۆڵکردوە لەدواوە پەلاماریان دان و موسوڵمانەکان شکان، ئەوانەی کە فەرمانەکەی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) شکاند هیچیان دەست نەکەوت و نەیان دەزانی بەرەو کوێ بڕۆن.

## باسی سەبارەت بە سوپا، کە ڕێك ڕاوەستانە بەرامبەر بە دوژمن.

## ١١٧ - باب فِي الصُّفُوفِ.

**٢٦٦٣ - (صحيح) عن حمزة بن أبي اسيد، عن أبيه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ اصْطَفَفْنَا يَوْمَ بَدْرٍ: (إِذَا أَكْثَبُوكُمْ) يَعْنِي إِذَا غَشُوكُمْ فَارْمُوهُمْ بِالنَّبْلِ، وَاسْتَبْقُوا نَبْلَكُمْ).**

واتە: لە حەمزەی کوڕی ئەبو ئوسەیدەوە، لە باوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە لەڕۆژی جەنگی بەدردا بە چەند ڕیزێ بەرامبەر بە دوژمن راوەستاین، پێغەمبەری خوا

(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (کاتێ کە دوژمن نزیک بووەوە لێتان و تیرەکانتان دەیان گەیشتێ و هەدەفی دەپێکا ئەوکاتە تیربارانیان بکەن، لەدورەوە تیربارانیان مەکەن چونکە دوژمنەکانتان ناپێکن و تیرەکان بە هەدەر(خەسار) دەچن).

## باسی دەربارەی شمشێر دەرکێشان لەکالان لەکاتی بەرەنگاربونەوەی دوژمندا.

## ١١٨ - باب فِي سَلِّ السُّيُوفِ عِنْدَ اللِّقَاءِ.

٢٦٦٤ - (ضعيف) عن مالك بن حمزة بن أبي أسيد الساعدي، عن أبيه، عن جده قال: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ بَدْرٍ: (إِذَا أَكْثَبُوكُمْ فَارْمُوهُمْ بِالنَّبْلِ، وَلاَ تَسُلُّوا السُّيُوفَ حَتَّى يَغْشَوْكُمْ).

واتە: لە مالیکی کوڕی حەمزەی کوڕی ئەبو ئوسەیدی ساعدیەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی جەنگی بەدردا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (کاتێ کە دوژمن نزیك بووەوە لێتان و تیرەکانتان دەیان گەیشتێ ئەوکاتە تیربارانیان بکەن، وە شمشێر دەرمەکێشن لەکالان هەتا لێتان نزیك دەبنەوە).

## باسی سەبارەت بە زۆرانبازی روبەڕوبونەوەی دووكەس لەگەڵ یەكتر لەكاتی جەنگدا بۆ دەرخستنی هێز و توانا.

## ١١٩ - باب فِي الْمُبَارَزَةِ.

٢٦٦٥ - (صحيح) عن علي قال: تَقَدَّمَ - يَعْنِي عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ - وَتَبِعَهُ ابْنُهُ، وَأَخُوهُ، فَنَادَى: مَنْ يُبَارِزُ؟ فَانْتَدَبَ لَهُ شَبَابٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: مَنْ أَنْتُمْ؟ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيكُمْ، إِنَّمَا أَرَدْنَا بَنِي عَمِّنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (قُمْ يَا حَمْزَةُ، قُمْ يَا عَلِيُّ، قُمْ يَا عُبَيْدَةُ بْنَ الْحَارِثِ). فَأَقْبَلَ حَمْزَةُ إِلَى عُتْبَةَ، وَأَقْبَلْتُ إِلَى شَيْبَةَ، وَاخْتُلِفَ بَيْنَ عُبَيْدَةَ وَالْوَلِيدِ ضَرْبَتَانِ، فَأَثْخَنَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ، ثُمَّ مِلْنَا عَلَى الْوَلِيدِ فَقَتَلْنَاهُ، وَاحْتَمَلْنَا عُبَيْدَةَ.

واتە: لە پێشەوا عەلیەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە عوتبەی كوڕی رەبیعەو كوڕەكەی(وەلید)و براكەی(شەیبە) هاتنەپێشەوە بۆ روبەڕوبونەوە، عوتبە بانگی كردو وتی: كێ دێتەپێشەوە بۆ زۆرانیازی و جەنگ و روبەڕوبونەوە؟ سێ گەنج لە ئەنصارەكان چونە پێشەوەو وتیان: ئێمە ئامادەین بۆ جەنگ و بەرەنگاربونەوە، وتیان: ئێوە كێن؟ پێیان راگەیاندن كە لە ئەنصارن، وتیان: ئێوەمان ناوێت، بەڵكو كوڕە مامەكانی خۆمانمان دەوێت واتە قورەیشیەكان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

فەرمووی: (ئەی حەمزە هەستە، ئەی عەلی هەستە، ئەی عوبەیدەی كوڕی (حارِث) هەستە). عەلی وتی: حەمزە بەرەنگاری عوتبە بویەوەو كوشتی، منیش بەرەنگاری شەیبە بومەوەو كوشتم، عوبەیدەش بەرەنگاری وەلید بویەوەو یەكی سەرو شمشێرێن لەیەكتردا یەكتریان بریندار كرد، ئێمەش هەردوكمان نیشتینەسەر وەلیدو كوشتمان. عوبەیدەمان هەڵگرت و لەگۆڕەپانی جەنگەكە بردمانە دەرەوە.

## باسی سەبارەت بە قەدەغەكردنی ئەتك كردنی كوژراو وەك: بڕینی گوێ و لوتی یان هەر ئەندامێكی تری جەستەی.

## ١٢٠ – باب فِي النَّهْيِ عَنِ الْمُثْلَةِ.

**٢٦٦٦ - (ضعيف) عن عبد الله قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (أَعَفُّ النَّاسِ قِتْلَةً أَهْلُ الإِيمَانِ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) — ی كوڕی مەسعود - وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خەڵكی باوەڕدار لەهەموو كەس زیاتر بەبەزەییە لەكوشتنەوەدا.

**٢٦٦٧ - (صحيح) عن الهياج بن عمران: أَنَّ عِمْرَانَ أَبَقَ لَهُ غُلاَمٌ فَجَعَلَ لِلَّهِ عَلَيْهِ، لَئِنْ قَدَرَ عَلَيْهِ لَيَقْطَعَنَّ يَدَهُ، فَأَرْسَلَنِى لأَسْأَلَ لَهُ فَأَتَيْتُ سَمُرَةَ بْنَ جُنْدَبٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى**

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحُثُّنَا عَلَى الصَّدَقَةِ وَيَنْهَانَا عَنِ الْمُثْلَةِ، فَأَتَيْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَحُثُّنَا عَلَى الصَّدَقَةِ، وَيَنْهَانَا عَنِ الْمُثْلَةِ.

واتە: لە هەییاجی کوڕی عیمرانەوە دەگێرنەوە، کە غولامێکی باوکی هەڵهاتبو ئەویش (نذری) کرد ئەگەر گرتیەوە دەستی ببڕێت لەتۆڵەی ئەوەدا کە هەڵهاتوە، باوکم منی نارد هەتا لەوبارەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بپرسم، منیش چوم بۆلای سەمورەی کوڕی جوندوب لەوبارەوە لێم پرسی، سەمورە وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هانی دەداین کە چاکەو خێرو خێرات بکەین، وە ئەتك کردنی کوژراوی لێ قەدەغەکردوین، هەروەها چوم بۆلای عیمرانی کوڕی حوصەین لەوبارەوە لێم پرسی، ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هانی دەداین کە چاکەو خێرو خێرات بکەین، وە ئەتك کردنی کوژراوی لێ قەدەغەکردوین.

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی کوشتنی ئافرەتان لەجەنگدا.

## ١٢١ - باب فِي قَتْلِ النِّسَاءِ.

٢٦٦٨ - (صحيح) عن عبد الله: أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.

واته: له (عَبْدُ اللَّهِ)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لەیەکێ لەغەزاکانی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لاشەی ئافرەتێك بە کوژراوی دۆزرایەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئینکاری ئەو کارەی کردو زۆری پێ ناخۆش بوو، جا کوشتنی ئافرەت و منداڵی قەدەغەکرد – ئەگەر جەنگاوەر نەبن – .

**٢٦٦٩ - (حسن صحيح) عن رباح بن ربيع قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةٍ، فَرَأَى النَّاسَ مُجْتَمِعِينَ عَلَى شَيْءٍ فَبَعَثَ رَجُلاً فَقَالَ: (انْظُرْ عَلاَمَ اجْتَمَعَ هَؤُلاَءِ؟) فَجَاءَ، فَقَالَ: عَلَى امْرَأَةٍ قَتِيلٍ، فَقَالَ: (مَا كَانَتْ هَذِهِ لِتُقَاتِلَ!). قَالَ: وَعَلَى الْمُقَدِّمَةِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ، فَبَعَثَ رَجُلاً، فَقَالَ: (قُلْ لِخَالِدٍ: لاَ يَقْتُلَنَّ امْرَأَةً وَلاَ عَسِيفًا).**

واته: له ڕەباحی کوڕی ڕەبیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەیەکێ لە غەزاکاندا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووین، بینی خەڵك لەدەوری شتێك کۆبونەتەوە، ئەویش پیاوێکی نارد فەرمووی: (سەرنج بدەو بزانە ئەو خەڵکە بۆچی کۆبونەتەوە؟)، ئەویش ڕۆشت و هاتەوە وتی: لەدەوری ئافرەتێکی کوژراو کۆبونەتەوە، فەرمووی: (ئەوە نەدەبوو بکوژرایە!)، وتی: خالیدی کوڕی وەلید سەرکردەی سوپاکەیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی نارد بۆلای، فەرمووی: (بڵێ بە خالید: با ئافرەت و کرێ گرتە نەکوژێت – ئەگەر جەنگاوەر نەبوون و بۆ خزمەتکردن هاتبوون – ).

**٢٦٧٠ - (ضعيف) عن سمرة بن جندب قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اقْتُلُوا شُيُوخَ الْمُشْرِكِينَ وَاسْتَبْقُوا شَرْخَهُمْ).**

واتە: لە سەمورەی كوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لەكاتی جەنگدا پیرو بەساڵاچوانی هاوبەش بۆ خوا دانەران بكوژن ئەوانەی كە توانای شەڕكردنیان هەیە یان راو بۆچونیان لیّ وەربگیرێت - واتە لەجەنگدا خەبیر بوون - ، بەڵام ئەو منداڵانە مەكوژن كە نەگەیشتونەتە تەمەنی باڵغ بوون و خزمەتكارن ئەگەر جەنگاوەر نەبوون).

**٢٦٧١ - (صحيح) عن عائشة قالت: لَمْ يُقْتَلْ مِنْ نِسَائِهِمْ - تَعْنِي بَنِي قُرَيْظَةَ - إِلاَّ امْرَأَةٌ، إِنَّهَا لَعِنْدِي تُحَدِّثُ: تَضْحَكُ ظَهْرًا وَبَطْنًا، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْتُلُ رِجَالَهُمْ بِالسُّيُوفِ إِذْ هَتَفَ هَاتِفٌ بِاسْمِهَا: أَيْنَ فُلاَنَةُ؟ قَالَتْ: أَنَا، قُلْتُ: وَمَا شَأْنُكِ؟ قَالَتْ: حَدَثٌ أَحْدَثْتُهُ، قَالَتْ: فَانْطَلَقَ بِهَا، فَضُرِبَتْ عُنُقُهَا، فَمَا أَنْسَى عَجَبًا مِنْهَا: أَنَّهَا تَضْحَكُ ظَهْرًا وَبَطْنًا وَقَدْ عَلِمَتْ أَنَّهَا تُقْتَلُ!.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: كاتیّ كە پیاوەكانی (بَنِي قُرَيْظَةَ)یان كوشت، ئافرەتەكانیان نەكوشتن تەنها یەك ئافرەتیان نەبێت، ئەو ئافرەتە لەلای من بوو كە قسەی دەكرد ئەوەندە پێدەكەنی دەچو بە پشتا یان زۆر شادومان و خۆشحاڵ بوو، لەكاتێكدا كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پیاوەكانیانی بە شمشێر دەكوشت، لەو كاتەدا جارچیەك جاڕیدا بەناوی ئەو ئافرەتەوە دەیوت: فلاّنە ئافرەت لەكوێیە؟ وتی: منم، عائیشە وتی: منیش وتم: ئەوە چیتە بۆچی دەتكوژن لەكاتێكدا كە ئافرەتان ناكوژن؟ وتی: قسەیەكە كردومە — بێگومان جنێوی دابوو بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) - ، عائیشە وتی: بردیان دایان لەملی و كوشتیان، لەیادم ناچیّ و زۆرم

پیَ سەیر بوو کە قسەی دەکرد ئەوەندە پێدەکەنی دەچوو بە پشتا یان زۆر شادومان و خۆشحاڵ بوو، لەکاتێکدا کە دەیزانی دەیکوژن و پیاوەکانیشیان دەکوژران.

**٢٦٧٢ - (صحيح) عن الصعب بن جثامة: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الدَّارِ مِنَ الْمُشْرِكِينَ يُبَيَّتُونَ، فَيُصَابُ مِنْ ذَرَارِيِّهِمْ وَنِسَائِهِمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هُمْ مِنْهُمْ). وَكَانَ عَمْرٌو - يَعْنِي ابْنَ دِينَارٍ - يَقُولُ: هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: ثُمَّ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ.**

واتە: صەعبی کوڕی (جثامة) دەڵێت: لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پرسیار کرا سەبارەت بەوەی کە سوپای ئیسلام بەشەو لەناکاو دەدات بەسەر ماڵی هاوبەش بۆ خوا دانەراندا ئافرەتان و ژن و منداڵانیان بەردەکەون و دەکوژرێن ئەوە حوکمی چۆنە؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەوانیش لەوانن - واتە حوکمی ئەوانیان هەیە ئەگەر بە ئەنقەست نەکوژرێن - )، عەمری کوڕی دینار وتی: ئەوانیش حوکمی باب و باپیرانیان هەیە. پێشەوا زوهری وتی: لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کوشتنی منداڵ و ئافرەتانی قەدەغەکرد.

# باسی سەبارەت بە ناپەسەندی سوتاندنی دوژمن بە ئاگر.

# ١٢٢ - باب فِي كَرَاهِيَةِ حَرْقِ الْعَدُوِّ بِالنَّارِ.

**٢٦٧٣ - (صحيح) عن محمد بن حمزة الأسلمي، عن أبيه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَّرَهُ عَلَى سَرِيَّةٍ، قَالَ: فَخَرَجْتُ فِيهَا، وَقَالَ: (إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا فَاحْرِقُوهُ بِالنَّارِ). فَوَلَّيْتُ، فَنَادَانِي، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: (إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا فَاقْتُلُوهُ وَلاَ تُحْرِقُوهُ، فَإِنَّهُ لاَ يُعَذِّبُ بِالنَّارِ إِلاَّ رَبُّ النَّارِ).**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی حەمزەی ئەسلەمییەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشکرێکی نارد بۆ کوشتنی پیاوێ فەرمانی کرد بە حەمزەی ئەسلەمی ببێتە فەرماندەیان، حەمزەی ئەسلەمی وتی: منیش لەگەڵ لەشکرەکە دەرچوم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر فلانە کەستان دی بیسوتێنن بە ئاگر)، کاتێ کە کەوتمەڕێ، بانگی کردم، منیش گەڕامەوە بۆ خزمەتی، فەرمووی: (ئەگەر فلانە کەستان دی بیکوژن بە ئاگر مەیسوتێنن، چونکە بەڕاستی هیچ کەسێك بۆی نیە سزاو ئازاری هیچ ڕۆح لەبەرێك بدات بە ئاگر جگە لە خاوەنی ئاگر نەبێت کە (الله)یە).

**٢٦٧٤ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي بَعْثٍ فَقَالَ: (إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ لەشکرێکدا ناردینی فەرمووی: (ئەگەر فلان و فلانتان دی ...). جا راوی فەرموودەکەی پێشوی بە هەمان مانا گێڕایەوە.

**٢٦٧٥ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن عبد الله، عن أبيه قال: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ، فَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ، فَرَأَيْنَا حُمَّرَةً مَعَهَا فَرْخَانِ، فَأَخَذْنَا فَرْخَيْهَا، فَجَاءَتِ الْحُمَّرَةُ، فَجَعَلَتْ تَفْرُشُ، فَجَاءَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَنْ فَجَعَ هَذِهِ بِوَلَدِهَا؟ رُدُّوا وَلَدَهَا إِلَيْهَا). وَرَأَى قَرْيَةَ نَمْلٍ قَدْ حَرَّقْنَاهَا، فَقَالَ: (مَنْ حَرَّقَ هَذِهِ؟). قُلْنَا: نَحْنُ، قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ رَبُّ النَّارِ).**

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە، لەباوکیەوە - واتە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی مەسعود - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بووین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرچو بۆ سەرئاو، باڵندەیەکی بچوکی وەك چۆلەکەمان دی دوو بەچکەی لەگەڵ بوو، بەچکەکانمان گرت، دایکەکەیان هات بەدەورماندا باڵەکانی بڵاوکردبنەوە لەزەوی نزیك بوو بۆوە دەستی کرد بە باڵە تەپە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتەوە فەرمووی: (ئەوە کێ ئەو کارەساتەی بەسەر ئەو باڵندەیەدا هێناوەو بەچکەکانی لێ سەندوە؟ با بۆی بگێڕێتەوە). سەیری کرد شارە مێرولەیەکیان سوتاندوە، فەرمووی: (کێ ئەمەی سوتاندوە؟)، وتمان: ئێمە، فەرمووی: (بەڕاستی هیچ کەسێك بۆی نیە سزاو ئازاری هیچ رۆح لەبەرێك بدات بە ئاگر جگە لە خاوەنی ئاگر نەبێت کە (اللە)یە).

## باسی دەربارەی کەسێ وڵاخەکەی بدات بە کرێ بە نیوەیی یان بە بەش(سهم)ی دەستکەوتەکە.

## ١٢٣ - باب فِي الرَّجُلِ يُكْرِي دَابَّتَهُ عَلَى النِّصْفِ أَوِ السَّهْمِ.

٢٦٧٦ - (صحيح) عن واثلة بن الأسقع قال: نَادَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَخَرَجْتُ إِلَى أَهْلِي، فَأَقْبَلْتُ وَقَدْ خَرَجَ أَوَّلُ صَحَابَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَطَفِقْتُ فِي الْمَدِينَةِ أُنَادِي: أَلاَ مَنْ يَحْمِلُ رَجُلاً لَهُ سَهْمُهُ، فَنَادَى شَيْخٌ مِنَ الأَنْصَارِ قَالَ: لَنَا سَهْمُهُ عَلَى أَنْ نَحْمِلَهُ عَقَبَةً وَطَعَامُهُ مَعَنَا، قُلْتُ: نَعَمْ . قَالَ: فَسِرْ عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ تَعَالَى. قَالَ: فَخَرَجْتُ مَعَ خَيْرِ صَاحِبٍ حَتَّى أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْنَا فَأَصَابَنِي قَلاَئِصُ فَسُقْتُهُنَّ حَتَّى أَتَيْتُهُ، فَخَرَجَ فَقَعَدَ عَلَى حَقِيبَةٍ مِنْ حَقَائِبِ إِبِلِهِ، ثُمَّ قَالَ: سُقْهُنَّ مُدْبِرَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: سُقْهُنَّ مُقْبِلاَتٍ، فَقَالَ: مَا أَرَى قَلاَئِصَكَ إِلاَّ كِرَامًا، قَالَ: إِنَّمَا هِيَ غَنِيمَتُكَ الَّتِي شَرَطْتُ لَكَ، قَالَ: خُذْ قَلاَئِصَكَ يَا ابْنَ أَخِي فَغَيْرَ سَهْمِكَ أَرَدْنَا.

واتە: لە (واثلـة)ی کوڕی ئەسقەعەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کـە پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جاڕی دا بۆ غەزای تەبوك، منیش ڕۆشـتم بـۆ نـاو کەسـوکارەکەم هەتا وڵاخێکی سواری پەیدا بکـەم و خـۆم ئامادەکـەم بـۆ جیهـاد، جـا یەکـەم هـاوەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەرچو بۆ غەزا من هەر لەناو مەدینـەدا دەسـوڕامەوە هاوارم دەکرد: ئەوە کەسێ نیە پیاوێ سواری وڵاخەکەی بکات لـەبرێتی دا بەش(سـهم)ی دەستکەوتەکەی بداتێ، پیاوێکی بە تەمـەن لـە ئەنصـارەکان هـاواری کـرد وتـی: مـن دەتدەمێ بەمەرجێ بەش(سهم)ی دەستکەوتەکە بۆ ئێمە بێ و خواردنەکەشی لەلای ئێمـە بێت و لای ئێمە بخوات و بە نۆبە سواری وڵاخەکە بن جارێ تۆ و جارێکی تر کەسێکی تر. وتم: بەڵێ ڕازیم، وتی: دەی با لەسەر بەرەکەتی خوای گەورە بەرێکەوین بۆ غەزا، منـیش لەگەڵ چاکترین هاوڕێدا پێکهاتم، هەتا خوای گەورە لە دەستکەوتی جەنگی پێی بەخشین، وشترێکی لاوم بەرکەوت، لێم خوڕی هەتا هات، کابرای ئەنصـاری دەرچـو لەسـەر بەشـی دواوەی کۆپانی وشترەکەی دانیشت، ئینجا وتی: ئادەی بۆ پاشەوە لێخوڕە، لەپاشدا وتـی: ئادەی بۆ پێشەوە لێخوڕە، وتی: پێم وایە وشترەکەت وشترێکی ڕەسـەن و چـاکە، (واثلـة) وتی: ئەمە بەش(سهم)ی تۆیە کە مەرجمان ئەوە بوو بۆ تـۆ بێـت، وتـی: ئـەی برازاکـەم وشترەکە بۆ خۆت جگە لەو بەش(سهم)ەمان دەوێت واتە پاداشتی قیامـەتم دەوێـت نـەك دونیا.

## باسی سەبارەت بە کۆت و زنجیرکردنی دیل.

## ١٢٤ – باب فِي الأَسِيرِ يُوثَقُ.

٢٦٧٧ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: سمعت رسول الله صلى الله عليه و سلم يقول: (عَجِبَ رَبُّنَا عَزَّ وَجَلَّ مِنْ قَوْمٍ يُقَادُونَ إِلَى الْجَنَّةِ فِي السَّلاَسِلِ).

واتە: لە ئەبو هوردیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (خوای گەورە زۆر پێی چاکەو رازیە کەکۆمەڵێ بە کۆت و زنجیر کراوی رایاندەکێشن بۆ بەهەشت — واتە کاتێ کە دیلی دەکەن کۆت و زنجیری دەکەن و رایدەکێشن لەپاشدا موسوڵمان دەبێ و دەچێت بۆ بەهەشت -.

٢٦٧٨ - (ضعيف) عن جندب بن مكيث قال: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ غَالِبٍ اللَّيْثِيَّ فِي سَرِيَّةٍ، وَكُنْتُ فِيهِمْ، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشُنُّوا الْغَارَةَ عَلَى بَنِي الْمُلَوَّحِ بِالْكَدِيدِ، فَخَرَجْنَا، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْكَدِيدِ لَقِينَا الْحَارِثَ بْنَ الْبَرْصَاءِ اللَّيْثِيَّ، فَأَخَذْنَاهُ، فَقَالَ إِنَّمَا جِئْتُ أُرِيدُ الإِسْلاَمَ، وَإِنَّمَا خَرَجْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْنَا: إِنْ تَكُنْ مُسْلِمًا لَمْ يَضُرَّكَ رِبَاطُنَا يَوْمًا وَلَيْلَةً، وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ نَسْتَوْثِقْ مِنْكَ، فَشَدَدْنَاهُ وِثَاقًا.

واتە: لە جوندوبی كوڕی (مكيث)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە فەرماندەیی (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی غالبی (الليثي) كۆمەڵێكی نارد، منيش لەناو ئەو كۆمەڵەدا بووم، فەرمانی پێ كرد لەناكاو بدات بەسەر (بَنِي الْمُلَوِّح)دا لە كەديد، ئێمەش دەرچوين، هەتا لە كەديد گەيشتين بە (حارث)ی كوڕی (برصاء)ی (الليثي). گرتمان، وتی: بەڕاستی هاتوم بۆ ئەوەی موسوڵمان ببم و بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتوم، وتمان: ئەگەر تۆ موسوڵمانی، ئەوە شەو و ڕۆژێ بەستنەوەت زيانت پێ ناگەيەنێت، ئەگەر موسوڵمانيش نەبويت ئەوە ئێمە دڵنيا دەبين لەوەی كە ڕاناكەيت، بۆيە بە توندی بەستمانەوە.

٢٦٧٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْلاً قِبَلَ نَجْدٍ، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ: ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ سَيِّدُ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (مَاذَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟). قَالَ عِنْدِي يَا مُحَمَّدُ خَيْرٌ، إِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ، وَإِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ، فَتَرَكَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا كَانَ الْغَدُ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: (مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟). فَأَعَادَ مِثْلَ هَذَا الْكَلاَمِ فَتَرَكَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْغَدِ فَذَكَرَ مِثْلَ هَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَطْلِقُوا ثُمَامَةَ). فَانْطَلَقَ إِلَى نَخْلٍ قَرِيبٍ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ فِيهِ،

ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَقَالَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ. قَالَ عِيسَى أَخْبَرَنَا اللَّيْثُ وَقَالَ ذَا ذِمٍّ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵێك ئەسپ سواری بەرەو نەجد نارد، پیاوێکیان لە بەنی حەنیفە هێنا ناوی: (ثمامة)ی کوڕی (أثال) بوو گەورەی خەڵکی یەمامەبوو، بەستیانەوە بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چو بۆلای فەرمووی: (ئەی (ثمامة) چیت لەدڵدایەو پێت وایە چیت لێ دەکەین؟). وتی: ئەی موحەممەد ئومێدی خەیر و چاکەت لێ دەکەم، چونکە تۆ زوڵم و ستەم لەکەس ناکەیت و لێبوردەیت، ئەوەی دەیکوژی لەبەر ئەوە دەیکوژی شایەنی کوشتنە، لەسەر ئەوە سەرزەنشت ناکرێیت، ئەوەی پیاوەتی لەگەڵ دەکەی ئەوە مایەی سوپاسە بۆ تۆ و شانازی و خۆشحاڵیە بۆ ئەو، خۆ ئەگەر ماڵ و سامانت دەوێ چەندە حەزدەکەیت داوابکە پێت دەدەم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وازی لێ هێنا، ڕۆژی دواتر هاتەوە بۆلای پێی فەرموو: (ئەی (ثمامة) پێت وایە چیت لێ دەکەین؟). وتی: هەر ئەوەیە کە پێم گوتیت، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وازی لێ هێنا، سێیەم ڕۆژ هاتەوە بۆلای هەمان وتەی پێ فەرموو، (ثمامة)یش هەمان وەڵامی هەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((ثمامة) بەردەن). جا (ثمامة) ڕۆشت بۆ ناو باخە خورمایەکی نزیك مزگەوتەکە لەوێ خۆی شت، لەپاشدا هاتەوە چوە ناو مزگەوتەوە وتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). واتە: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله). وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە. جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە، عیسا وتی: لە (لیث)ەوە (ذَا دَمٍ) بە (ذَا ذِمٍّ) هاتوە.

٢٦٨٠ - (ضعيف) عن يحيى بن عبد الله بن عبد الرحمن بن سعد بن زرارة قال: قُدِمَ بِالأُسَارَى حِينَ قُدِمَ بِهِمْ وَسَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ عِنْدَ آلِ عَفْرَاءَ فِي مُنَاخِهِمْ عَلَى عَوْفٍ وَمُعَوِّذٍ ابْنَيْ عَفْرَاءَ، قَالَ: وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُضْرَبَ عَلَيْهِنَّ الْحِجَابُ، قَالَ: تَقُولُ سَوْدَةُ: وَاللَّهِ إِنِّي لَعِنْدَهُمْ إِذْ أَتَيْتُ فَقِيلَ: هَؤُلاَءِ الأُسَارَى قَدْ أُتِيَ بِهِمْ، فَرَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهِ، وَإِذَا أَبُو يَزِيدَ سُهَيْلُ بْنُ عَمْرٍو فِي نَاحِيَةِ الْحُجْرَةِ مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ بِحَبْلٍ. ثُمَّ ذَكَرَ الْحَدِيثَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُمَا قَتَلاَ أَبَا جَهْلِ بْنَ هِشَامٍ وَكَانَا انْتَدَبَا لَهُ وَلَمْ يَعْرِفَاهُ، وَقُتِلاَ يَوْمَ بَدْرٍ.

واتە: لە یەحیای کوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی (عَبْدُ الرحمن)ی کوڕی سەعدی کوڕی زوراره‌وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە دیلەکانی غەزای بەدریان هێنا لەوکاتەدا کە هێنانیان سەودەی کچی زەمعە لەلای (آلِ عَفْرَاء) بوو، هەر لەوکاتەدا عەوف و (مُعَوِّذ)ی کوڕی (عَفْرَاء) لەناو (پەچە)ی وشترەکاندا بوون — (مبرك) جێگەی وشتر بەستنەوەو مۆڵدانیان - ، وتی: ئەمە لەپێش ئەوەدا بوو کە (حجاب) فەرز بکرێت لەسەر ئافرەتان، وتی: سەودە وتی: سوێند بە (اللَّه) من لەلای ئەوان بووم یەکێ هات بۆلام وتی: ئەوانە دیلەکانن هێناویانن، منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەکەی خۆم بینیم پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەوێیەو، ئەبو یەزیدی سوهەیلی کوڕی عەمر لە سوچێکی هۆدەکەدا هەردوو دەستی بە کۆکراوەیی بە حەبلێ شەتەك درابوو بەملیەوە. جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە. ئەبو داود دەڵێت: عەوف و (مُعَوِّذ) ئەو دوو کەسە بوون کە ئەبو جەهلیان کوشت، لەجەنگی بەدردا ئەبو جەهلیان نەدەناسی ئەوەبوو ئەگەڕان بەدوایاو هەواڵیان

دەپرسی بۆ ئەوەی بیکوژن — سەرەنجام (عبد الرحمن)ی کوڕی عەوف نیشانی دان - ئەوانیش پەلاماریان داو بە شمشێر کوشتیان.

## باسی سەبارەت بە دیل کە لێی دەدرێت و دەربارەی هەواڵی دوژمن پرسیاری لیٚ دەکرێت.

## ١٢٥ – باب فِي الأَسِيرِ يُنَالُ مِنْهُ وَيُضْرَبُ وَيُقَرَّرُ.

٢٦٨١ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَدَبَ أَصْحَابَهُ فَانْطَلَقُوا إِلَى بَدْرٍ، فَإِذَا هُمْ بِرَوَايَا قُرَيْشٍ فِيهَا عَبْدٌ أَسْوَدُ لِبَنِي الْحَجَّاجِ، فَأَخَذَهُ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجَعَلُوا يَسْأَلُونَهُ أَيْنَ أَبُو سُفْيَانَ؟ فَيَقُولُ: وَاللَّهِ مَا لِي بِشَيْءٍ مِنْ أَمْرِهِ عِلْمٌ، وَلَكِنْ هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ جَاءَتْ، فِيهِمْ أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ ابْنَا رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، فَإِذَا قَالَ لَهُمْ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ، فَيَقُولُ: دَعُونِي دَعُونِي أُخْبِرْكُمْ، فَإِذَا تَرَكُوهُ قَالَ: وَاللَّهِ مَا لِي بِأَبِي سُفْيَانَ مِنْ عِلْمٍ، وَلَكِنْ هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ أَقْبَلَتْ، فِيهِمْ أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ ابْنَا رَبِيعَةَ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، قَدْ أَقْبَلُوا. وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي، وَهُوَ يَسْمَعُ ذَلِكَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لَتَضْرِبُونَهُ إِذَا صَدَقَكُمْ، وَتَدَعُونَهُ إِذَا

**كَذَبَكُمْ، هَذِهِ قُرَيْشٌ قَدْ أَقْبَلَتْ، لِتَمْنَعَ أَبَا سُفْيَانَ). قَالَ أَنَسٌ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ غَدًا). وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ، (وَهَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ غَدًا). وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ، (وَهَذَا مَصْرَعُ فُلَانٍ غَدًا). وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا جَاوَزَ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَرَ بِهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأُخِذَ بِأَرْجُلِهِمْ، فَسُحِبُوا، فَأُلْقُوا فِي قَلِيبِ بَدْرٍ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاوەڵەکانی بانگ کردو دەرچوون بۆ بەدر - بۆ ئەوەی ڕێ لەکاروانیە بازرگانیەکەی ئەبو سوفیان بگرن کە لەشام گەڕابووەوە - ، هاوەڵان گەیشتن بە ئاوکێشەکانی قورەیش بەندەیەکی ڕەشیان لە هۆزی حەججاج تێدا بوو گرتیان، دەربارەی ئەبو سوفیان و کاروانەکی پرسیاریان لێ کرد وتیان: ئەبو سوفیان لە کوێیە؟ وتی: سوێند بە (الله) هیچ هەواڵی نازانم و ئاگام لێی نیە، بەڵام ئەوە قورەیشە هاتوە بۆ جەنگ، ئەبو جەهل و عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەیان لەناودایە، لەگەڵ ئومەییەی کوڕی خەڵەف، کاتێ کە ئەوەی پێ وتن دەستیان کرد بەلێدانی، وتی: وازم لێ بێن، وازم لێ بێن هەواڵتان دەدەمێ، کاتێ کە وازیان لێ هێنا وتی: سوێند بە (الله) هیچ هەواڵێکی ئەبو سوفیان نازانم، بەڵام ئەوە قورەیشە هاتوە، ئەبو جەهل و عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەیان لەناودایە، لەگەڵ ئومەییەی کوڕی خەڵەف، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد، گوێی لە قسەکانیان بوو، کاتێ کە سەلامی دایەوە فەرمووی: (سوێند بەو (الله)یەی کە گیانی منی بەدەستە کاتێ کە قسەی ڕاستی بۆ دەکردن ئێوە لێتان دەدا، کاتێ کە درۆی بۆ دەکردن ئێوە وازتان لێ دەهێنا، ئەوە قورەیشە هاتوە بۆ ئەوەی ئەبو

سوفیان و کاروانەکەی رزگار بکات لەدەستان). ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەمە شوێنی کوشتنی فلاّنە کەسە کە بەیانی لێرەدا دەکوژرێت). دەستی دەخستە سەر زەوی واتە ئەو شوێنە، (وە ئەمە شوێنی کوشتنی فلاّنە کەسە کە بەیانی لێرەدا دەکوژرێت). دەستی دەخستە سەر زەوی واتە ئەو شوێنە، (وە ئەمە شوێنی کوشتنی فلاّنە کەسە کە بەیانی لێرەدا دەکوژرێت). دەستی دەخستە سەر زەوی واتە ئەو شوێنە، ئەنەس وتی: سوێند بە (اللە) کە گیانی منی بەدەستە، هەموو یەکێ لەوانە لەشوێنی دیاریکراوی خۆیدا کوژرا ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستی لەسەر دانابوو، زیادو کەمی نەبوو، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردن قاچیان بگرن و رایان کێشن بیانخەنە ناو بیرەکانی بەدر ئەو بیرانەی کە هەڵنەچنربون.

## باسی سەبارەت بە ئایا دیل زۆری لێ دەکرێت موسوڵمان ببێت یان نا؟

## ١٢٦ - باب فِي الأَسِيرِ يُكْرَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ.

٢٦٨٢ - (صحيح) عن ابن عباس قال: كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَكُونُ مِقْلاَتًا، فَتَجْعَلُ عَلَى نَفْسِهَا إِنْ عَاشَ لَهَا وَلَدٌ أَنْ تُهَوِّدَهُ، فَلَمَّا أُجْلِيَتْ بَنُو النَّضِيرِ كَانَ فِيهِمْ مِنْ أَبْنَاءِ الأَنْصَارِ، فَقَالُوا: لاَ نَدَعُ أَبْنَاءَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ﴾. قَالَ أَبُو دَاوُدَ الْمِقْلاَتُ الَّتِى لاَ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ژنێ - لە ئەنصار - منداڵی بۆ نەدەما، لەسەر خۆی (نذر) کرد کە ئەگەر منداڵێکی بۆ بمێنێ بیکاتە جولەکە، کاتێ کە جولەکەکانی (بنو نضیر) چۆڵیان کردو رۆشتن، ئەنصارەکان وتیان: ئێمە منداڵەکانی خۆمان نادەین بیان بەن لەگەڵ خۆتان ئەو منداڵانەی کە بوبون بە جولەکە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ﴾. سورة البقرة: ٢٥٦. واتە: بە هیچ جۆرێك زۆر لێکردن لەدیندا نیە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام) چونکە بەڕاستی لەیەك جیابۆتەوە رێنمونی و شارەزایی لە گومڕایی و سەرلێشێواوی.

ئەبو داود دەڵێت: (الْمِقْلاَتُ) ئەو ژنانەن کە منداڵیان بۆ نامێنێ.

**٢٦٨٣ - (صحيح) عن سعد قال: لَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ أَمَّنَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ إِلاَّ أَرْبَعَةَ نَفَرٍ وَامْرَأَتَيْنِ، وَسَمَّاهُمْ وَابْنُ أَبِي سَرْحٍ. فَذَكَرَ الْحَدِيثَ، قَالَ: وَأَمَّا ابْنُ أَبِي سَرْحٍ فَإِنَّهُ اخْتَبَأَ عِنْدَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَلَمَّا دَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النَّاسَ إِلَى الْبَيْعَةِ، جَاءَ بِهِ حَتَّى أَوْقَفَهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ، يَا نَبِيَّ اللَّهِ بَايِعْ عَبْدَ اللَّهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ ثَلاَثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَأْبَى عَلَيهِ، فَبَايَعَهُ بَعْدَ ثَلاَثٍ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: (أَمَا كَانَ فِيكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ يَقُومُ إِلَى هَذَا حَيْثُ رَآنِي كَفَفْتُ يَدِي عَنْ بَيْعَتِهِ فَيَقْتُلُهُ؟). فَقَالُوا: مَا نَدْرِي يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا فِي نَفْسِكَ، أَلاَ أَوْمَأْتَ إِلَيْنَا بِعَيْنِكَ، قَالَ: (إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لِنَبِيٍّ أَنْ تَكُونَ لَهُ خَائِنَةُ الأَعْيُنِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ**

**أَخَا عُثْمَانَ مِنَ الرَّضَاعَةِ، وَكَانَ الْوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ أَخَا عُثْمَانَ لأُمِّهِ، وَضَرَبَهُ عُثْمَانُ الْحَدَّ إِذْ شَرِبَ الْخَمْرَ.**

واتە: لە سەعدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەمانی دا بە هەموو خەڵك واتە بێ ترسی و دڵنیایی لەوەی کە نەکوژرێن جگە لە چوار پیاو و دوو ئافرەت نەبێ کە ناوی هێنان لەگەڵ ئیبنو ئەبو سەرح، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە، وتی: ئیبنو ئەبو سەرح لەلای پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ خۆی شاردبۆوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خەڵکی بانگ کرد بۆئەوەی پەیمان(بیعە)یان لێ وەرگرێت و بێنە ناو ئیسلامەوە، پێشەوا (عُثْمَان) ئیبنو ئەبو سەرحی هێنا هەتا لەبەردەم پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) رایوەستاند، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پەیمان(بیعە) لە (عبد الله) وەربگرە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سێ جار سەری بەرزکردەوەو، سەیری (عبد الله)ی کرد، نەیویست پەیمان(بیعە)ی لێ وەربگرێت، لەپاش سێ جارەکە پەیمان(بیعە)ی لێ وەرگرت، ئینجا ئاوڕی دایەوە بەلای هاوەڵانیدا فەرمووی: (ئەوە پیاوێکی هۆشیار و عاقڵتان تێدا نەبوو لەکاتێکدا کە من سێ جار دەستم گێڕایەوەو پەیمان(بیعە)م لێ وەرنەگرت بدات لەملی و بیکوژێ؟). وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەمانزانی چی لەدڵتدایەو مەبەستت چییە، بۆچی بە چاو ئاماژەت پێ نەکردین، فەرمووی: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە چاوی خیانەتکار بێت).

ئەبو داود دەڵێت: ئیبنو ئەبو سەرح برای شیری پێشەوا (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان بوو، وەلیدی کوڕی عوقبەش برای دایکی بوو، پێشەوا (عُثْمَان) داری (حد)سزاو تۆڵەی لێ دا کاتێ کە مەیی خواردبووە.

# باسی سەبارەت بە کوشتنی دیل پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت موسوڵمان ببێت.

## ١٢٧ - باب قَتْلِ الأَسِيرِ وَلاَ يُعْرَضُ عَلَيْهِ الإِسْلاَمُ.

٢٦٨٤ - (صحيح) عن عمرو بن عبد الرحمن بن سعيد بن يربوع المخزومي قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: (أَرْبَعَةٌ لاَ أُؤْمِنُهُمْ فِي حِلٍّ وَلاَ حَرَمٍ). فَسَمَّاهُمْ. قَالَ وَقَيْنَتَيْنِ كَانَتَا لِمِقْيَسٍ فَقُتِلَتْ إِحْدَاهُمَا وَأُفْلِتَتِ الأُخْرَى فَأَسْلَمَتْ.

واتە: لە عەمری کوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەعیدی کوڕی یەربوعی مەخزومیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (چوار لەوانە ئەمانیان پێ نادەم لەهەرکوێ دەستان کەوتن بیان کوژن). ناوی هێنان، وتی: لەگەڵ دوو کەنیزەکی گۆرانی بێژدا کە هی میقیەس بوون یەکێکیان کوژراو ئەوی تریان دەربازی بوو سەرەنجام موسوڵمان بوو.

٢٦٨٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ، فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: (اقْتُلُوهُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: ابْنُ خَطَلٍ اسْمُهُ عَبْدُ اللَّهِ، وَكَانَ أَبُو بَرْزَةَ الأَسْلَمِيُّ قَتَلَهُ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوە ناو شاری مەککەوە لەڕۆژی رزگارکردنیدا کڵاو و زریەیەکی لەسەردا بوو، کە کڵاو و زریەکی لەسەری داکەند، پیاوێ هات وتی: (ابْنُ خَطَلٍ) پەنای بردۆتە بەر کەعبە، فەرمووی: (بیکوژن). ئەبو داود دەڵێت: (ابْنُ خَطَلٍ) ناوی (عبد الله) بوو، ئەبو بەرزەی ئەسلەمی کوشتی.

## باسی سەبارەت بە بەستنەوەی دیل و کوشتنی.

## ١٢٨ - باب فِي قَتْلِ الأَسِيرِ صَبْرًا.

٢٦٨٦ - (حسن صحيح) عن إبراهيم قال: أَرَادَ الضَّحَّاكُ بْنُ قَيْسٍ أَنْ يَسْتَعْمِلَ مَسْرُوقًا، فَقَالَ لَهُ عُمَارَةُ بْنُ عُقْبَةَ: أَتَسْتَعْمِلُ رَجُلاً مِنْ بَقَايَا قَتَلَةِ عُثْمَانَ؟ فَقَالَ لَهُ مَسْرُوقٌ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ - وَكَانَ فِي أَنْفُسِنَا مَوْثُوقَ الْحَدِيثِ - أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا أَرَادَ قَتْلَ أَبِيكَ، قَالَ: مَنْ لِلصِّبْيَةِ؟ قَالَ: (النَّارُ). فَقَدْ رَضِيتُ لَكَ مَا رَضِيَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

واتە: لە ئیبراهیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە (ضحاك)ی کوڕی قەیس ویستی مەسروق بکاتە کاربەدەست، عومارەی کوڕی عوقبە پێی وت: ئایا پیاوێ دەکەیتە کاربەدەست کە لە پاشماوەی بکوژانی پێشەوا (عُثْمَان)ە رەزای خوای لێ بێ، مەسروق پێی وت: (عَبْدُ اللّـه)ی کوڕی مەسعود بۆی باس کردین – کە فەرموودەکانی باوەڕ پێ کراو

بوون لەلای ئێمە — كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ویستی باوكت بكوژێت، باوكت وتی: كێ بەخێوكردن و پەروەردەكردنی منداڵەكانم دەگرێتە ئەستۆ؟ فەرمووی: (تۆ خەمی خۆتت بێ ئاگر بۆ تۆیەو - ئەوانیش خوای گەورە پەكیان ناخات و رۆزیان دەدات)، مەسروق وتی: منیش لەتۆ رازیم مادەم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لێت رازی بووە.

## باسی سەبارەت بە كوشتنی دیل بە تیر.

## ١٢٩ - باب فِي قَتْلِ الأَسِيرِ بِالنَّبْلِ.

٢٦٨٧ - عن ابن تعلي قال: غَزَوْنَا مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ فَأُتِيَ بِأَرْبَعَةِ أَعْلاَجٍ مِنَ الْعَدُوِّ فَأَمَرَ بِهِمْ فَقُتِلُوا صَبْرًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ لَنَا غَيْرُ سَعِيدٍ، عَنِ ابْنِ وَهْبٍ فِي هَذَا الْحَدِيثِ قَالَ بِالنَّبْلِ صَبْرًا، فَبَلَغَ ذَلِكَ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنْ قَتْلِ الصَّبْرِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَتْ دَجَاجَةٌ مَا صَبَرْتُهَا. فَبَلَغَ ذَلِكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ فَأَعْتَقَ أَرْبَعَ رِقَابٍ.

واتە: لە (ابْنِ تِعْلَى)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لە غەزایەكدا لە خزمەت (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی خالیدی كوڕی وەلیددا بووین چوار دیلی زلەی كافری عەجەمیان هێنا، (عَبْدُ الرَّحْمَن) فەرمانی دا بیان بەستنەوەو بیانكوژن. ئەبو داود دەڵێت: جگە لە سەعید ئەمەی بۆ باس كردوین، لە ئیبنو وەهبەوە لەم فەرموودەدا وتی: بە بەستراوەیی بە تیر

كوشتنیان، ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە ئەبو ئەیوبی ئەنصاری وتی: بیستومە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كە كوشتنی دیلی بە بەستراوەیی قەدەغەكردوە، سوێند بەو (الله)یە كە گیانی منی بەدەستە ئەگەر مریشكێكیش بوایە من بەو شێوەیە نەمدەكوشت، قسەكەی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری گەیشتەوە بە (عَبْدُ الرَّحْمَنِ)ی كوڕی خالیدی كوڕی وەلید ئەویش چوار كۆیلەی رزگار كرد.

## باسی سەبارەت بەردانی دیل بەبێ بەرامبەر.

## ١٣٠ - باب فِي الْمَنِّ عَلَى الأَسِيرِ بِغَيْرِ فِدَاءٍ.

٢٦٨٨ - (صحيح) عن أنس، أَنَّ ثَمَانِينَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ هَبَطُوا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابِهِ مِنْ جِبَالِ التَّنْعِيمِ عِنْدَ صَلاَةِ الْفَجْرِ لِيَقْتُلُوهُمْ، فَأَخَذَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَلَمًا، فَأَعْتَقَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: هەشتا پیاو لە خەڵكی مەككە لە كێوی تەنعیمەوە هاتنەخوارەوە بۆئەوەی لەنوێژی بەیانی دا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵەكانی بكوژن، دیل كران و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەبێ بەرامبەر بەرەڵای كردن، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا

(٢٤). سورة الفتح: ٢٤. واتە: خوا ئەو زاتەیە کەدەستی ئەوانی (کافران) لەئێوە کۆتا کرد، دەستی ئێوەشی لەوان (کۆتاکرد بەپێکهاتنی حودەیبیە - (صلح الحديبيه) - ) لەناوجەرگەی مەککەدا، لەپاش ئەوەی ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵ کرد، وەخوا بەهەرچی ئێوە دەیکەن بینایە.

**٢٦٨٩ - (صحيح) عن محمد بن جبير بن مطعم، عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لأُسَارَى بَدْرٍ: (لَوْ كَانَ مُطْعِمُ بْنُ عَدِى حَيًّا ثُمَّ كَلَّمَنِي فِي هَؤُلاَءِ النَّتْنَى لأَطْلَقْتُهُمْ لَهُ).**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە دیلەکانی جەنگی بەدری فەرموو: (ئەگەر ئێستا (مطعم)ی کوڕی عەدی زیندو بوایە واتە باوکت، لەپاشدا دەربارەی ئەم پیس و بۆگەنانە قسەی لەگەڵم بکردایە کە بەرەڵایان بکەم بەرەڵام دەکردن بۆی).

## باسی سەبارەت بە (فدیە) وەرگرتن بەرامبەر بە بەرەڵاکردنی دیل.

## ١٣١ - باب فِي فِدَاءِ الأَسِيرِ بِالْمَالِ.

**٢٦٩٠ - (حسن صحيح) عن عمر بن الخطاب قال: لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ فَأَخَذَ - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - الْفِدَاءَ، أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ( مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ**

فِي ٱلْأَرْضِ ) إِلَى قَوْلِهِ (لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ) مِنَ الْفِدَاءِ، ثُمَّ أَحَلَّ لَهُمُ اللَّهُ الْغَنَائِمَ.

واتە: لە پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی بەدردا بەرامبەر بە بەرەڵاكردنی دیلەكانی بەدر (فدیە)ی وەرگرت، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ( مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾). سورة الأنفال: ٦٧ - ٦٨. واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نی یە كە دیلی (لە دوژمنان) هەبێ، هەتا كوشتاری زۆریان لێ نەكات لەزەویدا، ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێ (بە وەرگرتنی فیدیە)، وە خواش (پاداشتی) ڕۆژی دوایی دەوێ (بۆ ئێوە)، وە خوا توانا و زاڵی كار دروستە. ئەگەر نووسراو (و بڕیار)ێك لەلایەن خواوە پێش نەكەوتایە (كە حەڵاڵ بوونی دەستكەوتو غەنیمەتی جەنگە)، بێگومان لەبەر ئەو (فیدیە)ی كە وەرتان گرت تووشتان دەبوو سزایەكی گەورە. لەپاشدا خوای گەورە حەڵاڵ بوونی دەستكەوتو غەنیمەتی جەنگی بۆ حەڵاڵ كردن.

**٢٦٩١ - (صحيح دون الأربع مئة) عن ابن عباس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَعَلَ فِدَاءَ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعَمِائَةٍ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە جەنگی بەدردا بۆ بەرەڵاكردنی هەر یەكێ لە دیلە كافرەكانی خەڵكی مەككە چوارسەد درهەم (فدیە)ی وەرگرت.

٢٦٩٢ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها قالت: لَمَّا بَعَثَ أَهْلُ مَكَّةَ فِي فِدَاءِ أَسْرَاهُمْ بَعَثَتْ زَيْنَبُ فِي فِدَاءِ أَبِي الْعَاصِ بِمَالٍ، وَبَعَثَتْ فِيهِ بِقِلاَدَةٍ لَهَا كَانَتْ عِنْدَ خَدِيجَةَ أَدْخَلَتْهَا بِهَا عَلَى أَبِي الْعَاصِ. قَالَتْ: فَلَمَّا رَآهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَقَّ لَهَا رِقَّةً شَدِيدَةً، وَقَالَ: (إِنْ رَأَيْتُمْ أَنْ تُطْلِقُوا لَهَا أَسِيرَهَا وَتَرُدُّوا عَلَيْهَا الَّذِي لَهَا). قَالُوا: نَعَمْ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَ عَلَيْهِ، أَوْ وَعَدَهُ، أَنْ يُخَلِّيَ سَبِيلَ زَيْنَبَ إِلَيْهِ، وَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ وَرَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: (كُونَا بِبَطْنِ يَأْجِجَ حَتَّى تَمُرَّ بِكُمَا زَيْنَبُ فَتَصْحَبَاهَا حَتَّى تَأْتِيَا بِهَا).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خەڵکی مەککە (فدیە)یان نارد بۆ بەرەڵاکردنی دیلەکانیان، یەکێ لە دیلەکان ئەبو (العاص)ی مێردی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، زەینەب ملوانکەیەکی هەبوو ناردی بۆ ئەوەی مێردەکەی بۆ بەرەڵابکەن، ملوانکەکەش خەدیجەی دایکی پێی بەخشیبو کاتێ کە شوی کردبو بە ئەبو (العاص)، عائیشە وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوەی بینی زۆر بەزەیی بە زەینەبدا هاتەوە، فەرمووی: (ئەگەر دەتانەوێ دیلەکەی بەبێ (فدیە) بۆ بەردەن ملوانکەکەی بۆ بگێڕنەوە). هاوەڵان وتیان: بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەڵێنی وەرگرت لە ئەبو (العاص) کە ڕێگە بدات بە زەینەب کۆچ بکات بۆ مەدینەو بێت بۆلای باوکی، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زەیدی کوڕی (حارثة)و پیاوێکی ئەنصاری نارد بۆ مەککە پێی فەرموون: (لە

(بَطْنِ يَأْجِجِ) بهێننەوە - کە شوێنێکە لە نزیك مەککە - هەتا زەینەب دەدات بەلاتاندا ئەوکاتە لەگەڵ خۆتان بیهێن بۆ مەدینە).

**٢٦٩٣ - (صحيح) عن عروة بن الزبير: أَنَّ مَرْوَانَ وَالْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ أَخْبَرَاهُ، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: حِينَ جَاءَهُ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَعِي مَنْ تَرَوْنَ، وَأَحَبُّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ، فَاخْتَارُوا إِمَّا السَّبْيَ وَإِمَّا الْمَالَ). فَقَالُوا: نَخْتَارُ سَبْيَنَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ ثُمَّ قَالَ: (أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلاَءِ جَاءُوا تَائِبِينَ، وَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يُطَيِّبَ ذَلِكَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ). فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذَلِكَ لَهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّا لاَ نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ، فَارْجِعُوا حَتَّى يَرْفَعَ إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ). فَرَجَعَ النَّاسُ، فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ فَأَخْبَرُوهُمْ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا.**

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕنەوە، کە مەروان و میسوەری کوڕی مەخرەمە بۆیان گێراوەتەوە، کاتێ کە هۆزی هەوازین لەدوای جەنگی حونەین موسوڵمان بوون

نوێنەریان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، داوایان لێ كرد كە ماڵ و سامەنەكانیان بۆ بگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموون: (ئەوەی لەلای منە دەتان دەمەوە، سەربازەكانیش حەقی خۆیانە، بۆیان هەیە بۆتان نەگێڕنەوە، خۆشەویسترین قسە بەلای منەوە راست و دروستیانە، جا ئێوە یەكێ لەم دوانە هەڵبژێرن: یان ژن و منداڵەكانتان دەدەمەوە یا ماڵ و سامەنەكانتان)، ئەوانیش وتیان: ژن و منداڵەكانمان بدەنەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەستایەوە وتارێكی خوێندەوە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی كردو فەرمووی: (لەدوایدا، براكانتان لە هۆزی هەوازین موسوڵمان بوون و هاتون بۆلامان، من پێم وایە دیلەكانیان بۆ بگێڕینەوە، جا هەركەسێ لەئێوە پێی خۆشە با بە رەزامەندی و پیاوەتی خۆی بەشی خۆی بداتەوە پێیان، وە هەركەسێ پێی خۆشە بەشی خۆی بە مەرجێ بداتەوە كە تۆڵەی بۆ بكەینەوە، ئەوە ئێمە لەیەكەم دەستكەوتی جەنگی كە خوای گەورە بۆی رەخساندین تۆڵەی بۆ دەكەینەوەو بەشی دەدەین). خەڵكەكە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەموومان پێمان خۆشە بە پیاوەتی بۆیان بگێڕینەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموون: (ئێمە نازانین كێ رازیەو كێ ناڕازییە بەشی خۆی بداتەوە، بگەڕێنەوە بە گەورەكانتاندا وەڵامەكانمان بۆ بنێرنەوە)، خەڵكەكە گەڕانەوە، لەگەڵ گەورەكانیان قسەیان كردو پێیان راگەیاندن كە رازین بە پیاوەتی خۆیان دیلەكانیان بۆ بگێڕنەوە.

**٢٦٩٤ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده - في هذه القصة - قال: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (رُدُّوا عَلَيْهِمْ نِسَاءَهُمْ وَأَبْنَاءَهُمْ، فَمَنْ مَسَكَ بِشَيْءٍ مِنْ هَذَا الْفَيْءِ فَإِنَّ لَهُ بِهِ عَلَيْنَا سِتَّ فَرَائِضَ مِنْ أَوَّلِ شَيْءٍ يُفِيئُهُ اللَّهُ عَلَيْنَا). ثُمَّ دَنَا - يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - مِنْ بَعِيرٍ فَأَخَذَ وَبَرَةً مِنْ سَنَامِهِ، ثُمَّ قَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ**

لَيْسَ لِي مِنَ الْفَيْءِ شَيْءٌ، وَلاَ هَذَا). وَرَفَعَ أُصْبُعَيْهِ (إِلاَّ الْخُمُسَ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ عَلَيْكُمْ، فَأَدُّوا الْخِيَاطَ وَالْمِخْيَطَ). فَقَامَ رَجُلٌ فِي يَدِهِ كُبَّةٌ مِنْ شَعْرٍ فَقَالَ: أَخَذْتُ هَذِهِ لأُصْلِحَ بِهَا بَرْذَعَةً لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا مَا كَانَ لِي وَلِبَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَهُوَ لَكَ). فَقَالَ: أَمَّا إِذْ بَلَغَتْ مَا أَرَى فَلاَ أَرَبَ لِي فِيهَا. وَنَبَذَهَا.

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باکیەوە، لە باپیریەوە — بەسەرهاتی پێشو - دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ژن و منداڵەکانیان بۆ بگێرنەوە، هەرکەسێ لەئێوە بە پیاوەتی خۆی نایداتەوە ئەگەر بیگەڕێتەوە ئێمە لەیەکەم دەستکەوتی جەنگی دا کە خوای گەورە بۆی ڕەخساندین لە جیاتیدا شەش وشتری دەدەینێ— مەبەستی ئەوە بوو لە پێنج یەکەکەی خۆی دەیداتێ - ). لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نزیك بوەوە لە وشترێك تەڵە مویەکی لە کۆپارەکەی گرت بەدەستەوە، ئینجا فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! لەم دەستکەوتە هیچی بۆ من نیە تەنانەت ئەم تەڵە موەش) هەردوو پەنجەی بەرزکردەوە ئەو دوو پەنجەیەی کە تەڵە مودکەی پێ گرتبو (جگە لە پێنج یەك، ئەوا پێنج یەکەکەش دەگێڕمەوە بۆ ئێوەو لەبەرژەوەندی ئێوەدا خەرجی دەکەم، دەی ئێوەش هەموو شتێ بگێڕنەوە تەنانەت دەرزی و دەزوی خەیاتیش)، پیاوێ هەستایەوە پارچەیە موی بەدەستەوە بو وتی: من لەپێش دابەشکردنی دەستکەوتەکەدا ئەم پارچە مووەم هەڵگرتوە بۆ چاککردنی ژێر جلی وشترەکەم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی بەر من و نەوەی (عبد المطلب) دەکەوێت بۆ تۆ، جگە لەوەش بۆ تۆ حەڵاڵ نیە) پیاوەکە وتی: مادەم کار گەیشتە ئەوە ئەمەش دەبێ دابەش بکرێت ئەوە هیچ پێویستم پێی نیە، جا کابرا پارچە موەکەی فڕێی دا.

## باسی دەربارەی مانەوەی پێشەوا لەو شوێنەدا کە سەرکەوتوە بەسەر دوژمندا.

## ١٣٢ - باب فِي الإِمَامِ يُقِيمُ عِنْدَ الظُّهُورِ عَلَى الْعَدُوِّ بِعَرْصَتِهِمْ.

**٢٦٩٥ - (صحيح) عن أبو طلحة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا غَلَبَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثًا. قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: إِذَا غَلَبَ قَوْمًا أَحَبَّ أَنْ يُقِيمَ بِعَرْصَتِهِمْ ثَلاَثًا.**

واتە: لە ئەبو (طَلْحَة)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: هەرکاتێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەسەر گەلێکدا سەربکەوتایە سێ شەو لەو شوێنەدا دەمایەوە - (عرصە) گۆڕەپانێکە کە بیناو خانوی تێدا نەبێت - . (ابْنُ الْمُثَنَّى) دەڵێت: هەرکاتێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەسەر گەلێکدا سەربکەوتایە حەزی دەکرد سێ شەو لە (عرصە)کەیاندا بمێنێتەوە.

## باسی دەربارەی جیاکردنەوەی (سەبایا) واتە: ژن و منداڵی دیل لەیەکتر.

## ١٣٣ – باب فِي التَّفْرِيقِ بَيْنَ السَّبْيِ.

٢٦٩٦ - (حسن) عن عن ميمون بن أبي شبيب، عن علي رضي الله عنه: أَنَّهُ فَرَّقَ بَيْنَ جَارِيَةٍ وَوَلَدِهَا، فَنَهَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ ذَلِكَ، وَرَدَّ الْبَيْعَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَمَيْمُونٌ لَمْ يُدْرِكْ عَلِيًّا، قُتِلَ بِالْجَمَاجِمِ، وَالْجَمَاجِمُ سَنَةُ ثَلَاثٍ وَثَمَانِينَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَالْحَرَّةُ سَنَةُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ، وَقُتِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ سَنَةَ ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ.

واتە: لە مەیمونی کوڕی ئەبو شەبیبەوە، لە پێشەوا عەلی - کوڕی (أَبِی طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە کەنیزەکێك و منداڵەکەی لێك جیاکردەوە واتە یەکێکیانی فرۆشت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری ئەو کارەی لێ کردو، مامەڵەکەی هەڵوەشاندەوە . ئەبو داود دەڵێت: مەیمون پێشەوا عەلی نەدیوە لە ڕوداوی (جَمَاجِم)دا کوژراوە، ڕوداوی (جَمَاجِم)یش لەساڵی هەشتاو سێی کۆچیدا ڕویداوە. ئەبو داود دەڵێت: ڕوداوی (الْحَرَّة) لەساڵی شەست و سێی کۆچیدا ڕویداوە، (عبد الله)ی کوڕی زوبێریش لەساڵی حەفتاو سێی کۆچیدا کوژراوە.

## باسی سەبارەت بە روخسەتی جیاکردنەوەی باڵغەکان لەیەتر.

## ١٣٤ - باب الرُّخْصَةِ فِي الْمُدْرِكِينَ يُفَرَّقُ بَيْنَهُمْ.

٢٦٩٧- (حسن) عن سلمة بن الأكوع، قال: خَرَجْنَا مَعَ أَبِي بَكْرٍ - وَأَمَّرَهُ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فَغَزَوْنَا فَزَارَةَ، فَشَنَنَّا الْغَارَةَ، ثُمَّ نَظَرْتُ إِلَى عُنُقٍ مِنَ النَّاسِ فِيهِ الذُّرِّيَّةُ وَالنِّسَاءُ، فَرَمَيْتُ بِسَهْمٍ فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْجَبَلِ، فَقَامُوا، فَجِئْتُ بِهِمْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فِيهِمُ امْرَأَةٌ مِنْ فَزَارَةَ، وَعَلَيْهَا قِشْعٌ مِنْ أَدَمٍ مَعَهَا بِنْتٌ لَهَا مِنْ أَحْسَنِ الْعَرَبِ، فَنَفَّلَنِي أَبُو بَكْرٍ ابْنَتَهَا. فَقَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَلَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لِي: (يَا سَلَمَةُ، هَبْ لِيَ الْمَرْأَةَ). فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لَقَدْ أَعْجَبَتْنِي، وَمَا كَشَفْتُ لَهَا ثَوْبًا، فَسَكَتَ حَتَّى إِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي السُّوقِ فَقَالَ: (يَا سَلَمَةُ، هَبْ لِيَ الْمَرْأَةَ، لِلَّهِ أَبُوكَ). فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَشَفْتُ لَهَا ثَوْبًا، وَهِيَ لَكَ، فَبَعَثَ بِهَا إِلَى أَهْلِ مَكَّةَ وَفِي أَيْدِيهِمْ أَسْرَى فَفَادَاهُمْ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ.

واتە: لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت ئەبو بەکردا ڕەزای خوای لێ بێ دەرچوین بۆ غەزای هۆزی فەزارە - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه

وسلم) ئەبو بەکری کردە سەرکردەمان - ، لەچەند لایەکەوە لەناکاودا هێرشمان کردە سەریان، لەپاشدا سەیرم کرد کۆمەڵێ خەڵك ژن و منداڵیان تێدا بوو بەرەو شاخەکە هەڵدەهاتن منیش تیرێکم گرتە بەرپێیان بۆئەوەی بەریان پێ بگرم تیرەکە لەنێوان ئەوان و شاخەکەدا کەوتە زەوی، کە تیرەکەیان بینی وەستان، منیش چوم هێنامن بۆ خزمەت ئەبو بەکر ژنێکی خانەدانیان تێدا بوو لە هۆزی فەزارە بوو کەوڵە کۆنێکی لە چەشنی فەروە لەبەردا بوو، کچێکی لەگەڵدا بوو لەجوانترین کچانی عەرەب بوو، ئەبو بەکر لەپێش دابەشکردنی دەسکەوتەکەدا بەخشی بە خۆم، لەگەڵ خۆم بردمەوە بۆ مەدینە، لەبازاڕ بە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەیشتم پێی فەرمووم: (ئەی سەلەمە، ئەو ژنەی کە دەستت کەوتوە بیبەخشە بەمن)، وتم: سوێند بە (الله) زۆر دڵم دەیگرێ، هێشتا بە نیازی ژن و مێردی نزیکی نەبومەتەوە واتە لەگەڵی جوت نەبووم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بێدەنگ بوو، بۆ ڕۆژی دواتر لەبازاڕ بە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەیشتمەوە پێی فەرمووم: (ئەی سەلەمە، ئەو ژنەی کە دەستت کەوتوە بیبەخشە بەمن — دیل بە دیلی پێ دەکەم - )، وتم: سوێند بە (الله) هێشتا بە نیازی ژن و مێردی نزیکی نەبومەتەوە، فەرموو ئەوە بەخشیم بە تۆ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردی بۆ مەککە چەند کەسێکی پێ ئازاد کرد کە پێشتر بەدیل گیرابوون.

## باسی دەربارەی ئەگەر كافرەكان شتی یەكێ لە موسوڵمانانیان دەستكەوت و بردیان، لەپاشدا موسوڵمانەكان سەركەوتن بەسەریانداو ئەو شتەیان دەستكەوت ئایا دابەش دەكرێت یان دەدرێتەوە بە خاوەنەكەی؟

## ١٣٥ – باب فِي الْمَالِ يُصِيبُهُ الْعَدُوُّ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ يُدْرِكُهُ صَاحِبُهُ فِي الْغَنِيمَةِ.

٢٦٩٨ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ غُلَامًا لابْنِ عُمَرَ أَبَقَ إِلَى الْعَدُوِّ فَظَهَرَ عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ، فَرَدَّهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى ابْنِ عُمَرَ، وَلَمْ يُقْسَمْ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ غَيْرُهُ رَدَّهُ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە غولامێكی هەبوو هەڵهاتبو بۆ ناو خاكی دوژمن، كاتێ كە موسوڵمانان سەركەوتن بەسەریاندا غولامەكەیان گرت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) غولامەكەی دایەوە بە ئیبنو عومەر، دابەشی نەكرد. ئەبو داود و جگە لەویش دەڵێن: خالیدی كوڕی وەلید كە سەركردەی سوپاكە بوو غولامەكەی بۆ گەڕاندەوە.

**٢٦٩٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: ذَهَبَ فَرَسٌ لَهُ، فَأَخَذَهَا الْعَدُوُّ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ، فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَبَقَ عَبْدٌ لَهُ، فَلَحِقَ بِأَرْضِ الرُّومِ، فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بَعْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگێرنەوە، کە ئەسپێکی هەبوو، بەرەڵابوو بوو رۆشتبو بۆ ژێر دەسەڵاتی کافرەکان، ئەوانیش گرتیان و بردیان بۆ خۆیان، کاتیّ کە موسوڵمانەکان سەرکەوتن بەسەریاندا ئەسپەکەیان دایەوە بە خۆی، ئەمەش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بوو، هەروەها ئیبنو عومەر بەندەیەکی هەڵهاتوی رایکرد بۆ ناو ولاَتی رۆم، کاتیّ کە موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەر رۆمەکاندا بەندەکەیان دەستکەوتەوە، خالیدی کوڕی وەلید بەندەکەی گەڕاندەوە بۆ ئیبنو عومەر لەدوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

## باسی سەبارەت بە بەندەی کافرەکان کاتێ کە موسوڵمان دەبن و پەیوەندی دەکەنبە موسوڵمانانەوە رادەستی کافرەکان ناکرێنەوە.

## ١٣٦ - باب فِي عَبِيدِ الْمُشْرِكِينَ يَلْحَقُونَ بِالْمُسْلِمِينَ فَيُسْلِمُونَ.

٢٧٠٠ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب قال: خَرَجَ عِبْدَانٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - يَعْنِي يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ - قَبْلَ الصُّلْحِ فَكَتَبَ إِلَيْهِ مَوَالِيهِمْ فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، وَاللَّهِ مَا خَرَجُوا إِلَيْكَ رَغْبَةً فِي دِينِكَ، وَإِنَّمَا خَرَجُوا هَرَبًا مِنَ الرِّقِّ، فَقَالَ نَاسٌ: صَدَقُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ رُدَّهُمْ إِلَيْهِمْ، فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (مَا أُرَاكُمْ تَنْتَهُونَ يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ حَتَّى يَبْعَثَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ مَنْ يَضْرِبُ رِقَابَكُمْ عَلَى هَذَا). وَأَبَى أَنْ يَرُدَّهُمْ، وَقَالَ: (هُمْ عُتَقَاءُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِی طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەپێش ڕۆژی پێکهاتنی حودەیبییەدا دوو کۆیلەی کافرەکان هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جا گەورەکانیان نامەیان نوسی بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتیان: ئەی موحەممەد سوێند بە (الله) لەبەر ئەوە هەڵنەهاتون کە

حەزیان لەدینی ئیسلامە، بەڵکو لەژیانی کۆیلەیەتی هەڵهاتون و خۆیان رزگار کردوە، هەندێ لە هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) راست دەکەن، بەندەکانیان بۆ بگێڕەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تورە بوو - چونکە بەربەرەکانی حوکمی شەرعیان کرد - فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی قورەیش باوەڕ ناکەم وازبهێنن لە دەمارگیری، ئێوە هەتا لەگەڵ شەرع بن سەرکەوتون، بەلام کاتێ کە پێچەوانەی شەرع جولانەوە خوای گەورە بۆتان دەنێرێت بدات لەگەردنتان لەسەر ئەوە)، جا کۆیلەکانی نەگەڕاندەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە فەرمووی: (ئەوانە ئازادکراوی خوای گەورەن).

**٢٧٠١ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ جَيْشًا غَنِمُوا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَعَامًا وَعَسَلاً فَلَمْ يُؤْخَذْ مِنْهُمُ الْخُمُسُ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لەغەزایەکدا لەشکرێ هەندێ دانەوێڵەو خواردن و هەنگوینیان دەستکەوت پێنج یەکیان لێ نەسەندن.

## باسی سەبارەت بە ئایا خواردنی خواردەمەنی لەپێش دابەشكردندا رەوایە لەخاكی كافراندا.

## ١٣٧ - باب فِي إِبَاحَةِ الطَّعَامِ فِي أَرْضِ الْعَدُوِّ.

**٢٧٠٢ - (صحيح) عن عبد الله بن مغفل قال: دُلِّيَ جِرَابٌ مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَالْتَزَمْتُهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: لاَ أُعْطِي مِنْ هَذَا أَحَدًا الْيَوْمَ شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَبَسَّمُ إِلَيَّ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی موغەفەلەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەڕۆژی خەیبەردا پێستەیەكی وەك كونە یان جەوەنە كە پڕ بوو لە پیو لەدوژمن كەوتبو، وتی: منیش چووم بەچاكی هەڵمگرت، وتی: لەپاشدا وتم: ئەمڕۆ هیچ لەمە بەشی كەس نادەم ئەوەندە پێویستی پێی هەبوو، وتی: لامكردەوە سەیرم كرد پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زەردەخەنە ئەیگرێ.

## باسی سەبارەت بە قەدەغەکردنی دەستگرتن بەسەر خواردندا لەپێش دابەش کردندا ئەگەر کەم بو لەخاکی کافراندا.

## ١٣٨ – باب فِي النَّهْيِ عَنِ النُّهْبَى إِذَا كَانَ فِي الطَّعَامِ قِلَّةٌ فِي أَرْضِ الْعَدُوِّ.

**٢٧٠٣ – (صحيح) عن أبو لبيد قال: كُنَّا مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ بِكَابُلَ، فَأَصَابَ النَّاسُ غَنِيمَةً، فَانْتَهَبُوهَا، فَقَامَ خَطِيبًا فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَى عَنِ النُّهْبَى. فَرَدُّوا مَا أَخَذُوا، فَقَسَمَهُ بَيْنَهُمْ.**

واتە: لە ئەبو لوبەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەکابول لەگەڵ (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەدا بووین خەڵکەکە هەندێ غەنیمەتیان دەستکەوت، لەپێش دابەش کردندا بردیان، (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورە هەستا وتاری بۆدان وتی: لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بیستوە رێگری کردوە لەوەی دەست بەسەر ماڵ و سامانی غەنیمەتدا بگیرێت لەپێش دابەش کردندا. جا ئەوانیش ئەوەی کە بردبویان گەڕاندیانەوە، ئەویش لەنێوانیاندا دابەشی کرد.

**٢٧٠٤ - (صحيح) عن محمد بن أبو مجالد، عن عبد الله بن أبي أوفى قال: قُلْتُ: هَلْ كُنْتُمْ تُخَمِّسُونَ - يَعْنِي الطَّعَامَ - فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ فَقَالَ: أَصَبْنَا طَعَامًا يَوْمَ**

خَيْبَرَ، فَكَانَ الرَّجُلُ يَجِيءُ فَيَأْخُذُ مِنْهُ مِقْدَارَ مَا يَكْفِيهِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ.

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئەبو موجالیدەوە، لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئەبو ئەوفاوە دەگێڕنەوە، کە موحەممەدی کوڕی ئەبو موجالید وتویەتی: وتم بە هەندێ لە هاوەڵانم: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لە خواردن پێنج یەکتان دەردەکرد؟ وتیان: لەڕۆژی غەزای خەیبەردا هەندێ خواردنمان دەستکەوت، پیاوێ دەهات ئەوەندەی لێ هەڵدەگرت کە پێویستی بوایە، لەپاشدا دەڕۆیشتینەوە بۆ شوێنی خۆمان.

٢٧٠٥ - (صحيح) عن عاصم يعني ابن كليب، عن أبيه، عن رجل من الأنصار قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَأَصَابَ النَّاسَ حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ وَجَهْدٌ، وَأَصَابُوا غَنَمًا فَانْتَهَبُوهَا، فَإِنَّ قُدُورَنَا لَتَغْلِي إِذْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْشِي عَلَى قَوْسِهِ فَأَكْفَأَ قُدُورَنَا بِقَوْسِهِ، ثُمَّ جَعَلَ يُرَمِّلُ اللَّحْمَ بِالتُّرَابِ، ثُمَّ قَالَ: (إِنَّ النُّهْبَةَ لَيْسَتْ بِأَحَلَّ مِنَ الْمَيْتَةِ). أَوْ (إِنَّ الْمَيْتَةَ لَيْسَتْ بِأَحَلَّ مِنَ النُّهْبَةِ).

واتە: لە عاصیمەوە – واتە ئیبنو ئەبو کولەیب – ، لەباوکیەوە، لە پیاوێکی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دەرچوین بۆ غەزایە، خەڵکەکە زۆر برسی و هیلاك و ماندو بوون، مەڕێکیان دەستکەوت، لەپێش دابەشکردندا بردیان خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە بۆ ئەوەی بکوڵێت، مەنجەڵەکە قوڵپی دەدا لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هات داردەستێکی بەدەستەوە بوو، بە داردەستەکەی مەنجەڵەکە قلْب کردەوەو گۆشتەکە رژاو خۆڵاوی بوو،

لەپاشدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەو دەستکەوتەی کە لەپێش دابەشکردندا لێی دەبرێت لە گۆشتی مردارۆ بوو حەڵاڵ تر نیە) یان فەرمووی: (گۆشتی مردارۆ بوو لەو دەستکەوتەی کە لەپێش دابەشکردندا لێی دەبرێت حەڵاڵ تر نیە) - کەواتە هەردوکیان حەرامن و جیاوازیان نیە - .

## باسی سەبارەت بە هەڵگرتنی خواردنی خاکی کافران.

## ١٣٩ - باب فِي حَمْلِ الطَّعَامِ مِنْ أَرْضِ الْعَدُوِّ.

**٢٧٠٦ - (ضعيف) عن القاسم مولى عبد الرحمن، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كُنَّا نَأْكُلُ الْجَزْرَ فِي الْغَزْوِ، وَلاَ نَقْسِمُهُ، حَتَّى إِنْ كُنَّا لَنَرْجِعُ إِلَى رِحَالِنَا وَأَخْرِجَتُنَا مِنْهُ مُمْلاَةٌ.**

واتە: لە قاسمی بەندەی ئازادکراوی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ەوە، لە هەندێ لەهاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویانە: ئێمە لە غەزایەکدا گۆشتی ئاژەڵێکی سەربڕاومان دەخوارد، تەنانەت کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان، دەفرەکانمان پڕ بوو لە گۆشتی ئاژەڵی سەربڕاو.

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی خواردن ئەگەر لەپێویستی خەڵك زیاد بوو لە خاكی كافراندا.

## ١٤٠ – باب فِي بَيْعِ الطَّعَامِ إِذَا فَضَلَ عَنِ النَّاسِ فِي أَرْضِ الْعَدُوِّ.

٢٧٠٧ - (حسن) عن عبد الرحمن بن غنم قال: رَابَطْنَا مَدِينَةَ قِنَّسْرِينَ مَعَ شُرَحْبِيلَ بْنِ السِّمْطِ، فَلَمَّا فَتَحَهَا أَصَابَ فِيهَا غَنَمًا وَبَقَرًا، فَقَسَمَ فِينَا طَائِفَةً مِنْهَا وَجَعَلَ بَقِيَّتَهَا فِي الْمَغْنَمِ، فَلَقِيتُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ مُعَاذٌ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ فَأَصَبْنَا فِيهَا غَنَمًا فَقَسَمَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ طَائِفَةً وَجَعَلَ بَقِيَّتَهَا فِي الْمَغْنَمِ.

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی غەنەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بە فەرماندەیی شورەحبیلی كوڕی (سمط)دا بۆ رزگاركردنی شاری (قِنَّسْرِين)لە سەنگەردا ماینەوە، كاتێ كە رزگارمان كرد كۆمەڵێ مەڕ و مانگامان دەستكەوت، شورەحبیل ئەوەندەی كە پێویستمان بوو دابەشیكرد بەسەرماندا هەندێكی وەك غەنیمەت مایەوە، گەیشتم بە (معاذ)ی كوڕی جەبەل بەسەرهاتەكەم بۆ گێڕایەوە، (معاذ) وتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەشداری غەزای خەیبەرمان كرد، كاتێ كە قەڵای خەیبەرمان رزگار كرد كۆمەڵێ مەڕ و مانگامان دەستكەوت، پێغەمبەری خوا (صلى الله

عليه وسلم) ئەوەندەی کە پێویستمان بوو دابەشیکرد بەسەرماندا هەندێکی تری وەك غەنیمەت مایەوە.

## باسی سەبارەت بە کەسێ سود لەدەستکەوتی جەنگی غەنیمەت وەرگرێت پێویستی پێی نەبێت.

## ١٤١ - باب فِي الرَّجُلِ يَنْتَفِعُ مِنَ الْغَنِيمَةِ بِالشَّيْءِ.

**٢٧٠٨ - عن رويفع بن ثابت الأنصاري، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَرْكَبْ دَابَّةً مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَعْجَفَهَا رَدَّهَا فِيهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَلْبَسْ ثَوْبًا مِنْ فَيْءِ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى إِذَا أَخْلَقَهُ رَدَّهُ فِيهِ).**

واتە: لە ڕوەیفیعی کوڕی (ثابت)ی ئەنصاریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك باوەڕی بە خوای گەورەو بەڕۆژی دوایی هەیە با سواری وڵاخی غەنیمەت نەبێ هەتا لەڕو لاوازی دەکات لەپاشدا بیگێڕێتەوە بۆناو دەستکەوتەکە، وە هەرکەسێك باوەڕی بە خوای گەورەو بەڕۆژی دوایی هەیە با پۆشاکی غەنیمەت لەبەر نەکات کاتێ کە ڕزی و کۆن بوو ئینجا بیگێڕێتەوە بۆناو دەستکەوتەکە).

# باسی سەبارەت بە روخسەتی بەكارهێنانی چەكی غەنیمەت لە جەنگدا.

# ١٤٢ - باب فِي الرُّخْصَةِ فِي السِّلاَحِ يُقَاتَلُ بِهِ فِي الْمَعْرَكَةِ.

٢٧٠٩ - (صحيح) عن أبو عبيدة، عن أبيه قال: مَرَرْتُ فَإِذَا أُبُو جَهْلٍ صَرِيعٌ قَدْ ضُرِبَتْ رِجْلُهُ فَقُلْتُ: يَا عَدُوَّ اللَّهِ، يَا أَبَا جَهْلٍ، قَدْ أَخْزَى اللَّهُ الأَخِرَ- قَالَ: وَلاَ أَهَابُهُ عِنْدَ ذَلِكَ - فَقَالَ: أَبْعَدُ مِنْ رَجُلٍ قَتَلَهُ قَوْمُهُ!! فَضَرَبْتُهُ بِسَيْفٍ غَيْرِ طَائِلٍ، فَلَمْ يُغْنِ شَيْئًا حَتَّى سَقَطَ سَيْفُهُ مِنْ يَدِهِ فَضَرَبْتُهُ بِهِ حَتَّى بَرَدَ.

واتە: لە ئەبو عوبەیدەوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەجەنگی بەدردا دام بەلای ئەبو جەهلدا لەگۆڕەپانی جەنگەكەدا بەبریندارى كەوتبو بەشمشێر دام لەقاچی وتم: ئەی دوژمنی خوا، ئەی ئەبو جەهل، خوای گەورە سەرسۆڕ و ریسوات بكات و لەخێر دورت بخاتەوە - وتی: نەترسام لە ئەبو جەهل چونكە لەوكاتەدا بە بریندارى كەوتبو - ، ئەبو جەهل وتی: لەپیاوێ دوربكەوەرەوە كە قەومەكەی خۆی كوشتویانە، جا بەشمشێرێكی كول لێمدا بەخۆی نەزانی هەتا شمشێرەكەی خۆی لەدەست كەوت، منیش بە شمشێرەكەی خۆی لێمدا هەتا كوشتم.

# باسی سەبارەت بە گەورەیی دزی و خیانەتکردن لەغەنیمەت.

## ١٤٣ - باب فِي تَعْظِيمِ الْغُلُولِ.

٢٧١٠ - (ضعيف) عن زيد بن خالد الجُهني: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تُوُفِّيَ يَوْمَ خَيْبَرَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ). فَتَغَيَّرَتْ وُجُوهُ النَّاسِ لِذَلِكَ، فَقَالَ: (إِنَّ صَاحِبَكُمْ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ). فَفَتَّشْنَا مَتَاعَهُ فَوَجَدْنَا خَرَزًا مِنْ خَرَزِ يَهُودَ لاَ يُسَاوِي دِرْهَمَيْنِ.

واتە: لە زەیدی کوڕی خالیدی جوهەینیەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی خەیبەردا کۆچی دوایی کرد، بەسەرهاتی مردنەکەی بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسکرا فەرمووی: (نوێژی مردوو لەسەر هاوڕێکەتان بکەن) - واتە من نوێژی لەسەر ناکەم — خەڵکەکە بەو وتەیە ڕەنگیان تێکچو، فەرمووی: (هاوڕێکەتان لەڕێگەی خوای گەورەدا دزی و خیانەتی کردوە)، کەل و پەلەکەیان پشکنی هەندێ مووروی جولەکەکانی تێدا بوو بایی دوو درهەم نەدەبوو — بێگومان موورووەکان مووروی غەنیمەت بوون - .

٢٧١١ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ خَيْبَرَ فَلَمْ يَغْنَمْ ذَهَبًا وَلاَ وَرِقًا إِلاَّ الثِّيَابَ

**وَالْمَتَاعَ وَالأَمْوَالَ، قَالَ: فَوَجَّهَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَ وَادِي الْقُرَى - وَقَدْ أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَبْدٌ أَسْوَدُ يُقَالُ لَهُ مِدْعَمٌ - حَتَّى إِذَا كَانُوا بِوَادِي الْقُرَى، فَبَيْنَا مِدْعَمٌ يَحُطُّ رَحْلَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ جَاءَهُ سَهْمٌ فَقَتَلَهُ، فَقَالَ النَّاسُ: هَنِيئًا لَهُ الْجَنَّةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كَلاَّ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَارًا!!). فَلَمَّا سَمِعُوا ذَلِكَ جَاءَ رَجُلٌ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (شِرَاكٌ مِنْ نَارٍ). أَوْ قَالَ: (شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەساڵی غەزای خەیبەردا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوین بۆ خەیبەر لەوێ زێڕ و زیومان دەستنەکەوت بەڵام جل و بەرگ و پۆشاك و کەل و پەل و مەڕو ماڵات و زەوی و زارمان دەستکەوت، وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و لەشکرەکە بەرەو (وَادِي الْقُرَى) کەوتنە ڕێ — غولامێکی ڕەش بەخشرابوو بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناوی میدعەم بوو — هەتا گەیشتنە (وَادِي الْقُرَى)، کاتێ کە میدعەم خەریك بوو بارەکەی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەسەر پشتی وڵاخەکەی دادەگرت، لەوکاتەدا تیرێك هات بەریکەوت و کوشتی، خەڵکەکە وتیان: بەهەشتی پیرۆز بێ نۆشی گیانی بێ - واتە لەڕێگەی خوای گەورەدا شەهید بوو - ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (نەخێر، سوێند بەو (اللە)یەی کە ڕۆحی منی بەدەستە ئەو پۆشاکەی کە دەدرێت بە

ـەرشاندا لەرۆژی خەیبەردا لەپێش دابەشكردنی دەستكەوتەكەدا بردبووی لەبەریدا گـڕی تیێ بەردەبیێ و دەسوتیێ - یان دەبیێ بە ئاگر و سزای دەدات - )، كاتیێ كە خەڵكەكە ئـەو وتەیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیست زۆر ترسان، پیاویێ قـەیتانیێ یـان دوو قەیتانی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (قـەیتانێك لـەئاگر)، یـان فەرمووی: (دوو قەیتان لەئاگر).

## باسی سەبارەت بە ئەگەر دزی و خیانەتكردن لەغەنیمەت شتێكی كەم بوو پێشەوا وازی لیێ دەهێنێت و كەل و پەل و بارەكەی ناسوتێنێت.

## ١٤٤ - باب فِي الْغُلُولِ إِذَا كَانَ يَسِيرًا يَتْرُكُهُ الإِمَامُ وَلاَ يُحَرِّقُ رَحْلَهُ.

**٢٧١٢ - (حسن) عن عبد الله بن عمرو قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَصَابَ غَنِيمَةً أَمَرَ بِلاَلاً فَنَادَى فِي النَّاسِ، فَيَجِيئُونَ بِغَنَائِمِهِمْ، فَيُخَمِّسُهُ وَيُقَسِّمُهُ، فَجَاءَ رَجُلٌ بَعْدَ ذَلِكَ بِزِمَامٍ مِنْ شَعَرٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا فِيمَا كُنَّا أَصَبْنَاهُ مِنَ الْغَنِيمَةِ، فَقَالَ: (أَسَمِعْتَ بِلاَلاً يُنَادِي). ثَلاَثًا. قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: (فَمَا مَنَعَكَ أَنْ تَجِيءَ بِهِ). فَاعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: (كُنْ أَنْتَ تَجِيءُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلَنْ أَقْبَلَهُ عَنْكَ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كـە وتویـەتی: ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەغەزادا دەستكەوتی ببوایە فەرمانی دەدا بـە بیلال جاڕبدا بەناو خەڵكدا كە غەنیمەتەكەیان بهێنن ئەوانیش دەیان هێنا، پێنج یەكی لێ دەردەكردو ئەوی تریشی دابەش دەكرد بەسەریاندا، جارێ لەغەزایەكـدا پیاوێـك لـەدوای دابەشكردنی غەنیمەتەكە هات رەشمەیەكی ولاخی پێ بوو كە لەموو دروستكرا بوو وتـی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمەش لـەو غەنیمەتەیـە كـە دەسـتمانكەوتوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ جار لەسەریەك فەرمووی: (گوێـت لـە بـیلال بـوو جاڕبدا بەناو خەڵكدا)، ئەویش وتی: بەڵێ گوێم لـەبیلال بـوو داوای لێبـووردنی كـرد كـە دواكەوتوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (تۆ خۆت لـەرۆژی قیامەتـدا بیهێنـە بێگومان لێشت وەرناگرن و لێپێچینەوەت لەگەڵ دەكرێت لەسەری).

## باسی سەبارەت بە سزاو تۆڵەی ئەو كەسەی كە دزی و خیانەت دەكات لەغەنیمەت.

## ١٤٥ - باب فِي عُقُوبَةِ الْغَالِّ.

**٢٧١٣ - (ضعيف) عن صالح بن محمد بن زائدة - قَالَ أَبُـو دَاوُد: وَصَـالِحٌ هَذَا أَبُو وَاقِدٍ – قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ مَسْلَمَةَ أَرْضَ الـرُّومِ، فَـأُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ غَلَّ، فَسَأَلَ سَالِمًا عَنْهُ، فَقَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَـدِّثُ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا وَجَدْتُمْ الرَّجُلَ قَدْ غَلَّ فَأَحْرِقُوا مَتَاعَهُ وَاضْرِبُوهُ). قَـالَ:**

فَوَجَدْنَا فِي مَتَاعِهِ مُصْحَفًا، فَسَأَلَ سَالِمًا عَنْهُ فَقَالَ: بِعْهُ وَتَصَدَّقْ بِثَمَنِهِ.

واتە: لە صالحی كوڕی موحەممەدی كوڕی زائیدەوە - ئەبو داود دەڵێت: ئەم صالحە نازناوەكەی باوكی واقیده - دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ مەسلەمەدا چوینە ناو خاكی رۆمەوە، پیاوێكیان هێنا دزی كردبوو لە غەنیمەت، لەوبارەوە مەسلەمە لە سالمی كوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب)یان رەزای خوای لێ بێ پرسی، سالم وتی: بیستم لە باوكم لە باوكیەوە ئەم فەرمودەی گێڕایەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر دیتان پیاوێ دزی لە غەنیمەت كردبو كەل و پەلەكەی بسوتێنن و لێشی بدەن). وتی: لەناو كەل و پەلەكەیدا (مصحف)قورئانێكمان بینی، لەوبارەوە لە سالمان پرسی كە چی لێ بكەین؟ وتی: كەل و پەلەكەی بسوتێنن بەڵام (مصحف)قورئانەكە بفرۆشن و نرخەكەی بكەنە خێر.

٢٧١٤ - (ضعيف مقطوع) عن صالح بن محمد قال: غَزَوْنَا مَعَ الْوَلِيدِ بْنِ هِشَامٍ وَمَعَنَا سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ، فَغَلَّ رَجُلٌ مَتَاعًا، فَأَمَرَ الْوَلِيدُ بِمَتَاعِهِ فَأُحْرِقَ، وَطِيفَ بِهِ، وَلَمْ يُعْطِهِ سَهْمَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا أَصَحُّ الْحَدِيثَيْنِ رَوَاهُ غَيْرُ وَاحِدٍ أَنَّ الْوَلِيدَ بْنَ هِشَامٍ حَرَّقَ رَحْلَ زِيَادِ بْنِ سَعْدٍ - وَكَانَ قَدْ غَلَّ - وَضَرَبَهُ.

واتە: لە صالحی كوڕی موحەممەد دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ ولیدی كوڕی هیشام — ی كوڕی (عبد الملك كوڕی مەروان — دا غەزامان كرد، سالمی كوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ و عومەری كوڕی (عبد

العزيز)يشمان لەگەڵ بوو، پیاوێك دزی کردبو لە کەل و پەلی غەنیمەت، وەلید فەرمانی دا کەل و پەلەکەی بسوتێنن و بیگێڕن بەوناوەدا بۆ ئەوەی پەندی لێ وەربگیرێت، وە بەشە غەنیمەتەکەشی نەدەنێ. ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرمودە لە فەرمودەی پێشو صەحیح ترە، زیاتر لە کەسێك گێڕاویانەتەوە، کە وەلیدی کوڕی هیشام بارەکەی زیادی کوڕی سەعدی سوتاندو لێشی دا چونکە دزی کردبو لە غەنیمەت.

**٢٧١٥ - (ضعيف) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ حَرَّقُوا مَتَاعَ الْغَالِّ وَضَرَبُوهُ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَزَادَ فِيهِ عَلِيُّ بْنُ بَحْرٍ، عَنِ الْوَلِيدِ - وَلَمْ أَسْمَعْهُ مِنْهُ — (وَمَنَعُوهُ سَهْمَهُ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکەوە، لەو باپیریەوە — عەمری کوڕی عاص - دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەکر و عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ کەل و پەلی ئەو کەسەیان دەسوتاند کە دزی لە غەنیمەت دەکرد وە لێشیان دەدا. ئەبو داود دەڵێت: عەلی کوڕی بەحر کە مامۆستای خۆی بووە لە فەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: (بەشە غەنیمەتەکەشیان نەدەدایە)، - بەڵام ئەبو داود خۆی (بەشە غەنیمەتەکەشیان نەدەدایە)ی لە عەلی کوڕی بەحر نەبیستوە، بەڵکو لە خەڵکی تری بیستوە.

**٢٧١٦ - (ضعيف مقطوع) قَالَ أَبو دَاوُدَ: وَحَدَّثَنَا بِهِ الْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ وَعَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ نَجْدَةَ، قَالاَ: حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، عَنْ زُهَيْرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، قَوْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ عَبْدُ الْوَهَّابِ بْنُ نَجْدَةَ الْحَوْطِيُّ: مَنَعَ سَهْمَهُ.**

ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودە (مقطوع)ە وتەی عەمری کوڕی شوعەیبە. وە (عبد الوهاب)ی کوڕی نەجدەی (حوطی) باسی (بەشە غەنیمەتەکەشیان نەددایە)ی نەکرد.

## باسی قەدەغەکردنی ئاشکرانەکردنی ئەو کەسەی کە دزی و خیانەت دەکات لەغەنیمەت.

## ١٤٦ - باب النَّهْيِ عَنِ السَّتْرِ عَلَى مَنْ غَلَّ.

**٢٧١٧ - (ضعيف مقطوع) عن سمرة بن جندب قال: أَمَّا بَعْدُ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ كَتَمَ غَالاًّ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ).**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەدوایدا: بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ دزی و خیانەتی کرد لەغەنیمەت کەسێکی تر پێی زانی - ئامۆژگاری بکات کە بیگێڕێتەوە ئەگەر نەیگێڕایەوە - ئاشکرای نەکات و هەواڵەکە بە سەرکردەی لەشکرەکە رانەگەیەنێت ئەوە سزاو تۆڵەی وەك هی ئەو کەسە وایە کە دزیەکەی کردوە).

## باسى سەبارەت بە كەل و پەل و كەرەستەى كەسى كوژراو لە غەزادا دەدرێت بەو كەسەى كە كوشتويەتى.

## ١٤٧ – باب فِي السَّلَبِ يُعْطَى الْقَاتِلُ.

٢٧١٨ - (صحيح) عن أبو قتادة قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي عَامِ حُنَيْنٍ فَلَمَّا الْتَقَيْنَا كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ عَلاَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، قَالَ: فَاسْتَدَرْتُ لَهُ حَتَّى أَتَيْتُهُ مِنْ وَرَائِهِ، فَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ عَلَى حَبْلِ عَاتِقِهِ، فَأَقْبَلَ عَلَيَّ فَضَمَّنِي ضَمَّةً وَجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ الْمَوْتِ! ثُمَّ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَأَرْسَلَنِي، فَلَحِقْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فَقُلْتُ: مَا بَالُ النَّاسِ؟ قَالَ: أَمْرُ اللَّهِ!. ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ رَجَعُوا وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَقَالَ: (مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ). قَالَ: فَقُمْتُ، ثُمَّ قُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ الثَّانِيَةَ: (مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ). قَالَ: فَقُمْتُ، ثُمَّ قُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي، ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ الثَّالِثَةَ، فَقُمْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا لَكَ يَا أَبَا قَتَادَةَ؟). قَالَ: فَاقْتَصَصْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: صَدَقَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَلَبُ ذَلِكَ الْقَتِيلِ

عِنْدِي، فَأَرْضِهِ مِنْهُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: لَاهَا اللَّـهِ، إِذًا يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسْدِ اللَّهِ يُقَاتِلُ عَنِ اللَّـهِ وَعَـنْ رَسُـولِهِ فَيُعْطِيكَ سَلَبَهُ؟! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (صَدَقَ فَأَعْطِهِ إِيَّاهُ). فَقَـالَ أَبُـو قَتَـادَةَ: فَأَعْطَانِيـهِ فَبِعْـتُ الدِّرْعَ، فَابْتَعْتُ بِهِ مَخْرَفًا فِي بَنِـي سَـلِمَةَ فَإِنَّـهُ لأَوَّلُ مَـالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الإِسْلَامِ.

واتە: لە ئەبو قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەساڵی غەزای حونەینـدا لەخزمـەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوین بـۆ ئـەو غەزایـە، کـاتێ کـە بـەرەنگاری کافرەکان بوینەوە لەجەولەی یەکەمی جەنگەکەدا موسـوڵمانان لەچـەند لایەکـەوە شـکان بەڵام لە قۆڵی پێغەمـبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) نەشکان، ئەبو قـەتادە وتـی: پیـاوێکم لـە هاوبەش بۆ خوا دانەران بینی پیاوێکی موسوڵمانی دابـوو بەزەویـدا لەسـەری دانیشـتبو دەیویست بیکوژێت، وتی: منیش سوڕێکم بۆ خواردو لەپشتیەوە بۆی چـوم شمشـێرێکم دا لەنێوان مل و شانی، ئەویش پەلاماری دام و باوەشی پیاکردم بەشێوەیەکی توند گوشیمی بەخۆیەوە بۆنی مردنم کرد واتە ئازارێکی پێ گەیاندم وەك ئازاری مردن، بـەڵام خـاوبوەو کەوت منی بەرداو مرد، گەیشتم بە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطّـاب) ڕەزای خـوای لـێ بێ، وتم: بۆچی ئەو خەڵکە شکان؟ وتی: فەرمانی خوای گەورە بوو، لەپاشدا خەڵکەکە – بەدەنگی عەباسی کوڕی (عبد المطلب) کە هاواری لـێ کـردن و دەیـوت: ئـەی کۆمـەڵی ئەنصار ئـەی ... – ئـەوانیش مەردانـە گەڕانـەوە بۆنـاو گۆڕەپـانی جەنگەکـە بـۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و قارەمانانە جـەنگان هـەتا دوژمنیـان شکسـت پـێ هێناو سەرکەوتن، لەدوای تەواو بوونی جەنگەکە پێغەمبەری خوا (صـلی الله علیـه وسـلم) دانیشت و فەرمووی: (کەسێ لەغەزادا کەسێکی بێ باوەڕ بکوژێت بەڵگەی هەبێ کە ئەو کوشتویەتی ئەوە ڕوتی بکاتەوەو کەل و پەل و کەرەستەکانی بۆ ئەو کەسە دەبێت). وتـی:

منیش هەستامەوە، لەپاشدا وتم: کێ شایەتیم بۆدەدات کە پاڵەوانێکم کوشتوە؟ ئینجا دانیشتمەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتەکەی دووبارە کردەوە: (کەسێ لەغەزادا کەسێکی بێ باوەڕ بکوژێت بەڵگەی هەبێ کە ئەو کوشتویەتی ئەوە روتی بکاتەوەو کەل و پەل و کەرەستەکانی بۆ ئەو کەسە دەبێت). وتی: منیش هەستامەوە، لەپاشدا وتم: کێ شایەتیم بۆدەدات کە پاڵەوانێکم کوشتوە؟ ئینجا دانیشتمەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشتەکەی سێ بارە کردەوە، منیش هەستامەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەوە چیتە ئەی ئەبو قەتادە؟)، وتی: منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، پیاوێ لە قەومەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەبو قەتادە راست دەکات، کەل و پەلی کوژراوەکەش لەلای منە، فەرموو ئەو رازی بکە لە من با شتێکی تر وەربگرێت لە جیاتی حەقەکەی خۆی، ئەبو بەکری صدیق وتی: نە بە خوای گەورە شتی وا نابێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شتی وا ناکات کەل و پەل و کەرەستەکەی کوژراوێ بدات بەتۆ لەکاتێکدا کە حەقی کەسێکە لەرێگەی دینی خواو پێغەمبەری خوادا وەك شێر جەنگاوەو کوشتویەتی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەبو بەکر راست دەکات، کەواتە هەموو کەل و پەل و کەرەستەکەی بدەن بە ئەبو قەتادە)، ئەبو قەتادە وتی: کابرا هەموو کەل و پەل و کەرەستەکەی دایەوە بە من، زرێکەیم فرۆشت، لەناوچەی بەنی سەلەمە باخێکم پێ کڕی، ئیتر ئەو باخە بوو بە بناغەی ماڵداری سەردەمی ئیسلامەتیم.

**٢٧١٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَئِذٍ - يَعْنِي يَوْمَ حُنَيْنٍ -: (مَنْ قَتَلَ كَافِرًا فَلَهُ سَلَبُهُ). فَقَتَلَ أَبُو طَلْحَةَ يَوْمَئِذٍ عِشْرِينَ رَجُلاً وَأَخَذَ أَسْلَابَهُمْ، وَلَقِيَ أَبُو طَلْحَةَ أُمَّ سُلَيْمٍ وَمَعَهَا خِنْجَرٌ، فَقَالَ: يَا أُمَّ سُلَيْمٍ، مَا هَذَا مَعَكِ؟ قَالَتْ: أَرَدْتُ وَاللَّهِ إِنْ دَنَا مِنِّي**

**بَعْضُهُمْ أَبْعَجُ بِهِ بَطْنَهُ!. فَأَخْبَرَ بِذَلِكَ أَبُو طَلْحَةَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَرَدْنَا بِهَذَا الْخِنْجَرَ، وَكَانَ سِلاَحَ الْعَجَمِ يَوْمَئِذٍ الْخِنْجَرُ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوکاتەدا - واتە لەڕۆژی حونەین دا - فەرمووی: (کەسێ لەغەزادا کەسێکی بێ باوەڕ بکوژێت ئەوە کەل و پەلەکانی و کەرەستەکانی بۆ ئەو کەسە دەبێت). لەو ڕۆژەدا ئەبو (طلحة) بیست کەسی لەکافران کوشت و کەل و پەل و کەرەستەکانی برد بۆ خۆی، ئەبو (طلحة) گەیشت بە ئوممو سولەیمی هاوسەری خەنجەرێکی پێ بوو، وتی: ئەی ئوممو سولەیم، ئەوە چییە پێت؟ وتی: سوێند بە (الله) دەمەوێت هەر کافرێ لێم نزیك بویەوە بەم خەنجەرە ورگی هەڵدڕم! ئەبو (طلحة) ئەو هەواڵەی ڕاگەیاند بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم). ئەبو داود دەڵێت: ئەو کاتە چەکی عەجەم خەنجەر بوو.

## باسی سەبارەت بە پێشەوا رێگری لە بکوژ دەکات جگە لە وڵاخی سواریەکەی پۆشاك و کەرەستە جەنگیەکانی ببات بۆ خۆی.

## ١٤٨ - باب فِي الإِمَامِ يَمْنَعُ الْقَاتِلَ السَّلَبَ إِنْ رَأَى وَالْفَرَسُ وَالسِّلاَحُ مِنَ السَّلَبِ.

٢٧١٩ – م- (صحيح) عن عوف بن مالك الأشجعي قال: خَرَجْتُ مَعَ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ فِي غَزْوَةِ مُؤْتَةَ فَرَافَقَنِي مَدَدِيٌّ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ لَيْسَ مَعَهُ غَيْرُ سَيْفِهِ، فَنَحَرَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ جَزُورًا، فَسَأَلَهُ الْمَدَدِيُّ طَائِفَةً مِنْ جِلْدِهِ، فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ، فَاتَّخَذَهُ كَهَيْئَةِ الدَّرَقِ، وَمَضَيْنَا، فَلَقِينَا جُمُوعَ الرُّومِ، وَفِيهِمْ رَجُلٌ عَلَى فَرَسٍ لَهُ أَشْقَرَ عَلَيْهِ سَرْجٌ مُذْهَبٌ وَسِلاَحٌ مُذْهَبٌ، فَجَعَلَ الرُّومِيُّ يُغْرِي بِالْمُسْلِمِينَ، فَقَعَدَ لَهُ الْمَدَدِيُّ خَلْفَ صَخْرَةٍ، فَمَرَّ بِهِ الرُّومِيُّ فَعَرْقَبَ فَرَسَهُ، فَخَرَّ، وَعَلاَهُ فَقَتَلَهُ وَحَازَ فَرَسَهُ وَسِلاَحَهُ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِلْمُسْلِمِينَ بَعَثَ إِلَيْهِ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ فَأَخَذَ مِنَ السَّلَبِ، قَالَ عَوْفٌ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: يَا خَالِدُ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالسَّلَبِ لِلْقَاتِلِ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنِّي اسْتَكْثَرْتُهُ، قُلْتُ: لَتَرُدَّنَّهُ عَلَيْهِ أَوْ لأُعَرِّفَنَّكَهَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،

فَأَبَى أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهِ، قَالَ عَوْفٌ: فَاجْتَمَعْنَا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَصَصْتُ عَلَيْهِ قِصَّةَ الْمَدَدِيِّ وَمَا فَعَلَ خَالِدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا خَالِدُ مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟) قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتَكْثَرْتُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا خَالِدُ رُدَّ عَلَيْهِ مَا أَخَذْتَ مِنْهُ). قَالَ عَوْفٌ: فَقُلْتُ لَهُ: دُونَكَ يَا خَالِدُ أَلَمْ أَفِ لَكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَمَا ذَلِكَ) قال: فَأَخْبَرْتُهُ، قَالَ: فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (يَا خَالِدُ لاَ تَرُدَّ عَلَيْهِ، هَلْ أَنْتُمْ تَارِكُونَ لِي أُمَرَائِي؟ لَكُمْ صِفْوَةُ أَمْرِهِمْ وَعَلَيْهِمْ كَدَرُهُ).

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ زەیدی کوڕی (حارثة)دا دەرچوین بۆ غەزای (مؤتة) — غەزای (مؤتة) لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا لەخاکی رۆم رویدا سێ کەس لە سەرکردەکانی تێدا شەهید بوو - یەکێ لەو پیاوانەی کە دێن بۆ یارمەتی ئەو جەنگاوەرانەی لەجەنگدان خەڵکی یەمەن بوو بوو بە هاوڕێم، جگە لەشمشێرەکەی هیچی تری پێ نەبوو، یەکێ لە موسوڵمانان وشترێکی سەربڕی، کابرای یەمەنی داوای پارچەیە لە پێستەکەی کرد، ئەویش پێی دا، هەتا لەدوای وشك کردنەوە کە پتەو بوو زرێی چەرمی لێ دروست بکات، گەیشتین بە کۆمەڵێ لە رۆم پیاوێکیان لەناودا بوو بەسەر ئەسپێکی سورەوە زینی ئەسپەکەی و چەکەکەی بە ئاڵتون روکەش کرابو، کابرای رۆمی رۆمەکانی زۆر هان دەدا بۆ جەنگ و کوشتاری موسوڵمانەکان، پیاوە یەمەنیەکەش لەپاڵ بەردێکی گەورەدا خۆی حەشاردا، کاتێ کە پیاوە رۆمیەکە دای بەلایدا پەلاماری دایە دەماری سەر پاژنەی قاچی ئەسپەکەی بڕییەوە، کابرای رۆمی

لەسەر ئەسپەکەی کەوتەخوارەوە، پیاوە یەمەنیەکە سەرکەوت بەسەریداو کوشتی جا ئەسپەکەی و چەك و کەرەستەکانی کۆکردەوەو بردی بۆ خۆی، کاتێ کە خوای گەورە موسوڵمانانی سەرخست بەسەر رۆمەکاندا خالیدی کوڕی وەلید ناردی بۆلای پیاوە یەمەنیەکە هەندێ لەدەستکەوتەکەی لێ سەندەوە، عەوف وتی: چووم بۆلای خالید وتم: ئەی خالید! ئایا تۆ نازانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ کافرێك لەجەنگدا بکوژێت کەل و پەل و چەك و کەرەستەکانی بۆ ئەو کەسە بێ؟ خالید وتی: بەڵێ بەڵام پێم وایە ئەوە زۆرە — خالید دەیویست هەندێکی بۆ موسوڵمانان بێت - ، وتم: یان ئەوەتا بۆی دەگێڕیتەوە یا ئەم بەسەرهاتە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رادەگەیەنم هەتا بزانێ چ کارێکی خراپت کردوە، خالید نەیویست بیگێڕێتەوە، عەوف وتی: لەگەڵ خالید لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کۆبوینەوە بەسەرهاتی پیاوە یەمەنیەکەم بۆ گێڕایەوە هەروەها کە خالیدیش چ کارێکی کردوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی خالید! چی وای لێ کردی ئەو کارە بکەی؟)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێم وابوو ئەو بەشە زۆرە بۆ ئەو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی خالید! چیت لێ سەندوە بۆی بگێڕەرەوە)، عەوف وتی: پێم وت: ئەو بەڵێنەی کە پێم دای وەریبگرە واتە بەڵێنەکەم بردە سەر، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (چی بووە)، عەوف وتی: ئەو بەسەرهاتەی لەنێوان خۆم و خالید دا رویدا پێم راگەیاند، عەوف وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تووڕە بوو، فەرمووی: (ئەی خالید! کەل و پەل و کەرەستەکان مەدەرەوە بە پیاوە یەمەنیەکە، ئەوە ئێوە نافەرمانی فەرماندەو سەرکردەکانم دەکەن کە دامناون بەسەرتانەوە، لەکاتێکدا چاکی و پوختی فەرمانەکانیان بۆ ئێوەیەو، لێڵی و لێخنیەکەی بۆ خۆیانە).

**٢٧٢٠ – (صحيح) عن الوليد قال: سَأَلْتُ ثَوْرًا عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ، فَحَدَّثَنِي عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ، عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ، نَحْوَهُ.**

واتە: لە وەلیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی فەرموودەی پێشو لە پێشەوا (ثوری)م پرسی، ئەویش لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە، لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە، لە باوکیەوە، لە عەوفی کوڕی مالیکەوە بە هەمان مانا بۆ گێڕامەوە.

## باسی دەربارەی (سلب) پێنج یەکی لێ دەرناکرێت.

## ١٤٩ – باب فِي السَّلَبِ لاَ يُخَمَّسُ.

**٢٧٢١ - (صحيح) عن عن عوف بن مالك الأشجعي وخالد بن الوليد:**
**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى بِالسَّلَبِ لِلْقَاتِلِ، وَلَمْ يُخَمِّسِ السَّلَبَ.**

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعیی و خالیدی کوڕی وەلیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری داوە ئەگەر کەسێ کافرێك لەجەنگدا بکوژێت کەل و پەل و چەك و کەرەستەکانی بۆ ئەو کەسە بێ و، پێنج یەکی لێ دەرناکرێت.

## باسی دەربارەی ئەگەر سەلمێنرا کەسێ بریندارێکی بۆگەنی لە گیانەڵادا کوشتوە هەندێ لە (سلب)ەکەی بۆ ئەو دەبێت.

## ١٥٠ – باب مَنْ أَجَازَ عَلَى جَرِيحٍ مُثْخَنٍ يُنَفَّلُ مِنْ سَلَبِهِ.

**٢٧٢٢ - (ضعيف) عن عبد الله بن مسعود قال: نَفَّلَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ بَدْرٍ سَيْفَ أَبِي جَهْلٍ، كَانَ قَتَلَهُ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جەنگی بەدردا شمشێرەکەی ئەبو جەهلی بە زیادە بەش دا مـن – لە صەحیحەیندا هاتوە کە دوو لاوی ئەنصاری ئەبو جەهلیان کوشتوە - .

# باسی دەربارەی ئەوەی لەدوای جەنگ و دابەشکردنی غەنیمەت هات بەشی ناکەوێت بەڵکو غەنیمەت بەو کەسە دەدرێت کە بەشداری جەنگ بکات.

## ١٥١ – باب فِيمَنْ جَاءَ بَعْدَ الْغَنِيمَةِ لاَ سَهْمَ لَهُ.

٢٧٢٣ - (صحيح) عن سعيد بن العاص: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ أَبَانَ بْنَ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ عَلَى سَرِيَّةٍ مِنَ الْمَدِينَةِ قِبَلَ نَجْدٍ، فَقَدِمَ أَبَانُ بْنُ سَعِيدٍ وَأَصْحَابُهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخَيْبَرَ بَعْدَ أَنْ فَتَحَهَا، وَإِنَّ حُزُمَ خَيْلِهِمْ لِيفٌ، فَقَالَ أَبَانُ: اقْسِمْ لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَقُلْتُ: لاَ تَقْسِمْ لَهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ أَبَانُ: أَنْتَ بِهَا يَا وَبْرُ تَحَدَّرُ عَلَيْنَا مِنْ رَأْسِ ضَالٍ! فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اجْلِسْ يَا أَبَانُ). وَلَمْ يَقْسِمْ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە سەعیدی کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشکرێکی بە فەرماندەیی ئەبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لە مەدینەوە نارد بەرەو نەجد، ئەبانی کوڕی سەعیدو هاوڕێکانی کاتێ کە گەڕانەوە لە خەیبەر گەیشتن بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوەی جەنگ تەواو بوو بوو خەیبەریان رزگاریان کردبو، قایشی ئەسپەکانیان لەتوێکڵی خورما بوو ئەوەی کە لە ناوەڕاستی سکی ولاخی سواری توند دەکرێت، ئەبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) غەنیمەتەکە

دابەش بکە بەسەرماندا، ئەبو هورەیرە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) دابەشی مەکە بەسەریاندا — چونکە بەشداری جەنگیان نەکردوە — ئەبان وتی: ئەی (وبر) - (وبر) زیندەوەرێکی بچوکە بەسەر زەویدا دەڕوات لە چۆڵەوانیدا دەژی - تۆ بەم وتەیەت دەتەوێ رێگری لەم کارە بکەیت و خۆت هەڵقورتێنیت لەم کارەدا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی ئەبان دانیشە). ئیتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) دابەشـی نەکرد بەسەر ئەبان و هاوڕێکانیدا.

٢٧٢٤ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخَيْبَرَ حِينَ افْتَتَحَهَا، فَسَأَلْتُهُ أَنْ يُسْهِمَ لِي، فَتَكَلَّمَ بَعْضُ وُلْدِ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ، فَقَالَ: لاَ تُسْهِمْ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَقُلْتُ: هَذَا قَاتِلُ ابْنِ قَوْقَلٍ، فَقَالَ سَعِيدُ بْنُ الْعَاصِ: يَا عَجَبًا لِوَبْرٍ قَدْ تَدَلَّى عَلَيْنَا مِنْ قَدُومِ ضَالٍ، يُعَيِّرُنِي بِقَتْلِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ أَكْرَمَهُ اللَّهُ عَلَى يَدَيَّ وَلَمْ يُهِنِّي عَلَى يَدَيْهِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَؤُلاَءِ كَانُوا نَحْوَ عَشَرَةٍ فَقُتِلَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ وَرَجَعَ مَنْ بَقِيَ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کـە وتویـەتی: کـاتێ کـە گەیشـتمەوە مەدینـە لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەیبەری رزگار کردبو لە خەیبەر بوو، داوام لێ کرد لە غەنیمەتەکەی خەیبەر بەشم بدات، ئەبان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صـلی الله علیه وسلم) بەشی نەدەیت، ئەبو هورەیرە توڕە بوو وتی: ئەمـە بکـوژی ئیبنـو قەوقەلـە — ئیبنو قەوقەل پیاوێکی موسوڵمان بوو لەکاتێکدا کە ئەبان کافر بـوو کوشـتی - ، ئـەبان وتی: عەجایب بۆ پیاوێ کە دەڵێی (وبر)ە هێرش دەکاتە سەرمان و، تانـەمان لـێ دەدات بەکوشتنی پیاوێکی موسوڵمان کە خوای گەورە رێزی لێ ناوە لەسەردەستی من — شەهید

بوو ڕۆیشت بۆ بەهەشت -، ئەگەر ئەو منی بکوشتایە دەڕۆشتم بۆ دۆزەخ چونکە من لەوکاتەدا کافر بووم. ئەبو داود دەڵێت: ئەوانە نزیکەی دە کەس بوون شەشیان کوژران و ئەوانی تر گەڕانەوە.

**٢٧٢٥ – (صحيح) عن أبو موسى قال: قَدِمْنَا فَوَافَقْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا، أَوْ قَالَ فَأَعْطَانَا مِنْهَا، وَمَا قَسَمَ لأَحَدٍ غَابَ عَنْ فَتْحِ خَيْبَرَ مِنْهَا شَيْئًا إِلاَّ لِمَنْ شَهِدَ مَعَهُ، إِلاَّ أَصْحَابَ سَفِينَتِنَا: جَعْفَرٌ وَأَصْحَابُهُ فَأَسْهَمَ لَهُمْ مَعَهُمْ.**

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە — لە یەمەن - گەڕاینەوە گەیشتین بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەوکاتەدا خەیبەری رزگار کردبوو، لە غەنیمەتەکەی خەیبەر بەشی داین، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە غەنیمەتەکەی خەیبەر جگە لەوانەی کە لەخزمەتیدا بەشداری جەنگەکە بوون و لەهاوڕێیانی کەشتیەکەی ئێمە بەشی کەسی تری نەدا.

- مەبەست لەهاوڕێیانی کەشتیەکە: جەعفەر - ی کوڕی ئەبو (طالب) و هاوڕێکانی بوون کە کۆچیان کردبو بۆ حەبەشە - .

**٢٧٢٦ – (صحيح) عن أبن عمر قال: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَامَ - يَعْنِي يَوْمَ بَدْرٍ - فَقَالَ: (إِنَّ عُثْمَانَ انْطَلَقَ فِي حَاجَةِ اللَّهِ وَحَاجَةِ رَسُولِهِ، وَإِنِّي أُبَايِعُ لَهُ). فَضَرَبَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَهْمٍ وَلَمْ يَضْرِبْ لأَحَدٍ غَابَ غَيْرَهُ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە رۆژی جەنگی بەدردا هەستایەوە وتاری دا فەرمووی: (بەشداری نەکردنی (عُثْمَان) لەپێناوی رەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەیدا بووە، مـن لـەجیاتی ئـەو (بەیعەت) دەدەم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك ئەوانی تر بەشی بۆ دانا، بەشی بۆ کەسی تر دانەنا لەوانەی کە بەشداریان نەکردبوو جگە لە پێشەوا (عُثْمَان) رەزای خوای لێ بێ.

## باسی دەربارەی ئافرەت و کۆیلە لەغەنیمەت بەشیان دەدرێت.

## ١٥٢ - باب فِي الْمَرْأَةِ وَالْعَبْدِ يُحْذَيَانِ مِنَ الْغَنِيمَةِ.

٢٧٢٧ - (صحيح) عن يزيد بن هرمز قال: كَتَبَ نَجْدَةُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ عَنْ كَذَا وَكَذَا وَذَكَرَ أَشْيَاءَ وَعَنِ الْمَمْلُوكِ: أَلَهُ فِي الْفَيْءِ شَيْءٌ؟ وَعَنِ النِّسَاءِ: هَلْ كُنَّ يَخْرُجْنَ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ وَهَلْ لَهُنَّ نَصِيبٌ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَوْلاَ أَنْ يَأْتِيَ أُحْمُوقَةً مَا كَتَبْتُ إِلَيْهِ، أَمَّا الْمَمْلُوكُ فَكَانَ يُحْذَى، وَأَمَّا النِّسَاءُ فَقَدْ كُنَّ يُدَاوِينَ الْجَرْحَى وَيَسْقِينَ الْمَاءَ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی هورمزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نەجدە نامـەی نوسـی بـۆ ئیبنو عەباس رەزای خوایان لێ بێ پرسیاری ئەوەو ئەوەی لێ کرد، باسی هەنـدێك شـتی کرد وە دەربارەی کۆیلە پرسیاری لێ کرد: کە ئایا لەدەستکەوتی جەنگی هیچ بەشیان بـۆ

هەیە؟ هەروەها دەربارەی ئافرەتان پرسیاری لیٚ کرد: کە ئایا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دەردەچون بۆ غەزا وە لەدەستکەوتی جەنگی پشك و بەشیان هەبوو؟ ئیبنو عەباس وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە توشی گەوجی ببیٚ و کارێکی ئەحمەقانەی لیٚ روویدات وەڵامم نەدەدایەوە، بەم شێوەیە وەڵامی نامەکەی دایەوە: سەبارەت بە کۆیلە بەشی دەدان، سەبارەت بە ئافرەتانیش تەداوی بریندارەکانیان دەکردو ئاویان دەدا بە جەنگاوەرەکان.

**٢٧٢٨ - (صحيح) عن يزيد بن هرمز قال: كَتَبَ نَجْدَةُ الْحَرُورِيُّ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ عَنِ النِّسَاءِ: هَلْ كُنَّ يَشْهَدْنَ الْحَرْبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ وَهَلْ كَانَ يُضْرَبُ لَهُنَّ بِسَهْمٍ؟ قَالَ: فَأَنَا كَتَبْتُ كِتَابَ ابْنِ عَبَّاسٍ إِلَى نَجْدَةَ: قَدْ كُنَّ يَحْضُرْنَ الْحَرْبَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَمَّا أَنْ يُضْرَبَ لَهُنَّ بِسَهْمٍ فَلاَ، وَقَدْ كَانَ يُرْضَخُ لَهُنَّ.**

واتە: لە یەزیدی کوڕی هورمزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نەجدەی حەروری نامەی نوسی بۆ ئیبنو عەباس رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەربارەی ئافرەتان پرسیاری لیٚ کرد: کە ئایا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەشداری جەنگیان دەکرد؟ وە ئایا لەدەستکەوتی جەنگی پشك و بەشی بۆ دادەنان؟ راوی وتی: من خۆم وەڵامی نامەکەی ئیبنو عەباسم نوسیەوە بۆ نەجدە بەم شێوەیە: کە بەڵیٚ ئافرەتان لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەشداری جەنگیان دەکرد؟ بەڵام لەدەستکەوتی جەنگی بەشی بۆ دانەدەنان، بەڵکو کەمیٚ بەخششی دەدانیٚ.

٢٧٢٩ - (ضعيف) حشرج بن زياد، عن جدته أم أبيه: أَنَّهَا خَرَجَتْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ سَادِسَ سِتِّ نِسْوَةٍ، فَبَلَغَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَعَثَ إِلَيْنَا، فَجِئْنَا فَرَأَيْنَا فِيهِ الْغَضَبَ، فَقَالَ: (مَعَ مَنْ خَرَجْتُنَّ وَبِإِذْنِ مَنْ خَرَجْتُنَّ؟). فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَرَجْنَا نَغْزِلُ الشَّعَرَ، وَنُعِينُ بِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَمَعَنَا دَوَاءُ الْجَرْحَى، وَنُنَاوِلُ السِّهَامَ، وَنَسْقِي السَّوِيقَ، فَقَالَ: (قُمْنَ) حَتَّى إِذَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ خَيْبَرَ أَسْهَمَ لَنَا كَمَا أَسْهَمَ لِلرِّجَالِ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهَا: يَا جَدَّةُ وَمَا كَانَ ذَلِكَ؟ قَالَتْ: تَمْرًا.

واتە: لە حەشرەجی کوڕی زیادەوە ، لەنەنکیەوە دایکی باوکی دەگێرنەوە، کە نەنکی یەکێ بوە لەو شەش ئافرەتانەی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوە بۆ غەزای خەیبەر، هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویش ناردی بەدوامانا، ئێمەش هاتینە خزمەتی، توڕەیی پێوە دیار بوو، فەرمووی: (ئێوە لەگەڵ کێ دەرچون بۆ غەزا؟ وە بە رەزامەندی کێ دەرچون؟). وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەرچوین خوری دەرێسین و یارمەتی جەنگاوەرانی پێ دەدەین لەپێناوی خوای گەورەدا، دەرمانمان پێیەو تەداوی بریندارەکانی پێ دەکەین، تیر ئامادە دەکەین بۆ جەنگاوەرەکان، (سویق) ئامادە دەکەین بۆیان - (سویق) خواردنێکە لە ئاردی گەنم و جۆ دروست دەکرێت — فەرمووی: (هەستن بلاوەی لێ بکەن)، هەتا خوای گەورە خەیبەری بۆ رزگار کرد، بەشی بۆ دانایین وەك چۆن بەشی بۆ پیاوان دانا — لەوانەیە مەبەست لەوە بێ وەك ئەوان خواردنی بەش دابن — کوڕەزاکەی وتی: پێم وت: ئەی نەنە گیان، ئەوەی بەشیدان چی بوو؟ وتی: خورما.

**٢٧٣٠ - (صحيح) عن عمير مولى آبي اللحم قال: شَهِدْتُ خَيْبَرَ مَعَ سَادَتِي فَكَلَّمُوا فِيَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَرَ بِي، فَقُلِّدْتُ سَيْفًا، فَإِذَا أَنَا أَجُرُّهُ، فَأُخْبِرَ أَنِّي مَمْلُوكٌ، فَأَمَرَ لِي بِشَيْءٍ مِنْ خُرْثِيِّ الْمَتَاعِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَعْنَاهُ أَنَّهُ لَمْ يُسْهِمْ لَهُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: كَانَ حَرَّمَ اللَّحْمَ عَلَى نَفْسِهِ فَسُمِّيَ آبِي اللَّحْمِ.**

واتە: لە عومەیری بەندەی (آبي اللحم)ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەگەڵ گەورەكانی ئەهلەكەم ئامادەی غەزای بەدر بووین، لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) گفتوگۆیان كرد دەربارەی بەشداری كردنم لەغەزاكەو حەقی مـن و بەشـم لەغەنیمەتەكە، ئەویش فەرمانی كرد شمشێرێكیان دامیێ بۆ ئەوەی كە بەشداری جەنگەكە بكەم و فێری هونەری جەنگی بم، شمشێرەكەم كردە شان بەڵام لەبەر بچوكی تەمەنم و كورتی قەدو باڵام بەشوێنی خۆمدا شمشێرەكەم رادەكێشا، بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) راگەیاند كە كۆیلەم، كاتێ كە غەنیمەتەكەیان دابەشكرد فەرمانی كرد هەندێ كەل وپەلی ناوماڵیان پێ بەخشیم. ئەبو داود دەڵێت: ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە لە غەنیمەتەكە بەشی نەبوە چونكە كۆیلە بوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەبو عوبەید وتی: گۆشتی لەسەر خۆی حەرام كردبو بۆیە پێیان دەوت: (آبي اللحم).

**٢٧٣١ - (صحيح) عن جابر قال: كُنْتُ أَمِيحُ أَصْحَابِي الْمَاءَ يَوْمَ بَدْرٍ.**

واتە: لە جابر - ی كوڕی (عَبْدُ اللَّه) - وە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەرۆژی جەنگی بەدردا دادەبەزیمە ناو بیری ئاو كە ئاوەكەی كەم بوو بەدەستی خۆم ئاوەكەم هەڵدەگۆست و دۆڵچەم لێ پڕدەكردو دەمدا بە هاوڕێكانم.

## باسی دەربارەی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر لەغەنیمەت بەشی دەدرێت یان نا.

## ١٥٣ – باب فِي الْمُشْرِكِ يُسْهَمُ لَهُ.

٢٧٣٢ - (صحيح) عن عائشة - قال يحيى: أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ لَحِقَ بِالنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيُقَاتِلَ مَعَهُ، فَقَالَ: (ارْجِعْ). ثُمَّ اتَّفَقَا - فَقَالَ: (إِنَّا لاَ نَسْتَعِينُ بِمُشْرِكٍ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە — یەحیا وتی: پیاوێ لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران پەیوەندی کرد بە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی لەخزمەتیدا بجەنگێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بگەڕێرەوە). لەپاشدا هەردوو راوی یەحیاو موسەددەد یەکدەنگن — وتیان: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئێمە پشت نابەستین بە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر پێویستمان بە یارمەتی تۆ نیە).

## باسی سەبارەت بە بەشی ئەسپ لەغەنیمەت.

## ١٥٤ – باب فِي سُهْمَانِ الْخَيْلِ.

**٢٧٣٣ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْهَمَ لِرَجُلٍ وَلِفَرَسِهِ ثَلاَثَةَ أَسْهُمٍ: سَهْمًا لَهُ، وَسَهْمَيْنِ لِفَرَسِهِ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەغەنیمەت بۆ سوارێك و ئەسپەکەی سێ بەشی دادەنا: بەشێ بۆ پیاوەکە خۆی و، دوو بەش بۆ ئەسپەکەی.

**٢٧٣٤ - (صحيح) عن أبو عمرة، عن أبيه قال: أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْبَعَةَ نَفَرٍ وَمَعَنَا فَرَسٌ، فَأَعْطَى كُلَّ إِنْسَانٍ مِنَّا سَهْمًا، وَأَعْطَى لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ.**

واتە: لە ئەبو (عمرە)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوار کەس ئەسپێکمان پێ بوو ڕۆشتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ جەنگ، هەریەکێ لەئێمە بەشێکی لەغەنیمەتەکە دایە، دوو بەشیشی دا بە ئەسپەکە.

**٢٧٣٥ - (صحيح) عن أبو عمرة، بِمَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: ثَلاَثَةَ نَفَرٍ، زَادَ: فَكَانَ لِلْفَارِسِ ثَلاَثَةُ أَسْهُمٍ.**

واتە: لە ئەبو (عمرە)وە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە تەنها ئەوەندە نەبێ لەجیاتی چوار کەس وتی: سێ کەس، ئەمەی بۆ زیاد کرد: بۆ سوارە سێ بەشی دانا.

## باسی سەبارەت بەوانەی کە بۆ ئەسپ بەشێك دادەنێن.

## ١٥٥ – باب فِيمَنْ أَسْهَمَ لَهُ سَهْمًا.

٢٧٣٦ - (ضعف) عن مجمع بن جارية الأنصاري - وَكَانَ أَحَدَ الْقُرَّاءِ الَّذِينَ قَرَءُوا الْقُرْآنَ – قال: شَهِدْنَا الْحُدَيْبِيَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا انْصَرَفْنَا عَنْهَا إِذَا النَّاسُ يَهُزُّونَ الأَبَاعِرَ، فَقَالَ بَعْضُ النَّاسِ لِبَعْضٍ: مَا لِلنَّاسِ؟ قَالُوا: أُوحِيَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَخَرَجْنَا مَعَ النَّاسِ نُوجِفُ، فَوَجَدْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاقِفًا عَلَى رَاحِلَتِهِ عِنْدَ كُرَاعِ الْغَمِيمِ، فَلَمَّا اجْتَمَعَ عَلَيْهِ النَّاسُ قَرَأَ عَلَيْهِمْ: (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا). فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَتْحٌ هُوَ؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّهُ لَفَتْحٌ). فَقُسِّمَتْ خَيْبَرُ عَلَى أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ، فَقَسَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَهْمًا، وَكَانَ الْجَيْشُ أَلْفًا وَخَمْسَمِائَةٍ، فِيهِمْ ثَلاَثُمِائَةِ فَارِسٍ، فَأَعْطَى الْفَارِسَ سَهْمَيْنِ وَأَعْطَى الرَّاجِلَ سَهْمًا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: حَدِيثُ أَبِي مُعَاوِيَةَ أَصَحُّ، وَالْعَمَلُ عَلَيْهِ، وَأَرَى: الْوَهَمَ فِي حَدِيثِ مُجَمِّعٍ أَنَّهُ قَالَ: ثَلاَثُمِائَةِ فَارِسٍ وَكَانُوا مِائَتَيْ فَارِسٍ.

واتە: لە موجەمیعی کوڕی جاریەی ئەنصاریەوە – موجەمیع یەکێك بووە لە قورئان خوێنەکان - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) لە پێکهاتنی حودەیبیەدا بەشداریمان کرد، کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە خەڵك بە پەلە وشتر و وڵاخەکانیان لێ دەخوڕی، هەندێ لە خەڵکەکە بە هەندێکیان وت: ئەو خەڵکە چیانە بۆ بە پەلە وڵاخەکانیان لێ دەخوڕن؟ وتیان: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەحی بۆ هاتوە، ئێمەش بە پەلە لەگەڵ خەڵکەکە دەرچوین، دەبینین پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وا بەسەر وڵاخەکەیەوە لە (كُرَاعِ الْغَمِيم) - کە شوێنێکە لەنێوان مەککەو مەدینەدا – کاتێ کە خەڵکەکە لێی کۆبونەوە ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾). واتە: بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێ دایت (کە پێکهاتنی حودەیبیەیە).

پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە سەرکەوتنە، فەرمووی: (بەڵێ، سوێند بەو (الله)یەی کە گیانی منی بەدەستە ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەیە)، جا زەوی و زار و غەنیمەتەکەی خەیبەر دابەشکرا بەسەر ئەوانەدا کە بەشداری پێکهاتنی حودەیبیەیان کردبو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کردی بە هەژدە بەشەوە، ژمارەی سوپاکە هەزارو پێنج سەد کەس بوو، سێ سەد سواریان لەناودا بوو، دوو بەشی دا بە هەر سوارێك بۆ خۆی و ئەسپەکەی، بۆ هەر پیادەیەکیش بەشێ.

ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەی پێشو صەحیح ترە و لەلایەن زۆربەی زانایانەوە کاری پێ دەکرێت: کە بۆ هەر سوارێك سێ بەشە: بەشێ بۆ خۆی و دوو بەشیش بۆ ئەسپەکەی، پێم وایە: (وهم) لە فەرموودەکەی موجەمیع دا ئەوەیە کە دەڵێ: سێ سەد سوار بوون، بەڵام خۆیان دوو سەد سوار بوون.

## باسی سەبارەت بە زیادە بەش.

## ١٥٦ - باب فِي النَّفْلِ.

٢٧٣٧ - (صحيح) عن ابن عباس قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ بَدْرٍ: (مَنْ فَعَلَ كَذَا وَكَذَا فَلَهُ مِنَ النَّفْلِ كَذَا وَكَذَا). قَالَ: فَتَقَدَّمَ الْفِتْيَانُ وَلَزِمَ الْمَشْيَخَةُ الرَّايَاتِ فَلَمْ يَبْرَحُوهَا، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَالَتِ الْمَشْيَخَةُ: كُنَّا رِدْءًا لَكُمْ لَوِ انْهَزَمْتُمْ لَفِئْتُمْ إِلَيْنَا، فَلاَ تَذْهَبُوا بِالْمَغْنَمِ وَنَبْقَى، فَأَبَى الْفِتْيَانُ وَقَالُوا: جَعَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَنَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ) إِلَى قَوْلِهِ: (كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَـٰرِهُونَ) يَقُولُ: فَكَانَ ذَلِكَ خَيْرًا لَهُمْ، فَكَذَلِكَ أَيْضًا فَأَطِيعُونِي فَإِنِّي أَعْلَمُ بِعَاقِبَةِ هَذَا مِنْكُمْ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی غەزای بەدردا فەرمووی: (ئەوەی ئاواو ئاوا بکات ئەوەندەو ئەوەندە زیادە بەشی لە دەستکەوت دەدرێتێ). ڕاوی وتی: ئیتر کوڕە لاوەکان چونەپێشەوە و پیرەکان لەدەوری ئاڵاکان کۆبونەوەو نەجوڵان، کاتێ کە خوای گەورە سەریخستن بەسەر کافرەکاندا، لاوەکان وتیان: ئێمە جەنگمان کردوە بۆیە دەستکەوتەکە هی ئێمەیە، پیرەکان وتیان: ئێمە پشتی ئێوەمان گرتبو، ئەگەر بشکانایە دەهاتنەوە بۆلای ئێمە، نابێ ئێوە

دەستکەوتەکە ببەن و ئێمە بەبێ بەش بمێنینەوە، لاوەکان رازی نەبون وتیان: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خۆی داویەتی بە ئێمە، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿يَسْئَلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ﴾. سورة الأنفال: ١. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە دەسکەوتەکان(ی جەنگی بەدر)، تۆش بڵێ: ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن. هەتا دەگاتە ئایەتی: ﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥﴾. سورة الأنفال: ٥. واتە: هەر چۆنێك كە پەروەردگارت لە ماڵەکەت دەرهێنایت بەهەق و ڕاستی، لەکاتێکدا بێگومان دەستەیەك لەبڕواداران بێزاربوون و پێیان ناخۆش بوو.

فەرمووی: دەرچوونتان بۆ غەزای بەدر باشترە بۆ ئێوە، هەروەها دابەشکردنی دەستکەوتەکەش، ئێوە گوێڕایەڵی من بن لەبارەی دابەشکردنی ئەو دەستکەوتەکەوە پێچەوانەی فەرمانی من مەجوڵێنەوە، چونکە من لەئێوە شارەزاترم بە سەرەنجامی ئەو کارە.

**٢٧٣٨ - (صحيح) عن ابن عباس، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَوْمَ بَدْرٍ: (مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ كَذَا وَكَذَا، وَمَنْ أَسَرَ أَسِيرًا فَلَهُ كَذَا وَكَذَا)، ثُمَّ سَاقَ نَحْوَهُ، وَحَدِيثُ خَالِدٍ أَتَمُّ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی غەزای بەدردا فەرمووی: (ئەوەی کافرێ بکوژێت ئەوەندەو ئەوەندەی بۆ هەیە، ئەوەی کافرێ بە دیل بگرێت ئەوەندەو ئەوەندەی بۆ هەیە)، لەپاشدا ڕاوی بەهەمان مانا فەرموودەکەی گێڕایەوە، بەڵام فەرموودەکەی سالم تەواوترە واتە فەرموودەی پێشو.

**٢٧٣٩ - (صحيح) عن داود، بِهَذَا الْحَدِيثِ بِإِسْنَادِهِ، قَالَ: فَقَسَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالسَّوَاءِ، وَحَدِيثُ خَالِدٍ أَتَمُّ.**

واتە: لە داودەوە فەرموودەی پێشو هاتوە، وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستکەوتەکەی بە یەکسانی دابەشکرد بەسەریاندا، بەڵام فەرموودەکەی سالم تەواوترە واتە فەرموودەی پێشو.

**٢٧٤٠ - (حسن صحيح) عن مصعب بن سعد، عن أبيه قال: جِئْتُ إِلَى النَّبِي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ بَدْرٍ بِسَيْفٍ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ شَفَى صَدْرِي الْيَوْمَ مِنَ الْعَدُوِّ، فَهَبْ لِي هَذَا السَّيْفَ، قَالَ: (إِنَّ هَذَا السَّيْفَ لَيْسَ لِي وَلاَ لَكَ)، فَذَهَبْتُ وَأَنَا أَقُولُ: يُعْطَاهُ الْيَوْمَ مَنْ لَمْ يُبْلِ بَلاَئِي! فَبَيْنَا أَنَا إِذْ جَاءَنِي الرَّسُولُ، فَقَالَ: أَجِبْ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ نَزَلَ فِيَّ شَيْءٌ بِكَلاَمِي، فَجِئْتُ فَقَالَ لِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّكَ سَأَلْتَنِي هَذَا السَّيْفَ، وَلَيْسَ هُوَ لِي وَلاَ لَكَ، وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ جَعَلَهُ لِي فَهُوَ لَكَ، ثُمَّ قَرَأَ: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قِرَاءَةُ ابْنِ مَسْعُودٍ: (يَسْأَلُونَكَ النَّفْلَ).**

واتە: لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی غەزای بەدردا بەشمشێرێکی دەستکەوتەکەوە چومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)،

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەمڕۆ خوای گەورە شیفای دڵ و دەروونی دام کە بینیم هاوبەش بۆ خوا دانەران ئەو شکستە گەورەیان هێنا – حەفتا کەس لە گەورەکانی قورەیش کوژران - ئەم شمشێرەم بە دیاری پێ ببەخشە، فەرمووی: (ئەو شمشێرە لەدەستکەوتی جەنگە نە هی منە هەتا بیدەم بە تۆ وە نە هی تۆشە هەتا بیبەیت)، منیش رۆشتم دەموت: ئەمڕۆ دەیبەخشێت بەکەسێ ئەو کارەی کە من لەجەنگەکەدا کردومە ئەو نەیکردوە، واتە من شایستەترم ئەو وەك من نەجەنگاوە، لەکاتێکدا کە من سەرقاڵی کاری خۆم بووم فروستادەیەك هات وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بانگت دەکات وەرە بەدەم بانگەکەیەوە، منیش ترسام ئایەت لەبارەی قسەکەمەوە دابەزیبێ، جا چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (تۆ داوای ئەو شمشێرەت لێ کردم، ئەو شمشێرە لەدەستکەوتی جەنگە نە هی منەو نە هی تۆشە، بەڵام خوای گەورە بەخشی بەمن، ئەوا منیش بەخشیم بە تۆ)، لەپاشدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾. سورة الأنفال: ١. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە دەسکەوتەکان(ی جەنگی بەدر)، تۆش بڵێ: ئەو دەستکەوتانە هەر بۆ خواو پێغەمبەرن، کەواتە خۆتان بپارێزن و لە خوا بترسن، وە پەیوەندی نێوان خۆتان چاك بکەنەوە وگوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن ئەگەرئێوە بڕوادارن.

ئەبو داود دەڵێت: (خوێندنەوەی ئیبنو مەسعود بەم شێوەیە: (يَسْأَلُونَكَ النَّفلَ).

# باسی سەبارەت بەوەی ئەگەر کۆمەڵێ لە لەشکرەکە جیابونەوە.

# ١٥٧ – باب فِي نَفْلِ السَّرِيَّةِ تَخْرُجُ مِنَ الْعَسْكَرِ.

**٢٧٤١ - (صحيح) عن ابن عمر قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي جَيْشٍ قِبَلَ نَجْدٍ، وَانْبَعَثَتْ سَرِيَّةٌ مِنَ الْجَيْشِ، فَكَانَ سُهْمَانُ الْجَيْشِ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا ، اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا ، وَنَفَّلَ أَهْلَ السَّرِيَّةِ بَعِيرًا بَعِيرًا ، فَكَانَتْ سُهْمَانُهُمْ ثَلاَثَةَ عَشَرَ ثَلاَثَةَ عَشَرَ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەشکرێکی نارد بەرەو نەجد، خۆشم یەکێ بووم لەوان، کۆمەڵێ لە لەشکرەکە جیابونەوە چون بۆ غەزا بە دەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوە، کاتێ کە دەستکەوتەکەیان بەشکرد هەریەکەیان دوانزە وشتری بەرکەوت، ئەوانەی کە جیابونەوە لە لەشکرەکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەریەکەو سەرو وشترێکی تری دانێ بە زیادە بەش، جا ئەوان یەکی سیانزە وشتریان بەرکەوت.

**٢٧٤٢ – (صحيح) عن ابن المبارك، بِهَذَا الْحَدِيثِ، قُلْتُ: وَكَذَا حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فَرْوَةَ، عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: لاَ تَعْدِلْ مَنْ سَمَّيْتَ بِمَالِكٍ، هَكَذَا أَوْ نَحْوَهُ، يَعْنِي مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ.**

واتە: ئیبنو موبارەك فەرموودەی پێشوی گێڕاوەتەوە لەڕێگەی شوعەیبی کوڕی ئەبو حەمزەوە، لە نافیعەوە، وەلیدی کوڕی موسلیم دەڵێت منیش دەڵێم: هەروەها ئیبنو ئەبو فەروەش – واتە ئیسحاقی کوڕی (عبد الله)ی ئیبنو ئەبو فەروە - ، ئیبنو موبارەك لەوەڵامی وەلید دا وتی: شوعەیبی کوڕی **ئەبو** حەمزە لە لەبەرکردنی فەرموودەو ڕێکی گێڕانەوەیدا ناگاتە پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس، ئیبنو موبارەك بەم شێوەو بە هەمان گۆ(لفظ) فەرموودەی پێشوی لە پێشەوا مالیکەوە گێڕاوەتەوە.

**٢٧٤٣ - (صحيح) عن ابن عمر قال: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَرِيَّةً إِلَى نَجْدٍ، فَخَرَجْتُ مَعَهَا، فَأَصَبْنَا نَعَمًا كَثِيرًا، فَنَفَّلَنَا أَمِيرُنَا بَعِيرًا بَعِيرًا لِكُلِّ إِنْسَانٍ، ثُمَّ قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَسَّمَ بَيْنَنَا غَنِيمَتَنَا، فَأَصَابَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا بَعْدَ الْخُمُسِ، وَمَا حَاسَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالَّذِي أَعْطَانَا صَاحِبُنَا وَلاَ عَابَ عَلَيْهِ بَعْدَ مَا صَنَعَ، فَكَانَ لِكُلِّ رَجُلٍ مِنَّا ثَلاَثَةَ عَشَرَ بَعِيرًا بِنَفْلِهِ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەشکرێکی نارد بەرەو نەجد، خۆشم لەگەڵیان دەرچوم، وشترێکی زۆرمان دەستکەوت، سەرکردەکەمان بۆ هەریەکێ لە ئێمە وشترێکی زیادەی دانا، لەپاشدا گەیشتین بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێنج یەکی لەدەستکەوتەکە دەرکرد ئینجا یەکی دوانزە وشتری داینێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکردین لەسەر ئەوەی کە سەرکردەکەمان یەکی وشترێکی زیادەی داینێ، وە ڕەخنەی

نەگرت لەسەرکردەکەشمان لەسەر ئەو کارەی کە کردی، جا هەریەکێ لەئێمە بە زیادەکەوە سیانزە وشترمان بەرکەوت.

**٢٧٤٤ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ، فَغَنِمُوا إِبِلاً كَثِيرَةً، فَكَانَتْ سُهْمَانُهُمُ اثْنَىْ عَشَرَ بَعِيرًا، وَنُفِّلُوا بَعِيرًا بَعِيرًا. زَادَ ابْنُ مَوْهَبٍ:" فَلَمْ يُغَيِّرْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەشکرێکی نارد بەرەو نەجد، (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەریشیان لەناودا بوو، وشترێکی زۆریان دەستکەوت، یەکی دوانزە وشتریان بەرکەوت، سەرکردەکەیان یەکی وشترێکی زیادەی دانێ. ئیبنو وەهەب ئەمەی بۆ زیاد کرد: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گۆڕانکاری تێدا نەکرد ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی.

**٢٧٤٥ - (صحيح) عن عبد الله قال: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَرِيَّةٍ، فَبَلَغَتْ سُهْمَانُنَا اثْنَىْ عَشَرَ بَعِيرًا، وَنَفَّلَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعِيرًا بَعِيرًا.**

**(صحيح) قَالَ أَبُو دَاوُدَ: عن نَافِعٍ مِثْلَهُ إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ: وَنُفِّلْنَا بَعِيرًا بَعِيرًا. لَمْ يَذْكُرِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

لەشکرێکی نارد بەرەو نەجد، منیشیان لەگەڵ بوو، بەشەکەمان گەیشتە دوانزە وشتر، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەریەکە وشترێکی زیادەی داینێ واتە یەکی سیانزە وشترمان بەرکەوت.

ئەبو داود دەڵێت: لەنافعەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە تەنها ئەوەندە نەبێ کە وتی: سەرو وشتری زیادەیان داینێ، باسی پێغەمبەریشی (صلى الله عليه وسلم) نەکرد.

**٢٧٤٦ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ كَانَ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً النَّفْلَ، سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ، وَالْخُمُسُ فِي ذَلِكَ وَاجِبٌ كُلُّهُ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاتێ کۆمەڵێ لە لەشکرێکی دەنارد بەلایەکدا لەبەر چالاکیەکانیان بەشی تایبەت بە خۆیانی دادەنا، جگە لەوەی کە دابەشی دەکرد بەسەر لەشکرەکەدا بە گشتی، لەهەمویدا دەرکرنی پێنج یەك واجبە.

**٢٧٤٧ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ يَوْمَ بَدْرٍ فِي ثَلاَثِمِائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ حُفَاةٌ فَاحْمِلْهُمْ، اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ عُرَاةٌ فَاكْسُهُمْ، اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ جِيَاعٌ فَأَشْبِعْهُمْ). فَفَتَحَ اللَّهُ لَهُ يَوْمَ بَدْرٍ، فَانْقَلَبُوا حِينَ انْقَلَبُوا وَمَا مِنْهُمْ رَجُلٌ إِلاَّ وَقَدْ رَجَعَ بِجَمَلٍ أَوْ جَمَلَيْنِ، وَاكْتَسَوْا وَشَبِعُوا.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّـه)ی كوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژی غەزای بەدر بە سێ سەدو پانزە كەسەوە دەرچو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (خوایە ئەمانە پیادەن ولاخی سواریان پێ ببەخشە هەتا هەڵیان بگرێت، ڕوتن پۆشتەیان بكەرەوە واتە پۆشاكیان پێ ببەخشە هەتا خۆیانی پێ داپۆشن، برسین تێریان بكە واتە ڕۆزییان بۆ بنێرە هەتا تێر بن)، خوای گەورە لەجەنگی بەدردا سەریخستن، كاتێ كە گەڕانەوە بۆ مەدینە هەریەكێ لەوان بە وشترێ یان دوو وشترەوە گەڕایەوە، تێر و پۆشتەو پەرداخ بوون.

## باسی ئەوانەی كە دەڵێن: سەرەتا جیاكردنەوەی پێنج یەك، لەپاشدا زیادە بەش.

## ١٥٨ – باب فِيمَنْ قَالَ: الْخُمُسُ قَبْلَ النَّفْلِ.

**٢٧٤٨ - (صحيح) عن حبيب بن مسلمة الفهري قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنَفِّلُ الثُّلُثَ بَعْدَ الْخُمُسِ.**

واتە: حەبیبی كوڕی مەسلەمەی فیهری دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەدوای جیاكردنەوەی پێنج یەك ئینجا سێ یەكی بە زیادە بەش دەدا بەوانەی كە غەنیمەتەكەیان گرتوە.

**٢٧٤٩ - (صحيح) عن حبيب بن مسلمة، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُنَفِّلُ الرُّبُعَ بَعْدَ الْخُمُسِ، وَالثُّلُثَ بَعْدَ الْخُمُسِ، إِذَا قَفَلَ.**

واتە: حەبیبی کوڕی مەسلەمە دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) دەردەچو بۆ غەزا پێنج یەکی لە دەسکەوتەکە جیادەکردەوە، لەدوایدا چوار یەکی بە زیادە بەش دەدا بەوانەی کە غەنیمەتەکەیان گرتوە، بەڵام کاتێ کە دەگەڕایەوە پێنج یـەکی لـە دەسکەوتەکە جیادەکردەوە ئینجا سێ یەکی دەدانێ.

٢٧٥٠ - (صحيح) عن مكحول قال: كُنْتُ عَبْدًا بِمِصْرَ لامْرَأَةٍ مِنْ بَنِي هُذَيْلٍ، فَأَعْتَقَتْنِي، فَمَا خَرَجْتُ مِنْ مِصْرَ وَبِهَا عِلْمٌ إِلاَّ حَوَيْتُ عَلَيْهِ فِيمَا أُرَى! ثُمَّ أَتَيْتُ الْحِجَازَ فَمَا خَرَجْتُ مِنْهَا وَبِهَا عِلْمٌ إِلاَّ حَوَيْتُ عَلَيْهِ فِيمَا أُرَى، ثُمَّ أَتَيْتُ الْعِرَاقَ فَمَا خَرَجْتُ مِنْهَا وَبِهَا عِلْمٌ إِلاَّ حَوَيْتُ عَلَيْهِ فِيمَا أُرَى! ثُمَّ أَتَيْتُ الشَّامَ فَغَرْبَلْتُهَا، كُلُّ ذَلِكَ أَسْأَلُ عَنِ النَّفْلِ فَلَمْ أَجِدْ أَحَدًا يُخْبِرُنِي فِيهِ بِشَيْءٍ، حَتَّى أَتَيْتُ شَيْخًا يُقَالُ لَهُ: زِيَادُ بْنُ جَارِيَةَ التَّمِيمِيُّ، فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ سَمِعْتَ فِي النَّفْلِ شَيْئًا؟ قَالَ: نَعَمْ سَمِعْتُ حَبِيبَ بْنَ مَسْلَمَةَ الْفِهْرِيَّ يَقُولُ: شَهِدْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَفَّلَ الرُّبُعَ فِي الْبَدْأَةِ، وَالثُّلُثَ فِي الرَّجْعَةِ.

واتە: لە مکحولەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە میصر بەندەی ژنێکـی هـۆزی (بـنی هذیل) بووم ڕزگاری کردم، لە میصر دەرنەچوم هەتا هەرچی زانستی قورئـان و سـوننەت هەیە وەرم گرت و کۆمکردەوە بە بۆچونی خۆم، لەپاشدا چوم بۆ حیجاز لـەوێ دەرنەچـوم هەتا هەرچی زانستی قورئان و سوننەت هەیە بە بۆچونی خۆم وەرم گرت و کـۆمکردەوە،

لەپاشدا چوم بۆ عێراق – واتە کوفەو بەصرەو بەغداد - لە عێراق دەرنەچوم هەتا هەرچی زانستی قورئان و سوننەت هەیە وەرم گرت و کۆمکردەوە بە بۆچونی خۆم، لەپاشدا چوم بۆ شام هەوڵمدا هەرچی زانستی قورئان و سوننەت هەیە وەری بگرم، لەهەموو ئەو شوێنانەدا دەربارەی زیادە بەش پرسیارم دەکرد لەگەورەو بچوك کەسێکم نەدی لەبارەیەوە شتێك بزانێ و پێم بڵێ، هەتا چوم بۆلای شێخێ ناوی زیادی کوڕی جاریەی تەمیمی بوو لەبارەی زیادە بەشەوە پرسیارم لێ کرد وتم: ئایا لەبارەی زیادە بەشەوە شتێکت بیستوە؟ وتی: بەڵێ، لەحەبیبی کوڕی مەسلەمەی فیهریم بیستوە دەیوت: لەخزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووم کاتێ کە لەگەڵ سوپاکە دەردەچو بۆ غەزا پێنج یەکی لە دەسکەوتەکە جیادەکردەوە، لەدوایدا چوار یەکی بە زیادە بەش دەدا بەوانەی کە غەنیمەتەکەیان گرتوە، بەلام کاتێ کە دەگەڕایەوە پێنج یەکی لە دەسکەوتەکە جیادەکردەوە ئینجا سێ یەکی دەدانێ.

## باسی سەبارەت بەوەی ئەگەر کۆمەڵێ لە لەشکرەکە جیابونەوە بە دەستکەوتەوە گەڕانەوە وەك یەکیان بەردەکەوێت.

## ١٥٩ – باب فِي السَّرِيَّةِ تَرُدُّ عَلَى أَهْلِ الْعَسْكَرِ.

**٢٧٥١ - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ: يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، وَيُجِيرُ عَلَيْهِمْ أَقْصَاهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، يَرُدُّ مُشِدُّهُمْ عَلَى مُضْعِفِهِمْ،**

وَمُتَسَرِّعُهُمْ عَلَى قَاعِدِهِمْ، لاَ يُقْتَلُ مُـؤْمِنٌ بِكَـافِرٍ، وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ). وَلَمْ يَذْكُرِ ابْنُ إِسْحَاقَ الْقَوَدَ وَالتَّكَافُؤَ.

واتە: لە عەمری کوڕی شـوعەیبەوە، لـە باوکیـەوە، لـە باپیریـەوە دەگێڕنـەوە، کـە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویـەتی: (موسـوڵمانان خوێنـەکانیان یەکسانە - واتە: لە تۆڵە لێ سندن و خـوێن کەوتنەسـەردا وەك یـەکن گـەورەو بچـوك و خاوەن پلەو پایەو بێ پلەو پایە - ، ئەکەوێتە گەردنی هەموویانەوە ئەوەی کـە لەگـەردنی یەکێکیاندا یان کەمترینیاندا بێت — واتە ئەگەر کەمترینی موسـوڵمان لـە پلـەو پایـەدا پەنای کـافرێکی دا ئـەوا پێویسـتە لەسـەر هـەموو موسـوڵمانان بیپـارێزن - ، ئەگـەر موسوڵمانێ بەڵێن و پەیمانی دا بە کافرێ کە پەنای بدات و بیپارێزێ هەرچەندە ماڵەکـەی دور بێت بۆ هیچ موسوڵمانێ نیە ئەو بەڵێن و پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە، خاوەن پلەوپایـەو لەخوارترینیان وەك یەکن بۆ بەڵێن و پەیماندان بە کافر، موسوڵمانان یەکدەسـتن بەرامبـەر بە جگە لە خۆیان و یارمەتی دەری یەکترن، بەهێز و بێ هێزیـان وەك یـەك بەشـدارن لـە دەستکەوتی جەنگیدا، ئەوەی لە لەشـکرەکە جیابێتـەوە و ئـەوەی کـە دەمێنێتـەوە وەك یەکیان بەردەکەوێت، کەسی باوەڕدار بە کافر ناکوژرێت، کافرێ کە لەناو بەڵێن و پەیمانی موسوڵماندا بێ بە کافرێکی دەرەوەی بـەڵێن و پـەیمان ناکوژرێتـەوە).   ئیبنـو ئیسـحاق لەریوایەتەکیدا باسی: (تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ)، (لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ) نەکرد.

٢٧٥٢ - (حسن صحيح) عن إياس ابن سلمة، عن أبيه قال: أَغَـارَ عَبْـدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عُيَيْنَةَ عَلَى إِبِلِ رَسُولِ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، فَقَتَلَ رَاعِيَهَا، وَخَرَجَ يَطْرُدُهَا هُـوَ وَأُنَـاسٌ مَعَـهُ فِـي خَيْلٍ، فَجَعَلْتُ وَجْهِي قِبَلَ الْمَدِينَةِ، ثُمَّ نَادَيْتُ ثَلاَثَ مَـرَّاتٍ: يَا صَبَاحَاهُ. ثُمَّ اتَّبَعْتُ الْقَوْمَ، فَجَعَلْتُ أَرْمِي وَأَعْقِرُهُمْ، فَـإِذَا

رَجَعَ إِلَيَّ فَارِسٌ، جَلَسْتُ فِي أَصْلِ شَجَرَةٍ، حَتَّى مَا خَلَقَ اللَّهُ شَيْئًا مِنْ ظَهْرِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلاَّ جَعَلْتُهُ وَرَاءَ ظَهْرِي، وَحَتَّى أَلْقَوْا أَكْثَرَ مِنْ ثَلاَثِينَ رُمْحًا وَثَلاَثِينَ بُرْدَةً يَسْتَخِفُّونَ مِنْهَا، ثُمَّ أَتَاهُمْ عُيَيْنَةُ مَدَدًا، فَقَالَ: لِيَقُمْ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنْكُمْ. فَقَامَ إِلَيَّ أَرْبَعَةٌ مِنْهُمْ فَصَعِدُوا الْجَبَلَ فَلَمَّا أَسْمَعْتُهُمْ، قُلْتُ: أَتَعْرِفُونِي؟ قَالُوا: وَمَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ وَالَّذِي كَرَّمَ وَجْهَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لاَ يَطْلُبُنِي رَجُلٌ مِنْكُمْ فَيُدْرِكُنِي وَلاَ أَطْلُبُهُ فَيَفُوتُنِي. فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى فَوَارِسِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَتَخَلَّلُونَ الشَّجَرَ أَوَّلُهُمُ الأَخْرَمُ الأَسَدِيُّ فَيَلْحَقُ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُيَيْنَةَ وَيَعْطِفُ عَلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَاخْتَلَفَا طَعْنَتَيْنِ فَعَقَرَ الأَخْرَمُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ وَطَعَنَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَقَتَلَهُ فَتَحَوَّلَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ عَلَى فَرَسِ الأَخْرَمِ، فَيَلْحَقُ أَبُو قَتَادَةَ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ فَاخْتَلَفَا طَعْنَتَيْنِ فَعَقَرَ بِأَبِي قَتَادَةَ وَقَتَلَهُ أَبُو قَتَادَةَ فَتَحَوَّلَ أَبُو قَتَادَةَ عَلَى فَرَسِ الأَخْرَمِ، ثُمَّ جِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ عَلَى الْمَاءِ الَّذِي جَلَّيْتُهُمْ عَنْهُ ذُو قَرَدٍ فَإِذَا نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي خَمْسِمِائَةٍ، فَأَعْطَانِي سَهْمَ الْفَارِسِ وَالرَّاجِلِ.

واتە: لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە – سەلەمەی کوڕی ئەکوەع - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عویەینە لەگەڵ چەند سوارێکدا لەناکاودا دای بەسەر وشترەکانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) شوانی وشترەکانی کوشت، وشترەکانی دایەبەر خۆی و دەرچو، منیش روم کردە مەدینەو سێ جار لەسەریەك هاوارم کرد: (يَا صَبَاحَاهُ) – ئەم وتەیە لەکاتی ترسدا دەوترێت - ، سەلەمە وتی: منیش دوایان کەوتم تیربارانم دەکردن لە ولاخەکانیانم دەکوشت، کاتێ کە سوارێ دەگەڕایەوە بۆم خۆم دەدایە پەنای دارێك و بۆی دادەنیشتم بۆ ئەوەی باشتر بیانپێکم - بێگومان بەدانیشتنەوە باشتر هەدەف دەپێکرێت - ، بەو شێوەیە هەتا هەموو وشترەکانی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) لێ سەندنەوە – شارەزایانی سیرە دەڵێن: ژمارەیان بیست سەر بووە - ، فڕاندنم و زیاد لە سی تیرم بۆ هاویشتن لەترساندا سی بوردە لە بوردەکانی خۆیان کردبو بە قەڵغان بۆ ئەوەی بەپەلە دەرچن لەدەستم، لەپاشدا کافرەکان هاتن بە دەمیانەوە عویەینەی باوکی (عَبْدُ الرَّحْمَن) کە یەکێك بوو لەوان وتی: کۆمەڵێکتان بچن بۆی، چوار پیاویان بۆم هاتن، سەرکەوتن بۆ سەر کێوەکە، کاتێ کە نزیك بوونەوە ئەوەندەی کە توانیم دەنگم بیانگاتێ و گوێبیستم بن وتم: ئێوە دەمناسن؟ وتیان: تۆ کێیت؟ وتم: من کوڕی ئەکوەعم، سوێند بەو (اللە)یەی کە رووی موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) رێزدار کردوە، هەرکەسێ لەئێوە پەلامارم بدات و بیەوێت بمگرێت ناتوانێ بمگرێت، پەلاماری هەر کەسێکیشتان بدەم لەدەستم دەرناچێ هەڕەشەی لێ کردن، هەر لەجێگای خۆمدا بووم دیم سوارەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتنە نیوان درەختەکانەوە، یەکەمین کەسیان ئەخرەمی ئەسەدی بوو گەیشتە سەر (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عویەینە پەلاماری دایە سەر و شمشێریان لەیەکتر دا، ئەخرەم ئەسپەکەی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوشت، (عَبْدُ الرَّحْمَن)یش ئەخرەمی ئەسەدی کوشت و سواری ئەسپەکەی ئەخرەم بوو، ئینجا ئەبو قەتادە گەیشتە سەر (عَبْدُ الرَّحْمَن) سەر و شمشێریان لەیەکتر دا، (عَبْدُ الرَّحْمَن) ئەسپەکەی ئەبو قەتادەی کوشت، ئەبو قەتادەش (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوشت و سواری ئەسپەکەی ئەخرەم بوو، لەپاشدا چو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە لەوکاتەدا لەسەر ئەو ئاوە بوو کە

من دوژمنەكانم دەركرد لەسەری لە (ذو قرد) بوو، بە پێنج سەد وشتری دەستكەوتەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەدەستكەوتەكە ئەوەندەی كەسێكی پیادەو سوارەیەكی پێدام.

## باسی دەربارەی زیادە بەش لەزێڕ و زیو و ئەو دەستكەوتەی لەسەرەتاوە دەستی جەنگاوەران دەكەوێت لەپێش جیاكردنەوەی پێنج یەك.

## ١٦٠ – باب فِي النَّفْلِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَمِنْ أَوَّلِ مَغْنَمٍ.

٢٧٥٣ - (صحيح) عن أبو الجويرية الجرمي قال: أَصَبْتُ بِأَرْضِ الرُّومِ جَرَّةً حَمْرَاءَ فِيهَا دَنَانِيرُ فِي إِمْرَةِ مُعَاوِيَةَ، وَعَلَيْنَا رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ يُقَالُ لَهُ: مَعْنُ بْنُ يَزِيدَ، فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَقَسَمَهَا بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَعْطَانِي مِنْهَا مِثْلَ مَا أَعْطَى رَجُلاً مِنْهُمْ، ثُمَّ قَالَ: لَوْلاَ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ نَفْلَ إِلاَّ بَعْدَ الْخُمُسِ). لأَعْطَيْتُكَ. ثُمَّ أَخَذَ يَعْرِضُ عَلَيَّ مِنْ نَصِيبِهِ فَأَبَيْتُ.

واتە: لە ئەبو جوەیریەی جیرمیەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعاویەدا لەخاكی ڕۆم گۆزەیەكی سور دینارم دەستكەت،

سەرکردەکەمان کە یەکێ بوو لە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەناوی مەعنی کوڕی یەزید کە لە هۆزی (بنی سولیم) بوو، لەگەڵ خۆم هێنام بۆ مەعن، ئەویش بە یەکسانی دابەشی کرد بەسەر موسوڵماناندا، وەکو یەکێ لە ئەوان بەشی منیشی دا، لەپاشدا وتی: ئەگەر لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) نەبیستایە دەیفەرموو: (زیادە بەش نیە مەگەر لەدوای جیاکردەوەی پێنج یەك)، ئەوا زیادە بەشم پێ دەدای. لەپاشدا بەشەکەی خۆی پێشکەش کردم بەڵام من قبوڵم نەکرد.

**٢٧٥٤ - (صحيح) عن عاصم بن كليب، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ.**

واتە: لە عصیمی کوڕی کولەیبەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان سەنەدو مانا هاتوە.

## باسی دەربارەی پێشەوا شتێ لە غەنیمەت هەڵدەبژێرێ بۆ خۆی لەپێش دابەشکردندا.

## ١٦١ – باب فِي الإِمَامِ يَسْتَأْثِرُ بِشَيْءٍ مِنَ الْفَيْءِ لِنَفْسِهِ.

**٢٧٥٥ - (صحيح) عن عمرو بن عبسة، قال: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَغْنَمِ فَلَمَّا سَلَّمَ أَخَذَ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ الْبَعِيرِ، ثُمَّ قَالَ: (وَلاَ يَحِلُّ لِي مِنْ غَنَائِمِكُمْ مِثْلُ هَذَا إِلاَّ الْخُمُسَ، وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ).**

واتە: لە عەمری كوڕی عەبسەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليه وسلم) بەرەو روی وشترێكی دەستكەوت بەرنوێژی بۆ كردین - واتە وشـترەكەی كردبـو بە سوترە - ، كاتێ كە سەلامی دایەوە تەڵە مویەكی لە لاتەنیشـتی وشـترەكە كـردەوە، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی خەڵكینە! لەم دەستكەوتە هیچی بۆ من حەڵاڵ نیە تەنانەت ئەم تەڵە موەش جگە لە پێنج یەك، پێنج یەكەكەش دەگێڕمەوە بۆ ئێوەو لەبەرژەوەندی ئێوەدا خەرجی دەكەم).

## باسی دەربارەی پەیمان بردنەسەرو غەدر لێ نەكردنی

## ١٦٢ – باب فِي الْوَفَاءِ بِالْعَهْدِ.

**٢٧٥٦ - (صحيح) عن ابن عمر، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الْغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ: هَذِهِ غَـدْرَةُ فُلاَنِ بْنِ فُلاَنٍ).**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صـلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (غەدر كەر لە رۆژی قیامەتـدا ئاڵایـەكی بـۆ دادەچـەقێنرێت، دەڵێن: بزانن ئەمە غەدری فلانی كوڕی فولانە).

## باسی دەربارەی پێشەوا خۆی سەروکاری پەیمانی نێوان موسوڵمانان و کافران دەکات پارێزەریەتی.

## ١٦٣ - باب فِي الإِمَامِ يُسْتَجَنُّ بِهِ فِي الْعُهُودِ.

**٢٧٥٧ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّمَا الإِمَامُ جُنَّةٌ يُقَاتَلُ بِهِ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (بێگومان پێشەوا پارێزەر و قەدەغەکەر و پەناگەیە دوژمنان دەپارێزێ لەوەی موسوڵمانان ئازاریان بدەن، وە رێگری لەوە دەکات کە هەندێکیان ئازاری هەندێکی تریان بدەن، بە فەرمان و راو بۆچونی ئەو دەجەنگن، جێگەی باوەڕ و متمانەیانە، پێشەوایانە لەجەنگ کردن و بەستنی پەیماندا خۆی سەروکاریان دەکات ئەوان شوێنکەوتەی ئەون و پێشی ناکەون، وە بە پێی فەرمان و زانیاریەکانی ئەو هەنگاو هەڵدەگرن).

**٢٧٥٨ - (صحيح) عن أبو رافع قال: بَعَثَتْنِى قُرَيْشٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُلْقِيَ فِي قَلْبِيَ الإِسْلاَمُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي وَاللَّهِ لاَ أَرْجِعُ إِلَيْهِمْ أَبَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنِّي لاَ أَخِيسُ بِالْعَهْدِ وَلاَ أَحْبِسُ الْبُرُدَ وَلَكِنِ ارْجِعْ، فَإِنْ كَانَ فِي نَفْسِكَ الَّذِي فِي نَفْسِكَ الآنَ فَارْجِعْ). قَالَ فَذَهَبْتُ،**

**ثُمَّ أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمْتُ. قَالَ بُكَيْرٌ وَأَخْبَرَنِي أَنَّ أَبَا رَافِعٍ كَانَ قِبْطِيًّا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا كَانَ فِي ذَلِكَ الزَّمَانِ فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلاَ يَصْلُحُ.**

واتە: لە ئەبو رافیعەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: قورەیش منیان نارد بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کاتێ کە بینیم ئیسلام چوە دڵمەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سوێند بە (الله) هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆلایان واتە بۆلای قورەیش، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (من بەڵێن و پەیمان ناشکێنم، فروستادەو نێرراو لەلای خۆم گل نادەمەوە، بەڵام تۆ بگەڕێرەوە بۆلایان، ئەگەر ئەوەی ئێستا لەدڵتدایە هەر بەو شێوەیە بووی واتە ئەگەر حەزت کرد موسوڵمان بیت ئەو کاتە بگەڕێرەوە بۆلامان). ئەبو رافع وتی: منیش رۆشتمەوە بۆ ناو قورەیش، لەپاشدا هاتمەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسوڵمان بووم. بوکەیر دەڵێت: - حەسەنی کوڕی عەلی کە ئەبو رافع باپیری بووە - پێی راگەیاندم کە ئەبو رافع بەندەیەکی (قِبطی) بووە. ئەبو داود دەڵێت: ئەمە کە دەڵێت: ئەبو رافع بەندەیەکی (قِبطی) بووە بۆ ئەو کات و سەردەمە بوە ئەگینا ئێستا لەبەر پلەو پایەی صەحابە پێی ناوترێت، یان مانایەکی تر هەڵدەگرێت ئەویش ئەوەیە کە ناردنەوەی فروستادە تایبەت بوە بۆ ئەو کات و سەردەمەو کە کاتی ئاگربەست(هدنە) بووە، ئەگینا ئێستا ئەگەر فروستادەیە موسوڵمان ببێت نانێردرێتەوە بۆ ناو کافران.

# باسی دەربارەی ئەگەر لەنێوان دوژمن و پێشەوادا پەیمان هەبوو پێش تەواو بوونی ماوەی پەیمانەكە پێشەوا نزیك دەبێتەوە لێیان هەتا لەدوای تەواوبونی ماوەكە بدات بەسەریاندا.

## ١٦٤ – باب فِي الإِمَامِ يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ عَهْدٌ فَيَسِيرُ إِلَيْهِ.

٢٧٥٩ - (صحيح) عن سليم بن عامر - رَجُلٍ مِنْ حِمْيَرَ - قال: كَانَ بَيْنَ مُعَاوِيَةَ وَبَيْنَ الرُّومِ عَهْدٌ، وَكَانَ يَسِيرُ نَحْوَ بِلاَدِهِمْ، حَتَّى إِذَا انْقَضَى الْعَهْدُ غَزَاهُمْ، فَجَاءَ رَجُلٌ عَلَى فَرَسٍ أَوْ بِرْذَوْنٍ وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، وَفَاءٌ لاَ غَدْرٌ، فَنَظَرُوا فَإِذَا عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ مُعَاوِيَةُ فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ، فَلاَ يَشُدُّ عُقْدَةً وَلاَ يَحُلُّهَا حَتَّى يَنْقَضِيَ أَمَدُهَا، أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ). فَرَجَعَ مُعَاوِيَةُ.

واتە: لە سولەیمی كوڕی عامیرەوە — كە پیاوێ بوو لە هۆزی حیمیەر - دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەنێوان موعاویەو رۆمەكاندا پەیمان هەبوو، موعاویە بەخۆی و لەشكرێكەوە بەرەو ولاتی رۆمەكان كەوتەڕێ، بۆئەوە نزیك بێتەوە لێیان هەتا ئەگەر ماوەی پەیمانەكە تەواو بوو غەزایان بكات، پیاوێ بە سواری ئەسپێكی عەرەبیەوە یان غەیرە عەرەبیەوە

هات هاواری دەکردو دەیوت: (الله أکبر)، (الله أکبر)، غەدر مەکەن وەفاتان هەبێ بەرامبەر بەو پەیمانەی کە داوتانە واجبە لەسەرتان ئەو پەیمانە بپارێزن، سەیریان کرد دەبینن عەمری کوڕی عەبسەیە، موعاویە ناردی بەدوایا هەتا پرسیاری لێ بکات لەو بارەوە، عەمر وتی: لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بیستوە دەیفەرموو: (هەرکەسێك لەنێوان ئەو و کۆمەڵێکدا پەیمان هەبوو، ئەوە با بەیەك لایەنەو لەلای خۆیەوە هەڵینەوەشێنێتەوە هەتا کاتەکەی تەواو دەبێت، یان پەیمانەکەیان پێ بداتەوە بۆ ئەوەی هەردوو لایان یەکسان بن لەهەڵوەشاندنەوەو ئاگاداربن). ئیتر موعاویە بەخۆی و لەشکرەکەیەوە گەڕایەوە.

## باسی دەربارەی ئەگەر کەسێك پەیمانی هەبوو لەگەڵ موسوڵمانان پێویستە پەیمانەکە بپارێزن و غەدری لێ نەکەن بەشێوەیەکی شایستە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن نەیکوژن و ئازاری نەدەن.

## ١٦٥ - باب فِي الْوَفَاءِ لِلْمُعَاهِدِ وَحُرْمَةِ ذِمَّتِهِ.

**٢٧٦٠ - (صحيح) عن أبو بكرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ قَتَلَ مُعَاهِدًا فِي غَيْرِ كُنْهِهِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ).**

واتە: لە ئەبو بەکرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك کەسێکی خاوەن پەیمان بکوژێت لە غەیری کاتی خۆیدا خوای

گەورە بە هەشتی لێ حەرام دەکات) — ناچێتە بەهەشتەوە لەگەڵ ئەوانەی کە لەیەکەم جاردا دەچنە بەهەشتەوە - ) ١.

## باسی سەبارەت بە فروستادەکان.

## ١٦٦ - باب فِي الرُّسُلِ.

٢٧٦١ - (صحيح) عن محمد بن إسحق قال: كَانَ مُسَيْلِمَةُ كَتَبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: وَقَدْ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ، عَنْ شَيْخٍ مِنْ أَشْجَعَ يُقَالُ لَهُ: سَعْدُ بْنُ طَارِقٍ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ نُعَيْمِ بْنِ مَسْعُودٍ الأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ نُعَيْمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ لَهُمَا حِينَ قَرَأَ كِتَابَ مُسَيْلِمَةَ: (مَا تَقُولاَنِ أَنْتُمَا؟) قَالاَ: نَقُولُ كَمَا قَالَ. قَالَ: (أَمَا وَاللَّهِ لَوْلاَ أَنَّ الرُّسُلَ لاَ تُقْتَلُ لَضَرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَا).

واتە: لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: موسەیلمەی درۆزن نامەی نوسی بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی پێغەمبەرایەتی دەکرد، راوی وتی: موحەممەدی کوڕی ئیسحاق بۆی باس کردم، لە شێخێکی هۆزی ئەشجەعەوە کە ناوی سەعدی کوڕی (طارق) بوو، ئەویش لە سەلەمەی کوڕی نوعەیمی کوڕی

---

[1] - عون المعبود شرح سنن أبي داود لمحمد آبادي علق عليه وخرج أحاديثه أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان).

مەسعودی ئەشجەعییەوە، لەباوکیەوە نوعەیم، كە وتویەتی: كاتێ كە دوو نوێنەرەكەی موسەیلەمەی درۆزن نامەكەی موسەیلەمەیان خوێندەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: (ئێوە چی دەڵێن؟)، وتیان: ئەوەی ئەو دەیڵێ ئێمەش ئەوە دەڵێین واتە شایەتی دەدەین كە پێغەمبەرە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (سوێند بە (الله) ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە نوێنەر ناكوژرێت لەملم دەدان).

**٢٧٦٢ - (صحيح) عن حارثة بن مضرب: أَنَّهُ أَتَى عَبْدَ اللَّهِ فَقَالَ: مَا بَيْنِي وَبَيْنَ أَحَدٍ مِنَ الْعَرَبِ حِنَةٌ، وَإِنِّي مَرَرْتُ بِمَسْجِدٍ لِبَنِي حَنِيفَةَ فَإِذَا هُمْ يُؤْمِنُونَ بِمُسَيْلِمَةَ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمْ عَبْدُ اللَّهِ، فَجِيءَ بِهِمْ فَاسْتَتَابَهُمْ غَيْرَ ابْنِ النَّوَّاحَةِ، قَالَ لَهُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لَوْلاَ أَنَّكَ رَسُولٌ لَضَرَبْتُ عُنُقَكَ). فَأَنْتَ الْيَوْمَ لَسْتَ بِرَسُولٍ فَأَمَرَ قَرَظَةَ بْنَ كَعْبٍ فَضَرَبَ عُنُقَهُ فِي السُّوقِ، ثُمَّ قَالَ: مَنْ أَرَادَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى ابْنِ النَّوَّاحَةِ قَتِيلاً بِالسُّوقِ.**

واتە: له (حارثة)ی كوڕی (مضرب)ەوە دەگێڕنەوە، كە چوە بۆلای (عَبْدُ اللَّه) ـ ی كوڕی مەسعود كاتێ كە والی كوفە بوو - وتی: لەنێوان من و هیچ كەسێكی عەرەبدا دوژمنایەتی و دوو بەرەكی و كینە نیە، بەڵام دام بەلای مزگەوتێكی هۆزی بەنی حەنیفەدا خەڵكەكەی باوەڕیان هێنابوو بە موسەیلەمەی درۆزن، (عَبْدُ اللَّه) ناردی بەدوایاندا، هێنانیان داوای لێ كردن كە تەوبە بكەن لەو هەڵگەڕانەوەیە لەئیسلام ئەوانیش هەموویان تەوبەیان كرد جگە لە ئیبنو نەوواحە نەبێ، (عَبْدُ اللَّه) بە ئیبنو نەوواحەی وت: لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بیست فەرمووی: (ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە فروستادەیت لەملم دەدایت). بەڵام تۆ ئەمڕۆ فروستادە نیت، كەواتە لەملت دەدەم،

فەرمانی دا بە (قرظة)ی کوڕی کەعب لەبازاڕدا لەملی دا، لەپاشدا وتی: ئەوەی دەیەوێت سەیری ئیبنو نەوواحە بکات ئەوەتا لەبازاڕادا کوژراوە با سەیری بکات.

# باسی سەبارەت بە ئەماندانی ئافرەت.

## ١٦٧ – باب فِي أَمَانِ الْمَرْأَةِ.

**٢٧٦٣ - (صحيح) أم هانيء بنت أبي طالب: أَنَّهَا أَجَارَتْ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ الْفَتْحِ، فَأَتَتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَذَكَرَتْ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: (قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ، وَأَمَّنَّا مَنْ أَمَّنْتِ).**

واتە: لە (أم هانیء)ی کچی (أَبِی طَالِب)ەوە دەگێرنەوە، کە لەڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا پەنای پیاوێکی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەری دا، جا چو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسەکەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (ئێمەش پەنای ئەو کەسە دەدەین کە تۆ پەنات داوە، ئەمان دەدەینە کەسێ کە تۆ ئەمانت داوەتێ).

**٢٧٦٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: إِنْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ لَتُجِيرُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ فَيَجُوزُ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر ئافرەت پەنای کافری دا کە رێگری بکات لەوەی موسوڵمانان نەیکوژن ئەوە کارەکەی دروستەو نابێ بیکوژن.

## باسى سەبارەت بە ئاشتى لەگەڵ كافراندا.

## ١٦٨ - باب فِي صُلْحِ الْعَدُوِّ.

٢٧٦٥ - (صحيح) عن المسور بن مخرمة قال: خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي بِضْعَ عَشَرَةَ مِائَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِذِي الْحُلَيْفَةِ قَلَّدَ الْهَدْيَ وَأَشْعَرَهُ وَأَحْرَمَ بِالْعُمْرَةِ. وَسَاقَ الْحَدِيثَ، قَالَ وَسَارَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالثَّنِيَّةِ الَّتِي يُهْبَطُ عَلَيْهِمْ مِنْهَا بَرَكَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ فَقَالَ النَّاسُ حَلْ حَلْ خَلأَتِ الْقَصْوَاءُ. مَرَّتَيْنِ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (مَا خَلأَتْ وَمَا ذَلِكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ). ثُمَّ قَالَ: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَسْأَلُونِي الْيَوْمَ خُطَّةً يُعَظِّمُونَ بِهَا حُرُمَاتِ اللَّهِ إِلاَّ أَعْطَيْتُهُمْ إِيَّاهَا). ثُمَّ زَجَرَهَا فَوَثَبَتْ فَعَدَلَ عَنْهُمْ حَتَّى نَزَلَ بِأَقْصَى الْحُدَيْبِيَةِ عَلَى ثَمَدٍ قَلِيلِ الْمَاءِ فَجَاءَهُ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ الْخُزَاعِيُّ ثُمَّ أَتَاهُ - يَعْنِي عُرْوَةَ بْنَ مَسْعُودٍ - فَجَعَلَ يُكَلِّمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَكُلَّمَا كَلَّمَهُ أَخَذَ بِلِحْيَتِهِ وَالْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ قَائِمٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَمَعَهُ السَّيْفُ وَعَلَيْهِ الْمِغْفَرُ فَضَرَبَ يَدَهُ بِنَعْلِ السَّيْفِ،

وَقَالَ: أَخِّرْ يَدَكَ عَنْ لِحْيَتِهِ. فَرَفَعَ عُرْوَةُ رَأْسَهُ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ. فَقَالَ: أَيْ غُدَرُ أَوَلَسْتُ أَسْعَى فِى غَدْرَتِكَ وَكَانَ الْمُغِيرَةُ صَحِبَ قَوْمًا فِى الْجَاهِلِيَّةِ فَقَتَلَهُمْ وَأَخَذَ أَمْوَالَهُمْ، ثُمَّ جَاءَ فَأَسْلَمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَمَّا الإِسْلاَمُ فَقَدْ قَبِلْنَا، وَأَمَّا الْمَالُ فَإِنَّهُ مَالُ غَدْرٍ لاَ حَاجَةَ لَنَا فِيهِ). فَذَكَرَ الْحَدِيثَ فَقَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (اكْتُبْ هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ). وَقَصَّ الْخَبَرَ فَقَالَ سُهَيْلٌ وَعَلَى أَنَّهُ لاَ يَأْتِيكَ مِنَّا رَجُلٌ وَإِنْ كَانَ عَلَى دِينِكَ إِلاَّ رَدَدْتَهُ إِلَيْنَا. فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قَضِيَّةِ الْكِتَابِ قَالَ النَّبِىُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لأَصْحَابِهِ: (قُومُوا فَانْحَرُوا ثُمَّ احْلِقُوا). ثُمَّ جَاءَ نِسْوَةٌ مُؤْمِنَاتٌ مُهَاجِرَاتٌ الآيَةَ فَنَهَاهُمُ اللَّهُ أَنْ يَرُدُّوهُنَّ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرُدُّوا الصَّدَاقَ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَجَاءَهُ أَبُو بَصِيرٍ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ - يَعْنِى فَأَرْسَلُوا فِى طَلَبِهِ - فَدَفَعَهُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ فَخَرَجَا بِهِ حَتَّى إِذَا بَلَغَا ذَا الْحُلَيْفَةِ نَزَلُوا يَأْكُلُونَ مِنْ تَمْرٍ لَهُمْ، فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ لأَحَدِ الرَّجُلَيْنِ: وَاللَّهِ إِنِّى لأَرَى سَيْفَكَ هَذَا يَا فُلاَنُ جَيِّدًا. فَاسْتَلَّهُ الآخَرُ فَقَالَ أَجَلْ قَدْ جَرَّبْتُ بِهِ فَقَالَ أَبُو بَصِيرٍ أَرِنِى أَنْظُرْ إِلَيْهِ فَأَمْكَنَهُ مِنْهُ فَضَرَبَهُ حَتَّى بَرَدَ وَفَرَّ الآخَرُ حَتَّى أَتَى الْمَدِينَةَ فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ يَعْدُو فَقَالَ

النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:(لَقَدْ رَأَى هَذَا ذُعْرًا). فَقَالَ: قَدْ قُتِلَ وَاللَّهِ صَاحِبِي وَإِنِّي لَمَقْتُولٌ، فَجَاءَ أَبُو بَصِيرٍ فَقَالَ: قَدْ أَوْفَى اللَّهُ ذِمَّتَكَ، فَقَدْ رَدَدْتَنِي إِلَيْهِمْ، ثُمَّ نَجَّانِي اللَّهُ مِنْهُمْ . فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (وَيْلَ أُمِّهِ مِسْعَرَ حَرْبٍ لَوْ كَانَ لَهُ أَحَدٌ). فَلَمَّا سَمِعَ ذَلِكَ عَرَفَ أَنَّهُ سَيَرُدُّهُ إِلَيْهِمْ فَخَرَجَ حَتَّى أَتَى سِيفَ الْبَحْرِ، وَيَنْفَلِتُ أَبُو جَنْدَلٍ فَلَحِقَ بِأَبِي بَصِيرٍ، حَتَّى اجْتَمَعَتْ مِنْهُمْ عِصَابَةٌ.

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) - راستیەکەی ئەمەیە — کە بە خۆی و هەزار و چوار سەد کەس لە هاوەڵانیەوە لەمەدینە دەرچو بەرەو مەککە بۆ عومرە، هەتا گەیشتنە (ذِي الْحُلَيْفَةِ) — کە شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینەیە - لەوێ گەردن بەندی کردە ملی وڵاخە قوربانیەکان و نیشانەی کردن و ئیحرامی عەمرەی دابەست. جا راوی فەرمودەکەی گێڕایەوە.

راوی وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قۆناغ بە قۆناغ رۆیشت هەتا گەیشتە دەربەندی ئەو کێوەی کە لێیەوە دادەبەزن بۆ ناو خەڵکی مەککە، وشترەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چۆکی دادا، خەڵکەکە دوو جار لەسەریەك وتیان: (حَلْ حَلْ، خلأت القصواء) (قصواء) مانی گرت و لاساری کرد - (حل حل) وشەیەکە بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێت کە وشتر هەستێتەوە، (قصواء) کە ناوی وشترەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو - ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (عادەتی وەها نیە بەڵکو خوای گەورە گیری دا لەوەی کە نەڕوات وەك چۆن رێگری کرد لە فیلەکانی ئەبرەهە کە بڕۆن بەرەو مەکە)، لەپاشدا فەرمووی: (سوێند بە (الله) کە گیانی منی بەدەستە ئەمڕۆ داوای هەر شتێکم لێ بکەن بەمەرجێ بەگەورەگرتن رێزی (حرومات)ی خوای گەورە بێ ئیللا

وەڵامیان دەدەمەوەو ڕیکەوتنیان لەگەڵ دەکەم — ئاماژە بوو بەوەی کە جەنگ ڕوونادات لە نیوان ئەوان و کافرەکاندا لە حەرەم — جا خوڕییە وشترەکەی بە پەلە هەستا بەرەو مەککە نەڕۆیشت بەڵکو بەرەو حودەیبیە کەوتەڕێ، هەتا لە کۆتایی حودەیبیەدا لەلای بیرێ یان چاڵاوێکدا کە ئاوەکەی کەم بوو دابەزین، بودەیلی کوڕی وەرقائی خوزاعی هات، لەپاشدا — عوروەی کوڕی ئیبنو مەسعود — هات، لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) گفتوگۆیان کرد، کاتێ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قسەیەکی دەکرد عوروە ڕیشی دەگرت، موغیرەی کوڕی شوعبە بەڕاسەری پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) راوەستا بوو، شمشێرێکی پێ بوو کڵاو زرێیەکی بەسەرەوە بوو، بە بەشی خواروی کێلانی شمشێرەکەی دای لەدەستی عوروە، پێی وت: دەستت لابە، عوروە وتی: ئەوە کێیە؟ وتیان: موغیرەی کوڕی شوعبەیە، وتی: ئەی غەدرکەر، ئەوە تۆ نەبووی هەوڵت دەدا بە بەخشینی ماڵ و سامان غەدر و کەتنەکەت لەسەر خۆت لابەیت و شەڕەکە بکوژێنیتەوە؟ بێگومان موغیرەی کوڕی شوعبە لەپێش موسوڵمان بونیدا هاوڕێی کۆمەڵێ بوو - کە ژمارەیان سیانزە کەس بوو لە هۆزی (ثقیف) بوون چون بۆ سەردانی موقەوقەس لە میصر لەرێگا خواردیانەوە سەخۆش بوون - موغیرە هەموویانی کوشت و ماڵ و سامانەکەشیانی برد، لەپاشدا هات بۆ مەدینە موسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بۆ موسوڵمان بوونەکەی ئێمە قبوڵمانە، ئەمما بۆ ماڵ و سامانەکە کە هێناویەتی ماڵ و سامانی غەدرە ئێمە هیچ پێویستیمان پێی نیە). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بنوسە: ئەمە ئەو پێکهاتن نامەیە کە موحەممەد پێغەمبەری خوا پێکهاتوە لەسەری). جا راوی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، سوهەیل — ی کوڕی عەمر کە نوێنەرایەتی کافرەکانی دەکرد - وتی: هەر کەسێ لەلایەن ئێمەوە هات بۆلات با لەسەر دینی تۆش بێت دەبێ بیگێڕیتەوە بۆ لامان، کاتێ کە لەنوسینی پێکهاتن نامەکە بوونەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە هاوەڵەکانی فەرموو: (هەستن قوربانیەکانتان سەربڕن، لەپاشدا سەرتان بتاشن)، ئەگەر ئافرەتانی باوەڕدار هاتن

بۆلات بە کۆچ کەری، ئایەت دابەزی، ڕێگری ئەوەی کرد کە بیانگێڕنەوە، فەرمانی کرد بە بڕواداران مارەییەکانیان بۆ بگێڕنەوە ئەو مارەییەی کە کافرەکان پێیان دابوون.

لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەبو بەصیر کە پیاوێکی قورەیشی بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆئەوەی موسوڵمان بێت –کافرەکانی قورەیش دوو پیاویان نارد بەدوایا داوایان کرد کە بیاندەنەوە - ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناردیەوە لەگەڵیان، ئەویش لەگەڵیان دەرچو بەرەو مەککە، هەتا گەیشتنە (ذِي الْحُلَيْفَة) لەوێ دابەزین، دوو پیاوەکەی خورمایان دەخوارد، ئەبو بەصیر بە یەکێکیانی وت: فلان کەس سوێند بە (اللّه) پێم وایە شمشێرەکەت شمشێرێکی چاکە، خاوەنی شمشێرەکە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا، وتی: بەڵێ، ئەبو بەصیر وتی: ئادەی با سەیری بکەم، ئەویش دایە دەستی، ئەبو بەصیر یەك شمشێری لێداو کوشتی، ئەوی تریشیان لەترسان هەڵهات، رای کرد هەتا گەیشتەوە مەدینە بە پەلە خۆی کرد بە مزگەوتدا لەترسی ئەوەی نەوەکا ئەبو بەصیر دەستی بیگاتێ و بیکوژێت، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (پیاوەکەم دی بە ترس و لەرزەوە)، پیاوەکە وتی: سوێند بە (اللّه) هاوڕێکەمی کوشت و منیش دەکوژێت.

ئەبو بەصیر هات وتی: تۆ خاوەنی بەڵێنی خۆت بویت، بەڵێنی خۆت بردەسەر منت گەڕاندەوە بۆ لایان، بەڵام خوای گەورە رزگاری کردم لەدەستیان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (وەیل بۆ دایکی ئەمە هەڵگرسێنەری جەنگە ئەگەر کەسێ ببێت یارمەتی بدات پێکهاتنەکە هەڵدەوەشێنێتەوە)، ئەبو بەصیر کە ئەوەی بیست زانی کە دەیگێڕنەوە بۆ لایان، بۆیە بۆی دەرچو هەتا گەیشتە (سيف البحر)، ئەبو جەندەل لەدەستی کافرەکان رزگاری بوو ئەویش پەیوەندی کرد بە ئەبو بەصیرەوە، ئیتر کۆمەڵێکیان لێ کۆبوەوە لەوانەی کە لە مەککەوە دەهاتن و موسوڵمان دەبوون.

**٢٧٦٦ - (حسن) عن المسور بن مخرمة و مروان بن الحكم، أَنَّهُمُ اصْطَلَحُوا عَلَى وَضْعِ الْحَرْبِ عَشْرَ سِنِينَ يَأْمَنُ فِيهِنَّ النَّاسُ، وَعَلَى أَنَّ بَيْنَنَا عَيْبَةً مَكْفُوفَةً، وَأَنَّهُ لاَ إِسْلاَلَ وَلاَ إِغْلاَلَ.**

واتە: لە میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەروانی کوڕی حەکەمەوە دەگێڕنەوە، کە موسوڵمانان و کافرەکانی مەککە پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە هەتا دە ساڵ جەنگ لەنێوانیاندا رونەدات و خەڵك بە ئاشتی و ئارامی بژین لەو ماوەیەدا کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر کەس، هەروەها لە نێوانیاندا پەیوەندیەکی توندو پتەو هەبێت و سینە پاك بن بەرامبەر بە یەکتر و فرو فێڵ لەیەکتر نەکەن و پابەند بن بە پێکهاتن نامەکەوە، وە لەنێوانیاندا دزی و خیانەت و ناپاکی نەبێت، ماڵ و سامانیان پارێزراو بێت.

**٢٧٦٧ - (صحيح) عن جبير قال: انْطَلَقْ بِنَا إِلَى ذِي مِخْبَرٍ - رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ – فَأَتَيْنَاهُ، فَسَأَلَهُ جُبَيْرٌ عَنِ الْهُدْنَةِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (سَتُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا، وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِكُمْ).**

واتە: لە جوبەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جوبەیری کوڕی نوفەیر و چەند کەسێکی تر هاتن لەگەڵمان بۆلای (ذي مخبر) — کە یەکێ بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جوبەیر دەربارەی ئاگر بەست لەنێوان موسوڵمانان و گاورەکاندا لە ئاخر زەماندا پرسیاری لێ کرد، (ذي مخبر) وتی: لە پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بیستوە فەرمووی: (لەگەڵ رۆمەکان - یان گاورەکان - رێك دەکەون ئەو پێکهاتنە دەبێتەهۆی

بەرقەراربوونی ئاشتی و ئارامی لەنێوانتاندا، ئێوە غـەزا دەکـەن رۆمـەکانیش بەشـداری دەکەن و یارمەتیتان دەدەن واتە هەردوو لاتان پێکەوە دەجەنگن بەرامبەر بە دوژمنێ کە دوژمنی هاوبەشتانە).

## باسی سەبارەت بە موسوڵمانێ بیەوێ بە فێڵ لەناکاودا دوژمنێ بکوژێت خۆی بکات بە یەکێ لەوان.

## ١٦٩ - باب فِي الْعَدُوِّ يُؤْتَى عَلَى غِرَّةٍ وَيُتَشَبَّهُ بِهِمْ.

**٢٧٦٨ - (صحيح) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:** (مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الأَشْرَفِ فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ). فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قَالَ: فَأْذَنْ لِي أَنْ أَقُولَ شَيْئًا. قَالَ: (نَعَمْ قُلْ). فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا الرَّجُلَ قَدْ سَأَلَنَا الصَّدَقَةَ وَقَدْ عَنَّانَا، قَالَ: وَأَيْضًا لَتَمَلُّنَّهُ. قَالَ: اتَّبَعْنَاهُ فَنَحْنُ نَكْرَهُ أَنْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظُرَ إِلَى أَيِّ شَيْءٍ يَصِيرُ أَمْرُهُ، وَقَدْ أَرَدْنَا أَنْ تُسْلِفَنَا وَسْقًا أَوْ وَسْقَيْنِ . قَالَ كَعْبٌ: أَيَّ شَيْءٍ تَرْهَنُونِي؟ قَالَ: وَمَا تُرِيدُ مِنَّا؟ قَالَ: نِسَاءَكُمْ، قَالُوا: سُبْحَانَ اللَّهِ أَنْتَ أَجْمَلُ الْعَرَبِ نَرْهَنُكَ نِسَاءَنَا فَيَكُونُ ذَلِكَ عَارًا عَلَيْنَا. قَالَ: فَتَرْهَنُونِي أَوْلاَدَكُمْ. قَالُوا: سُبْحَانَ اللَّهِ يُسَبُّ ابْنُ أَحَدِنَا فَيُقَالُ: رُهِنْتَ

بِوَسْقٍ أَوْ وَسْقَيْنِ. قَالُوا: نَرْهَنُكَ اللأْمَةَ يُرِيدُ السِّلاَحَ، قَالَ: نَعَمْ. فَلَمَّا أَتَاهُ نَادَاهُ فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُتَطَيِّبٌ يَنْضَخُ رَأْسُهُ، فَلَمَّا أَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ وَقَدْ كَانَ جَاءَ مَعَهُ بِنَفَرٍ ثَلاَثَةٍ أَوْ أَرْبَعَةٍ فَذَكَرُوا لَهُ، قَالَ: عِنْدِي فُلاَنَةُ وَهِيَ أَعْطَرُ نِسَاءِ النَّاسِ. قَالَ: تَأْذَنُ لِي فَأَشُمُّ؟ قَالَ: نَعَمْ. فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي رَأْسِهِ فَشَمَّهُ، قَالَ: أَعُودُ، قَالَ: نَعَمْ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِي رَأْسِهِ فَلَمَّا اسْتَمْكَنَ مِنْهُ قَالَ: دُونَكُمْ. فَضَرَبُوهُ حَتَّى قَتَلُوهُ.

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (كێ هەڵئەسێ كەعبی كوڕی ئەشرەفم بۆ لەناودەبات، چونكە بەڕاستی ئەو ئازاری خواو پێغەمبەرەكەی دەدات)، موحەممەدی كوڕی مەسلەمە هەستا وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، حەزدەكەیت بیكوژم؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: ڕێگەم پێ بدە لەبارەی تۆوە شتێ بڵێم بەهۆیەوە بیخەڵەتێنم، فەرمووی: (بیڵێ)، جا موحەممەدی كوڕی مەسلەمە چو بۆلای كەعب وتی: ئەی كەعب ئەم پیاوە واتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای خێر و صەدەقەمان لێ دەكات، بەڕاستی ئەم پیاوە بێزاری كردوین، كەعب وتی: زیاتریش لێی بێزار دەبن، موحەممەد وتی: ئێمە شوێنی كەوتوین و حەزیش ناكەین وازی لێبهێنین هەتا بزانین كاروباری ئەم پیاوە بەكوێ دەگات، دەمەوێ ویسقێ یان دوو ویسق خورمام بە قەرز بدەیتێ، كەعب وتی: بەڵێ باشە بەڵام چ شتێ بە بارمتە لەلام دادەنێن؟ وتی: چیت دەوێ بە بارمتە لەلات دایبنێین؟ كەعب وتی: ژنەكانتان، وتیان: (سبحان الله) تۆ جوانترینی عەرەبیت ژنەكانمان بە بارمتە لات دابنێین ئەوە شورەییە بۆمان و ئابڕومان دەچێت، كەعب وتی: دەی كوڕەكانتانم پێ بدەن بە بارمتە، وتیان: (سبحان الله) سبەینێ جنێویان پێ دەدەن و پێیان دەڵێن: ئەی بارمتەی ویسقێ یان دوو ویسق خورما، بەڵام زریە واتە چەكت لەلا دادەنێین، كەعب وتی: باشە.

موحەممەد بەڵێنە دا کە بچێ بۆلای، شەو چون بۆلای بانگیان کرد، ئەویش هاتەدەرەوە بۆلایان بۆنی خۆشی لەسەری دابوو، کاتێ کە موحەممەد لەلای دانیشت بەهەرحاڵ موحەممەد سێ کەس یان چوار کەسی لەگەڵ خۆی هێنا بوو، کەعب وتی: ئەم شەو فلانە ژنم لەلایە کە بۆنخۆشترین و جوانترین ئافرەتە مەبەستی لە ژنەکەی خۆی بوو، موحەممەد وتی: مۆڵەتم دەدەی بۆنی ئەو بۆنە خۆشە بکەم؟ کەعب وتی: بەڵێ، دەستی خستە ناو موەکانی سەری کەعب و بۆنی سەری کرد، وتی: دووبارە بۆنی بکەمەوە؟ کەعب وتی: بەڵێ، کاتێ کە توند گرتی وتی: ئادەی بیکوژن ئەوانیش لێیان دا هەتا کوشتیان.

**٢٧٦٩ - (صحيح) عن أبي هريرة: عن النبي صلى الله عليه و سلم قال: (الإِيمَانُ قَيَّدَ الْفَتْكَ، لاَ يَفْتِكُ مُؤْمِنٌ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئیمان باوەڕدار قەدەغەدەکات لەوەی کە کەسی بێ ئاگا لەشوێنێکی نهێنی دا بەفێڵ و بە غەدر بکوژێت، باوەڕدار ئیمانەکەی دەیبەستێتەوە لەوەی کە کەس لەغەیری جێگەی خۆیدا بکوژێت).

## باسی دەربارەی (الله أكبر) کردنی کاتی سەرکەوتنە سەر هەر بەرزاییە لەکاتی سەفەردا.

## ١٧٠ - باب فِي التَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ فِي الْمَسِيرِ.

**٢٧٧٠ - (صحيح) عن عبد الله بن عمرو: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا قَفَلَ مِنْ غَزْوٍ أَوْ حَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ يُكَبِّرُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ مِنَ الأَرْضِ ثَلاَثَ تَكْبِيرَاتٍ وَيَقُولُ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ، تَائِبُونَ، عَابِدُونَ، سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ).**

واتە: (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی عەمر دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەغەزا یان لەحەج یا لەعومرە دەگەڕایەوە کاتێ سەردەکەوتە سەر هەر بەرزاییەکی سەر زەوی سێ (الله أكبر)ی دەکرد و دەیفەرموو: (هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، گەڕاینەوە لەسەفەر بۆ وڵاتی خۆمان، بە تەوبەکردن و پەرستش کردن و سەجدەبردنەوە، سوپاس و ستایشی پەروەردگارمان دەکەین، خوای گەورە بەڵێنەکەی بەراست بەجێهێناو دینەکەی ئاشکرا کرد، بەندەکەی خۆی سەرخست و، هەموو کۆمەڵ و حیزبەکانی شکاند).

# باسی دەربارەی مۆڵەت وەرگرتن لە گەڕانەوەدا لەدوای قەدەغەکردنی

## ١٧١ – باب فِى الإِذْنِ فِى الْقُفُولِ بَعْدَ النَّهْىِ.

٢٧٧١ - (حسن) عن ابن عباس قال: ( لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ ) الآيَةَ نَسَخَتْهَا الَّتِى فِى النُّورِ (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ) إِلَى قَوْلِهِ (غَفُورٌ رَّحِيمٌ ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئایەتی ( لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ ) سورة التوبة: ٤٤.

واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) مۆڵەتت لێ وەرناگرن ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بەخواو بەڕۆژی دوایی.

ئەم ئایەتەی سورەتی (النور) نەسخی کردۆتەوە: (إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾) سورة النور: ٦٢.

واتە: بەڕاستی ئیمانداران تەنها ئەوانەن کەبڕوایان بەخواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، وە هەر کاتێ لەگەڵ ئەو (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) دابن لەکارێکی گرنگدا کەکۆیان دەکاتەوە (وەك غەزاو نوێژی جومعەو جەژن) ناڕۆن بە هیچ لایەکدا هەتا مۆڵەت

لەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) وەرنەگرن، بێگومـان ئەوانـەی مۆڵـەتت لـێ وەردەرگـرن ئەوانە کەسانێکن کەبڕوایان هەیە بەخواو پێغەمبەرەکەی، جـا هـەر کـاتێ ئەوانـە داوای مۆڵەتیان لێ کردیت بۆ هەندێ ئیش و کاری تایبەتی خۆیـان ئـەوە هـەر کامیـان خـۆت ویستت مۆڵەتی بدە، وە داوای لێبووردنیان بۆ بکـە لـەخوا، بەڕاسـتی خـوا لێبـووردەی میهرەبانە.

## باسی سەبارەت بە مژدەدانی نێردراوەکان بە سەرکەوتن لەکارە گرنگەکەیاندا.

## ١٧٢ - باب فِي بَعْثَةِ الْبُشَرَاءِ.

**٢٧٧٢ - (صحيح) عن جرير قال: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَلاَ تُرِيحُنِي مِنْ ذِي الْخَلَصَةِ). فَأَتَاهَا فَحَرَّقَهَا، ثُمَّ بَعَثَ رَجُلاً مِنْ أَحْمَسَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يُبَشِّرُهُ يُكْنَى أَبَا أَرْطَاةَ.**

واتە: لە جـابر - ی کـوڕی (عَبْدُ اللَّه)ی بەجەلیـەوە - دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (ئـەی جـەریر لەدەسـت بوتخانـەی (ذي الخصلة) رزگارم بکەو بمحەوێنەوە)، جەریریش رۆشت سوتاندی، لەپاشـدا پیـاوێ لـەهۆزی ئەحمەس کە بە (أَبَا أَرْطَاة) ناسراو بوو ناردی بۆلای پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) مـژدەی بداتێ بەوەی کە سوتاندویەتی و روخاندویەتی.

## باسی سەبارەت بە سەجدەی سوپاس.

## ١٧٤ – باب فِي سُجُودِ الشُّكْرِ.

٢٧٧٤ - (صحيح) عن أبي بكرة: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ إِذَا جَاءَهُ أَمْرُ سُرُورٍ أَوْ بُشِّرَ بِهِ خَرَّ سَاجِدًا شَاكِرًا لِلَّهِ.

واتە: ئەبی بەکرە دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵێکی دڵخۆشکەر یان موژدەی خۆش و سەرکەوتنی بۆ بهتایە بۆ سوپاسکردنی خوای گەورە سەجدەی شوکری دەبرد.

٢٧٧٥ - (ضعيف) عن عامر بن سعد، عن أبيه قال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ مَكَّةَ نُرِيدُ الْمَدِينَةَ، فَلَمَّا كُنَّا قَرِيبًا مِنْ عَزْوَرَا نَزَلَ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً، ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا فَمَكَثَ طَوِيلاً، ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً، ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا فَمَكَثَ طَوِيلاً، ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ سَاعَةً، ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا، ذَكَرَهُ أَحْمَدُ ثَلاَثًا قَالَ: (إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي، وَشَفَعْتُ لأُمَّتِي، فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي، فَخَرَرْتُ سَاجِدًا شُكْرًا لِرَبِّي، ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي، فَسَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي، فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي، فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي شُكْرًا، ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي، فَسَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي، فَأَعْطَانِي الثُّلُثَ الآخَرَ، فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي).

واتە: لە عامیری كوڕی سەعدەوە، لە باوكیەوە — سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص - دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم) لەمەككەوە دەرچوین بۆ مەدینە، كاتێ كە لە عەزوەرا نزیك بوینەوە لەسەر وڵاخەكەی دابەزی، لەپاشدا هەردوو دەستی بەرزكردەوە ماوەیە لەخوای گەورە پاڕایەوە، ئینجا سەجدەی بردو ماوەیەكی زۆر مایەوە، لەپاشدا هەستایەوە هەردوو دەستی بەرزكردەوە ماوەیە لەخوای گەورە پاڕایەوە، ئینجا سەجدەی بردو ماوەیەكی زۆر مایەوە، لەپاشدا هەستایەوە هەردوو دەستی بەرزكردەوە ماوەیە لەخوای گەورە پاڕایەوە، ئینجا سەجدەی بردەوە، ئەحمەد - ی كوڕی صالح راوی فەرموودەكە - وتی سێ جار، جا فەرمووی: (لە پەروەردگارم پاڕامەوە تكام بۆ ئومەتەكەم كرد، سێ یەكی ئومەتەكەمی پێ بەخشیم، منیش بۆ سوپاسكردنی خوای گەورە سەجدەیەكم برد، لەپاشدا سەرم بەرزكردەوە، جارێكی تریش لە پەروەردگارم پاڕامەوە بۆ ئومەتەكەم، سێ یەكی تری ئومەتەكەمی پێ بەخشیم، منیش بۆ سوپاسكردنی خوای گەورە سەجدەیەكی ترم بۆ بردەوە، دیسان سەرم بەرزكردەوە، جارێكی تریش لە پەروەردگارم پاڕامەوە بۆ ئومەتەكەم، سێ یەكی تری ئومەتەكەمی پێ بەخشیم، منیش بۆ سوپاسكردنی خوای گەورە سەجدەیەكی ترم بۆ بردەوە).

# باسی سەبارەت بە گەڕانەوە بۆناو ماڵ و خێزان لەشەوداو دان لەدەرگا لەناوکادا بەبێ ئاگادار کردنەوەیان

## ١٧٥ - باب فِي الطُّرُوقِ.

**٢٧٧٦ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَكْرَهُ أَنْ يَأْتِيَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ طُرُوقًا.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی ناخۆش بوو کاتێ کە پیاو لەسەفەر گەڕایەوە بەشەو لەدەرگا بدات و لەناکاودا بەبێ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە خۆی بکات بەناو ماڵ و خێزاندا.

**٢٧٧٧ - (صحيح) عن جابر، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ أَحْسَنَ مَا دَخَلَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ أَوَّلَ اللَّيْلِ).**

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (چاکترین کاتێ کە پیاو لەسەفەر گەڕایەوە بڕواتەوە بۆ ناو ماڵ و خێزانی سەرتای شەوە چونکە ئەو کاتە نەخەوتون).

**٢٧٧٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَلَمَّا ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ قَالَ: (أَمْهِلُوا حَتَّى نَدْخُلَ لَيْلاً لِكَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ الزُّهْرِيُّ: الطُّرُوقُ بَعْدَ الْعِشَاءِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ لاَ بَأْسَ بِهِ.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) چوین بۆ غەزایە، کاتێ کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە ویستمان بچینەوە بۆ ماڵەوە بۆ ناو ماڵ و خێزانمان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (کاتێ کە لەسەفەر گەڕانەوە بەشەو ئاگاداریان بکەنەوە سەرەتای شەو بچنەوە بۆ ماڵەوە با هاوسەرەکانتان قژیان شانە بکەن و مووی زیادەی لەشیان لابەرن). ئەبو داود دەڵێت: زوهری وتی: گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەدوای عیشا. ئەبو داود دەڵێت: گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەدوای شێوان هیچی تێدا نیە.

## باسی سەبارەت بە پێشوازیکردن لەوانەی کە لەسەفەر دەگەڕێنەوە.

## ١٧٦ - باب فِي التَّلَقِّي.

٢٧٧٩ - (صحيح) عن السائب بن يزيد قال: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَدِينَةَ مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ تَلَقَّاهُ النَّاسُ، فَلَقِيتُهُ مَعَ الصِّبْيَانِ عَلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ.

واتە: لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە غەزا تەبوک گەڕایەوە و گەیشتەوە مەدینە، خەڵکی مەدینە چوونە پێشوازی، منیش لەگەڵ منداڵان لە دەربەندی وەداع(ثَنِيَّةِ الْوَدَاع) پێشوازیمان لێ کرد.

## باسی سەبارەت بە ڕەوایە کەسێ کاتێ کە لەسەفەر گەڕایەوە توێشوی پێ نەمێنێ.

## ١٧٧ - باب فِيمَا يُسْتَحَبُّ مِنْ إِنْفَاذِ الزَّادِ فِي الْغَزْوِ إِذَا قَفَلَ.

٢٧٨٠ - (صحيح) عن أنس بن مالك، أن فتى من أسلم قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ الْجِهَادَ، وَلَيْسَ لِي مَالٌ أَتَجَهَّزُ بِهِ. قَالَ:

**(اذْهَبْ إِلَى فُلاَنٍ الأَنْصَارِيِّ فَإِنَّهُ كَانَ قَدْ تَجَهَّزَ فَمَرِضَ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ، وَقُلْ لَهُ ادْفَعْ إِلَيَّ مَا تَجَهَّزْتَ بِهِ). فَأَتَاهُ فَقَالَ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ يَا فُلاَنَةُ ادْفَعِي لَهُ مَا جَهَّزْتِنِي بِهِ وَلاَ تَحْبِسِي مِنْهُ شَيْئًا، فَوَاللَّهِ لاَ تَحْبِسِينَ مِنْهُ شَيْئًا فَيُبَارِكَ اللَّهُ فِيهِ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە لاوێکی هۆزی ئەسلەم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەمەوێ جیهاد بکەم بەڵام ماڵ و سامانم نیە هەتا خۆمی بۆ ئامادە بکەم، فەرمووی: (بڕۆ بۆلای فلان کەس ئەو خۆی ئامادەکردوە بەڵام نەخۆش کەوتوە پێی بڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەلامت لێ دەکات، هەروەها پێی بڵێ: ئەوەی کە ئامادەت کردوە بۆ جیهاد بیدە بەمن)، ئەویش چو بۆلای پێی وت، کابرا بەژنەکەی وت: ئەی فلان ئەوەی ئامادەم کردوە بۆ جیهاد هەمووی بدەرێ، هیچی لێ گل مەدەرەوە، سوێند بە (الله) خوا بەرەکەتی تێ ناخات.

# باسی سەبارەت بە نوێژکردن لەکاتی گەڕانەوە لەسەفەر

## ١٧٨ – باب فِي الصَّلاَةِ عِنْدَ الْقُدُومِ مِنَ السَّفَرِ.

**٢٧٨١ - (صحيح) كعب بن مالك، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ لاَ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلاَّ نَهَارًا. قَالَ الْحَسَنُ: فِي الضُّحَى، فَإِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ أَتَى الْمَسْجِدَ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ.**

واتە: کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ڕۆژدا نەبوایە لەسەفەر نەدەگەڕایەوە. کاتی کە دەگەڕایەوە سەرەتا دەچوە مزگەوتەوە دوو رکات نوێژی دەکرد، لەپاشدا دادەنیشت بۆ پێشوازیکردن لە خەڵك.

**٢٧٨٢ - (حسن صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ أَقْبَلَ مِنْ حَجَّتِهِ دَخَلَ الْمَدِينَةَ، فَأَنَاخَ عَلَى بَابِ مَسْجِدِهِ، ثُمَّ دَخَلَهُ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى بَيْتِهِ. قَالَ نَافِعٌ فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ كَذَلِكَ يَصْنَعُ.**

واتە: ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە حەجەکەی گەڕایەوە خۆی کرد بە شاری مەدینەدا، لەپاشدا لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا وڵاخەکەی یخ دا، ئینجا چوە ناو مزگەوتەوە دوو رکات نوێژی کرد پێش ئەوەی دانیشێت، لەپاشدا چووە بۆ ماڵەکەی خۆی. نافیع دەڵێت: ئیبنو عومەریش بە هەمان شێوەی دەکرد.

## باسی سەبارەت بە کرێی دابەشکەر.

## ١٧٩ - باب فِي كِرَاءِ الْمَقَاسِمِ.

**٢٧٨٣ - (ضعيف) عن سعيد الخدري: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِيَّاكُمْ وَالْقُسَامَةَ؟). قَالَ: فَقُلْنَا وَمَا الْقُسَامَةُ؟ قَالَ: (الشَّيْءُ يَكُونُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَجِيءُ فَيَنْتَقِصُ مِنْهُ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئاگاداربن خۆتان بپارێن لە (الْقُسَامَةَ). وتمان: (الْقُسَامَةَ) چی یە؟ فەرمووی: (شتێ کە خەڵك تێیدا هاوبەش بن ئەو کەسەی کە دابەشی دەکات بەسەریاندا بەشی خۆی هەڵگرێت).— بێگومان ئەگەر خاوەن بەشەکان رازی نەبن ئەوە حەرامە بەکۆی یەکدەنگی زانایان -

**٢٧٨٤ - (ضعيف) عن عطاء بن يسار: عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحْوَهُ، قَالَ: (الرَّجُلُ يَكُونُ عَلَى الْفِئَامِ مِنَ النَّاسِ فَيَأْخُذُ مِنْ حَظِّ هَذَا وَحَظِّ هَذَا).**

واتە: لە (عطاء)ی کوڕی یەسارەوە فەرموودەی پێشو بەهەمان شێوە هاتوە. (عطاء) وتی: پیاوێ ببێتە پیاو ماقوڵ و ریش سپی کۆمەڵانێ لەخەڵك ئەوەی دابەشی دەکات بەسەریاندا لەبەشی ئەوە شتێ بۆخۆی دابنێ، وە لەبەشی ئەوەش شتێ بۆخۆی دابنێ.

## باسی سەبارەت بە بازرگانی لە غەزادا.

## ١٨٠ - باب فِي التِّجَارَةِ فِي الْغَزْوِ.

٢٧٨٥ - (ضعيف) عبيد الله بن سلمان أن رجلا من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم حدثه قال: لَمَّا فَتَحْنَا خَيْبَرَ أَخْرَجُوا غَنَائِمَهُمْ مِنَ الْمَتَاعِ وَالسَّبْيِ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ غَنَائِمَهُمْ، فَجَاءَ رَجُلٌ حِينَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقَدْ رَبِحْتُ رِبْحًا مَا رَبِحَ الْيَوْمَ مِثْلَهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ هَذَا الْوَادِي! قَالَ: (وَيْحَكَ وَمَا رَبِحْتَ). قَالَ مَا زِلْتُ أَبِيعُ وَأَبْتَاعُ حَتَّى رَبِحْتُ ثَلاَثَمِائَةِ أُوقِيَّةٍ، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(أَنَا أُنَبِّئُكَ بِخَيْرِ رَجُلٍ رَبِحَ). قَالَ: مَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: (رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الصَّلاَةِ).

واتە: لە (عُبيد اللّـه)ی کوڕی سەلمانەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆی گێڕایەوە وتی: کاتێ کە قەڵای خەیبەرمان رزگار کرد، هەرکەس لەبەشی خۆی لە غەنیمەتەکە وەرگرت، خەڵکەکە بەشە غەنیمەتەکەی خۆیان دەفرۆشت بە یەکتر، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژی دەکرد، پیاوێ هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قازانجێکی وەهام کردوە هیچ کەسێ لەخەڵکی ئەم شیوە ئەمڕۆ ئەوەندە قازانجی نەکردوە! فەرمووی: (هەواڵت بدەمێ کە

چاکترین (قازانجی پیاو کامەیە؟)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کامەیە؟ فەرمووی: (دوو رکاتی سوننەتی دوای نوێژە فەرزەکانە).

## باسی سەبارەت بە هەڵگرتنی چەك بۆناو خاکی دوژمن ئەگەر بۆ جیهاد بێ هیچی تێدا نیە.

## ١٨١ - باب فِي حَمْلِ السِّلاَحِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ.

٢٧٨٦ - (ضعيف) عن ذي الجوشن رجل من الضباب قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ أَنْ فَرَغَ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ بِابْنِ فَرَسٍ لِي، يُقَالُ لَهَا: الْقَرْحَاءُ، فَقُلْتُ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي قَدْ جِئْتُكَ بِابْنِ الْقَرْحَاءِ لِتَتَّخِذَهُ، قَالَ: (لاَ حَاجَةَ لِي فِيهِ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ أُقِيضَكَ بِهِ الْمُخْتَارَةَ مِنْ دُرُوعِ بَدْرٍ فَعَلْتُ). قُلْتُ مَا كُنْتُ أُقِيضُهُ الْيَوْمَ بِغُرَّةٍ، قَالَ: (فَلاَ حَاجَةَ لِي فِيهِ).

واتە: لە (ذي الجوشن)ەوە — کە پیاوێ بوو لەهۆزی (الضباب) - دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێش ئەوەی کە موسوڵمان ببم چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوای ئەوەی کە لە ئیش و کاری خەڵکی بەدر بوەوە، جوانویەکم هەبوو پێی دەوترا: (قرحاء)، وتم: ئەی موحەممەد ئەم جوانوەم بۆیە هێناوە هەتا بیبەخشم بەتۆ بەکاری بهێنیت، فەرمووی: (هیچ پێویستیم پێی نیە، ئەگەر دەتەوێت بۆت دەگۆڕمەوە بە زرێیە لە زرێکانی بەدر)، وتم: من ئەمڕۆ شتی گرانبەهای خۆم ناگۆڕمەوە بە ئەسپ و بە

کەنیزەك و بە بەندە چ جای بە زرێیەکی بەدر؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (دەی منیش هیچ پێویستیم پێی نیە).

## باسی سەبارەت بە مانەوە لە خاکی هاوبەش بۆ خوا دانەراندا.

## ١٨٢ – باب فِي الإِقَامَةِ بِأَرْضِ الشِّرْكِ.

**٢٧٨٧ - (صحيح) عن سمرة بن جندب: أما بعد، قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(مَنْ جَامَعَ الْمُشْرِكَ وَسَكَنَ مَعَهُ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ).**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، لەدواییدا، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو کەسەی تێکەڵاوی هاوبەش بۆ خوا دانەر بکات و لەگەڵی بژی ئەوە وەك ئەو وایە).

کۆتایی کتێبی جیهادو تێکۆشان

بسم الله الرحمن الرحيم

# سەرەتای کتێبی قوربانیەکان.

# ١٠ – أَوَّلُ كِتَابِ الضَّحَايَا

## باسی ئەوەی سەبارەت بە واجبی قوربانی هاتوە.

## ١ – باب مَا جَاءَ فِي إِيجَابِ الأَضَاحِي.

٢٧٨٨ - (حسن) مخنف بن سليم رضي الله عنه قال: وَنَحْنُ وُقُوفٌ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَرَفَاتٍ قَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ عَلَى كُلِّ أَهْلِ بَيْتٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُضْحِيَةً وَعَتِيرَةً، أَتَدْرُونَ مَا الْعَتِيرَةُ؟ هَذِهِ الَّتِي يَقُولُ النَّاسُ: الرَّجَبِيَّةُ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْعَتِيرَةُ مَنْسُوخَةٌ، هَذَا خَبَرٌ مَنْسُوخٌ.

واتە: لە میخنەفی کوڕی سولەیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئێمە لەخزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە عەرەفات وەستابووین فەرمووی: (ئەی خەڵکینە، واجبە لەسەر هەموو خێزانێ قوربانیەك و رەجەبانە(عتيره)یە بکەن، ئایا دەزانن (عتيرة) چی یە؟ ئەوەیە کە خەڵك پێی دەڵێن: (الرَّجَبِيَّة)) - (عتيرة) مەڕێ یان

ئاژەڵێکە لە دەی یەکەمی مانگی رەجەبدا خەڵك سەریان دەبڕی پێیان دەوت: رەجەبییە - . ئەبو داود دەڵێت: (عتيرة) نەسخ بۆتەوە، ئەم هەواڵەش مەنسوخە.

**٢٧٨٩ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو بن العاص: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (أُمِرْتُ بِيَوْمِ الأَضْحَى: عِيدًا جَعَلَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِهَذِهِ الأُمَّةِ). قَالَ الرَّجُلُ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَجِدْ إِلاَّ مَنِيحَةً أُنْثَى أَفَأُضَحِّي بِهَا؟ قَالَ: (لاَ، وَلَكِنْ تَأْخُذُ مِنْ شَعْرِكَ وَأَظْفَارِكَ، وَتَقُصُّ شَارِبَكَ، وَتَحْلِقُ عَانَتَكَ؟ فَتِلْكَ تَمَامُ أُضْحِيَتِكَ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (فەرمانم پێ کراوە کە ڕۆژی قوربانی بکەم بە جەژن، خوای گەورە خۆی دایناوە بۆ ئەم ئوممەتە). پیاوێ وتی: پێم بڵێ ئەگەر کەسێ جگە لە مەڕێ یان بزنێکی شیردەر زیاتری نەبێ ئەویشی دابێ بە کەسێ سود لەشیرەکەی وەربگرێت ئایا بیگێڕێتەوە بیکات بە قوربانی یان نا؟ فەرمووی: (نا، بەڵام سەرت کورت بکەرەوەو نینۆکت بکەو، سمێڵت کورت بکەرەوە و، بەرت بتاشە، ئەوە قوربانیەکەت تەواوە لەلای خوای گەورە — واتە بەو نیەتەت پاداشتی قوربانیەکی تەواوت بۆ هەیە - ).

## باسی دەربارەی قوربانی کردن بۆ مردو.

## ٢ - باب الأُضْحِيَةِ عَنِ الْمَيِّتِ.

**٢٧٩٠ - (ضعيف) عن حنش قال: رَأَيْتُ عَلِيًّا يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْصَانِي أَنْ أُضَحِّيَ عَنْهُ، فَأَنَا أُضَحِّي عَنْهُ.**

واتە: لە حەنەشەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِی طَالِب)م رەزای خوای لیّ بیّ بینی دوو بەرانی کردە قوربانی، وتم: ئەوە چی یە؟ وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پیّ کردوم کە لەدوای خۆی هەموو ساڵیّ قوربانی بۆ بکەم، منیش یەکێکیانم بۆ ئەو کردە قوربانی.

## باسی دەربارەی كەسێ كە بیەوێ قوربانی بكات لەسەرەتای مانگی (ذي الحجة)وە ئایا موو لەسەری بكاتەوە یان نا؟

## ٣ - باب الرَّجُلُ يَأْخُذُ مِنْ شَعْرِهِ فِي الْعَشْرِ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يُضَحِّيَ.

**٢٧٩١ - (حسن صحيح) عن أم سلمة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ كَانَ لَهُ ذِبْحٌ يَذْبَحُهُ فَإِذَا أَهَلَّ هِلاَلُ ذِي الْحِجَّةِ فَلاَ يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ وَلاَ مِنْ أَظْفَارِهِ شَيْئًا حَتَّى يُضَحِّيَ).**

واتە: لە ئوممو سەلەمەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر كەسێ ئاژەڵێكی دانابوو بیەوێ بیكاتە قوربانی لەمانگی نوێی قوربانەوە نە موو لەخۆی بكاتەوە نە نینۆكی بكات هەتا قوربانیەكەی دەكات).

# باسی دەربارەی ئەو ئاژەڵانەی کە دروستە بکرێن بە قوربانی.

## ٤ - باب ما يُسْتَحَبُّ مِنَ الضَّحَايَا.

٢٧٩٢ - (حسن) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَمَرَ بِكَبْشٍ أَقْرَنَ يَطَأُ فِي سَوَادٍ وَيَنْظُرُ فِي سَوَادٍ وَيَبْرُكُ فِي سَوَادٍ، فَأُتِيَ بِهِ فَضَحَّى بِهِ، فَقَالَ: (يَا عَائِشَةُ هَلُمِّي الْمُدْيَةَ). ثُمَّ قَالَ: (اشْحَذِيهَا بِحَجَرٍ). فَفَعَلَتْ، فَأَخَذَهَا، وَأَخَذَ الْكَبْشَ فَأَضْجَعَهُ وَذَبَحَهُ، وَقَالَ: (بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّدٍ وَآلِ مُحَمَّدٍ وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ). ثُمَّ ضَحَّى بِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بەرانێکی شاخداریان بۆ هێنا کە بیکات بە قوربانی، شاخەکانی گەورەو جوان بوون، هەرچوار پەلی و دەم و چاو و ژێر سکی ڕەشباو بوو - واتە هەرچوار پەلی تەواو سپی یان ڕەش نەبوو بەڵکو ڕەش و سپی بوو - ، فەرمووی: (ئەی عائیشە چەقۆکە بهێنە) لەپاشدا فەرموی: (بە بەردێ تیژی بکە)، منیش فەرمانەکەیم بەجێهێناو کێردەکەم بۆ تیژ کرد، بەرانەکەی پاڵ خست و کاتێ کە ویستی سەری ببڕێت فەرمووی: (بە ناوی خودا، خودایە ئەی پەروەردگارم ئەم قوربانیە قبوڵ بفەرموو لە موحەممەد و کەسوکاری موحەممەدو گەلی موحەممەد). لەپاشدا بەرانەکەی کردە قوربانی.

٢٧٩٣ - (صحيح) عن أنس، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَحَرَ سَبْعَ بَدَنَاتٍ بِيَدِهِ قِيَامًا، وَضَحَّى بِالْمَدِينَةِ بِكَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەدەستی خۆی حەوت وشتری گەورەو قەڵەوی سپی تێکەڵاو بە کەمێ ڕەش بەپێوە سەربڕی، لە مەدینەش دوو بەرانی شاخداری سپی تێکەڵاو بە کەمێ ڕەش کردە قوربانی.

٢٧٩٤ - (صحيح) عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَحَّى بِكَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ يَذْبَحُ وَيُكَبِّرُ وَيُسَمِّي وَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى صَفْحَتِهِمَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوو بەرانی شاخداری سپی تێکەڵاو بە کەمێ ڕەشی سەربڕی لەکاتی سەربڕینیاندا دەیفەرموو: (بسم الله، الله أكبر)، پێی ڕاستی دانا لەسەر لاملیان.

٢٧٩٥ - (ضعيف) عن جابر بن عبد الله قال: ذَبَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الذَّبْحِ كَبْشَيْنِ أَقْرَنَيْنِ أَمْلَحَيْنِ مُوجَأَيْنِ فَلَمَّا وَجَّهَهُمَا قَالَ: (إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ، عَلَى مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ

**شَرِيكَ لَهُ، وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ، وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ، اللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَكَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأُمَّتِهِ بِاسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ). ثُمَّ ذَبَحَ.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّهِ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەڕۆژی جەژنی قورباندا دوو بەرانی شاخدار کە خەسێنراوبوون سەری بڕین لەکاتی سەربڕینەکەیاندا دەیفەرموو: (ڕوودەکەمە ئەو خودایە کە ئەم ئاسمانانەو زەمینەی دروستکردووە، من موسڵمانێکی پاك و بێ خەوشم و بە هیچ شێوەیە لە هاوبەش پەیداکەران نیم، بێگومان نوێژ و قوربانی و مەناسیکەکانی حەج و خواپەرستیم و ژیان و مردنم هەمووی هەر بۆ خوایە، کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، کە هیچ هاوبەش و هاوڕێیەکی بۆ نیە، وە بەمە فەرمانم پێکراوە، من یەکێکم لە موسڵمانان، خودایە لەتۆوەیەو بۆ تۆیە، ئەم قوربانیە قبوڵ بفەرموو لە موحەممەد و گەلی موحەممەد، (بسم الله، الله أكبر) ئینجا سەری بڕی.

**٢٧٩٦ - (ضعيف) عن أبو سعيد قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُضَحِّي بِكَبْشٍ أَقْرَنَ فَحِيلٍ يَنْظُرُ فِي سَوَادٍ وَيَأْكُلُ فِي سَوَادٍ وَيَمْشِي فِي سَوَادٍ.**

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرانێکی شاخداری نەخەسێنراوی کردە قوربانی، هەرچوار پەلی و دەم و چاو و ژێر سکی ڕەشباو بوو - واتە هەرچوار پەلی تەواو سپی یان ڕەش نەبوو بەڵکو ڕەش و سپی بوو - .

## باسی سەبارەت بە تەمەنی قوربانی.

## ٥ - باب مَا يَجُوزُ مِنَ السِّنِّ فِي الضَّحَايَا.

٢٧٩٧ - (ضعيف) عن جابر قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ).

واتە: لە جابرەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئاژەڵێ سەرە نەبێ سەری مەبڕن، ئەگەر دەستان نەكەوت ئەوا كاوڕێ یان گیسكێ سەربڕن).

٢٨٩٨ - (حسن صحيح) عن زيد بن خالد الجهني قال: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَصْحَابِهِ ضَحَايَا، فَأَعْطَانِي عَتُودًا جَذَعًا، قَالَ: فَرَجَعْتُ بِهِ إِلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّهُ جَذَعٌ. قَالَ: (ضَحِّ بِهِ). فَضَحَّيْتُ بِهِ.

واتە: لە زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنییەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاژەڵی قوربانی دابەشكرد بەسەر هاوەڵانیدا، كیسكێكی دا بە من، وتی: منیش بۆم گێڕایەوەو پێم وت: ئەمە گیسكە، فەرمووی: (بیكە بە قوربانی بۆ خۆت)، منیش كردم بە قوربانی.

٢٧٩٩ - (صحيح) عن عاصم بن كليب، عن أبيه قال: كُنَّا مَعَ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُقَالُ لَهُ مُجَاشِعٌ، مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، فَعَزَّتِ الْغَنَمُ، فَأَمَرَ مُنَادِيًا فَنَادَى: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُولُ: (إِنَّ الْجَذَعَ يُوَفِّي مِمَّا يُوَفِّي مِنْهُ الثَّنِيُّ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهُوَ مُجَاشِعُ بْنُ مَسْعُودٍ.

واتە: لە عاصیمی کوڕی کولەیبەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ یەکێ لە هاوەڵانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووین پێیان دەوت: موجاشیع لە هۆزی (بنی سليم) بوو، ئەوە مەڕی سەرە ئەوانەی کە تەمەنیان سێ ساڵە کەمبونەوە، فەرمانی دا جارچیە جاڕبدات بەناو خەڵکدا بڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خێر و پاداشتی یەك ساڵانێ وەك خێر و پاداشتی مەڕێکی سەرە وایە). ئەبو داود دەڵێت: موجاشیعی کوڕی مەسعود.

٢٨٠٠ - (صحيح) عن البرّاء قال: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ النَّحْرِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَالَ: (مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَتِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ). فَقَامَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَاللَّهِ لَقَدْ نَسَكْتُ قَبْلَ أَنْ أَخْرُجَ إِلَى الصَّلاَةِ وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، فَتَعَجَّلْتُ فَأَكَلْتُ وَأَطْعَمْتُ أَهْلِي وَجِيرَانِي، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(تِلْكَ شَاةُ لَحْمٍ). فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي عَنَاقًا جَذَعَةً وَهِيَ خَيْرٌ مِنْ شَاتَيْ

لَحْمٍ فَهَلْ تُجْزِئُ عَنِّي؟ قَالَ: (نَعَمْ وَلَنْ تُجْزِئَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ).

واتە: لە بەرائەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ڕۆژی قوربانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتاری بۆداین لەدوای نوێژ فەرمووی: (ئەوەی وەك ئێمە نوێژ دەکات و بە پێی سوننەتی ئێمە قوربانی دەکات، ئەوە پێکاویەتی قوربانیەکەی شەرعی و دروستە، ئەوەی لەپێش نوێژی جەژن قوربانی بکات ئەوە قوربانی نیە چونکە قوربانی لەدوای نوێژی جەژنەوەیە، ئەوە مەڕەکەی مەڕی گۆشتە تەنها سود لەگۆشتەکەی وەردەگیرێت هەروەك سەربڕاوەکانی ڕۆژانی تر)، ئەبو بوردەی کوڕی نیار هەستایەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، سوێند بە (اللّه) پێش ئەوەی بێم بۆ نوێژی جەژن قوربانیەکەم سەربڕی زانیم کە ئەمڕۆ ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە، پەلەم کرد لێم خواردو دەرخواردی کەسوکار و دراوسێکانیشم دا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوە مەڕی گۆشتە قوربانی نیە)، وتی: گیسکێکم هەیە یەك ساڵی تەواو نەکردوە بەڵام چاکترە لەو شەکەی کە سەرم بڕیوە ئەوە بەسە بیکەم بە قوربانی؟ فەرمووی: (بەڵێ، بیکە بە قوربانی بەڵام لەپاش تۆ بۆ کەسی تر دروست نیە).

٢٨٠١ - (صحيح) عن البرّاء بن عازب قال: ضَحَّى خَالٌ لِي يُقَالُ لَهُ: أَبُو بُرْدَةَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عِنْدِي دَاجِنًا جَذَعَةً مِنَ الْمَعْزِ، فَقَالَ: (اذْبَحْهَا وَلاَ تَصْلُحُ لِغَيْرِكَ).

واتە: لە بەرائی کوڕی عازبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خاڵێکم کە بە ئەبو بوردە ناسراو بوو لەپێش نوێژی جەژن قوربانی کردبو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووی: (مەڕەکەت مەڕی گۆشتە ئەوە قوربانی نیە چونکە قوربانی لەدوای نوێژی

جەژنەوەیە)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گیسکێکی ماڵیم هەیە — واتە لەماڵەوە بەخێو دەکرا - یەك ساڵی تەواو نەکردوە بەڵام چاکترە لەو شەکەی کە سەرم بڕیوە ئەوە بەسە بیکەم بە قوربانی؟ فەرمووی: (بەڵێ، سەری ببڕە بەڵام لەپاش تۆ بۆ کەسی تر دروست نیە).

## باسی دەربارەی ئەو ئاژەڵانەی کە دروست نیە بکرێن بە قوربانی.

## ٦ – باب مَا يُكْرَهُ مِنَ الضَّحَايَا.

٢٨٠٢ - (صحيح) عن عبيد بن فيروز قال: سَأَلْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ مَا لاَ يَجُوزُ فِي الأَضَاحِي فَقَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَصَابِعِي أَقْصَرُ مِنْ أَصَابِعِهِ وَأَنَامِلِي أَقْصَرُ مِنْ أَنَامِلِهِ فَقَالَ: (أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الأَضَاحِي: الْعَوْرَاءُ بَيِّنٌ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ بَيِّنٌ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ بَيِّنٌ ظَلْعُهَا، وَالْكَسِيرُ الَّتِي لاَ تَنْقَى). قَالَ: قُلْتُ: فَإِنِّي أَكْرَهُ أَنْ يَكُونَ فِي السِّنِّ نَقْصٌ. قَالَ: (مَا كَرِهْتَ فَدَعْهُ، وَلاَ تُحَرِّمْهُ عَلَى أَحَدٍ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: لَيْسَ لَهَا مُخٌّ.

واتە: لە عوبەیدی کوڕی فەیروزەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی چ ئاژەڵێ بکرێتە قوربانی دروست نیە لە بەرائی کوڕی عازبم پرسی؟ وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەستایەوە وتاری بۆداین بە پەنجەو سەری پەنجەکانی ئاماژەی کرد هەرچەندە

پەنجەو سەری پەنجەکانی من کورتترن - ئەمەش ئەدەب بووە بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) - ، فەرمووی: (چوار سیفەت هەن دروست نیە لە ئاژەڵی قوربانیدا هەبن: ئاژەڵێکی کوێر کە کوێریەکەی ئاشکرا بێت، ئاژەڵێکی نەخۆش کە نەخۆشیەکەی ئاشکرا بێت، ئاژەڵێکی شەل کە شەلیەکەی ئاشکرا بێت و نەگات بە ئاژەڵەکانی تردا کاتێک دەبرێن بۆ لەوەڕ، شکاوی یان ئەوەندە لەڕو لاواز بێت ئێسکەکەی مۆخی تێدا نەمابێت)، وتی: وتم: پێم ناخۆشە لە تەمەنەکەیدا کەموکوڕی هەبێت، وتی: پێت ناخۆش نەبێت ڕێگری لەکەس مەکە، ئەگەر کەموکوڕیەکە نەگەیشتە رادەی ڕێگری با قوربانی خۆیان بکەن. ئەبو داود دەڵێت: مۆخی تێدا نەمابێت.

**٢٨٠٣ - (ضعيف) عن يزيد ذو مصر قال: أَتَيْتُ عُتْبَةَ بْنَ عَبْدٍ السُّلَمِيَّ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا الْوَلِيدِ، إِنِّى خَرَجْتُ أَلْتَمِسُ الضَّحَايَا فَلَمْ أَجِدْ شَيْئًا يُعْجِبُنِى غَيْرَ ثَرْمَاءَ، فَكَرِهْتُهَا، فَمَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَفَلاَ جِئْتَنِى بِهَا. قُلْتُ سُبْحَانَ اللَّهِ تَجُوزُ عَنْكَ وَلاَ تَجُوزُ عَنِّى؟ قَالَ: نَعَمْ إِنَّكَ تَشُكُّ وَلاَ أَشُكُّ، إِنَّمَا نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمُصْفَرَّةِ وَالْمُسْتَأْصَلَةِ وَالْبَخْقَاءِ وَالْمُشَيَّعَةِ، وَالْكَسْرَاءِ، فَالْمُصْفَرَّةُ الَّتِى تُسْتَأْصَلُ أُذُنُهَا حَتَّى يَبْدُوَ سِمَاخُهَا، وَالْمُسْتَأْصَلَةُ الَّتِى اسْتُؤْصِلَ قَرْنُهَا مِنْ أَصْلِهِ، وَالْبَخْقَاءُ: الَّتِى تَبْخَقُ عَيْنُهَا، وَالْمُشَيَّعَةُ: الَّتِى لاَ تَتْبَعُ الْغَنَمَ، عَجْفًا وَضَعْفًا، وَالْكَسْرَاءُ: الْكَسِيرَةُ.**

واتە: لە یەزیدی (ذو مصر)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چووم بۆلای عوتبەی کوڕی عەبدی سولەمی پێم وت: ئەی ئەبا وەلید، چووم ئاژەڵێ بێنم بیکەم بە قوربانی هیچم

دەسنەكەوت كە دڵم بیگرێ تەنها ئاژەڵێكی قەڵەو نەبێ ئەویش ددانەكانی كەوتبون، ئـەو عەیبەی هەبوو بۆیە پێم ناخۆش بوو بیكەم بە قوربانی تۆ دەڵێی چی؟ وتی: بۆچـی بـۆت نەهێنام هەتا من بیكەم بە قوربانی بۆ خۆم، وتم: (سبحان الله) بۆ تۆ دروستە بەڵام بۆمن دروست نیە؟ وتی: بەڵێ، تۆ گومانت هەیە بەڵام من گومانم لێی نیە، پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) رێگری كردوە لەم پێنجە كە بكرێنە قوربـانی: گـوێی لـەبنا بـڕا بێـت بەتەواوەتی، كۆڵ بێت شاخی نەبێت، چاوی دەرهاتبێت، نـەتوانێت بـڕوات لەگـەڵ رانـدا ئەوەندە لەڕ و لاواز بێت نەگات بـە ئاژەڵـەكانی تـردا، شـكاویە كـە نـەتوانێت بـڕوات، (فَالْمُصْفَرَّةُ): ئەو ئاژەڵەیە گوێی لەبنا بڕا بێت بەتەواوەتی، (وَالْمُسْتَأْصَلَةُ): ئەو ئاژەڵەیـە كۆڵ بێت شاخی نـەبێت، (وَالْبَخْقَـاءُ): ئـەو ئاژەڵەیـە چـاوی دەرهاتبێـت، (وَالْمُشَـيَّعَةُ): نەتوانێت بڕوات لەگەڵ رانـدا، (عَجْفًـا): لـەڕ و لاواز بێـت، (وَالْكَسْـرَاءُ): شـكاویە كـە نەتوانێت بڕوات.

**٢٨٠٤ - (ضعيف إلا جملة الأمر بالاستشراف) عن علي رضي الله عنـه قال: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ أَنْ نَسْتَشْـرِفَ الْعَيْنَ وَالأُذُن، وَلاَ نُضَحِّيَ بِعَوْرَاءَ، وَلاَ مُقَابَلَةٍ، وَلاَ مُـدَابَرَةٍ، وَلاَ خَرْقَاءَ، وَلاَ شَرْقَاءَ. قَالَ زُهَيْرٌ: فَقُلْتُ لأَبِي إِسْحَاقَ: أَذَكَرَ عَضْبَاءَ؟ قَالَ: لاَ. قُلْتُ: فَمَا الْمُقَابَلَـةُ؟ قَـالَ: يُقْطَعُ طَـرَفُ الأُذُنِ. قُلْتُ: فَمَا الْمُدَابَرَةُ؟ قَـالَ: يُقْطَـعُ مِـنْ مُـؤَخَّرِ الأُذُنِ، قُلْتُ: فَمَا الشَّرْقَاءُ؟ قَالَ: تُشَقُّ الأُذُنُ، قُلْتُ: فَمَـا الْخَرْقَـاءُ؟ قَالَ: تُخْرَقُ أُذُنُهَا لِلسِّمَةِ.**

واتە: پێشەوا عەلی كوڕی (أَبِي طَالِب) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ كردوین: كە بەباشی سەرنجی چاو و گوێی ئەو ئاژەڵە بدەین

کە دەمانەوێ بیکەین بە قوربانی و دڵنیا بین لەوەی کە چاو و گوێی سەلامەتە، ئاژەڵێ نەکەین بە قوربانی کە کوێر بێت و کوێریەکەی ئاشکرا بێت، ئاژەڵێ نەکەین بە قوربانی گوێی لەباری پانی لەپێشەوە هەڵدڕابێ و وازی لێ هێنرا بێت بە هەڵواسراوی، هەروەها ئاژەڵێ نەکەین بە قوربانی گوێی لەباری پانی لەدواوە هەڵدڕابێ، وە ئاژەڵێ نەکەین بە قوربانی کە گوێیان سمی بێ و نیشانە کرابێت بۆ ئەوەی بناسرێتەوە، وە ئاژەڵێ نەکەین بە قوربانی گوێی تا بن داتلیشێنرابێ و بوبێت بە دوو بەشەوە، وتی: وتم بە ئیبنو ئیسحاق ئەی باسی ئەو ئاژەڵەی نەکر کە زۆربەی گوێی یان شاخی بڕابێت؟ وتی: نەو، وتم: (مُقَابَلَةٍ) چی یە؟ وتی: بەشێ لەگوێی لەپێشەوە بڕابێت، وتم: (مُدَابَرَةٍ) چی یە؟ وتی: گوێی لەدواوە بڕابێت، وتم: (شَرْقَاءَ) چی یە؟ وتی: گوێی کرابێ بە دوو بەشەوە، وتم: ئەی (خَرْقَاءَ) چی یە؟ وتی: گوێیان سمی بێ بۆ ئەوەی بناسرێتەوە.

**٢٨٠٥ - (ضعيف) عن علي رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُضَحَّى بِعَضْبَاءِ الأُذُنِ وَالْقَرْنِ.**

واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگەی نەدواە ئاژەڵی گوێ قرتاو و شاخ شکاو بکرێن بە قوربانی.

**٢٨٠٦ – (صحيح مقطوع) عن قتادة قال: قُلْتُ لِسَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ: مَا الأَعْضَبُ؟ قَالَ: النِّصْفُ فَمَا فَوْقَهُ.**

واتە: لە قەتادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: وتم بە سەعیدی کوڕی موسەییەب: (الأَعْضَب) کامەیە؟ وتی: ئەو ئاژەڵەیە کە گوێی یان شاخی زیاد لەنیوەی قرتا بێت.

# باسی سەبارەت بە چەند کەس هاوبەش بن لە وشترێ یان مانگایەکدا.

## ٧ – باب فِي الْبَقَرِ وَالْجَزُورِ عَنْ كَمْ تُجْزِئُ.

**٢٨٠٧ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كُنَّا نَتَمَتَّعُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، نَذْبَحُ الْبَقَرَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْجَزُورَ عَنْ سَبْعَةٍ، نَشْتَرِكُ فِيهَا.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: ئێمـە لەسـەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لە حەج بۆ حەوت کـەس مانگایـە یـان وشـترێکمان دەکرد بە قوربانی پێکەوە بە هاوبەشی.

**٢٨٠٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (الْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْجَزُورُ عَنْ سَبْعَةٍ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مانگایە یان گایەك دروستە بکرێت بە قوربانی بۆ حەوت کەس، هـەروەها وشترێکیش دروستە بکرێت بە قوربانی بۆ حەوت کەس.

**٢٨٠٩ – (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: نَحَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْحُدَيْبِيَةِ الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالْبَقَـرَةَ عَـنْ سَبْعَةٍ.**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەساڵی حودەیبییەدا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووین بە حەوت کەس وشترێ یان مانگایەکمان سەردەبڕی بۆ قوربانی.

## باسی سەبارەت بە لەجیاتی کۆمەڵێ مەڕێ دەکرێتە قوربانی.

## ٨ - باب فِي الشَّاةِ يُضَحَّى بِهَا عَنْ جَمَاعَةٍ.

**٢٨١٠ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الأَضْحَى بِالْمُصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى خُطْبَتَهُ نَزَلَ مِنْ مِنْبَرِهِ وَأُتِيَ بِكَبْشٍ فَذَبَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِيَدِهِ وَقَالَ: (بِسْمِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، هَذَا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: جەژنی قوربان لەنوێژگاکە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووم، کاتێ لەوتارەکەی لێ بویەوە لەسەر مینبەرەکەی دابەزی بەرانێکیان بۆ هێنا بەدەستی خۆی سەری بڕی فەرمووی: ((بسم الله، الله أكبر) ئەم قوربانیە لەجیاتی خۆم وە لەجیاتی ئەو کەسانەی ئوممەتم کە نیانە قوربانی بکەن).

## باسی سەبارەت بە پێشنوێژ ئاژەڵە قوربانیەکەی سەردەبڕێت لەنوێژگاکەدا.

## ٩ - باب الإمَامِ يَذْبَحُ بِالْمُصَلَّى.

**٢٨١١ - (حسن صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ كَانَ يَذْبَحُ أُضْحِيَتَهُ بِالْمُصَلَّى وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەنوێژگاکەدا ئاژەڵە قوربانیەکەی سەردەبڕی - بۆ ئەوەی خەڵك چاوی لێ بکەن و هەژارانیش گۆشتیان دەستکەوێت - ، ئیبنو عومەریش بەهەمان شێوە ئەو کارەی دەکرد.

## باسی سەبارەت بە پاشەکەوتکردنی گۆشتی قوربانی

## ١٠ - باب فِي حَبْسِ لُحُومِ الأَضَاحِي.

**٢٨١٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَفَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حَضْرَةَ الأَضْحَى فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(ادَّخِرُوا الثُّلُثَ، وَتَصَدَّقُوا بِمَا بَقِيَ). قَالَتْ: فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَقَدْ كَانَ**

النَّاسُ يَنْتَفِعُونَ مِنْ ضَحَايَاهُمْ، وَيَجْمُلُونَ مِنْهَا الْوَدَكَ، وَيَتَّخِذُونَ مِنْهَا الأَسْقِيَةَ، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(وَمَا ذَاكَ). أَوْ كَمَا قَالَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَهَيْتَ عَنْ إِمْسَاكِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِى دَفَّتْ عَلَيْكُمْ فَكُلُوا وَتَصَدَّقُوا وَادَّخِرُوا).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) لەڕۆژی جەژنی قورباندا كۆمەڵێ لەخەڵكی داماو و هەژاری سارانشینەكان هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی گۆشتی قوربانیان دەستكەوێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لەگۆشتی قوربانیەكانتان سێ یەكی لێ هەڵگرن بۆ خۆتان و ئەوی تری ببەخشنەوە بەسەر هەژاراندا)، وتی: لەدوایدا بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، خەڵك سود لە قوربانیەكانیان وەردەگرن، لەپێستەكانیان كوندەو مەشكەو هیزە دروست دەكەن و پیوی قوربانیەكانی تێدا هەڵدەگرن ئایا ئەوە دروستە؟ فەرمووی: (بۆچی چی بوە ئەو پرسیارە دەكەن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تۆ رێگریت كرد لەوەی كە گۆشتی قوربانی لە سێ شەو زیاتر پاشەكەوت بكرێت، فەرمووی: (ئەوجارە لەپێناو ئەو كۆمەڵە سارانشینە هەژارانەدا بوو كە هاتن بۆ ئەوەی گۆشتیان دەستبكەوێت، جا لێی بخۆن و بەشی خەڵكی لێ بدەن و بەشی خۆشتانی لێ پاشەكەوت بكەن).

٢٨١٣ - (صحيح) عن نبيشة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(إِنَّا كُنَّا نَهَيْنَاكُمْ عَنْ لُحُومِهَا أَنْ تَأْكُلُوهَا فَوْقَ

ثلاَثٍ، لِكَيْ تَسَعَكُمْ، فَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِالسَّعَةِ، فَكُلُوا وَادَّخِـرُوا وَاتَّجِرُوا، أَلاَ وَإِنَّ هَذِهِ الأَيَّامَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللَّهِ عَـزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە نوبەیشەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (ئێمە رێگریمان لێ كردن كە لە سێ رۆژ زیاتر لـە گۆشـتی قوربانیـەكانتان بخۆن، بۆ ئەوەی هەمووتان گۆشتی قوربانیتان بەربكەوێت، ئێـستا خـوای گـەورە دەرووی خێری لێ كردونەتەوەو رۆزیتـان فـراوان بـووە، جـا لێـی بخـۆن و بەشـی خۆشـتانی لـێ پاشەكەوت بكەن و، لێـی بكـەن بـە خێـر و داوای پاداشـت بكـەن لـەخوای گـەورە بـە بەخشینەوەی، ئاگاداربن ئەمڕۆ ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو زیكر و یادی خوای گەورەیە).

## باسی سەبارەت بە رێگری كردن لەوەی ئاژەڵ بكرێتە نیشانەو نەرمونیانی لەگەڵ ئەو ئاژەڵەی كە سەردەبڕدرێت.

## ١١ - باب فِي النَّهْيِ أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ وَالرِّفْقِ بِالذَّبِيحَةِ.

٢٨١٤ - (صحيح) عن شداد بن أوس قال: خَصْلَتَانِ سَمِعْتُهُمَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الإِحْسَـانَ عَلَـى كُلِّ شَيْءٍ، فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا). قَـالَ غَيْـرُ مُسْـلِمٍ يَقُـولُ:

(فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ، وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ، وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ، وَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ).

واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دوو شتم بیستو لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم): (خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك نوسیوە، ئەگەر کەسێکتان لەتۆڵەدا کوشتەوە بە چاکی بیکوژنەوە)، جگە لە پێشەوا موسلیم دەڵێن: (بە چاکی بیکوژنەوە، ئەگەر ئاژەڵێکتان سەربڕی بەچاکی سەری ببڕن، ئەو کەسەتان ئاژەڵێکی سەربڕی با تیغەکەی تیژ بکاتەوەو پشو بدات بە سەربڕاوەکە بە شێوەیە بێت زوو گیانی دەرچێت و ئازاری کەم پێ بگات).

٢٨١٥ - (صحيح) عن هشام بن زيد قال: دَخَلْتُ مَعَ أَنَسٍ عَلَى الْحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ فَرَأَى فِتْيَانًا - أَوْ غِلْمَانًا - قَدْ نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ.

واتە: لە هیشامی کوڕی زەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ ئەنەس چوین بۆلای حەکەمی کوڕی ئەیوب کۆمەڵێ منداڵی بینی مریشکێکیان کردبوە نیشانەو تیریان تێ دەگرت، ئەنەس وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قەدەغەی کردوە ئاژەڵ بکرێتە نیشانەو تیری تێ بگیرێت.

## باسی سەبارەت بە قوربانی کردنی موسافیر.

## ١٢ – باب فِي الْمُسَافِرِ يُضَحِّي.

٢٨١٦ - (صحيح) عن ثوبان قال: ضَحَّى رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: (يَا ثَوْبَانُ أَصْلِحْ لَنَا لَحْمَ هَذِهِ الشَّاةِ). قَـالَ: فَمَا زِلْتُ أُطْعِمُهُ مِنْهَا حَتَّى قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ.

واتە: لە (ثوبان)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) قوربانی کردو فەرمووی: (ئەی (ثوبان) لەگۆشتی ئەم مەڕەمان بۆ ئامادە بکە بۆ خواردن. وتی: بەردەوام لە گۆشتی ئەو مەڕەم دەخوارد دەدا هەتا گەیشتینەوە مەدینە.

## باسی سەبارەت بە سەربڕاوی خاوەن نامە ئاسمانیەکان واتە گاور و جولەکە.

## ١٣ – باب فِي ذَبَائِحِ أَهْلِ الْكِتَابِ.

٢٨١٧ - (حسن) عن ابن عباس قال: (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) (وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ) فَنُسِخَ وَاسْتَثْنَى مِنْ ذَلِـكَ فَقَالَ: (وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ). سورة الأنعام: ١١٨. واتە: دەبخۆن لەو (سەربڕاو)ەی کەناوی خوای لەسەر هێنراوە. (وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ). سورة الأنعام: ١٢١. واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنرایەوە (کاتی سەربڕین). حوکمەکەی نەسخ بووەو خوای گەورە خاوەن نامە ئاسمانیەکانی جیاکردەوەو ئەم ئایەتەی دابەزاند: (وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ). سورة المائدة: ٥. واتە: وە خۆراکی ئەوانەی نامەیان پیٚ دراوە حەلاڵە بۆتان، وە خۆراکی ئێوەش حەلاڵە بۆ ئەوان.

**٢٨١٨ - (صحيح) عن ابن عباس في قولـه: (وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ) يَقُولُونَ: مَا ذَبَحَ اللَّهُ فَلاَ تَـأْكُلُوا، وَمَـا ذَبَحْـتُمْ أَنْتُمْ فَكُلُوا، فَأَنْزَلَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ (وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیٚ بیٚ دەربارەی ئەم ئایەتە هاتوە: (وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ). سورة الأنعام: ١٢١. واتە: وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن، بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن.

دەڵێن: ئەوەی خوای گەورە سەری بڕیوە مەیخۆن چونکە مرداربۆتەوە، ئەوەی خۆتان سەری دەبڕن بیخۆن، ئەمە لە سروشی شەیتانەوەیە، خوای گەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: (وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ). سورة الأنعام: ١٢١. واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (کاتی سەربڕین). -ئەوە مردارۆبوە-

**٢٨١٩ - (صحيح لكن ذكر اليهود فيه منكر والمحفوظ أنهم مشركون)**

**عن ابن عباس قال: جَاءَتِ الْيَهُودُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: نَأْكُلُ مِمَّا قَتَلْنَا، وَلاَ نَأْكُلُ مِمَّا قَتَلَ اللَّهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ﴾ إِلَى آخِرِ الآيَةِ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: جولەكە هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، - راستیەكەی هاوەبەش بۆ خوا دانەران هاتن بۆلای - وتیان: لەگۆشتی ئەو ئاژەڵە دەخۆین كە خۆمان كوشتومانە، لەگۆشتی ئەو ئاژەڵە ناخۆین كە خوای گەورە دەیكوژێت، خوای گەورەش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾. سورة الأنعام: ١٢١. واتە: لەو (سەربڕاوە) مەخۆن كەناوی خوای لەسەر نەهێنراوە (كاتی سەربڕین)، بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە، وە بێگومان شەیتانەكان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێتان لەگەڵ بكەن، جائەگەر بەگوێیان بكەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش دانەران دەبن.

## باسی ئەوەی دەربارەی خواردنی گۆشتی (مُعَاقَرَة)ی عەرەبە دەشتەکیەکان هاتوە.

## ١٤ – باب مَا جَاءَ فِي أَكْلِ مُعَاقَرَةِ الأَعْرَابِ.

٢٨٢٠ - عن ابن عباس قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ أَكْلِ مُعَاقَرَةِ الأَعْرَابِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رێگری کردوە لە خواردنی گۆشتی وشتری (معاقره)ی عەرەبە دەشتەکیەکان – عەرەبە دەشتەکیەکان پێش برکێیان دەکرد لەسەر وشتر سەربرین، جا کامەیان وشتری زیاتری سەربڕیایە ئەوە سەرکەوتو بوو شانازی پێوە دەکرد جا بە گۆشتی ئەو وشترانە دەوترا (معاقره).

## باسی سەبارەت بەو ئاژەڵەی کە سەردەبڕدرێت بە مەروە، کە بەردێکی سپی ساف و تیژە وەك چەقۆ بەکاردەهێنرێت.

## ١٥ – باب فِي الذَّبِيحَةِ بِالْمَرْوَةِ.

٢٨٢١ - (صحيح) عن رافع بن خديج قال: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَلْقَى الْعَدُوَّ غَدًا وَلَيْسَ

مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْمَرْوَةِ وَشِقَّةِ الْعَصَا؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَرِنْ أَوْ أَعْجِلْ، مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلُوا، مَا لَمْ يَكُنْ سِنًّا أَوْ ظُفْرًا، وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ). وَتَقَدَّمَ بِهِ سَرَعَانٌ مِنَ النَّاسِ فَتَعَجَّلُوا فَأَصَابُوا مِنَ الْغَنَائِمِ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي آخِرِ النَّاسِ، فَنَصَبُوا قُدُورًا فَمَرَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْقُدُورِ فَأَمَرَ بِهَا فَأُكْفِئَتْ، وَقَسَمَ بَيْنَهُمْ فَعَدَلَ بَعِيرًا بِعَشْرِ شِيَاهٍ، وَنَدَّ بَعِيرٌ مِنْ إِبِلِ الْقَوْمِ وَلَمْ يَكُنْ مَعَهُمْ خَيْلٌ فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّ لِهَذِهِ الْبَهَائِمِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فَمَا فَعَلَ مِنْهَا هَذَا فَافْعَلُوا بِهِ مِثْلَ هَذَا).

واتە: لە رافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئێمە سبەینێ دەگەین بە دوژمن و چەقۆمان پێ نیە، ئایا دروستە بە مەروە یان بە لەتی داردەست ئاژەڵ سەر ببڕین؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بە پەلە سەری بڕن بۆ ئەوەی بەئاسانی گیانی دەرچێت و نەخنکێت، هەرشتێ فیچقە بە خوێن بکات و ناوی خوای لەسەر ببرێت لێی بخۆن، بەمەرجێ ددان و نینۆك نەبێ، ئەوەشتان پێ دەڵێم چونکە ددان ئێسقانەو کولە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشیە کافرەکانە – خۆچواندنە بەوان - )، لەخەڵکەکە ئەوانەی کە لەپێشەوە بوون و بە پەلە بوون بە دەستکەوتەوە گەڕانەوە دەستکەوتەکە وشتر و مەڕیشی تێدابوو، مەنجەڵیان خستە سەر ئاگر و خۆیان ئامادە کرد

بۆ گۆشت لێنان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدوای خەڵکەکەوە بوو، دای بەلای مەنجەڵەکاندا فەرمانی دا مەنجەڵەکانیان قلْپ کردەوەو رێگری لێ کردن کە بەکاری بهێنن، چونکە غەنیمەتەکە دابەش نەکرابو، جا دەستکەوتەکەی دابەشکرد بەسەریاندا، وشترێکی لەبەرامبەر دە مەڕدا دانا، وشترێ هەڵهات ئەسپێکی بەهێزیان پێ نەبوو هەتا بیگرنەوە، پیاوێ تیرێکی تێ گرت و تیرەکە لێی داو وەستا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەم ئاژەڵانە هەیانە وەك درندەکان یاخی دەبن، جا هەر کامێکیان یاخی بوو بەو شێوەیەی لێ بکەن).

**٢٨٢٢ - (صحيح) عن محمد بن صفوان - أو صفوان بن محمد - قال: اصَّدْتُ أَرْنَبَيْنِ فَذَبَحْتُهُمَا بِمَرْوَةٍ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْهُمَا، فَأَمَرَنِي بِأَكْلِهِمَا.**

واتە: لە موحەممەدی کوڕی صەفوانەوە - یان لە صەفوانی کوڕی موحەممەدەوە - دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوو کەروێشکم ڕاو کرد بە مەروە سەرم بڕین، لەبارەیانەوە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمانی پێ کردم لە گۆشتەکەیان بخۆم.

**٢٨٢٣ - (صحيح) عن عطاء بن يسار، عن رجل من بني حارثة: أَنَّهُ كَانَ يَرْعَى لِقْحَةً بِشِعْبٍ مِنْ شِعَابِ أُحُدٍ، فَأَخَذَهَا الْمَوْتُ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يَنْحَرُهَا بِهِ، فَأَخَذَ وَتَدًا فَوَجَأَ بِهِ فِي لَبَّتِهَا حَتَّى أُهْرِيقَ دَمُهَا، ثُمَّ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَأَمَرَهُ بِأَكْلِهَا.**

واتە: لە (عطاء)ی كوڕی یەسارەوە - لە پیاوێكی هۆزی (بنی حارثة)وە دەگێرنەوە، لە شیویّ لە شیوەكانی مەدینەدا وشترێكی ئاوسی شیردەری دەلەوەڕاند كە ئەوەندەی نەمابو بزێت، خەریك بوو مردار بێتەوە، ئەویش هیچی دەستنەكەوت كە پێی سەربڕێت، مێخێكی تیژی هەڵگرت لەكراگەیدا هەتا خوێن فیچقەی كرد، لەپاشدا هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەواڵەكەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمانی پێ كرد لە گۆشتەكەی بخوات.

**٢٨٢٤ - (صحيح) عن عدي بن حاتم قال: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ أَحَدُنَا أَصَابَ صَيْدًا وَلَيْسَ مَعَهُ سِكِّينٌ أَيَذْبَحُ بِالْمَرْوَةِ وَشِقَّةِ الْعَصَا؟ فَقَالَ: (أَمْرِرِ الدَّمَ بِمَا شِئْتَ، وَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).**

واتە: لە عەدی كوڕی حاتیمەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر كەسێ لە ئێمە نێچیرێكی راوكردو چەقۆی پێ نەبوو ئایا بە مەروە یان بە لەتی داردەست كە تیژبێت سەری ببڕێت؟ فەرمووی: (بە هەرچی دەتەوێ سەری ببڕە بەمەرجێ خوێنی لەبەر بڕوات - جگە لە ددان و نینۆك - ، بەڵام ناوی خوای لەسەر بێنە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی چۆنیەتی سەربڕینی ئاژەڵێ کە لەبەرزاییەوە بەربێتەوە.

## ١٦ - باب مَا جَاءَ فِي ذَبِيحَةِ الْمُتَرَدِّيَةِ.

**٢٨٢٥ - (منكر) عن أبو العشراء، عن أبيه، قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمَا تَكُونُ الذَّكَاةُ إِلاَّ مِنَ اللَّبَّةِ أَوِ الْحَلْقِ؟ قَالَ: فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لَوْ طَعَنْتَ فِي فَخِذِهَا لأَجْزَأَ عَنْكَ).**
**قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا لاَ يَصْلُحُ إِلاَّ فِي الْمُتَرَدِّيَةِ، وَالْمُتَوَحِّشِ.**

واتە: لە ئەبو عوشرائەوە، لەباوکیەوە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەربڕینی شەرعی تەنها بەشی سەرەوەی قوڕقوڕاگە یان قوڕقوڕاگە دەگرێتەوە ؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر رانی بپێکی و برینداری بکەی بەسە - لەجیاتی سەربڕین - ). ئەبو داود دەڵێت: ئەمەش دروست نیە بۆ بێجگە لە ئاژەڵێ کە لە بەرزاییەوە بەربێتەوە - بۆ ناو بیرێ - وە ئاژەڵێ دڕندە و یاخی کە هەڵبێ و نەگیرێتەوە.

## باسی سەبارەت بە زێدەڕۆیی لە سەربڕیندا.

## ١٧ – باب فِي الْمُبَالَغَةِ فِي الذَّبْحِ.

**٢٨٢٦ - (ضعيف) عن ابن عباس رضي الله عنهما - زاد ابن عيسى: و أبي هريرة - قالا: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ شَرِيطَةِ الشَّيْطَانِ. زَادَ ابْنُ عِيسَى فِي حَدِيثِهِ: وَهِيَ الَّتِي تُذْبَحُ فَيُقْطَعُ الْجِلْدُ وَلاَ تُفْرَى الأَوْدَاجُ، ثُمَّ تُتْرَكُ حَتَّى تَمُوتَ.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ - عیسا لەفەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: وە لە ئەبو هورەیرەیشەوە دەگێڕنەوە، کە وتویانە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردوە لەو سەربڕاوەی کە دەمارەکانی لاملی نابڕدرێت بە (شَرِيطَةِ الشَّيْطَانِ) ناوی بردوە، چونکە شەیتان ئەو کارە دەکات بە مرۆڤ هەتا ئاژەڵەکە مرداربێتەوە - . عیسا لەفەرمودەکەیدا ئەمەی بۆ زیاد کرد: ئەو ئاژەڵەیە کە سەردەبڕرێت پێستەکەی دەبڕن بەڵام دەمارەکانی لاملی نابڕن، لەپاشدا وازی لێ دەهێنن هەتا ڕۆحی دەردەچێت.

# باسی ئەوەی دەربارەی چۆنیەتی سەربڕینی کۆرپەلە هاتوە.

## ١٨ - باب مَا جَاءَ فِي ذَكَاةِ الْجَنِينِ.

٢٨٢٧ - (صحيح) عن أبو سعيد قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْجَنِينِ، فَقَالَ: (كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ). وَقَالَ مُسَدَّدٌ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَنْحَرُ النَّاقَةَ وَنَذْبَحُ الْبَقَرَةَ وَالشَّاةَ فَنَجِدُ فِي بَطْنِهَا الْجَنِينَ، أَنُلْقِيهِ أَمْ نَأْكُلُهُ؟ قَالَ: (كُلُوهُ إِنْ شِئْتُمْ، فَإِنَّ ذَكَاتَهُ ذَكَاةُ أُمِّهِ).

واتە: لە ئەبو سەعیدەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کرد دەربارەی کۆرپەلە، فەرمووی: (ئەگەر ویستان بیخۆن). موسوددەد وتی: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، جاری وا هەیە وشتر و مانگاو مەڕ سەردەبڕین دەبینین کۆرپەلە لە سکیدایە ئایا فڕێ بدەین یان بیخۆین؟ فەرمووی: (ئەگەر ویستان بیخۆن چونکە سەربڕینی دایکی وەك سەربڕینی ئەویش وایە).

٢٨٢٨ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله، عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال:: (ذَكَاةُ الْجَنِينِ ذَكَاةُ أُمِّهِ).

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللّـه)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سەربڕینی کۆرپەلە سەربڕینی دایکیەتی).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی خواردنی گۆشتێ کە نازانرێت ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا؟

## ١٩ – باب مَا جَاءَ فِي أَكْلِ اللَّحْمِ لاَ يُدْرَى أَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ أَمْ لاَ.

**٢٨٢٩ - (صحيح) عن حماد و مالك عن عائشة، أنهم قالوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ قَوْمًا حَدِيثُو عَهْدٍ بِالْجَاهِلِيَّةِ، يَأْتُونَنَا بِلُحْمَانٍ، لاَ نَدْرِي أَذَكَرُوا، اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا أَمْ لَمْ يَذْكُرُوا، أَفَنَأْكُلُ مِنْهَا؟ فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(سَمُّوا اللَّهَ وَكُلُوا).**

واتە: لە حەمادو مالیکەوە، لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، قەومێك کە نزیکن لەسەردەمی نەفامیەوە و تازە موسوڵمان بوون ئەحکامەکانی شەرع نازانن — گۆشتمان بۆ دێنن، نازانین ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا، ئایا لێی بخۆین؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ناوی خوای لێ بێنن و بیخۆن).

# باسی سەبارەت بە سەربڕاوی سەرەتای مانگی رەجەب

## ٢٠ - باب فِي الْعَتِيرَةِ.

٢٨٣٠ - (صحيح) عن أبو المليح قال: قال نبيشة: نَادَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنَّا كُنَّا نَعْتِرُ عَتِيرَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ فِي رَجَبٍ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (اذْبَحُوا لِلَّهِ فِي أَيِّ شَهْرٍ كَانَ، وَبَرُّوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَأَطْعِمُوا). قَالَ: إِنَّا كُنَّا نُفْرِعُ فَرَعًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: (فِي كُلِّ سَائِمَةٍ فَرَعٌ تَغْذُوهُ مَاشِيَتُكَ حَتَّى إِذَا اسْتَحْمَلَ). قَالَ نَصْرٌ: (اسْتَحْمَلَ لِلْحَجِيجِ، ذَبَحْتَهُ فَتَصَدَّقْتَ بِلَحْمِهِ). قَالَ خَالِدٌ: أَحْسَبُهُ قَالَ: (عَلَى ابْنِ السَّبِيلِ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ). قَالَ خَالِدٌ: قُلْتُ لأَبِي قِلاَبَةَ: كَمِ السَّائِمَةُ؟ قَالَ: مِائَةٌ.

واتە: لە ئەبو مەلیحەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: نوبەیشە وتی: پیاوێ پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بانگ كرد وتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا لەسەرەتای مانگی رەجەبدا مەڕێكمان سەر دەبڕی، تۆ فەرمانمان بەچی پێ دەكەی وازی لێ بهێنین یان بەردەوام بین لەسەری؟ فەرمووی: (بۆ خوای گەورە سەری ببڕن لەهەر مانگێكدا بێت دروستە بەمەرجێ بۆ خوا بێ واتە لە پێناوی خوای گەورەدا سەربڕرێت، كردەوەی چاكە بكەن بۆ خوا، لەگۆشتی سەربڕاوەكە بەشی هەژارانی لێ بدەن). هەروەها وتی: ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا نۆبەرەی ئاژەڵ - واتە مەڕ و بزن و مانگاو وشتر- مان سەردەبڕی، تۆ فەرمانمان بەچی پێ دەكەی وازی لێ بهێنین یان بەردەوام بین لەسەری؟ فەرمووی: (وەك

چۆن ئالَف دەدەی بەو ولاخەی کە سواری دەبیت ئاوەهاش ئـالَفی بـدەرێ هـەتا گـەورەو بەهێز دەبێ و توانای هەڵگرتنی باری دەبێت). نەصر - شێخی ئەبو داود - وتی: (هـەتا توانای ئەوەی دەبێت باری لێ بنێن و حەجاج بیبەن لەگەڵ خۆیان بۆ حەج و سواری دەبن، ئەوکاتە سەری دەبڕی و گۆشتەکەی دەکەی بە خێر). خالید وتـی: پـێم وایـە فـەرمووی: (گۆشتەکەی دابەش دەکەی بەسەر رێبوارانداا، ئەوە خێر و چاکەیە). خالید وتـی: وتم بـە ئەبو قیلابە: لە چەند (سائمە سەرێ؟ وتی: لە سەد.

**٢٨٣١ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ).**

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە دەگێرنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (فرع) و (عتیرە) نیە، واتە ئەم دوو جۆرە سەربڕینە لەئیسلامدا نیە.

**٢٨٣٢ - (صحيح مقطوع) عن سعيد قال: الْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ فَيَذْبَحُونَهُ.**

واتە: لە سەعیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صـلى الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (فرع) بریتیە لە نۆبەرەی وشتر و مەڕ کە دەبو، سەریان دەبڕی لەسـەردەمی نەفامیدا.

**٢٨٣٣ - (صحيح) عن عائشة قالت: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ كُلِّ خَمْسِينَ شَاةً شَاةٌ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ بَعْضُهُمْ: الْفَرَعُ أَوَّلُ مَا تُنْتَجُ الإِبِلُ كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ، ثُمَّ**

يَأْكُلُونَهُ، وَيُلْقِى جِلْدُهُ عَلَى الشَّجَرِ، وَالْعَتِيرَةُ فِى الْعَشْرِ الأُوَلِ مِنْ رَجَبٍ.

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێ کردین لەهەر پەنجا سەر مەڕێ مەڕێ. ئەبو داود دەڵێت: هەندێکیان دەڵێن: (فرع) بریتیە لە نۆبەرەی وشتر کە دەبو، سەریان دەبڕی بۆ بتەکانیان، لەپاشدا لێیان دەخوارد، پێستەکەیان هەڵدەواسی بە درەختێکدا، (عتیرە)ش ئەو ئاژەڵە بوو کە لەسەرەتای مانگی ڕەجەبەوە سەریان دەبڕی.

## باسی سەبارەت بە گوێزەبانە(حەوتم).

## ٢١ - باب فِي الْعَقِيقَةِ.

٢٨٣٤ - (صحيح) عن أم كرز الكعبية قالت: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ قَالَ: مُكَافِئَتَانِ أَيْ مُسْتَوِيَتَانِ أَوْ مُقَارِبَتَانِ.

واتە: لە ئومو کورزی کەعبیەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە گوێزەبانە دەیفەرموو: (بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك و هاوتەمەن سەربرڕێت،، بۆ کچیش یەك مەڕ). ئەبو داود دەڵێت: بیستم لە ئەحمەد لەبارەی (مُكَافِئَتَان)ەوە وتی: وەك یەك و هاوتەمەن بن.

**٢٨٣٥ - (صحيح عدا مابين معكوفتين) عن أم كرز قالت: سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: ﴿(أَقِرُّوا الطَّيْرَ عَلَى مَكِنَاتِهَا)﴾. قَالَتْ وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ، لاَ يَضُرُّكُمْ أَذُكْرَانًا كُنَّ، أَمْ إِنَاثًا).**

واتە: لە ئوممو کورزەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (باڵندە هەڵمەفرێنن با لەجێگای خۆیدا بمێنێتەوە - چونکە نە سودی هەیەو نە زیانیش دەگەیەنێت - ). لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر کەسێ کارێکی پێویستی ببوایە ئەچو باڵندەیەکی لە هێلانەکەی هەڵدەفڕاند ئەگەر بەلا راستدا بفڕیایە دەچو بەدەم کارەکەیەوە، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا بفڕیایە ئەوە دەگەڕایەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارەی قەدەغەکرد - ئوممو کورز وتی: هەروەها لێم بیستوە فەرمووی: (بۆ کوڕ دوو مەڕ سەرببڕێت، بۆ کچیش یەك مەڕ، ئیتر مەڕەکە نێر بێ یان مێ وەك یەکەو زیانی نیە بۆتان).

**٢٨٣٦ - (صحيح) عن أم كرز قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مِثْلاَنِ، وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ).**

واتە: لە ئوممو کورزی کەعبیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی گوێزەبانە فەرموویەتی: (بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوشێوەو وەك یەك سەرببڕێت، بۆ کچیش یەك مەڕ).

**٢٨٣٧ - (صحيح دون قوله (وَيُدَمَّى) ﴿والمحفوظ (وَيُسَمَّى) كما في رواية الثانية﴾). عن سمرة عن رسول الله صلى الله عليه**

**وآله وسلم قال: (كُلُّ غُلَامٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ: تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ، وَيُدَمَّى). فَكَانَ قَتَادَةُ إِذَا سُئِلَ عَنِ الدَّمِ كَيْفَ يُصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: إِذَا ذَبَحْتَ الْعَقِيقَةَ أَخَذْتَ مِنْهَا صُوفَةً وَاسْتَقْبَلْتَ بِهِ أَوْدَاجَهَا، ثُمَّ تُوضَعُ عَلَى يَافُوخِ الصَّبِيِّ، حَتَّى يَسِيلَ عَلَى رَأْسِهِ مِثْلُ الْخَيْطِ، ثُمَّ يُغْسَلُ رَأْسُهُ بَعْدُ، وَيُحْلَقُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا وَهَمٌ مِنْ هَمَّامٍ (وَيُدَمَّى). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: خُولِفَ هَمَّامٌ فِي هَذَا الْكَلَامِ وَهُوَ وَهَمٌ مِنْ هَمَّامٍ، وَإِنَّمَا قَالُوا: (يُسَمَّى). فَقَالَ هَمَّامٌ: (يُدَمَّى). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلَيْسَ يُؤْخَذُ بِهَذَا.**

واتە: لە سەمورەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمویەتی: (هەموو كوڕێك ڕێگە نادرێت شەفاعەت بكات بۆ باوك و دایكی هەتا گوێزەبانەی بۆ نەكرێت ئەگەر بە منداڵی بمرێت، لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕرێت و خوێنی سەربڕاوەكە دەدرێت لەسەری و، سەریشی دەتاشرێت - ناویشی لێ دەنرێت - ). كاتێ كە پرسیار دەكرا لە قەتادە دەربارەی خوێنی سەربڕاوەكە كە چی لێ دەكرێت؟ دەیوت: كاتێ كە ئاژەڵێ دەكرا بە گوێزەبانە پارچەیە موویان دەهێنا بە خوێنی دەمارەكانی لاملی سەربڕاوەكەدا، لەپاشدا دەیاندا لە ناوەڕاستی سەری منداڵەكە خوێنەكە بە سەریا دەهاتەخوارەوە وەك دەزوو، لەپاشدا سەری دەشۆردرا جا دەتاشرا. ئەبو داود دەڵێت: (وَيُدَمَّى) ئەمە (وهم)ە لە هومامەوە - ڕاستیەكەی (يُسَمَّى)یە واتە: ناوی لێ دەنرێت - ، ئەبو داود دەڵێت: بەڵكو وتیان: (يُسَمَّى). واتە: ناوی لێ دەنرێت، هومام دەڵێت: (وَيُدَمَّى) ، ئەبو داود دەڵێت: بەو شێوەیە لێی وەرناگیرێت.

**٢٨٣٨ - (صحيح) عن سمرة بن جندب: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (كُلُّ غُلاَمٍ رَهِينَةٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَيُسَمَّى أَصَحُّ، كَذَا قَالَ سَلاَّمُ بْنُ أَبِي مُطِيعٍ، عَنْ قَتَادَةَ، وَإِيَاسُ بْنُ دَغْفَلٍ وَأَشْعَثُ، عَنِ الْحَسَنِ. قَالَ: (وَيُسَمَّى). وَرَوَاهُ أَشْعَثُ عَنِ الْحَسَنِ عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (وَيُسَمَّى).**

واتە: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (هەموو کوڕێك رێگە نادرێت شەفاعەت بکات بۆ باوك و دایکی هەتا گوێزەبانەی بۆ نەکرێت ئەگەر بە منداڵی بمرێت، لە رۆژی حەوتەمدا بۆی سەر دەبڕرێت و، سەری دەتاشرێت و ناویشی لێ دەنرێت). ئەبو داود دەڵێت: راستیەکەی (يُسمَّى)یە واتە: ناوی لێ دەنرێت - ، سەلامی کوڕی (مطيع) لە قەتادەوە، وە ئیاسی کوڕی دەغفەل و (أشعث)ی کوڕی حەسەن هەروەها گێڕاویانەتەوە، وتی: (وَيُسَمَّى). وە (أشعث)، لە حەسەنەوە، لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، بە هەمان شێوە گێڕاویەتیەوە.

**٢٨٣٩ - (صحيح) عن سلمان بن عامر الضبي قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَعَ الْغُلاَمِ عَقِيقَتُهُ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى).**

واتە: لە سەلمانی کوڕی عامیری (الضبي) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (لەگەڵ هەر منداڵێکدا گوێزەبانەیەك هەیە، سەربڕاوەکە خوێنی بە تەوژم لێ بڕوات و، پیسایی و پاشەڕۆکەی لێ بکرێتەوە.

٢٨٤٠ - (صحيح مقطوع) عن الحسن أنه كان يقول: إِمَاطَةُ الأَذَى حَلْقُ الرَّأْسِ.

واتە: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (إِمَاطَةُ الأَذَى) سەرتاشینە.

٢٨٤١ - (صحيح) عن ابن عباس، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَقَّ عَنِ الْحَسَنِ وَالْحُسَيْنِ كَبْشًا كَبْشًا.

کە پێغەمبەر صلی اللہ علیه وسلم گوێزەبانەی کرد بۆ حەسەن و حوسەین هەریەکەی بەرانێکی بۆ سەربڕین.

٢٨٤٢ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه أراه عن جده قال: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْعَقِيقَةِ، فَقَالَ: (لاَ يُحِبُّ اللَّهُ الْعُقُوقَ). كَأَنَّهُ كَرِهَ الاِسْمَ، وَقَالَ: (مَنْ وُلِدَ لَهُ وَلَدٌ فَأَحَبَّ أَنْ يَنْسُكَ عَنْهُ فَلْيَنْسُكْ عَنِ الْغُلاَمِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ وَعَنِ الْجَارِيَةِ شَاةٌ). وَسُئِلَ عَنِ الْفَرَعِ قَالَ: (وَالْفَرَعُ حَقٌّ، وَأَنْ تَتْرُكُوهُ حَتَّى يَكُونَ بَكْرًا شُغْزُبًّا ابْنَ مَخَاضٍ أَوِ ابْنَ لَبُونٍ فَتُعْطِيَهُ أَرْمَلَةً أَوْ تَحْمِلَ عَلَيْهِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذْبَحَهُ فَيَلْزَقَ لَحْمُهُ بِوَبَرِهِ، وَتُكْفِئَ إِنَاءَكَ، وَتُولِّهَ نَاقَتَكَ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، پێم وایە لەباپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی گوێزەبانە، فەرمووی: (خوای گەورە (عقوق) واتە بڕینی پێ خۆش نیە). وەك ئەوەی کە ناوەکەی پێ ناخۆش بێت،

بەڵکو پێی خۆش بوو بوترێت (نسك) هەروەها فەرمووی: (هەرکەسێك لە ئێوە منداڵی بوو حەزیکرد گوێزەبانەی بۆ بکا با بۆی بکات، بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك سەر ببڕێ و، بۆ کچیش یەك مەڕ). هەروەها دەربارەی (فرع) پرسیاری لێ کرا - کە بریتیە لە نۆبەرەی وشتر کە دەبو، سەریان دەبڕی - ، گوێزەبانە، فەرمووی: (نۆبەرە حەق و رەوایە، باشتر وایە وازی لێ بهێنرێت تاکو گەورە دەبێ و خڕکەڵە دەبێ و دەبێتەساڵێك یان دوو ساڵ توندوتۆڵ دەبێت، ببەخشێت بە بێوەژن و هەژار یان سواری بێت لەپێناوی خوای گەورەدا واتە بۆ جیهادو حەج، چاکترە لەوەی سەری ببڕێت و گۆشتەکەی بلکێت بە توکەکەیەوە لەبەر کەمی گۆشتەکەی، کەمۆڵەی شیرەکەت بەبێ شیر بمێنێتەوە واتە ئەگەر نۆبەرەکەی سەر ببڕرێت شیری بەردەوام نابێت، دایکەکەی دڵشکاو بکەیت).

کۆتایی کتێبی قوربانیەکان.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەبارەت بە راوکردنی ئاژەڵی کێوی.

# ١١ – الصيد.

## باسی سەبارەت بە راگیرکردنی سەگ بۆ راوکردن و جگە لە راوکردن

## ١ – باب فِي اتِّخَاذِ الْكَلْبِ لِلصَّيْدِ وَغَيْرِهِ.

٢٨٤٤ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبي صلى الله عليه وعلى آله وسلم قال: (مَنِ اتَّخَذَ كَلْبًا - إلاَّ كَلْبَ مَاشِيَةٍ أَوْ صَيْدٍ أَوْ زَرْعٍ - ، انْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطٌ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەسێ سەگێ رابگرێت، سەگی پاسی ئاژەڵ و، سەگی راهێنراوو راو و، سەگی پاسی زەوی و زارو مەزرا نەبێت - ئەوە هەموو رۆژێ ئەندازەیە(قیراط)ێ لە پاداشتی کردەوەی چاکی کەمدەبێتەوە).

**٢٨٤٥ - (صحيح) عن عبد الله بن مغفل قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَوْلاَ أَنَّ الْكِلاَبَ أُمَّةٌ مِنَ الأُمَمِ لأَمَرْتُ بِقَتْلِهَا، فَاقْتُلُوا مِنْهَا الأَسْوَدَ الْبَهِيمَ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی موغەففەلەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر سەگەکان ئوممەتێ نەبونایە لە ئوممەتان فەرمانم دەکرد بە کوشتن و لەناوبردنیان، بەڵام سەگی زۆر ڕەش بکوژن.

**٢٨٤٦ - (صحيح) عن جابر قال: أَمَرَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ حَتَّى إِنْ كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَقْدَمُ مِنَ الْبَادِيَةِ - يَعْنِي بِالْكَلْبِ - فَنَقْتُلُهُ، ثُمَّ نَهَانَا عَنْ قَتْلِهَا، وَقَالَ: (عَلَيْكُمْ بِالأَسْوَدِ).**

واتە: لە جابرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان هەتا ژن لەسارانشینەوە سەگی دەهێنا دەمان کوشت، لەپاشدا ڕێگری لێ کردین، وە فەرموویەتی: (ئاگاداربن سەگی ڕەش لەدەستان دەرنەچێ بیکوژن).

## سەبارەت بە راوکردنی ئاژەڵی کێوی.

## ٢ - باب فِي الصَّيْدِ.

٢٨٤٧ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم قال: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ: إِنِّي أُرْسِلُ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ فَتُمْسِكُ عَلَيَّ، أَفَآكُلُ؟ قَالَ: (إِذَا أَرْسَلْتَ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ). قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلْنَ قَالَ: (وَإِنْ قَتَلْنَ مَا لَمْ يَشْرَكْهَا كَلْبٌ لَيْسَ مِنْهَا). قُلْتُ: أَرْمِي بِالْمِعْرَاضِ فَأُصِيبُ أَفَآكُلُ؟ قَالَ: (إِذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَأَصَابَ فَخَزَقَ فَكُلْ وَإِنْ أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ).

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتم: من سەگی راوکەری راهێنراو ئاراستەی نێچیر دەکەم دەیگرن بۆم، ئایا گۆشتەکەی حەڵاڵەو لێی بخۆم؟ فەرمووی: (ئەگەر سەگە راوکەرەکەت ئاراستەی نێچیرەکە کردو ناوی خودات هێنا ئەویش نێچیرەکەی گرت، ئەوەی بۆتی دەگرێ بیخۆ نەك بۆ خۆی)، وتم: ئەی ئەگەر بیکوژن؟ فەرمووی: (ئەگەر بیشیکوژن، بەمەرجێ سەگێکی تر هاوبەشی نەکردبێ لە گرتنیدا — نەوەك ئەو سەگە کوشتبێتی). وتم: ئەگەر (معراض)[١] تیرێکی بێ پەڕ نێچیری پێ راوبکرێت ئایا گۆشتی نێچیرەکە حەڵاڵەو لێی بخۆم؟ فەرمووی:

[١] - (معراض) بریتیە: لە تیرێکی بێ پەڕ یان تەختەیەکی قورسە یا عصایەك ئاسنێك بەسەرەکەیەوەتی یان جگە لە ئاسن.

(ئەگەر ناوی خوات لەسەر هێنابێ و، لەسەر باری تیـژی لێـی دابێـت ئـەوە گۆشـتەکەی حەڵاڵەو لێی بخۆ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی لێی دابێت ئەوە لێی مەخۆ چونکە ئـەوە بە زبر مرداربۆتەوە).

**٢٨٤٨ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم قال: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قُلْتُ: إِنَّا نَصِيدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ، فَقَالَ لِي: (إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، وَإِنْ قَتَلَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَإِنْ أَكَلَ الْكَلْبُ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ).**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتم: من بەم سەگانە راوی ئاژەڵی کێوی دەکـەم، پێـی فـەرمووم: (ئەگەر سەگە راوکەرە راهێنراوەکەت ئاراستەی نێچـیرەکە کـردو، نـاوی خـودات هێنـا، ئەویش نێچیرەکەی گرت بۆ تۆ ئـەوە لـە گۆشـتی نێچـیرەکە بخـۆ، ئەگـەر بیکوژێـت و مرداریش بوبێتەوە هەر لێی بخۆ، بەمەرجێ سەگ لێی نـەخواردبێت، ئەگـەر سـەگ لێـی خواردبێت مەیخۆ، چونکە دەترسم بۆ خۆی گرتبێت).

**٢٨٤٩ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَوَجَدْتَهُ مِنَ الْغَدِ، وَلَمْ تَجِدْهُ فِي مَاءٍ، وَلاَ فِيهِ أَثَرٌ غَيْرَ سَهْمِكَ فَكُلْ، وَإِذَا اخْتَلَطَ بِكِلاَبِكَ كَلْبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ، لاَ تَدْرِي لَعَلَّهُ قَتَلَهُ الَّذِي لَيْسَ مِنْهَا).**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر بەتیرەکەت نێچیرەکەت پێکاو، نـاوی خـودات هێنـا، ڕۆژی دواتـر دۆزیتەوە، نەکەوتبوە ناو ئاوەوە – چونکە نازانی ئاوەکە خنکاندویەتی یان تیرەکـەی تـۆ کوشتویەتی – ، وە بەس شوێنی تیرەکەی تۆی پێوە بوو ئەوە لە گۆشتی نێچـیرەکە بخـۆ، ئەگەر لەڕاوی نێچیرەکەدا سەگی تر تێکەڵی سەگە ڕاوکەرە ڕاهێنراوەکەی تـۆ بـوو ئـەوە لەگۆشتی ئەو نێچیرە مەخۆ، چونکە تۆ نازانی لەوانەیە ئەو سەگەی تر کوشـتبێتی – وە لەکاتی ئاڕاستەکردنیدا ناوی خوا نەهێنرابێت – ).

**٢٨٥٠ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَالَ: (إِذَا وَقَعَتْ رَمِيَّتُكَ فِي مَاءٍ فَغَرِقَ فَمَاتَ فَلاَ تَأْكُلْ).**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر نێچیرەکەت پێکاو کەوتە ناو ئاوەوەو نقوم بوو مرداربووەوە مەیخۆ).

**٢٨٥١ - (صحيح إلا قوله: (أَوْ بَازٍ) فإنه منكر) عن عدي ابن حاتم، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَا عَلَّمْتَ مِـنْ كَلْـبٍ أَوْ بَازٍ، ثُمَّ أَرْسَلْتَهُ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكَ عَلَيْكَ). قُلْتُ: وَإِنْ قَتَلَ؟ قَالَ: (إِذَا قَتَلَهُ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ شَـيْئًا فَإِنَّمَـا أَمْسَكَهُ عَلَيْكَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: الْبَازُ إِذَا أَكَلَ فَلاَ بَـأْسَ بِـهِ، وَالْكَلْبُ إِذَا أَكَلَ كُرِهَ، وَإِنْ شَرِبَ الدَّمَ فَلاَ بَأْسَ بِهِ.**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو سەگە یان ئـەو بـازەی کـە ڕایـدەهێنیت لەسـەر ڕاوکـردن، لەپاشـدا

ئاراستەی نێچیری دەکەیت، ناوی خودات لەسەر هێنا، لەگۆشتی نێچیرەکە بخۆ بە مەرجێ بۆ تۆی راو بکات)، وتم: ئەگەر بیکوژێت و مرداریش بوبێتەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ، ئەگەر بیکوژێت و مرداریش بوبێتەوەو هیچی لێی نەخواردبێ بیخۆ چونکە بۆ تـۆی راوکـردوە). ئەبو داود دەڵێت: ئەگەر باز لێشی بخوات هیچی تێدا نیەو خـواردنی گۆشـتی نێچـیرەکە دروستە، بەڵام ئەگەر سەگ لێی بخوات کەراهەتی هەیە، بەڵام ئەگـەر سـەگەکە لەخوێنـە رژاوەکەی بخوات هیچی تێدا نیە.

**٢٨٥٢ - (منكر) عن أبو ثعلبة الخشني قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَيْدِ الْكَلْبِ: (إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ، فَكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ، وَكُلْ مَا رَدَّتْ عَلَيْكَ يَدَاكَ).**

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی نێچیرێ کە سەگ راوی بکات فەرموویەتی: (ئەگـەر سـەگە راوکـەرە راهێنراوەکەت ئاراستەی نێچیرەکە کردو، ناوی خودات هێنا، بیخۆ، بـا لێشـی بخـوات، هەر شتێك تەنها بەدەستی خۆت راوی بکەیت بیخۆ).

**٢٨٥٣ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَدُنَا يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَقْتَفِي أَثَرَهُ الْيَوْمَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ، ثُمَّ يَجِدُهُ مَيِّتًا وَفِيهِ سَهْمُهُ أَيَأْكُلُ؟ قَالَ: (نَعَمْ إِنْ شَاءَ). أَوْ قَالَ: (يَأْكُلُ إِنْ شَاءَ).**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یەکێ لەئێمە ئەگەر تیری گرتە نێچیرێك و پێکای شـوێنی هەڵـدەگرێ، لـەپاش دوو سێ ڕۆژ بەمردوویی دەیدۆزێتەوە کە هێشتا تیرەکەی ئەوی پێوەیە ئایا لە گۆشتەکەی

بخوات یان نا؟ فەرمووی: (بەڵێ، گۆشتی نێچیرەکە حەلاڵە ئەگەر ویستی بیخوات، ئەگەر ویستیشی نەیخوات).

**٢٨٥٤ - (صحيح) عن عدي ابن حاتم قال: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْمِعْرَاضِ فَقَالَ: (إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّهُ وَقِيذٌ). قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي. قَالَ: (إِذَا سَمَّيْتَ، فَكُلْ، وَإِلاَّ فَلاَ تَأْكُلْ، وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ لِنَفْسِهِ). فَقَالَ أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ عَلَيْهِ كَلْبًا آخَرَ؟ فَقَالَ: (لاَ تَأْكُلْ، لأَنَّكَ إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ).**

واتە: لە عەدی کوڕی حاتیمەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دەربارەی نێچیرێ کە بە (معراض)[1] راوبکرێت پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: (ئەگەر ناوی خوات لەسەر هێنابێ و، لەسەر باری تیژی لێی دابێت ئەوە گۆشتەکەی حەلاڵەو لێی بخۆ، بەلاّم ئەگەر لەسەر باری پانی لێی دابێت مەیخۆ چونکە ئەوە بە زەبر مرداربۆتەوە). وتم: سەگە راهێنراوەکەم ئاراستەی نێچیر دەکەم؟ فەرمووی: (ئەگەر ناوی خودات هێنا، بیخۆ، ئەگینا لێی مەخۆ، ئەگەر سەگەکە خۆشی لێی خوارد هەر مەیخۆ، چونکە ئەوە بۆ خۆی گرتوە). وتی: ئەگەر سەگەکەی خۆمم ناردو سەگێکی ترم بینی لەگەڵی؟ فەرمووی: (نەخێر لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خودات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە نەك لەسەر سەگێکی تر).

---

[1] - (معراض) بریتیە: لە تیرێکی بێ پەڕ یان تەختەیەکی قورسە یا دار عەصایە ئاسنێك بەسەرەکەیەوەتی یان جگە لە ئاسن.

**٢٨٥٥ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني قال: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّى أَصِيدُ بِكَلْبِى الْمُعَلَّمِ وَبِكَلْبِى الَّذِى لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ، قَالَ: (مَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ، فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، وَكُلْ، وَمَا اصَّدْتَ بِكَلْبِكَ الَّذِى لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ).**

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من راو دەکەم بە سەگە راهێنراوەکەم و سەگە رانەهێنراوەکەشم، فەرمووی: (ئەوەی بە سەگە راهێنراوەکەت راوی دەکەیت، ناوی خوای لێ بێنەو، بیخۆ، ئەوەشی بە سەگە رانەهێنراوەکەت راوی دەکەیت، ئەگەر بە زیندویی فریای کەوتی سەری ببڕەو بیخۆ بەڵام ئەگەر مرداربوبوەوە مەیخۆ).

**٢٨٥٦ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني قال: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا أَبَا ثَعْلَبَةَ كُلْ مَا رَدَّتْ عَلَيْكَ قَوْسُكَ وَكَلْبُكَ). زَادَ عَنِ ابْنِ حَرْبٍ: (الْمُعَلَّمُ وَيَدُكَ فَكُلْ ذَكِيًّا وَغَيْرَ ذَكِيٍّ).**

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خوشەنییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (ئەی ئەبا (پعلبە) هەر شتێك کەوانەکەت و سەگە راوکەرەکەت بۆت بگێرێتەوە دروستە خواردنی). ئیبنو حەرب ئەمەی بۆ زیاد کرد: (هەر شتێك بە سەگە راوکەرەکەت و بەدەستی خۆت واتە بە کەوانەکەت راوی بکەیت بیخۆ، (ذكيا وغير ذكي) (ذكي) واتە: ئەگەر فریای کەوتی بە زیندویی و سەرت بڕی، (غير ذكي) واتە: ئەگەر فریای نەکەوتی و مرداربووبوەوە، بەڵام تیری بەر کەوتبێ و بریندار کردبێت، یان سەگی راهێنراو راوی کردبێ و بریندار کردبێت بەهۆی ئەوەوە مرداربوبێتەوە).

٢٨٥٧ - (حسن ولكن قوله: (وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ) منكر) عن أبو ثعلبة قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي كِلاَبًا مُكَلَّبَةً فَأَفْتِنِي فِي صَيْدِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنْ كَانَ لَكَ كِلاَبٌ مُكَلَّبَةٌ فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ). قَالَ: ذَكِيًّا أَوْ غَيْرَ ذَكِيٍّ؟ قَالَ: (نَعَمْ). قَالَ: فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ؟ قَالَ: (وَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفْتِنِي فِي قَوْسِي، قَالَ: (كُلْ مَا رَدَّتْ عَلَيْكَ قَوْسُكَ). قَالَ: ذَكِيًّا أَوْ غَيْرَ ذَكِيٍّ. قَالَ: وَإِنْ تَغَيَّبَ عَنِّي؟ قَالَ: (وَإِنْ تَغَيَّبَ عَنْكَ، مَا لَمْ يَصِلَّ أَوْ تَجِدَ فِيهِ أَثَرًا غَيْرَ سَهْمِكَ). قَالَ: أَفْتِنِي فِي آنِيَةِ الْمَجُوسِ إِنِ اضْطُرِرْنَا إِلَيْهَا، قَالَ: (اغْسِلْهَا وَكُلْ فِيهَا).

واته: لە ئەبو (ثعلبة)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، من سەگی ڕاهێنراوی ئازاو هەڵمەت بەرم هەیە، ئەگەر نێچیری گرت گۆشتەکەی حەڵاڵە یان نا؟ فەرمووی: (ئەگەر سەگی ڕاهێنراوی ئازاو هەڵمەت بەرت هەبوو، ئەوەی بۆ تۆی ڕاو دەکات لێی بخۆ)، وتی: (ذكيا وغير ذكي) (ذكي) واتە: ئەگەر فریای کەوتی بە زیندویی و سەرت بڕی، (غير ذكي) واتە: ئەگەر فریای نەکەوتی و مرداربووبووەوە، بەڵام تیری بەر کەوتبێ و برینداری کردبێت، یان سەگی ڕاهێنراو ڕاوی کردبێ و برینداری کردبێت بەهۆی ئەوەوە مرداربوبێتەوە). پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: ئەگەر لێشی بخوات؟ فەرمووی: (ئەگەر لێشی بخوات) — بەڵام بەهۆی ئەوەوە لێی بخوات کە چاوەڕوانی خاوەنەکەی زۆر بکات و پێویستی بە خواردن بێت - . وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر بە کەوانەکەم ڕاوی بکەم گۆشتەکەی حەڵاڵە یان نا؟ فەرمووی: (هەر شتێك کەوانەکەت بۆت بگێڕێتەوە دروستە خواردنی).

وتی: (ذكيا وغير ذكـي). وتی: ئەی ئەگەر لێم ون بوو؟ فەرمووی: (ئەگـەر لێـت ون بـوو كاتیٚ كە دۆزیتەوە بیخۆ، ئەگەر بۆگـەنی نـەكردبو، هـەروەها ئەگـەر شـوێنی جگـە لـە تیرەكەی تۆی پێوە نەبوو). وتی: ئەی پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەگـەر ناچـار بووم دەفر و قاپ و قاچاخی ئاگرپەرستەكان بەكاربهێنم و خواردنیان تێدا بخۆم حەڵاڵە یان نا؟ فەرمووی: (بیشۆ و خواردنی تێدا بخۆ).

## سەبارەت بە نیچیریٚ كە پارچەیەكی لیٚ بڕابێت بەزیندویی ئایا حوكمی ئەو پارچە گۆشتە چییە، حەڵاڵە یان نا؟

## ٣ – باب فِي صَيْدٍ قُطِعَ مِنْهُ قِطْعَةٌ.

**٢٨٥٨ – (صحيح) عن أبو واقد قال: قال النبي صلى الله عليـه وسـلم: (مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ).**

واتە: لە ئەبو واقیدەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (ئەوەی لە ئاژەڵی زیندو ببڕدرێت ئەوە مردارەوە بووە).

## باسی سەبارەت بە سەرقاڵ بوون بە راوکردنەوە

## ٤ - باب فِي اتِّبَاعِ الصَّيْدِ.

**٢٨٥٩ - (صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما، عن النبي صلى الله عليه وسلم - وقال مرة سفيان: ولا أعلمه إلا عن النبي صلى الله عليه وسلم - قال: (مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ جَفَا، وَمَنِ اتَّبَعَ الصَّيْدَ غَفَلَ، وَمَنْ أَتَى السُّلْطَانَ افْتُتِنَ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی - (مرە سفيان) دەڵێت: پێ نازانم کە جگە لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتبێ، فەرمووی: (کەسێ لەچۆڵەوانی نیشتەجێ بێت تەبیعەتی توند دەبێت و نەرم و نیان نابێت، کەسێك شوێن راو و شکار بکەوێت غافڵ و بێ ئاگا دەبێت لە نوێژ و پەرستشەکانی تر کاتەکانی بەفیڕۆ دەڕوات، کەسێکیش هاتوچۆی پاشا و فەرمانڕەوا بکات بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی دونیایی سەرەنجام گیرۆدەو گرفتار دەبێت و توشی بەلا دەبێت لەدین و دونیایدا).

**٢٨٦٠ - (ضعيف) عن أبي هريرة، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَى مُسَدَّدٍ، قَالَ: (وَمَنْ لَزِمَ السُّلْطَانَ افْتُتِنَ). زَادَ: (وَمَا ازْدَادَ عَبْدٌ مِنَ السُّلْطَانِ دُنُوًّا، إِلاَّ ازْدَادَ مِنَ اللَّهِ بُعْدًا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە فەرموودەکەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، واتە وەك فەرموودەکەی موسەددەد، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (کەسێ

پەیوەست بێ بە پاشا و فەرمانڕەواوە بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی دونیایی و یارمەتیدانی لەسەر زوڵم و ستەم کردن سەرەنجام گیرۆدەو گرفتار دەبێت و توشی بەڵا دەبێت لەدین و دونیایدا). راوی ئەمەشی بۆ زیاد کرد: (بەندە هەتا زیاتر لە پاشا و فەرمانڕەوا نزیك بێتەوە، ئیللا زیاتر لەخوای گەورە دووردەکەوێتەوە).

**٢٨٦١ - (صحيح) عن أبو ثعلبة الخشني قال: عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَأَدْرَكْتَهُ بَعْدَ ثَلاَثِ لَيَالٍ وَسَهْمُكَ فِيهِ فَكُلْهُ مَا لَمْ يُنْتِنْ).**

واتە: لە ئەبو (ثعلبة)ی خەشەنییەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر نێچیرەکەت پێکا لەپاش سێ شەو دۆزیتەوە هێشتا تیرەکەی تۆی پێوە بوو لێی بخۆ ئەگەر بۆگەنی نەکردبوو.

**کۆتایی کتێبی ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی.**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای کتێبی راسپێرییەکان.

# ١٢ – أول كتاب الوصايا.

## ئەوەی سەبارەت بە فەرمانکردن بە راسپێری هاتووە.

## ١ – باب مَا جَاءَ فِيمَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ الْوَصِيَّةِ.

٢٨٦٢ - (صحيح) عن عبد الله - يعني ابن عمر - : عن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: (مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه) – واتە: ئیبنو عومەر – ەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (ئەگەر موسوڵمانێك شتێکی هەبێت بیەوێت راسپێریی بکات، هەق وایە دوو شەوی بەسەردا تێ نەپەڕێت وەسیەتنامەکەی بە نوسراوی لە لای خۆی دانێ).

**٢٨٦٣ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا وَلاَ بَعِيرًا وَلاَ شَاةً، وَلاَ أَوْصَى بِشَيْءٍ.**

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نە دینار و نە درهەم و نە وشتر و نە مەڕی لەپاش بەجێما، وەسیەتیشی بە هیچ شتیّ نەكرد ئەوەی كە پەیوەندی بە ماڵ و سامانەوەیە.

## باسی ئەوەی كە هاتوە دەربارەی ئەو ڕاسپێرییەی كە دروست نیە كەسیّ بیكات لەماڵەكەیدا.

## ٢ - باب مَا جَاءَ فِيمَا لاَ يَجُوزُ لِلْمُوصِي فِي مَالِهِ.

**٢٨٦٤ - (صحيح) عن عامر بن سعد، عن أبيه، قال: مَرِضَ مَرَضًا - قَالَ ابْنُ أَبِي خَلَفٍ - بِمَكَّةَ - ثُمَّ اتَّفَقَا - أَشْفَى فِيهِ، فَعَادَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلاَّ ابْنَتِي، أَفَأَتَصَدَّقُ بِالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: (لاَ). قَالَ: فَبِالشَّطْرِ؟ قَالَ: (لاَ). قَالَ: فَبِالثُّلُثِ؟ قَالَ: (الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَتْرُكَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً إِلاَّ أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ). قُلْتُ: يَا**

رَسُولَ اللَّهِ، أَتَخَلَّفُ عَنْ هِجْرَتِي؟ قَالَ: (إِنَّكَ إِنْ تُخَلَّفْ بَعْدِي، فَتَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحًا تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللَّهِ، لاَ تَزْدَادُ بِهِ إِلاَّ رِفْعَةً وَدَرَجَةً، لَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ، حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ، وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ). ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ) يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ.

واته: لە عامری کوڕی سەعدەوە، لەباوکیەوە - واتە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص - ، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: نەخۆشکەوتم خەریك بوو بمرم — ئیبنو ئویەی کوڕی خەڵەف وتی: - لە مەککە — ئینجا هەردوو راوی یەکدەنگن - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەردانی کرد، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە، تەنیا کچێکیشم هەیە کە میراتم لێ بگرێت، ئایا دوو بەش لە سێ بەشی ماڵەکەم نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (نەء). وتی: ئەی نیوەی نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (نەو). وتی: ئەی سێ یەکی نەکەم بە خێر؟ فەرمووی: (سێ یەك دەبێ، سێ یەکیش زۆرە، چونکە تۆ لەپاش مردنت میراتبەرەکانت بە دەوڵەمەندی و تێر و تەسەلی بەجێ بهێڵیت گەلێ لەوە باشترە بەهەژاری بەجێیان بهێڵی و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، ئەوەش بزانە هەرچی بیبەخشیت و خەرجی بکەی لەبەر رەزامەندی خوای گەورە ئەوە پاداشتی باشی لەسەر وەردەگری، تەنانەت ئەو پاروەش کە بەرزی دەکەیتەوەو دەیکەیت بەدەمی هاوسەرەکەتەوە — ئەو خەرجی و مەسرەفەی کە دەیکەیت بۆ خاو خێزانی خۆت -)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەترسم لەمەککە بمرم و لەگەڵ ئێوە نەگەڕێمەوە بۆ مەدینە ئەوەش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ پاداشتی کەمترم دەستکەوێت، فەرمووی: (لەدوای وەفاتی من تۆ دەمێنیی، هەر کاروکردەوەیەکی چاك بکەیت لەبەر

ڕەزامەندی خوای گەورە — لە جیهاد و بەخشین - بەو کردەوە چاکە پلەوپایەت بەرزدەبێتەوە لەلای خوا، ئومید دەکەم کە جاریٚ نەمری لەدوای وەفاتی من بژیت هەتا گەلانی موسوڵمان سودی دین و دونیات لێ ببینن و خوای گەورە بتکاتە مایەی خێر و خۆشی بۆیان و، ببی بەهۆی شکستی و زیان بۆ کافران — ئەوەبو ژیا سەرکردایەتی جەنگی قادسیەی کردو زیانێکی زۆری گەیاند بە فارسە ئاگرپەرستەکان، عێراقی رزگار کردو خەڵکانێکی زۆر لەسەر دەستی ئەو موسوڵمان بوون - ). لەپاشدا فەرمووی: (خودایە کۆچی هاوەڵانم تاسەربێ و قبوڵ بێ لە مەدینە (دار الهجرە) بمرن، لێی پاشگەز نەبنەوە، بەڵام هەژار سەعدی کوڕی خەولە) لە مەککە مرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەزەیی پێدا هاتەوە.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی ناپەسەندی زیان گەیاندن بە میراتبەرەکان.

## ٣ - باب مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الإِضْرَارِ فِي الْوَصِيَّةِ.

٢٨٦٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: (أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ حَرِيصٌ، تَأْمُلُ الْبَقَاءَ، وَتَخْشَى الْفَقْرَ، وَلاَ تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ، قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کام خێر و بەخشینە باشترین و گەورەترە؟ فەرمووی: (باشترین بەخشین ئەوەیە لەکاتی لەش ساغی و حەزت لەماڵی دونیا بێت بیبەخشێت، کاتێ کە بە هیوای ژیانی و، لە هەژاری دەترسیت و، هیوات بە ژیان و دەوڵەمەندی هەیە، کەمتەرخەمی مەکە هەتاکو گیان دەگاتە بینەقاقات و دەکەویتە گیانەڵڵا، ئەوکاتە بڵێی: ئەوە بۆ فلان و، ئەمە بۆ فلان، لەکاتێکدا کە ئەو ماڵە بۆتە موڵکی خەڵکی تر واتە میرات بەرەکان).

**٢٨٦٦ - (ضعيف) عن أبي سعيد الخدري، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لأَنْ يَتَصَدَّقَ الْمَرْءُ فِي حَيَاتِهِ بِدِرْهَمٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِمِائَةٍ عِنْدَ مَوْتِهِ).**

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وت: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کام خێر و بەخشینە باشترین و گەورەترە؟ فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەژیانیدا درهەمێ ببەخشێت، چاکترە بۆی لەوەی کە لەکاتی سەرەمەرگدا سەد درهەم ببەخشێت).

**٢٨٦٧ - (ضعيف) عن أبي هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ وَالْمَرْأَةَ بِطَاعَةِ اللَّهِ سِتِّينَ سَنَةً ثُمَّ يَحْضُرُهُمَا الْمَوْتُ فَيُضَارَّانِ فِي الْوَصِيَّةِ، فَتَجِبُ لَهُمَا النَّارُ). قَالَ: وَقَرَأَ عَلَيَّ أَبُو هُرَيْرَةَ مِنْ هَا هُنَا: (مِنْ بَعْدِ**

وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ) حَتَّى بَلَغَ (وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پیاو یان ژنێ شەست ساڵ گوێڕایەڵی خوای گەورە دەکەن، لەپاشدا لەکاتی سەرەمەرگدا وەسیەتێك دەکەن کە زیان بە میراتگرەکان دەگەیەنێت بە هۆیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە). ئەبو هورەیرە لێرەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە بەسەرما: (مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾). سورة النساء: ١٢- ١٣.

واتە: لەپاش (دەرکردنی) وەسیەتێك کە کرابێت یان قەرزێك کە (وەسێتەکە یاقەرزەکە بۆ میراتگران) بێ زیان بێ، ئەمە بڕیارە لەلایەن خواوە، خواش زانای لەسەرخۆیە. ئەو (یاسایانە) سنوورەکانی خودان، هەر کەسێك گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت، (خوا) دەیخاتە ناو بەهەشتانێك کەرووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی، وە ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی قبوڵكردنی وەسیەت لەلایەن وەسیەت بۆ كراوەكانەوە.

## ٤ – باب مَا جَاءَ فِي الدُّخُولِ فِي الْوَصَايَا.

٢٨٦٨ - (صحيح) عن أبو ذر قال: قال لي رسول الله صلى الله عليه وسلم: (يَا أَبَاذَر إِنِّي أَرَاكَ ضَعِيفًا، وَإِنِّي أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي، فَلاَ تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ، وَلاَ تَوَلَّيَنَّ مَالَ يَتِيمٍ).

واتە: لە ئەبو (ذر)ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: (ئەی ئەبو (ذر) دەبینم تۆ پیاوێكی لاوازی، ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە، مەبەرە بەرپرسیاری دوو كەس، وە سەرپەرشتی ماڵی هەتیویش مەكە).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی (نسخ)ی وەسیەتكردن بە باشی بۆ دایك و باوك و كەسوكار.

## ٥ – باب مَا جَاءَ فِي نَسْخِ الْوَصِيَّةِ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ.

٢٨٦٩ - (حسن صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما: (إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ) فَكَانَتِ الْوَصِيَّةُ كَذَلِكَ حَتَّى نَسَخَتْهَا آيَةُ الْمِيرَاثِ.

واتە: ئیبنو عەباس رەزای خوایان لیّ بیّ دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ). سورة البقرة: ١٨٠. واتە: - كاتێ یەكێكتان لەسەرەمەرگدا بوو — ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێما، وەسیەتكردن بە باشی بۆ دایك و باوك و خزمان(یَك كە میراتیان بەردەكەوێت) بە جوانی و رێكوپێكی ...

سەرەتا وەسیەت بەم شێوە بوو، هەتاكو ئایەتی میرات (نەسخ)ی كردەوە — كە ئەویش بریتیە لەم ئایەتە: (يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ). سورة النساء: ١١. واتە: خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەكات دەربارەی (میراتی) رۆڵەكانتان بۆ نێرێك هەیە (لەمیرات) بەوێنەی بەشی دوو مێ.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی وەسیەت بۆ میراتبەرەكان.

## ٦ - باب مَا جَاءَ فِي الْوَصِيَّةِ لِلْوَارِثِ.

**٢٨٧٠ - (حسن صحيح) عن أبو ئومامة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِى حَقٍّ حَقَّهُ فَلاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ).**

واتە: لە ئەبو ئومامەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خوای گەورە هەقی هەموو مافدارێكی داوە، بۆیە دروست نیە وەسیەت بكرێت بۆ میراتگر).

## باسی تێکەڵی هەتیو لە خواردندا.

## ٧ - باب مُخَالَطَةِ الْيَتِيمِ فِي الطَّعَامِ.

٢٨٧١ - (حسن) عن ابن عباس قال: لَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ) وَ (إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا) الآيَةَ: انْطَلَقَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ يَتِيمٌ فَعَزَلَ طَعَامَهُ مِنْ طَعَامِهِ وَشَرَابَهُ مِنْ شَرَابِهِ، فَجَعَلَ يَفْضُلُ مِنْ طَعَامِهِ فَيُحْبَسُ لَهُ حَتَّى يَأْكُلَهُ أَوْ يَفْسُدَ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ). فَخَلَطُوا طَعَامَهُمْ بِطَعَامِهِ وَشَرَابَهُمْ بِشَرَابِهِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خوای گەورە ئەم دوو ئایەتەی ناردەخوارەوە: (وَلَا تَقْرَبُواْ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ) سورة الأنعام: ١٥٢. واتە: وە نزیکی ماڵی هەتیوان مەکەونەوە مەگەر بەو شێوەی کەجوانترو چاکتر بێت.

(إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾) سورة النساء: ١٠. واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ماڵی هەتیوەکان دەخۆن بە

ستەم و نارەوا، بەڕاستی ئەوانە لەسکی خۆیـان ئـاگر دەخـۆن، لەمــەوپاش دەچـنە نـاو ئاگرێکی بەتین و هەڵگیرساوەوە.

ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی منداڵی هەتیوی دەکرد خواردن و خوارنەوەی جیادەکردەوە لەخواردن و خواردنەوەی خۆیان، کاتێ کـە خـواردنی خـۆی دەرخـوارد دەدا هەرچـی لـێ دەمایەوە بۆی هەڵدەگرت هەتا لەپاشدا دەیخوارد یان خراپ دەبوو، ئەمەش زۆر قـورس و گران بوو لەسەریان، ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باسکرد، خوای گـەورە لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە:

(وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ) سـورة البقـرة: ٢٢٠.

واتە: لەبارەی هەتیوان (کەچۆن بن لەگەڵیاندا)، بڵێ چاکسازی (تێکەڵاوی کردن) بۆ ئەوان چاکترە، وە ئەگەر تێکەڵ ببن لەگەڵیاندا (قەیناکات چونکە) براتانن.

ئیتر خوارن و خواردنەوەکانیان لەگەڵ یەك تێکەڵ کردەوە.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی سەرپەرشتیاری هەتیو کە ئایا بۆی هەیە شتێ لە ماڵی هەتیو سەرف بکات؟

## ٨ – باب مَا جَاءَ فِيمَا لِوَلِيِّ الْيَتِيمِ أَنْ يَنَالَ مِنْ مَالِ الْيَتِيمِ.

**٢٨٧٢** - (حسن صحيح) عن عمرو بن شعيب، عن أبيـه، عـن جـده: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: إِنِّى فَقِيرٌ لَيْسَ لِى شَىْءٌ، وَلِى يَتِيمٌ. قَالَ: فَقَالَ: (كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ غَيْرَ مُسْرِفٍ، وَلاَ مُبَادِرٍ، وَلاَ مُتَأَثِّلٍ).

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لە باوکیەوە، لەباپیریەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتی: من هەژارم هیچ شتێکم نیە، سەرپەرشتی هەتیوێك دەکەم دەوڵەمەندەو خاوەنی ماڵ و سامانە، فەرمووی: (لەماڵی ئەو هەتیوە بخۆ کە سەرپەرشتی دەکەیت بەرامبەر بەو کارەی کە بۆی دەکەیت بەمەرجێ ئیسراف و زێدەڕۆیی تێدا نەکەیت، ماڵ و سامانەکەی نەخۆیت بە پەلە لەترسی ئەوەی نەوەك گەورە ببێ و لێت وەرگرێتەوە، وە با لە ئەسڵی ماڵەکە نەبێت).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی هەتیوی کەی تەواو دەبێت.

## ٩ – باب مَا جَاءَ: مَتَى يَنْقَطِعُ الْيُتْمُ.

**٢٨٧٣ - (صحيح) عن علي رضي الله عنه قال: حفظت عن رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يُتْمَ بَعْدَ احْتِلاَمٍ، وَلاَ صُمَاتَ يَوْمٍ إِلَى اللَّيْلِ).**

واتە: واتە: لە پێشەوا عەلی کوڕی (أَبِی طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) ئەم فەرمودەیەم لەبەرکردوە: (لەپاش باڵغ بوون هەتیوی نامێنێ، کاتێ کە ئیحتیلام بوو لەخەودا، بێدەنگی و قسەنەکردن بەڕۆژ هەتا شەو لەئیسلامدا دروست نیە – ئەوە عادەتێکی سەردەمی نەفامی بوو – ).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی هەڕەشەکردن لەو کەسانەی کە ماڵی هەتیو دەخۆن.

## ١٠ - باب مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي أَكْلِ مَالِ الْيَتِيمِ.

٢٨٧٤ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِى حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّى يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ).

واتە: لە ئەبو هوردیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خۆتان بەدوور بگرن لە حەوت تاوانە گەورە لەناوبەرەکە). وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو حەوت تاوانە گەورەیە چین؟ فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، سیحرو جادوکردن، کوشتنی کەسێك بەناهەق، خواردنی ماڵی هەتیو بەناهەق، خواردنی سوود(ربا)، پشتکردنە مەیدانی جەنگ لە کاتی روو بەروو بوونەوە لەگەڵ کافرو بێباوەڕان دا، تۆمەتی زینا دانە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاکی ئیماندار کە بێئاگان لێی).

٢٨٧٥ - (حسن) عن عبيد بن عمير، عن أبيه، أنه حدثه — كان له صحبة - أَنَّ رجلا سأله فقالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْكَبَائِرُ؟ فَقَالَ: (هُنَّ تِسْعٌ). فَذَكَرَ مَعْنَاهُ، زَادَ: (وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ

الْمُسْـلِمَيْنِ، وَاسْـتِحْلاَلُ الْبَيْـتِ الْحَـرَامِ قِبْلَـتِكُمْ أَحْيَـاءً وَأَمْوَاتًا).

واتە: لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە، لە باوکیەوە - واتە عومەیری کوڕی قەتادە — عومەیر بۆ عوبەیدی گێڕاوەتەوە — عومەیر هاوەڵێتی پێغەمبەری (صلی الله علیە وسلم) کردوە - کە پیاوێ دەربارەی تاوانە گەورەکان لێی پرسی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) تاوانە گەورەکان کامانەن ؟ فەرمووی: (تاوانە هەرە گەورەکان نۆن) جا راوی بە هەمان مانا فەرموودەی پێشوی گێڕایەوە، بەڵام ئەمەی بۆ زیاد کرد: (ئازاردانی دایك و باوکی موسوڵمان، هەتککردنی قیبلەکەتان ماڵی خوا بە زیندوویی و بە مردوویی وەك کوشتنی خەڵك و بڕینی درختەکانی و راوکردن، بە زیندویی واتە رونەکردنە قیبلە لەنوێژدا، بە مردوویی واتە وەرگێڕانی رووی مردو لە قیبلە).

## باسی دەبێت پێش هەموو شتێك کفن و دفن لەماڵ و سامانی مردو خۆی بێت.

## ١١ – باب مَا جَاءَ فِي الدَّلِيلِ عَلَى أَنَّ الْكَفَنَ مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ.

٢٨٧٦ - (صحيح) عن خباب قال: مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَلَـمْ تَكُنْ لَهُ إِلاَّ نَمِرَةٌ كُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَـهُ خَرَجَـتْ رِجْـلاَهُ، وَإِذَا غَطَّيْنَا رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقَـال رسـول الله صـلى الله

عليه وسلم:(غَطُّوا بِهَا رَأْسَهُ وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الإِذْخِرِ).

واتە: لە خەبابەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا موصعەبی کوڕی عومەیر کوژرا، هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو بێجگە لە (نَمِرَة)بوردەیەکی کورت نەبێت — (نَمِرَة) پۆشاکێکە هێڵی سپی و ڕەشی تێدایە کاتی خۆی عەرەب لەبەریان دەکرد —کاتێ کە سەریمان پێ دادەپۆشی قاچەکانی بەدەرەوە دەبوون، وە کاتێ کە قاچەکانیمان پێ دادەپۆشی سەری بەدەرەوە دەبوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بەبوردەکە سەری داپۆشن و قاچەکانیشی بە (إِذْخِر) داپۆشن - (إِذْخِر) گیایەکی بۆن خۆشە - ).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەگەر کەسێ شتێکی بەخشی بەکەسێکی تر لەپاشدا کەسەکە وەسیەتی بۆ کرد کە دیاریەکە بگێڕێتەوە بۆ خۆی بەمیراتی ئەوە ئیعتیباری هەیەو هیچی تێدا نیە.

## ١٢ – باب مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَهَبُ ثُمَّ يُوصَى لَهُ بِهَا أَوْ يَرِثُهَا.

٢٨٧٧ - (صحيح) عن بريدة: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: كُنْتُ تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّي بِوَلِيدَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، وَتَرَكَتْ تِلْكَ الْوَلِيدَةَ، قَالَ: (قَدْ وَجَبَ أَجْرُكِ وَرَجَعَتْ

إِلَيْكِ فِي الْمِيرَاثِ). قَالَتْ: وَإِنَّهَا مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَيُجْزِئُ - أَوْ يَقْضِي - عَنْهَا أَنْ أَصُومَ عَنْهَا؟ قَالَ: (نَعَمْ). قَالَتْ: وَإِنَّهَا لَمْ تَحُجَّ أَفَيُجْزِئُ - أَوْ يَقْضِي - عَنْهَا أَنْ أَحُجَّ عَنْهَا؟ قَالَ: (نَعَمْ).

واتە: لە بورەیدەوە دەگێرنەوە، کە ئافرەتێ هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: پێشتر کەنیزەکێکی لاوم بەخشی بە دایکم، ئێستا دایکم مردوە کەنیزەکەکەی لەپاش بەجێماوە — ئەگەر بیکەمەوە بە موڵکی خۆم ئایا ئەمە پەشیمان بونەوە نیە لە بەخشین؟ - ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (پاداشتەکەت مسۆگەر کردوەو، کەنیزەکەشت بۆ دەگەڕێتەوە بە میراتی). وتی: دایکم مردوەو مانگێ ڕۆژوو قەرزارە، ئایا بۆی بگرمەوە — یان بۆی بگێڕمەوە — ئەوەی بەسەو خێری دەگات؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: دایکم حەجیشی نەکردوە ئەگەر حەجی بۆ بکەم خێری دەگات ؟ فەرمووی: (بەڵێ).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی کەسێ ماڵ و سامانێ دەکاتە(وقف).

## ١٣ - باب مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يُوقِفُ الْوَقْفَ.

٢٨٧٨ - (صحيح) عن ابن عمر قال: أَصَابَ عُمَرُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ أَصَبْتُ أَرْضًا لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ أَنْفَسَ عِنْدِي مِنْهُ، فَكَيْفَ تَأْمُرُنِي بِهِ؟ قَالَ: (إِنْ

شِئْتَ حَبَّسْتَ أَصْلَهَا وَتَصَدَّقْتَ بِهَا). فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ أَصْلُهَا، وَلاَ يُوهَبُ، وَلاَ يُورَثُ، لِلْفُقَرَاءِ، وَالْقُرْبَى، وَالرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ - وَزَادَ عَنْ بِشْرٍ - وَالضَّيْفِ - ثُمَّ اتَّفَقُوا: لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، وَيُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. زَادَ عَنْ بِشْرٍ: قَالَ: وَقَالَ مُحَمَّدٌ: غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: باوکم لە خەیبەر زەویەکی دەستکەوت ناوی (ثَمْغ) بوو، چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: لە خەیبەر زەویەکم دەستکەوتوە هەرگیزماڵی ئەوەندە نایاب و بەنرخم نەبووە، جا دەربارەی بەخشینی فەرمانم بەچی پێ دەکەیت؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر دەتەوێت ئەسڵەکەی وەقف بکەو داهات و دەرامەتەکەی بکە بەخێر)، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ زەویەکەی کرد بەخێر بەمەرجێ کە نەفرۆشرێت و، نەبەخشرێت و، بە میرات نەبرێت و نەکرێتە موڵکی کەس، بەڵکو داهاتەکەی بۆ هەژاران و، خزمان و، ئازادکردنی کۆیلەو، لەرێگەی خواو، بۆ ڕێبوار سەرف بکرێت — ڕاوی واتە موسەددەد - لەبەشیرەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد: بۆ میوانیش - جا هەردوو ڕاوی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە وتی: ئەو کەسەش کە سەرپەرشتی ئەو وەقفە دەکات گوناهی ناگات ئەگەر بەچاکی لێی بخوات، یان دەرخواردی برادەری خۆی بدات بەڵام لێی پاشەکەوت نەکات و لێی لانەدات). — ڕاوی واتە موسەددەد - لەبەشیرەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد: - ڕاوی واتە ئیبنو عەون - وتی: وە موحەممەد —ی کوڕی سیرین - واتە ئیبنو سیرین- وتی: (وە نەیکات بە موڵکی خۆی).

**٢٨٧٩ - (صحيح وجادة) عن يحيى بن سعيد عن صدقة عمر بن الخطاب رضي الله عنه، قال: نَسَخَهَا لِي عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا مَا كَتَبَ عَبْدُ اللَّهِ عُمَرُ فِي ثَمْغٍ، ... فَقَصَّ مِنْ خَبَرِهِ نَحْوَ حَدِيثِ نَافِعٍ، قَالَ: غَيْرَ مُتَأَثِّلٍ مَالاً، فَمَا عَفَا عَنْهُ مِنْ ثَمَرِهِ فَهُوَ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ. - قَالَ: ... وَسَاقَ الْقِصَّةَ - قَالَ وَإِنْ شَاءَ وَلِيُّ ثَمْغٍ اشْتَرَى مِنْ ثَمَرِهِ رَقِيقًا لِعَمَلِهِ ... ، وَكَتَبَ مُعَيْقِيبٌ، وَشَهِدَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الأَرْقَمِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا مَا أَوْصَى بِهِ عَبْدُ اللَّهِ عُمَرُ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ، إِنْ حَدَثَ بِهِ حَدَثٌ، أَنَّ ثَمْغًا، وَصِرْمَةَ ابْنَ الأَكْوَعِ، وَالْعَبْدَ الَّذِي فِيهِ، وَالْمِائَةَ سَهْمٍ الَّتِي بِخَيْبَرَ، وَرَقِيقَهُ الَّذِي فِيهِ، وَالْمِئَةَ الَّتِي أَطْعَمَهُ مُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْوَادِي، تَلِيهِ حَفْصَةُ مَا عَاشَتْ، ثُمَّ يَلِيهِ ذُو الرَّأْيِ مِنْ أَهْلِهَا: أَنْ لاَ يُبَاعَ، وَلاَ يُشْتَرَى، يُنْفِقُهُ حَيْثُ رَأَى مِنَ السَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ، وَذِي الْقُرْبَى، وَلاَ حَرَجَ عَلَى مَنْ وَلِيَهُ إِنْ أَكَلَ، أَوْ آكَلَ، أَوِ اشْتَرَى رَقِيقًا مِنْهُ.**

واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەربارەی وەقف و خێرەکەی پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (عبد الحميد)ی کوڕی (عبد الله) کوڕی (عبد الله) کوڕی پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ بۆی نوسیم: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ

الرَّحِيمِ) ئەمە ئەو نامەیەیە کە راسپێری عومەرە کە بەندەی خوایەو ئێستا پێشەوای باوەڕدارانە دەربارەی زەوی (ثَمْغ) ... ، جا یەحیای کوڕی سەعید بەسەرهاتی زەویەکەی عومەری وەك فەرموودەکەی نافیع گێڕایەوە واتە وەك فەرموودەی پێشو، وتی: (بەمەرجێ نەیکات بە موڵکی خۆی). ئەوەی مایەوە ببەخشرێت بە بێ نەواو هەژاری داواکەرو داوانەکەر، وتی: یەحیای کوڕی سەعید فەرموودەکەی گێڕایەوە — وتی: ئەوکەسەی کە سەرپەرشتی زەوی (ثَمْغ) دەکات ئەگەر ویستی لە داهاتی بەروبومەکەی کۆیلە بکڕێت بۆ ئیشوکاری زەویەکە ... ،

وە موعەیقیب وەسیەتەکەی عومەری نوسی و (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئەرقەم بوو بە شایەت: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، ئەمە راسپێری عومەرە کە ئێستا بەندەی خوایەو پێشەوای باوەڕدارانە، ئەگەر خۆی شتێکی لێهات واتە ئەگەر مرد، ئەوا زەوی (ثَمْغ) و، باخی صیرمەی کوڕی ئەکوەع و، ئەو بەندەیەی کە کاری تێدا دەکات و، ئەو سەد پشکەی کە لە خەیبەرە و، ئەو کۆیلەیەش کە ئیشی تێدا دەکات، ئەو سەد ویسقە ساڵانەیەش کە موحەممەد لە (الوادی) داویەتی پێی بۆ نانی ساڵێك، ئەمانە هەر هەموویان وەقف بن و دایکی باوەڕداران حەفصەی کچم هەتا ماوە سەرپەرشتیان دەکات، لەدوای ئەویش هۆشیارانی کەسوکاری ئەو: بەمەرجێ کە نەفرۆشرێت و، نەکڕرێت و، چۆن خۆی بە باشی دەزانێت ئاوا داهاتەکەی بۆ بێ نەواو هەژاری داواکەرو داوانەکەر و، بۆ خزمان سەرفی بکات، ئەو کەسەش سەرەوکاری دەکات هیچ گوناهی ناگات ئەگەر لێی بخوات، یان دەرخواردی یەکێکی تری بدات، یان بەندەی پێ بکڕێت بۆ ئەوەی کاری تێدا بکات یان رزگار بکرێت.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی خێرکردن بۆ مردو

## ١٤ – باب مَا جَاءَ فِي الصَّدَقَةِ عَنِ الْمَيِّتِ.

٢٨٨٠ - (صحيح) عن أبو هورةيرة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَشْيَاءَ: مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر کاتێ ئادەمیزاد مرد لە کردەوەکەی دادەبڕێ، تەنها لەم سێ شتەدا نەبێت: خێرێکی بەردەوام، یان زانیاریەك بلاوبکاتەوە سودی لێ وەرگیرێت، یا مندالێکی صالح و چاك دوعای خێری بۆ بکات).

# باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی کەسێ کە بمرێ و وەسیەت نەکات، ئایا ئەگەر خێری بۆ بکرێت خێری دەگات؟

# ١٥ - باب مَا جَاءَ فِيمَنْ مَاتَ عَنْ غَيْرِ وَصِيَّةٍ، يُتَصَدَّقُ عَنْهُ.

**٢٨٨١ - (صحيح) عن عائيشة، أن امرأة قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَلَوْلاَ ذَلِكَ لَتَصَدَّقَتْ وَأَعْطَتْ، أَفَيُجْزِئُ أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (نَعَمْ فَتَصَدَّقِي عَنْهَا).**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە ئافرەتێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: دایکم کوتوپڕ مرد، ئەگەر کوتوپڕ نەمردایە وەسیەتی دەکردو خێری دەکرد، ئایا خێری دەگات ئەگەر من لەجیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگات).

**٢٨٨٢ - (صحيح) عن ابن عباس، أن رجلا قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ، أَفَيَنْفَعُهَا إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا فَقَالَ: (نَعَمْ). قَالَ: فَإِنَّ لِي مَخْرَفًا، وَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا.**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە پیاوێ وتی: ئەی

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتی: دایکم مردوە، ئەگەر من لەجیاتی خۆی خێری بۆ بکەم سودی بۆی دەبێت؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ). وتی: دەی من باخێکم هەیە، ئەوا تۆ بە شایەت بە دەیکەم بەخێر بۆی.

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی کافرێکی شەڕکەر ئەگەر واریسەکانی موسوڵمان بوون لەسەریانە وەسیەتەکەی بۆ جێبەجێ بکەن؟

## ١٦ - باب مَا جَاءَ فِي وَصِيَّةِ الْحَرْبِيِّ يُسْلِمُ وَلِيُّهُ أَيَلْزَمُهُ أَنْ يُنْفِذَهَا.

**٢٨٨٣ - (حسن) عن عمرو بن شعيب، عن أبيه، عن جده، أَنَّ الْعَاصَ بْنَ وَائِلٍ أَوْصَى أَنْ يُعْتَقَ عَنْهُ مِائَةُ رَقَبَةٍ، فَأَعْتَقَ ابْنُهُ هِشَامٌ خَمْسِينَ رَقَبَةً، فَأَرَادَ ابْنُهُ عَمْرٌو أَنْ يَعْتِقَ عَنْهُ الْخَمْسِينَ الْبَاقِيَةَ، فَقَالَ: حَتَّى أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي أَوْصَى بِعِتْقِ مِائَةِ رَقَبَةٍ، وَإِنَّ هِشَامًا أَعْتَقَ عَنْهُ خَمْسِينَ، وَبَقِيَتْ عَلَيْهِ خَمْسُونَ رَقَبَةً، أَفَأُعْتِقُ عَنْهُ؟ فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(إِنَّهُ لَوْ كَانَ مُسْلِمًا فَأَعْتَقْتُمْ عَنْهُ، أَوْ تَصَدَّقْتُمْ عَنْهُ، أَوْ حَجَجْتُمْ عَنْهُ بَلَغَهُ ذَلِكَ).**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە عاصی کوڕی وائیل وەسیەتی کرد، کە سەد بەندەی بۆ ئازاد بکرێت، جا هیشامی کوڕی پەنجای بۆ ئازاد کرد، عەمری کوڕیشی ویستی پەنجاکەی تر ئازاد بکات، وتی: هەتا پرسیار لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکەم کە ئەو کارە بکەم یان نا، هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، باوکم وەسیەتی کردوە بە ئازادکردنی سەد بەندە، هیشامی برام لەجیاتی ئەو پەنجای بەندەی ئازادکردوە، پەنجای ماوە، ئایا منیش ئەو پەنجایەی تری بۆی ئازادکەم؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر موسوڵمان بوایە لەجیاتی ئەو بەندەتان ئازادکردایە، یان چاکەتان بۆ بکردایە، یا حەجتان بۆ بکردایە پێی دەگەیشت و سودی بۆی دەبوو).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی کەسێ بمرێ و قەرزاربێ ماڵ و سامانی هەبێ کە قەرزەکەی بۆ بدەنەوە، خاوەن قەرزەکان قەرزەکەیان دوابخەن وە نەرمونیان بن لەگەڵ واریسەکانی هەتا قەرزەکەیان دەدەنەوە.

## ١٧ - باب مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَمُوتُ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ وَلَهُ وَفَاءٌ يُسْتَنْظَرُ غُرَمَاؤُهُ وَيُرْفَقُ بِالْوَارِثِ.

٢٨٨٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: أَنَّ أَبَاهُ تُوُفِّيَ وَتَرَكَ عَلَيْهِ ثَلاَثِينَ وَسْقًا لِرَجُلٍ مِنْ يَهُودَ، فَاسْتَنْظَرَهُ جَابِرٌ، فَأَبَى، فَكَلَّمَ جَابِرٌ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَشْفَعَ لَهُ إِلَيْهِ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَلَّمَ الْيَهُودِيَّ لِيَأْخُذَ ثَمَرَ نَخْلِهِ

بِالَّذِي لَهُ عَلَيْهِ، فَأَبَى عَلَيْهِ، وَكَلَّمَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُنْظِرَهُ، فَأَبَى.

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێرنەوە، کە باوکی مرد سی وەسق کە دەکاتە شەست مەن(صاع) خورمای پیاوێکی جولەکە قەرزار بوو، داوای لە پیاوە جولەکەکە کرد کە قەرزەکەی دوابخات و مۆڵەتی بدات هەتا قەرزەکەی دەداتەوە، بەڵام جولەکەکە قبولّی نەکرد، جابر لەوبارەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قسەی کرد کە تکای بۆ بکات لەلای، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ پیاوە جولەکەکە قسەی کرد کە بەرهەمی باخە خورماکەی ببات لەجیاتی قەرزەکەی، قبولّی نەکرد، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قسەی لەگەڵ کرد کە قەرزەکەی دوابخات و مۆڵەتی بدات هەتا قەرزەکەی دەداتەوە، هەر قبولّی نەکرد.

## کۆتایی کتێبی وەسیەتەکان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# ١٩ – أول كتاب الفرائض.

# سەرەتای کتێبی بەشە دانراوەکان یان میراتەکان.

## ١ – باب مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ الْفَرَائِضِ.

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە فێربونی زانستی بەشە دانراوەکان

**٢٨٨٥ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمرو بن العاص، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (الْعِلْمُ ثَلاَثَـةٌ، وَمَـا سِـوَى ذَلِـكَ فَهُـوَ فَضْلٌ: آيَةٌ مُحْكَمَةٌ، أَوْ سُنَّةٌ قَائِمَةٌ، أَوْ فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (زانست و زانیاری سێ شـتە جگـە لـەو سـیانە فەزڵـە: ئایـەتێکی موحکـەم و نەسـخ نـەکراوە،یان سـوننەتێکی راوەسـتاو و چەسـپاوە، یـان دابەشکردنێکی دادپەروەرانەیە).

## باسی سەبارەت بە (كلاله) واتە کەسێ بمرێ باوك و باپیر و نەوەی نەبێت.

## ٢ - باب فِي الْكَلاَلَةِ.

٢٨٨٦ - (صحيح) عن جابر قال: مَرِضْتُ فَأَتَانِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُنِي هُوَ وَأَبُو بَكْرٍ مَاشِيَيْنِ، وَقَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَلَمْ أُكَلِّمْهُ فَتَوَضَّأَ وَصَبَّهُ عَلَيَّ فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي وَلِي أَخَوَاتٌ؟ قَالَ: فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمَوَارِيثِ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ).

واتە: لە جابر - ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه) - وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: نەخۆشکەوتم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەبو بەکردا بەپێ هات سەردانی کردم، لەهۆش خۆم چو بوم، قسەم لەگەڵ نەکرد، دەستنوێژی گرت و هەندێ ئاوی دەستنوێژەکەی پژاند لێم بەئاگا هاتمەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چی لە ماڵەکەم بکەم چەند خوشکێکم هەیە، جابر وتی: ئایەتی میراتەکان هاتەخوارەوە: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ).سورة النساء: ١٧٦. واتە: (ئەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) داوای فتوات لێ دەکەن بڵێ خوا فتواتان بۆدەدات دەربارەی کەلالە (کەسێکە نەوەو کوڕو باوكو باپیری نەبێت).

# باسی سەبارەت بە کەسێ کە کوڕی نەبێ و چەند خوشکێکی هەبێت.

## ٣ - باب مَنْ كَانَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أَخَوَاتٌ.

٢٨٨٧ - (صحيح) عن جابر قال: اشْتَكَيْتُ وَعِنْدِي سَبْعُ أَخَوَاتٍ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَفَخَ فِي وَجْهِي، فَأَفَقْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلاَ أُوصِي لأَخَوَاتِي بِالثُّلُثِ؟ قَالَ: (أَحْسِنْ). قُلْتُ: الشَّطْرَ؟ قَالَ: (أَحْسِنْ). ثُمَّ خَرَجَ وَتَرَكَنِي، فَقَالَ: (يَا جَابِرُ، لاَ أُرَاكَ مَيِّتًا مِنْ وَجَعِكَ هَذَا، وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَنْزَلَ فَبَيَّنَ الَّذِي لأَخَوَاتِكَ، فَجَعَلَ لَهُنَّ الثُّلُثَيْنِ). قَالَ: فَكَانَ جَابِرٌ يَقُولُ: أُنْزِلَتْ فِيَّ هَذِهِ الآيَةُ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ).

واتە: لە جابرەوە ی کوڕی (عَبْدُ اللّه)وە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: حەوت خوشکم هەبوو نەخۆشکەوتم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتەژوورەوە بۆلام فوی کرد بە دەم و چاومدا، بەئاگا هاتمەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئایا وەسیەت نەکەم بەوەی سێیەکی ماڵ و سامانەکەم بۆ خوشکەکانم بێت، فەرمووی: (کارێکی زۆر چاك دەکەیت). وتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: (کارێکی زۆر چاك دەکەیت). لەپاشدا رۆشت و بەجێی هێشتم، فەرمووی: (ئەی جابر، پێم وایە بەم نەخۆشیە نامری، خوای گەورە ئایەتی میراتی ناردەخوارەوەو بەشی خوشکەکانتی دیاری کرد لە میرات، دوو بەش لە سێ

بەشی میراتەکەیان بەردەکەوێت). جابر وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە هاتەخوارەوە: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ).سورة النساء: ١٧٦.

**٢٨٨٨ - (صحيح) عن البرّاء بن عازب قال: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ فِي الْكَلاَلَةِ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ).**

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کۆتا ئایەت هاتەخوارەوە دەربارەی (کلالە) ئەم ئایەتە بوو: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ). النساء: ١٧٦.

**٢٨٨٩ - (صحيح) عن البرّاء بن عازب قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ يَسْتَفْتُونَكَ فِي الْكَلاَلَةِ، فَمَا الْكَلاَلَةُ؟ قَالَ: (تُجْزِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ). فَقُلْتُ لأَبِي إِسْحَاقَ: هُوَ مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَدَعْ وَلَدًا وَلاَ وَالِدًا، قَالَ: كَذَلِكَ، ظَنُّوا أَنَّهُ كَذَلِكَ.**

واتە: لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، داوای فتوات لێ دەکەن دەربارەی (کلالە)، (کلالە) چی یە؟ فەرمووی: ئایەتی(الصيف)ت بەسە واتە ئایەتی: (١٧٦)ی سورەتی (النساء). وتم بە ئەبو ئیسحاق: ئەو کەسەیە کە دەمرێ منداڵ و باوکی لەپاش بەجێ نامێنێت، وتی: وایە، وایان زانی وایە.

## ئەوەی هاتوە سەبارەت بە میراتی نەوە.

## ٤ - باب مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الصُّلْبِ.

٢٨٩٠ - (صحيح) عن هزيل بن شرحبيل الأودي قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ فَسَأَلَهُمَا عَنِ ابْنَةٍ وَابْنَةِ ابْنٍ وَأُخْتٍ لأَبٍ وَأُمٍّ، فَقَالاَ: لاِبْنَتِهِ النِّصْفُ، وَلِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ النِّصْفُ - وَلَمْ يُوَرِّثَا ابْنَةَ الاِبْنِ شَيْئًا - وَأْتِ ابْنَ مَسْعُودٍ فَإِنَّهُ سَيُتَابِعُنَا. فَأَتَاهُ الرَّجُلُ فَسَأَلَهُ وَأَخْبَرَهُ بِقَوْلِهِمَا، فَقَالَ: لَقَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَلَكِنِّي سَأَقْضِي فِيهَا بِقَضَاءِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لاِبْنَتِهِ النِّصْفُ، وَلاِبْنَةِ الاِبْنِ سَهْمٌ تَكْمِلَةُ الثُّلُثَيْنِ، وَمَا بَقِيَ فَلِلأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ.

واتە: لە هوزەیلی کوڕی شورحەبیلی ئەودییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ هات بۆلای ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی کوڕی رەبیعە دەربارەی میراتی کچ و کچی کوڕ و خوشکی باوك و دایکی پرسیاری لێ کردن، وتیان: کچەکەی نیوەی بۆ هەیە، خوشکەکەشی نیوەی بۆ هەیە — هیچیان دانەنا بۆ کچی کوڕ— بڕۆ بۆلای ئیبنو مەسعود ئەویش هەروەك ئێمە دەڵێ. پیاوەکە چو بۆلای ئیبنو مەسعود پرسیاری لێ کردو وەڵامەکەی ئەبو موسای ئەشعەری و سەلمانی کوڕی رەبیعەی پێ راگەیاند، وتی: بەڕاستی ئەگەر وابێت دەبێت من رێگەم هەڵەکردبێ و سەرم لێ شێوابێ و لەڕیزی ئەو کەسانەدا نابم کە رێنموونیان وەرگرتووە، بەڵام بڕیار دەدەم بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه

وسلم) بڕیاری لەسەرداوە، بۆ كچەكە نیوە هەیە، بۆ كچی كوڕەكەش شەش یەك هەیە كـە تەواوكەری دوو بەش لە سێ بەشە، هەرچیش مایەوە بۆ خوشكەكەیە.

٢٨٩١ - (حسن لكن ذكر (ثابتِ بْنِ قيسٍ) خطأ، والمحفوظ أنه سعد بن الربيع، كما في الرواية تالية). عن جابر بن عبد الله قـال: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ حَتَّـى جِئْنَـا امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ فِى الأَسْوَاف، فَجَاءَتِ الْمَرْأَةُ بِابْنَتَيْنِ لَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَاتَانِ بِنْتَا ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ قُتِلَ مَعَـكَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَقَدِ اسْتَفَاءَ عَمُّهُمَا مَالَهُمَا وَمِيرَاثَهُمَا كُلَّـهُ، فَلَـمْ يَدَعْ لَهُمَا مَالاً إِلاَّ أَخَذَهُ، فَمَا تَرَى يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَوَاللَّـهِ لاَ تُنْكَحَانِ أَبَدًا إِلاَّ وَلَهُمَا مَالٌ. فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(يَقْضِى اللَّهُ فِى ذَلِكَ). قَالَ: وَنَزَلَـتْ سُـورَةُ النِّسَـاءِ: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ﴾ الآيَةَ، فَقال رسول الله صـلى الله عليـه وسـلم: (ادْعُـوا لِـىَ الْمَـرْأَةَ وَصَـاحِبَهَا). فَقَـالَ لِعَمِّهِمَا: (أَعْطِهِمَا الثُّلُثَيْنِ، وَأَعْطِ أُمَّهُمَا الثُّمُنَ، وَمَا بَقِـىَ فَلَكَ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَخْطَأَ بِشْرٌ فِيهِ إِنَّمَا هُمَا ابْنَتَا سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ، وَثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ قُتِلَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ.

واتە: لە جابری كوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: لەخزمـەت پێغەمبـەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دەرچوین بۆ حەرەمی مەدینە، ئافرەتێ دوو منداڵی خـۆی هێنـا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم دوو كچە كچی (ثابت)ی كوڕی قەیسـن

– راستیەکەی کچی سەعدی کـوڕی ڕەبیـع بـوون راوی فەرموودەکـە بەهەڵـەدا چـووە – باوکیان لە غەزای ئوحوددا لەگەڵ تۆدا بوو کوژرا، ئێستا مامەکەیان هەرچی ماڵیان هەیە بردویەتی بۆ خۆی، هیچی بۆ ئەمان نەهێشتۆتەوە، ئەی پێغەمبەری خـوا (صـلی الله علیه وسلم) تۆ دەڵێی چی؟ سوێند بـە (الله) بـەبێ مـاڵ و دارایـش کـەس نایانخوازێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بۆ ئەم بابەتـە خـوای گـەورە خـۆی بڕیـار دەدات). وتـی: ئـیتر سـورەتی (النسـاء) هاتـەخوارەوە: واتـە: (يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَٰدِكُمۡ ...) سورة النساء: ١١. واتـە: خـودا سـەبارەت بـە منداڵـەکانتان وەسـیەتتان بۆدەکات و ڕێنومایتان دەکات لە بواری میراتگرتنـدا کـە بەشـی نێرینەیـەك ئەنـدازەی بەشی دوو مێینەیە ... .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ژنەکەو مامەی منداڵـەکانم بـۆ بـانگ بکەن). بە مامەکەیانی فەرموو: (دوو سێیەکی ماڵەکـە بـدە بـە دوو کچـەکە، هەشـت یـەکیش بـدەن بـەدایکیان، هەرچـی لـەوان مایـەوە بـۆ تـۆ). ئـەبو داود دەڵێـت: راوی فەرموودەکە بیشر بەهەڵەدا چووە راستیەکەی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیع بـوون، (ثابـت)ی کوڕی قەیس لە ڕۆژی یەمامەدا کوژراوە.

**٢٨٩٢ - (حسن) عن جابر بن عبد الله، أَنَّ امْرَأَةَ سَعْدِ بْنِ الرَّبِيعِ قَالَـتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ سَعْدًا هَلَكَ وَتَرَكَ ابْنَتَيْنِ. وَسَاقَ نَحْوَهُ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَهَذَا هُوَ الصَّوَابُ.**

واتە: لە جابری کـوڕی (عَبْـدُ اللَّـه)وە دەگێڕنـەوە، کـە ژنەکـەی سـەعد وتـی: ئـەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، سەعد کوژرا ئەم دوو کچەی لـەپاش بـەجێماوە، جـا راوی فەرموودەکـەی گێڕایـەوە وەك فـەرموودەی پێشـو. ئـەبو داود دەڵێـت: ئـا ئەمـە راستیەکەیەتی.

٢٨٩٣ - (صحيح) عن الأسود بن يزيد، أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ وَرَّثَ أُخْتًا وَابْنَةً، فَجَعَلَ لِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا النِّصْفَ، وَهُوَ بِالْيَمَنِ، وَنَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَئِذٍ حَيٌّ.

واتە: لە ئەسوەدی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە، کە (معاذ)ی کوڕی جەبەل لەیەمەن میراتی پیاوێکی دابەشکرد بەسەر خوشکێکی و کچێکیدا، بۆ هەریەکەیان نیوەی واتە نیوەی میراتەکەی دا بە کچەکەی، نیوەشی دا بە خوشکەکەی، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەوکاتەدا لەژیاندا بوو.

## باسی سەبارەت بە میراتی داپیرە میراتبەرەکان

## ٥ - باب فِي الْجَدَّةِ.

٢٨٩٤ - (ضعيف) عن قبيصة بن ذؤيب قال: جَاءَتِ الْجَدَّةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ: مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا عَلِمْتُ لَكِ فِي سُنَّةِ نَبِيِّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا فَارْجِعِي حَتَّى أَسْأَلَ النَّاسَ، فَسَأَلَ النَّاسَ، فَقَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْطَاهَا السُّدُسَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: هَلْ مَعَكَ غَيْرُكَ؟ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: مِثْلَ مَا قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ، فَأَنْفَذَهُ لَهَا أَبُو بَكْرٍ. ثُمَّ جَاءَتِ الْجَدَّةُ الأُخْرَى إِلَى عُمَرَ بْنِ

**الْخَطَّابِ رضى الله عنه تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا، فَقَالَ مَا لَكِ فِي كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، وَمَا كَانَ الْقَضَاءُ الَّذِي قُضِيَ بِهِ إِلاَّ لِغَيْرِكِ، وَمَا أَنَا بِزَائِدٍ فِي الْفَرَائِضِ، وَلَكِنْ هُوَ ذَلِكَ السُّدُسُ، فَإِنِ اجْتَمَعْتُمَا فِيهِ، فَهُوَ بَيْنَكُمَا، وَأَيَّتُكُمَا مَا خَلَتْ بِهِ فَهُوَ لَهَا.**

واتە: لە قەبیصەی کوڕی (ذُؤَيْب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: داپیرەیە هاتە لای پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ کرد، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: لە قورئاندا هیچت بۆ دیاری نەکراوە، لەسوننەتی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بۆشت دانرابێ ئاگام لێی نیە، بڕۆرەوە هەتاوەکو پرسیار لە خەڵك دەکەم، پرسیاری کرد، موغیرەی کوڕی شوعبە وتی: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بووم داپیرەیەك هاتە خزمەتی شەش یەکی بۆ دانا، پێشەوا ئەبو بەکر وتی: کەسی ترت لەگەڵدایە بۆ ئەم شایەتیە؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمە هەستا موغیرەی کوڕی شوعبە چی وت ئەویش هەمان قسەی ئەوی گێڕایەوە، ئیتر پێشەوا ئەبو بەکر جێبەجێی کردو شەش یەکی دا بە داپیرەکە.

دواتر داپیرەکەی تر کە دایکی دایکی مردوەکە بوو، هاتە لای پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ کرد، پێشەوا عومەر وتی: لە قورئاندا هیچت بۆ دیاری نەکراوە، ئەو حوکمەش کە کراوە لەسەردەمی ئەبو بەکردا بۆ ئەنکێکی تر بووە، منیش لەخۆمەوە بەشە دانراوەکان زیاد ناکەم، بەڵام تەنها ئەو شەش یەکەیە، جا ئەگەر کۆدەبنەوە تیایدا ئەوە دابەشی بکەن، بەڵام ئەگەر تەنها یەکێکتان داپیرەی ئەو مردوە بێت، ئەوە هەمووی بۆ ئەوە.

**٢٨٩٥ - (ضعيف) عن ابن بريدة، عن أبيه، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَعَلَ لِلْجَدَّةِ السُّدُسَ، إِذَا لَمْ تَكُنْ دُونَهَا أُمٌّ.**

واتە: لە ئیبنو بورەیدەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەش یەکی بۆ داپیرە دادەنا، ئەگەر دایکی مردووەکەی لەگەڵ نەبوو واتە ئەگەر مردووەکە دایکی نەبوو - ئەگەر مردووەکە دایکی هەبوو داپیرە هیچی ناکەوێت - .

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە میراتی باپیرە باوکی باوك.

## ٦ - باب مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الْجَدِّ.

**٢٨٩٦ - (ضعيف) عن عمران بن حصين، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ إِنَّ ابْنَ ابْنِي مَاتَ فَمَا لِي مِنْ مِيرَاثِهِ فَقَالَ: (لَكَ السُّدُسُ). فَلَمَّا أَدْبَرَ دَعَاهُ فَقَالَ: (لَكَ سُدُسٌ آخَرُ). فَلَمَّا أَدْبَرَ دَعَاهُ فَقَالَ: (إِنَّ السُّدُسَ الآخَرَ طُعْمَةٌ). قَالَ قَتَادَةُ: فَلاَ يَدْرُونَ مَعَ أَيِّ شَيْءٍ وَرَّثَهُ. قَالَ قَتَادَةُ: أَقَلُّ شَيْءٍ وَرِثَ الْجَدُّ السُّدُسَ.**

واتە: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە پیاوێ هاتە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: کوڕی کوڕەکەم مردوە، لەمیراتەکەی چی بۆ منە؟ فەرمووی: (بۆ تۆ شەش یەك هەیە — وەك بەشەدانراوەکان -)، کاتێ کە پشتی هەڵکردو ویستی بڕوات

بانگی كرد فەرمووی: (بۆ تۆ شەش یەكێكی تریش هەیە — وەك تەعصیب باوەنێتی بۆ تۆ ماوەتەوە - )، كاتێ كە پشتی هەڵكردووە ویستی بڕوات دیسان بانگی كردەوە فەرمووی: (شەش یەكەكەی تر بەش نیە، زیادە لە هەقی خۆت). قەتادە وتی: نەیاندەزانی لەگەڵ كام لە میراتبەرەكان دەبێ. قەتادە وتی: كەمترین شت باپیرە باوكی باوك شەش یەكی بۆ هەیە.

**٢٨٩٧ - (صحيح) عن الحسن، أن عمر رضي الله عنه قال: أَيُّكُمْ يَعْلَمُ مَا وَرَّثَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْجَدَّ؟ فَقَالَ مَعْقِلُ بْنُ يَسَارٍ: أَنَا، وَرَّثَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ السُّدُسَ. قَالَ مَعَ مَنْ؟ قَالَ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: لاَ دَرَيْتَ، فَمَا تُغْنِي إِذًا؟!.**

واتە: لە حەسەن — ی بەصری - ەوە دەگێڕنەوە، كە پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ وتویەتی: كامتان دەزانن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەندەی میرات داوە بە باپیرە باوكی باوك؟ مەعقیلی كوڕی یەسار وتی: من، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەش یەكی بۆ دادەنا، عومەر وتی: كێی تری لەگەڵ بوو شەش یەكی دایە؟ وتی: نازانم، وتی: كەواتە هەر نەتزانی، دەی ئیتر سودی چی یە؟!.

## باسی سەبارەت بە (الْعَصَبَةِ)میراتگری بەش دیاری نەکراو[1].

## ٧ – باب فِي مِيرَاثِ الْعَصَبَةِ.

٢٨٩٨ - (صحيح) عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(اقْسِمِ الْمَالَ بَيْنَ أَهْلِ الْفَرَائِضِ عَلَى كِتَابِ اللَّهِ، فَمَا تَرَكَتِ الْفَرَائِضُ فَلأَوْلَى ذَكَرٍ).

واتە: (بەپێی قورئانەکەی خوای گەورە بەشە میراتە دیاریکراوەکان بدەن بە خاوەنەکانیان، هەرچی لەوان مایەوە بیدەن بە نزیکترین خزمی مردوەکە بەمەرجێ نێرینە بێت).

## باسی سەبارەت بە میراتی خزمانی دایك.

## ٨ – باب فِي مِيرَاثِ ذَوِي الأَرْحَامِ.

٢٨٩٩ - (حسن صحيح) عن المقدام قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (مَنْ تَرَكَ كَلاًّ فَإِلَيَّ - وَرُبَّمَا قَالَ: إِلَى اللَّهِ وَإِلَى

[1] - مەبەست لەو کەسانەیە کە لەدوای وەرگرتنی میراتگرە بەش دیاری کراوەکان ئەگەر شتێك مایەوە وەری دەگرن ئەگەر نەشمایەوە هیچ, عەصەبە ئەگەر ئەگەر خاوەن بەشی دیاریکراو(ذوي الفروض)یان لەگەڵ نەبوو هەموو میراتەکە دەبەن.

رَسُولِهِ - وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَأَنَـا وَارِثُ مَـنْ لاَ وَارِثَ لَهُ، أَعْقِلُ لَهُ، وَأَرِثُهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَـهُ، يَعْقِـلُ عَنْهُ، وَيَرِثُهُ).

واتە: لە میقدامەوە ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) فەرموویەتی: (هەركەس منداڵ و قەرز و خاوخێزانی بێ دەرەتانی لێ بەجێما من بەرپرسم لێی – پێدەچێ فەرمووی: بۆ خوای گەورە وپێغەمبەرەكەیەتی - هەركەس ماڵی لەپاش بەجێما ئەوە بۆ میرتگرەكانیەتی، من میراتگری كەسێكم میراتگری نەبێت، پارەی خوێنی بۆ دەدەم و، میراتی لـێ دەگـرم، خـاڵیش میراتگـری كەسـێكە كـە میراتگـری نـەبێت، خوێنبایی بۆ دەدات و، میراتی لێ دەگرێ ئەگەر میراتگری نەبێت).

**٢٩٠٠ - (حسن صحيح) عن المقدام الكندي قال: قال رسـول الله صـلى الله عليه وسلم: (أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيْعَةً فَإِلَيَّ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَأَنَـا مَـوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ، أَرِثُ مَالَهُ، وَأَفُكُّ عَانَهُ، وَالْخَالُ مَوْلَى مَنْ لاَ مَوْلَى لَهُ، يَرِثُ مَالَهُ، وَيَفُكُّ عَانَهُ).**

واتە: لە میقدامی كەندییەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیـه وسلم) فەرموویەتی: (من لەپێشترم بۆ هەموو باوەڕدارێ لـەخودی خـۆی، جـا هەركەسـێ مردو قەرز یان خاوخێزانی بێ داڵدەی لەپاش بجێما مـن لێـی بەرپرسـم و قەرزەكـەی بـۆ دەدەمەوەو گوزەرانی خاوخێزانیشی لەسەر خۆمە، هەركەس ماڵی لەپاش بەجێما ئەوە بۆ میرتگرەكانیەتی، من (مولی)سەرپەرشتیاری كەسێكم سەرپەرشتیاری نەبێت، میراتی لێ

دەگرم، دیلی بۆ بەردەدەم، خاڵیش (مولی)سەرپەرشتیاری کەسێکە کە سەرپەرشتیاری نەبێت، ماڵی بە میرات دەگرێ و، دیلی بۆ رزگار دەکات).

**٢٩٠١ - (حسن صحيح) عن المقدام قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(أَنَا وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ، أَفُكُّ عَانِيَهُ، وَأَرِثُ مَالَهُ، وَالْخَالُ وَارِثُ مَنْ لاَ وَارِثَ لَهُ، يَفُكُّ عَانِيَهُ، وَيَرِثُ مَالَهُ).**

واتە: لە میقدامەوە ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی اللہ علیه وسلم) فەرموویەتی: (من میراتگری کەسێکم میراتگری نەبێت دیلی بۆ بەردەدەم، ماڵی بە میرات دەگرم، خاڵیش میراتگری کەسێکە میراتگری نەبێت، دیلی لەدیلی بۆ رزگار دەکات و، ماڵی بە میرات دەگرێ).

**٢٩٠٢ - (صحيح) عن عائشة رضى الله عنها: أَنَّ مَوْلًى لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاتَ وَتَرَكَ شَيْئًا وَلَمْ يَدَعْ وَلَدًا وَلاَ حَمِيمًا، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَعْطُوا مِيرَاثَهُ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ قَرْيَتِهِ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَحَدِيثُ سُفْيَانَ أَتَمُّ. وَقَالَ مُسَدَّدٌ: قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ أَرْضِهِ؟). قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: (فَأَعْطُوهُ مِيرَاثَهُ).**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بەندەیەکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مرد، ماڵێکی لەپاش بەجێما، نە منداڵی هەبوو نەخزمی نزیك، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (میراتەکەی بدەن بە کەسێ کە خەڵکی ناوچەکەی ئەوبێ). ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکەی سوفیان تەواوترە، موسەددەد

وتی: راوی وتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (كەس هەیە لێرە خەڵكی ولاتــی ئەوبێ). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (دە میراتەكەی بدەن بەو).

**٢٩٠٣ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة، عن أبيــه قــال: أَتَــى النَّبِــيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِي مِيرَاثَ رَجُلٍ مِنَ الأَزْدِ، وَلَسْتُ أَجِدُ أَزْدِيًّا أَدْفَعُهُ إِلَيْهِ، قَالَ: (اذْهَبْ فَــالْتَمِسْ أَزْدِيًّا حَوْلاً). قَالَ: فَأَتَاهُ بَعْدَ الْحَوْلِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَــمْ أَجِدْ أَزْدِيًّا أَدْفَعُهُ إِلَيْهِ، قَالَ: (فَــانْطَلِقْ، فَــانْظُرْ أَوَّلَ خُزَاعِــيٍّ تَلْقَاهُ فَادْفَعْهُ إِلَيْهِ). فَلَمَّا وَلَّى قَالَ: (عَلَيَّ الرَّجُلَ). فَلَمَّا جَاءَ قَالَ: (انْظُرْ كُبْرَ خُزَاعَةَ فَادْفَعْهُ إِلَيْهِ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی بورەیدەوە، لەباوكیەوە دەگێڕنەوە، كــە وتویــەتی: پیــاوێ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: میراتی پیاوێكی (ئــەزدی)م لایــە، ئەزدیە نیە هەتا بیدەمێ و بۆی رەوانە بكەم، فەرمووی: (برۆ یەك ســاڵ هــەواڵی بپرســە هەتا دەیدۆزیتەوە یان رێت لە ئەزدیە دەكەوێ بۆی رەوانــە بكــە)، وتــی: لــەپاش ســاڵێ هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەزدیەكم نەدۆزیەوە هەتا میراتەكەی بدەمێ، فەرمووی: (برۆ، سەرنج بدە كاتێ كــە گەیشــتی بــە یەكــەم كەســی خوزاعــەیی میراتەكەی بدەرێ). كاتێ كە پشتی هەڵكرد فەرمووی: (ئــەو پیــاوەم بــۆ بگەڕێننــەوە). كاتێ كە گەڕایەوە فەرمووی: (سەرنج بدە گەورەترین كەسی خوزاعەیت بینی میراتەكــەی بدەرێ).

**٢٩٠٤ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة، عن أبيه قال: مَاتَ رَجُلٌ مِــنْ خُزَاعَةَ، فَأُتِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ بِمِيرَاثِــهِ، فَقَــالَ:**

(الْتَمِسُوا لَهُ وَارِثًا أَوْ ذَا رَحِمٍ). فَلَمْ يَجِدُوا لَهُ وَارِثًا وَلاَ ذَا رَحِمٍ، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(أَعْطُوهُ الْكُبْرَ مِنْ خُزَاعَةَ). قَالَ يَحْيَى: قَدْ سَمِعْتُهُ مَرَّةً يَقُولُ فِى هَذَا الْحَدِيثِ: (انْظُرُوا أَكْبَرَ رَجُلٍ مِنْ خُزَاعَةَ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بورەیدەوە، لەباوکیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێکی خوزاعەیی مرد، میراتەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بگەڕێن بەدوای میراتگرێکی دا یان یەکێ لە خزمانی دایکی). نە میراتگرێ نە یەکێ لە خزمانی دایکیان نەدۆزیەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (بیدەن بە گەورەترین کەسی خوزاعەیی).

٢٩٠٥ - (ضعيف) عن ابن عباس: أَنَّ رَجُلاً مَاتَ وَلَمْ يَدَعْ وَارِثًا إِلاَّ غُلاَمًا لَهُ كَانَ أَعْتَقَهُ، فَقَالَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى الله عليه وسلم:(هَلْ لَهُ أَحَدٌ). قَالُوا: لاَ، إِلاَّ غُلاَمًا لَهُ كَانَ أَعْتَقَهُ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِيرَاثَهُ لَهُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ مرد، میراتگری نەبوو جگە لە غولامێ کە پێشتر ئازادی کردبو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئایا کەسی هەیە میراتی لێ بگرێ؟) وتیان: نەء تەنیا غولامێ نەبێ لەپێش مردنی خۆی ئەویشی ئازاد کردوە، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) میراتەکەی دا بە غولامەکە.

## باسی میراتی منداڵی (لیعان).

## ٩ - باب مِيرَاثِ ابْنِ الْمُلاَعِنَةِ.

**٢٩٠٦ - (ضعيف) عن واثلة بن الأسقع، عن النبى صلى الله عليه وسلم قال: (الْمَـرْأَةُ تُحْـرِزُ ثَلاَثَـةَ مَوَارِيـثَ عَتِيقَهَـا، وَلَقِيطَهَـا، وَوَلَدَهَا الَّذِي لاَعَنَتْ عَنْهُ).**

واتە: لە (وَاثِلَةَ)ی کوڕی ئەسقەعەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میراتی ئەم سێ کەسە بۆ ژنە: ئازادکراوی خۆی، منـداڵی دۆزراوەی خـۆی کە لە لاکۆڵان دەیدۆزێتەوەو بەخێوی دەکات، ئەو منداڵەی کـە بـە هـۆی شـەڕە نـەفرین (لیعان) - ەوە بووە بەهی خۆی).

**٢٩٠٧ - (صحيح) عن مكحول: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مِيرَاثَ ابْنِ الْمُلاَعِنَةِ لأُمِّهِ، وَلِوَرَثَتِهَا مِنْ بَعْدِهَا.**

واتە: مەکحول دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) میراتی منـداڵی لیعـانی دا بە دایکەکەی، وە لەپاش مردنی دایکی میراتەکەی دەدرێت بە میراتبـەرانی دایکـی. - هەروەك خۆشی میرات لەدایکی دەگرێ، میرات لەباوکی ناگرێت - .

**٢٩٠٨ - (صحيح) عن عمر بن شعيب، عن أبيه، عن جده، عَـنِ النَّبِـيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ.**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە فەرموودەی پێشوو بە هەمان شێوە هاتوە.

## باسی ئایا موسوڵمان میرات لە کافر وەردەگرێت.

## ١٠ - باب هَلْ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ.

٢٩٠٩ - (صحيح) عن أسامة بن زيد، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ يَرِثُ الْمُسْلِمُ الْكَافِرَ، وَلاَ الْكَافِرُ الْمُسْلِمَ).

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نە موسوڵمان میرات لە کافر وەردەگرێت، وە نە کافر میرات لە موسوڵمان وەردەگرێت).

٢٩١٠ - (صحيح) عن أسامة بن زيد قال، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ تَنْزِلُ غَدًا فِي حَجَّتِهِ. قَالَ: (وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مَنْزِلاً). ثُمَّ قَالَ: (نَحْنُ نَازِلُونَ بِخَيْفِ بَنِي كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْكُفْرِ). يَعْنِي: الْمُحَصَّبَ، وَذَاكَ أَنَّ بَنِي كِنَانَةَ حَالَفَتْ قُرَيْشًا عَلَى بَنِي هَاشِمٍ: أَنْ لاَ يُنَاكِحُوهُمْ، وَلاَ يُبَايِعُوهُمْ، وَلاَ يُئْوُوهُمْ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَالْخَيْفُ: الْوَادِي.

واتە: لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە حەجی مالآوایی دا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سبەینێ لەکوێ دادەبەزی؟ فەرمووی: (ئایا عەقیلی کوڕی ئەبو (طالب)ی مامم لە مەککە ماڵێکی بۆ دانەناوین — لەو ماڵانەی کە بە میرات لە ئەبو (طالب)ەوە بۆی ماوەتەوە؟ - ). لەپاشدا فەرمووی: (ئێمە لە خەیفی بەنی کینانە دادەبەزین کە هاوپەیمانی قورەیش بوون لەسەر کوفر و بێ باوەڕی). واتە: لە (مُحَصَّب) ، چونکە بەنی کینانە هاوپەیمانی قورەیش بوون لە دژایەتی کردنی بەنی هاشیم دا کە ژنیان نەدەنێ و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن و داڵدەیان نەدەن، راوی فەرمودەکە زوهری دەڵێت: (خیف): واتە شیو.

**٢٩١١ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لاَ يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ شَتَّى).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پەیڕەوانی دوو ئاینی جیاواز میراتی لە یەکتر ناگرن).

**٢٩١٢ - (ضعيف) عن عبد الله بن بريدة، أَنَّ أَخَوَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى يَحْيَى بْنِ يَعْمَرَ: يَهُودِيٌّ وَمُسْلِمٌ، فَوَرَّثَ الْمُسْلِمَ مِنْهُمَا، وَقَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو الأَسْوَدِ، أَنَّ رَجُلاً حَدَّثَهُ، أَنَّ مُعَاذًا حَدَّثَهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الإِسْلاَمُ يَزِيدُ وَلاَ يَنْقُصُ). فَوَرَّثَ الْمُسْلِمَ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللّٰه)ی کوڕی بورەیدەوە دەگێڕنەوە، کە دوو برا کە یەکێکیان جولەکە بوو ئەوی تریان موسوڵمان بوو سکاڵایان بردە لای یەحیای کوڕی یەعمەر، یەحیا میراتی تەنیا بۆ موسوڵمانەکەیان دانا، وە وتی: ئەبو ئەسوەد بۆی گێڕامەوە، لە پیاوێکی ترەوە، لە (معاذ)ەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (ئیسلام زیاد دەکات کەم ناکات). میراتی بۆ موسوڵمانەکەیان دانا.

**٢٩١٣ - (ضعيف) عن أبو الأسود الديلي: أَنَّ مُعَاذًا أُتِيَ بِمِيرَاثِ يَهُودِيٍّ وَارِثُهُ مُسْلِمٌ، بِمَعْنَاهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

واتە: لە ئەبو ئەسوەدی دیلییەوە دەگێڕنەوە، کە - جولەکەیە مرد دوو میراتگری هەبوو: یەکێکیان موسوڵمان بوو، ئەوی تریان جولەکە - (معاذ) میراتی بۆ موسوڵمانەکەیان دانا. جا راوی لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، بە هەمان مانا فەرمودەکەی پێشوی گێڕایەوە.

## باسی ئەوەی لەپێش دابەشکردنی میراتدا موسوڵمان بوە.

## ١١ - باب فِيمَنْ أَسْلَمَ عَلَى مِيرَاثٍ.

**٢٩١٤ - (صحيح) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (كُلُّ قَسْمٍ قُسِمَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَهُوَ عَلَى مَا قُسِمَ لَهُ وَكُلُّ قَسْمٍ أَدْرَكَهُ الإِسْلاَمُ فَهُوَ عَلَى قَسْمِ الإِسْلاَمِ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر ماڵێ كە لەسەردەمی نەزانیدا بەشكرابێ وەك خۆی دەمێنێتەوە، وە هەر ماڵێ كەوتبێتە سەردەمی ئیسلامەوە ئەوە بە حوكمی ئیسلام دابەش دەكرێت).

## باسی سەبارەت بە سەرپەرشتیاریی.

## ١٢ - بابٌ فِي الْوَلاَءِ.

٢٩١٥ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ جَارِيَةً تُعْتِقُهَا، فَقَالَ أَهْلُهَا: نَبِيعُكِهَا عَلَى أَنَّ وَلاَءَهَا لَنَا. فَذَكَرَتْ عَائِشَةُ ذَاكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (لاَ يَمْنَعُكِ ذَلِكَ" فَإِنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە عائیشەی دایكی باوەڕداران رەزای خوای لێ بێ دەیویست كەنیزەكێ بكڕێ و ئازادی بكات، خزمەكانی وتیان: پێت دەفرۆشین بەمەرجێ (الْـوَلاَءَ)سەرپەرشتیاری بۆ خۆمان بێت، عائیشە باسەكەی بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) راگەیاند، فەرمووی: (مامەڵەكەت راست و دروست و تەواوە، بەڵام مەرجەكەی ئەوان پوچە، چونكە (الْـوَلاَءَ)سەرپەرشتیاری بۆ ئەو كەسەیە كە كۆیلەكە ئازاد دەكات).

٢٩١٦ - (صحيح) عن عائيشة رضى الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْطَى الثَّمَنَ، وَوَلِيَ النِّعْمَةَ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (سەرپەرشتیاری(الْوَلاَءَ) بۆ ئەو کەسەیە کە نرخەکەی دەداو، خەڵاتی ئازادی پێ دەبەخشێ).

٢٩١٧ - (حسن) عن عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده: أَنَّ رِئَابَ بْنَ حُذَيْفَةَ تَزَوَّجَ امْرَأَةً، فَوَلَدَتْ لَهُ ثَلاَثَةَ غِلْمَةٍ، فَمَاتَتْ أُمُّهُمْ، فَوَرِثُوهَا رِبَاعَهَا وَوَلاَءَ مَوَالِيهَا، وَكَانَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ عَصَبَةَ بَنِيهَا، فَأَخْرَجَهُمْ إِلَى الشَّامِ، فَمَاتُوا، فَقَدِمَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ، وَمَاتَ مَوْلًى لَهَا، وَتَرَكَ مَالاً لَهُ، فَخَاصَمَهُ إِخْوَتُهَا إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَقَالَ عُمَرُ: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(مَا أَحْرَزَ الْوَلَدُ أَوِ الْوَالِدُ فَهُوَ لِعَصَبَتِهِ مَنْ كَانَ). قَالَ: فَكَتَبَ لَهُ كِتَابًا فِيهِ شَهَادَةُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَرَجُلٍ آخَرَ، فَلَمَّا اسْتُخْلِفَ عَبْدُ الْمَلِكِ اخْتَصَمُوا إِلَى هِشَامِ بْنِ إِسْمَاعِيلَ - أَوْ إِلَى إِسْمَاعِيلَ بْنِ هِشَامٍ - فَرَفَعَهُمْ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ، فَقَالَ: هَذَا مِنَ الْقَضَاءِ

**الَّذِي مَا كُنْتُ أَرَاهُ. قَالَ: فَقَضَى لَنَا بِكِتَابِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَنَحْنُ فِيهِ إِلَى السَّاعَةِ.**

واتە: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە، لەباوکیەوە، لەباپیریەوە دەگێرنەوە، کە ڕیئابی کوڕی (حُذَيْفَة) ژنێکی خواست، سێ منداڵی لێی بوو، دایکیان مرد، ماڵ و خانوبورەکەیان برد بۆ خۆیان لەگەڵ (ولاء)ی بەندە ئازادکراوەکەیان، عەمری کوڕی عاص خزمی منداڵەکانی بوو، لەگەڵ خۆی بردنی بۆ شام، هەموویان لەشام مردن — بە نەخۆشی تاعونی عەمواس - ، عەمری کوڕی عاص لەشام گەڕایەوە، ئەو بەندەیەی کە دایکی منداڵەکان ئازادی کردبو مرد، ماڵەکەی بۆ عەمر بەجێهێشت، براکانی سکاڵایان بردە لای پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ، عومەر وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی کوڕ یان باوك بەدەستی دەهێنن بۆ کەسوکاریەتی هەرکەسێ بن). ڕاوی وتی: عومەر نامەیەکی نوسی بۆ عەمری کوڕی عاص بەشایەتی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف و زەیدی کوڕی (ثابت) و پیاوێکی تر کە (ولاء) بۆ ئەوانە، کاتێ کە (عبد الملك) —ی کوڕی مەروان - بوو بە جێنشین، براکانی ژنەکە سکاڵایان بردە لای هیشامی کوڕی ئیسماعیل - کە کاربەدەستی مەدینە بوو - ئەویش سکاڵاکەیانی بەرزکردەوە بۆ (عبد الملك)، وتی: ئەمە ئەو بڕیارەیە کە منیش وای بۆ دەچم، وتی: (عبد الملك) بە نامەکەی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بڕیاری بۆداین، ئێمەش هەتا ئەم کاتە بەو بڕیارە ڕازین.

## باسی حوکمی شەرع چی یە سەبارەت بە کەسێ لەسەردەستی کەسێکی تر موسوڵمان دەبێت.

## ١٣ – باب فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ.

٢٩١٨ - (حسن صحيح) عن تميم الداري قال: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَقَالَ يَزِيدُ - إِنَّ تَمِيمًا - قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا السُّنَّةُ فِي الرَّجُلِ يُسْلِمُ عَلَى يَدَيِ الرَّجُلِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ؟ قَالَ: (هُوَ أَوْلَى النَّاسِ بِمَحْيَاهُ وَمَمَاتِهِ).

واتە: لە تەمیمی دارییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! وە یەزید وتی: تەمیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)! ئەگەر پیاوێ لەسەردەستی یەکێ لە موسوڵمانان موسوڵمان ببێت چ حەقێکی لەسەری هەیە؟ فەرمووی: (لەژیان و لە مردنی دا لەپێشترین کەسە بۆی).

## باسی سەبارەت بە فرۆشتنی (الولاء).

## ١٤ – باب فِي بَيْعِ الْوَلاَءِ.

٢٩١٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ، وَعَنْ هِبَتِهِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێگری کردوە لە فرۆشتنی سەرپەرشتیاری(الولاء) ، وە لە بەخشینی.

## باسی سەبارەت بە منداڵی تازە لەدایك بوو ئەگەر دەنگی لێوە هات، میرات دەگرێ.

## ١٥ – باب فِي الْمَوْلُودِ يَسْتَهِلُّ ثُمَّ يَمُوتُ.

٢٩٢٠ - (صحيح) عن أبي هريرة، عن النبى صلى الله عليه وسلم قال: (إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر منداڵ لەکاتی لەدایك بووندا دەنگی لێوە هات میراتی دەگرێت).

## باسی هەڵوەشانەوەی میراتی پەیمان بەستن بە میراتی خزم.

## ١٦ – باب نَسْخِ مِيرَاثِ الْعَقْدِ بِمِيرَاثِ الرَّحِمِ.

٢٩٢١ - (حسن صحيح) عن ابن عباس قال: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ) ، كَانَ الرَّجُلُ يُحَالِفُ الرَّجُلَ

لَيْسَ بَيْنَهُمَا نَسَبٌ، فَيَرِثُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، فَنَسَخَ ذَلِكَ الأَنْفَالُ، فَقَالَ تَعَالَى: (وَأُوْلُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ...) سورة النساء: ٣٣. واتە: وە ئەوانەش کەپەیمانتان لەگەڵ گرێ داون (کە میرات لەیەکتربەرن)، ئەوە بەشی خۆیانیان بدەنێ ...

لەپێشدا دوو پیاو دەبوون بە سوێند خۆری یەکتری، بەبێ ئەوەی کە خزمی یەکتر بن، ئیتر بەهۆی بەستنی ئەو پەیمانەوە میراتیان لەیەکتر دەگرت، تا لەپاشدا بەم ئایەتە هەڵوەشایەوە: (وَأُوْلُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ...). سورة الأنفال: ٧٥. واتە: وە ئەوانەی خزمی یەکترن هەندێکیان (بۆ میرات گرتن) شایستە ترن بەهەندێکی تریان ...

٢٩٢٢ - (صحيح) عن ابن عباس في قوله: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ). قَالَ: كَانَ الْمُهَاجِرُونَ حِينَ قَدِمُوا الْمَدِينَةَ تُوَرِّثُ الأَنْصَارَ دُونَ ذَوِي رَحِمِهِ، لِلأُخُوَّةِ الَّتِي آخَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ) قَالَ: نَسَخَتْهَا (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ) مِنَ النُّصْرَةِ وَالنَّصِيحَةِ وَالرِّفَادَةِ، وَيُوصِي لَهُ، وَقَدْ ذَهَبَ الْمِيرَاثُ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لـێ بـێ دەگێرنـەوە، کـە وتویـەتی: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ ...) سورة النساء: ٣٣. واتە: وە ئەوانەش کەپەیمانتان لەگەڵ گرێ داون (کە میرات لەیەکتربەرن)، ئەوە بەشی خۆیانیان بدەنێ ...

وتی: کاتێ کە موهاجرین گەیشتنە شاری مەدینە پێغەمبەری خـوا (صلی الله علیه وسلم) موهاجیرێك و ئەنصارییەکی کـردە بـرای یـەکتر، لەسـەرەتای ئیسـلامەوە موهاجیرەکـە میراتی لە برا ئەنصاریەکە دەگرت لە پێش خزمەکەی، کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ( وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَ ) سورة النساء: ٣٣. واتە: وە دامان ناوە بۆ هەموو (مردوویەك یان میراتێك) چەند میرات گرێك(کە بەشێ ئەگرن) لەوەی کـە دایك و باوك و خزمانیان بەجێیان هێشتووە.

ئیبنـو عـەباس وتـی: بەمـە هەڵوەشـایەوە: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡ ...) سوره النساء٣٣. واتە: وە ئەوانـەش کەپـەیمانتان لەگـەڵ گـرێ داون (کـە میرات لەیەکتربەرن) ئەوە بەشی خۆیانیان بدەنێ.

لە سەرخستن و ئامۆژگاریکردن و یارمەتیدان، وەسیەت بـۆ کردنـی، بـەڵام مـیرات ناگرن میراتەکە بۆ خزمان دەبێت.

**٢٩٢٣ - (ضعيف) عن داود بن الحصين قال: كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَى أُمِّ سَعْدٍ بِنْتِ الرَّبِيعِ، وَكَانَتْ يَتِيمَةً فِي حِجْرِ أَبِي بَكْرٍ، فَقَرَأْتُ: (وَالَّـذِينَ عَاقَـدَتْ أَيْمَـانُكُمْ)، فَقَالَـتْ: لاَ تَقْـرَأْ (وَالَّـذِينَ عَاقَـدَتْ أَيْمَانُكُمْ) وَلَكِنْ: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ) إِنَّمَا نَزَلَتْ فِي أَبِي بَكْرٍ وَابْنِهِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ حِينَ أَبَـى الإِسْـلاَمَ، فَحَلَـفَ أَبُو بَكْرٍ أَلاَّ يُوَرِّثَهُ، فَلَمَّا أَسْلَمَ أَمَرَ اللَّهُ تَعَـالَى نَبِيَّـهُ عَلَيْـهِ**

السَّلَامُ أَنْ يُؤْتِيَهُ نَصِيبَهُ. زَادَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: فَمَا أَسْلَمَ حَتَّى حُمِلَ عَلَى الإِسْلَامِ بِالسَّيْفِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَنْ قَالَ: (عَقَدَتْ) جَعَلَهُ حِلْفًا، وَمَنْ قَالَ: (عَاقَدَتْ) جَعَلَهُ حَالِفًا، قَالَ: وَالصَّوَابُ حَدِيثُ طَلْحَةَ (عَاقَدَتْ).

واتە: لە داودی کوڕی حوصەینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئوم سەعدی کچی رەبیع کە هەتیوێ بوو ئەبو بەکر بەخێوی کرد، ئەم ئایەتەم بەم شێوەیە خوێندەوە: (وَالَّذِينَ عَاقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ)، ئوم سەعد وتی: بەو شێوەیە مەیخوێنەوە، بەڵکو بەم شێوەیە بیخوێنەرەوە: (وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ)، ئەمە دەربارەی پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ و کوڕەکەی (عبد الرحمن) دابەزی لەکاتێکدا کە (عبد الرحمن)ی کوڕی موسوڵمان بوونی قبوڵ نەکرد، پێشەوا ئەبو بەکر سوێندی خوارد کە میراتی نەداتێ چونکە کافر بوو، لەپاشدا (عبد الرحمن) موسوڵمان بوو خوای گەورەش فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کە لەماڵی میراتی بەشی بدات. - (عَاقَدَتْ) و (عَقَدَتْ) ماناکەیان یەکەو خوێندنەوەیان سەلمێنراوە - (عبد العزیز) ئەمەی بۆ زیاد کرد: (عبد الرحمن) موسوڵمان نەبوو هەتا ئیسلام بە هێزی شمشێری سەرکەوت و خەڵك پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلامەوە. ئەبو داود دەڵێت: ئەوەی وتی: (عَقَدَتْ) ئەوە (حِلْفًا)، وە ئەوەی وتی: (عَاقَدَتْ) ئەوە (حَالِفًا). وتی: راستیەکەی فەرموودەکەی (طلحة)یە: (عَاقَدَتْ).

٢٩٢٤ - (حسن صحيح) عن ابن عباس: (ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ) (وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ) فَكَانَ الأَعْرَابِيُّ لاَ يَرِثُ الْمُهَاجِرَ، وَلاَ يَرِثُهُ الْمُهَاجِرُ، فَنَسَخَتْهَا، فَقَالَ: (وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ)

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە: ( إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ ) سورة الأنفال: ٧٢. واتە: بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێناو کۆچیان کرد.

(وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ) سورة الأنفال: ٧٢. واتە: وە ئەوانەی کەبڕوایان هێناوەو کۆچیان نەکردووە بۆ ئێوە نی یە هیچ جۆرە دۆستایەتیەکیان بکەن هەتا کۆچ نەکەن.

لەپێشدا ئەعرابی میراتی لە موهاجیر نەدەگرت، موهاجیریش میراتی لەوان نەدەگرت، تا لەپاشدا بەم ئایەتە هەڵوەشایەوە: (وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ...). سورة الأنفال: ٧٥. واتە: وە ئەوانەی خزمی یەکترن هەندێکیان (بۆ میرات گرتن) شایستە ترن بەهەندێکی تریان .

## باسی سەبارەت بە پەیمان بەستن.

## ١٧ - باب فِي الْحِلْفِ.

**٢٩٢٥ - (صحيح) عن جبير بن مطعم قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ، وَأَيُّمَا حِلْفٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ لَمْ يَزِدْهُ الإِسْلاَمُ إِلاَّ شِدَّةً).**

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە، ئەو پەیمانە ڕەوایانەش کە لەسەردەمی نەزانیدا بەسراون ئیسلام زیاتر بەهێز و پتەویان دەکات).

**٢٩٢٦ - (صحيح) عن عاصم الأحول قال: سمعت أنس بن مالك يقول: حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِنَا، فَقِيلَ لَهُ: أَلَيْسَ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ حِلْفَ فِي الإِسْلاَمِ). فَقَالَ: حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ فِي دَارِنَا، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا.**

واتە: لە عاصیمی ئەحوەلەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە ئەنەسی کوڕی مالیك دەیوت: وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەمەدینە لەماڵەکانی ئێمەدا پەیمانی دۆستایەتی و برایەتی بەست لەنێوان موهاجرین و ئەنصارییەکاندا. پێی وترا: مەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەیفەرموو: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە). ئەنەس دوو جار یان سێ جار وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەمەدینە لەماڵەکانی ئێمەدا پەیمانی دۆستایەتی و برایەتی بەست لەنێوان موهاجرین و ئەنصارییەکاندا.

# باسی دەربارەی ژن میرات دەگرێ لە خوێنبایی مێردەکەی.

## ١٨ – باب فِي الْمَرْأَةِ تَرِثُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا.

٢٩٢٧ - (صحيح) عن سعيد قال: كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَقُولُ: الدِّيَةُ لِلْعَاقِلَةِ، وَلاَ تَرِثُ الْمَرْأَةُ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا شَيْئًا، حَتَّى قَالَ لَهُ الضَّحَّاكُ بْنُ سُفْيَانَ: كَتَبَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ أُوَرِّثَ امْرَأَةَ أَشْيَمَ الضِّبَابِيِّ مِنْ دِيَةِ زَوْجِهَا. فَرَجَعَ عُمَرُ.

واتە: لە سەعیدەوە دەگێڕنەوە کەوتویەتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەیوت: خوێنبایی بۆ خزمانی باوکە، ژن میرات ناگرێ لە خوێنبایی مێردی، هەتا (ضحاك)ی کوڕی سوفیان پێی وت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ نوسیم: بەشە میرات دابنێ بۆ ژنەکەی ئەشیەمی (ضبابي) لەخوێنبایی مێردەکەی. ئیتر پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەقسەکەی خۆی پەشیمان بووەوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

# سەرەتای كتێبی خەراج و دەستكەوتی بەبێ جەنگ و فەرمانڕەوایی.

# ١٤ - أول الكتاب الخراج والفي والإمارة.

## باسی ئەوەی لەسەر فەرمانڕەوایە سەبارەت بە حەقی ژێردەستەكانی

## ١ - باب مَا يَلْزَمُ الإِمَامَ مِنْ حَقِّ الرَّعِيَّةِ.

٢٩٢٨ - (صحيح) عن عبد الله بن عمر، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِى عَلَى النَّاسِ رَاعٍ عَلَيْهِمْ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ وَهِىَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ).

واتە: لە (عَبْدُ اللَّـه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (واتە: (ئاگاداربن ئێوە هەمووتان شوانن و چاودێرن وە هەمووتان بەرپرسن لەژێردەستەکانتان، پێشەوا شوان و چاودێرە بەسەر خەڵکەوەو بەرپرسە لێیان، پیاو شوان و چاودێرە لەناو خانەوادەکەیدا و بەرپرسە لێیان، ژن شوان و چاودێرە بەرپرسیارە لە منداڵ و ماڵی مێردەکەی، بەندە شوان و چاودێرە بەرپرسیارە لە ماڵی گەورەکەی، وە ئێوە هەمووتان شوانن و چاودێرن وە هەمووتان بەرپرسن لەژێردەستەکانتان).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە داواکردنی فەرمانڕەوایی

## ٢ - باب مَا جَاءَ فِي طَلَبِ الإِمَارَةِ.

**٢٩٢٩ - (صحيح) عن عبد الرحمن بن سمرة قال: قال لي النبي صلى الله عليه وسلم: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ، لاَ تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِذَا أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ فِيهَا إِلَى نَفْسِكَ، وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا).**

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرمووم: (ئەی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی سەمورە، داوای فەرمانڕەوایەتی مەکە، چونکە ئەگەر بەبێ داواکردن پێت بدرێ یارمەتی دەدرێیت و خوای گەورە

سەرکەوتوت دەکات بەسەریا، بەڵام ئەگەر لەسەر داخوازی خۆت پێت بدرێ یارمەتی نادرێیت و دەبێت بەبار بەسەرتەوە).

**٢٩٣٠ - (منكر) عن أبو موسى قال: انْطَلَقْتُ مَعَ رَجُلَيْنِ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَشَهَّدَ أَحَدُهُمَا، ثُمَّ قَالَ: جِئْنَا لِتَسْتَعِينَ بِنَا عَلَى عَمَلِكَ، وَقَالَ الآخَرُ مِثْلَ قَوْلِ صَاحِبِهِ، فَقَالَ: (إِنَّ أَخْوَنَكُمْ عِنْدَنَا مَنْ طَلَبَهُ). فَاعْتَذَرَ أَبُو مُوسَى إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ: لَمْ أَعْلَمْ لِمَا جَاءَا لَهُ. فَلَمْ يَسْتَعِنْ بِهِمَا عَلَى شَيْءٍ حَتَّى مَاتَ.**

واتە: لە ئەبو موساوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەگەڵ دوو پیاو رۆشتین بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یەکێکیان دەستی کرد بە قسەکردن، لەپاشدا وتی: هاتوین بۆئەوەی کارێکمان پێ راسپێری لەوکارانەی کە خوای گەورە سپاردونی بە تۆ، ئەوی تریشیان هەمان قسەی ئەوی کرد واتە داوای ئەوەیان کرد کە بکرێن بە کاربەدەست، فەرمووی: (ناپاکترین کەستان لەلای ئێمە ئەوەتانە کە داوای کاربەدەستی دەکات). ئەبو موسا عوزرخواهی هێنایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: من نەمزانی کە ئەوانە بۆ ئەمە هاتوون، ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا لەژیاندا بوو ئەو دوو کەسەی نەکرد بە سەرکار و بەرپرسی هیچ شتێك.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە فەرمانڕەوایەتی نابینا

## ٣ – باب فِي الضَّرِيرِ يُوَلَّى.

٢٩٣١ - (صحيح) عن أنس، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَخْلَفَ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ عَلَى الْمَدِينَةِ مَرَّتَيْنِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوو جار ئیبنو ئوممی مەکتومی کرد بە جێنشینی خۆی و لەسەر مەدینە داینا- کە پیاوێکی نابینا بوو - .

## باسی سەبارەت بە دانانی وەزیر

## ٤ – باب فِي اتِّخَاذِ الْوَزِيرِ.

٢٩٣٢ - (صحيح) عن عائشة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِالأَمِيرِ خَيْرًا جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ صِدْقٍ، إِنْ نَسِيَ ذَكَّرَهُ، وَإِنْ ذَكَرَ أَعَانَهُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهِ غَيْرَ ذَلِكَ، جَعَلَ لَهُ وَزِيرَ سُوءٍ، إِنْ نَسِيَ لَمْ يُذَكِّرْهُ، وَإِنْ ذَكَرَ لَمْ يُعِنْهُ).

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لیّ بیّ دەگیّرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (کاتیّ خوای گەورە ویستی خێری بە فەرمانڕەوایە هەبوو، ئەوا وەزیرێکی باش و راستگۆی بۆ دادەنیّ، ئەگەر لەبیری چو یادی دەخاتەوە، ئەگەر لەیادی بوو یارمەتی دەدات، بەڵام کاتیّ کە خوای گەورە ویستی خێری پێی نەبوو، ئەوا وەزیرێکی خراپی بۆ دادەنیّ، ئەگەر لەیادی نەبوو نایخاتەوە بیری، ئەگەر لەیادیشی بوو یارمەتی نادات).

## باسی سەبارەت بە سەرکاری فەرمانڕەوا بەسەر کۆمەڵیّ لە خەڵکەوە

## ٥- باب فِي الْعِرَافَةِ.

٢٩٣٣ - (ضعيف) عن المقدام بن معد يكرب، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ضَرَبَ عَلَى مَنْكِبِهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُ: (أَفْلَحْتَ يَا قُدَيْمُ! إِنْ مُتَّ وَلَمْ تَكُنْ أَمِيرًا، وَلاَ كَاتِبًا، وَلاَ عَرِيفًا).

واتە: لە میقدامی کوڕی مەعد یکربەوە دەگیّرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داویەتی بە سەرشانیدا، لەپاشدا پێی فەرمووە: (ئەی قودەیم! - بچوك کراوەی ناوی مقدامە - ئەگەر بشمری مەبە بە فەرمانڕەواو کاربەدەس، وە مەبە بە نوسەری فەرمانڕەوا، هەروەها مەبە بە سەرکاری فەرمانڕەوا بەسەر کۆمەڵیّ لە خەڵکەوە).

٢٩٣٤- (ضعيف إلا قوله (لاَ بُدَّ لِلنَّاسِ مِنَ الْعُرَفَاءِ..) وهو حسن بمجموع طرقه) عن غالب القطان، عن رجل، عن أبيه، عن

جده، أَنَّهُمْ كَانُوا عَلَى مَنْهَلٍ مِنَ الْمَنَاهِلِ، فَلَمَّا بَلَغَهُمُ الإِسْلاَمُ جَعَلَ صَاحِبُ الْمَاءِ لِقَوْمِهِ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ عَلَى أَنْ يُسْلِمُوا، فَأَسْلَمُوا وَقَسَمَ الإِبِلَ بَيْنَهُمْ، وَبَدَا لَهُ أَنْ يَرْتَجِعَهَا مِنْهُمْ، فَأَرْسَلَ ابْنَهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ لَهُ: ائْتِ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ أَبِي يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ، وَإِنَّهُ جَعَلَ لِقَوْمِهِ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ عَلَى أَنْ يُسْلِمُوا، فَأَسْلَمُوا، وَقَسَمَ الإِبِلَ بَيْنَهُمْ، وَبَدَا لَهُ أَنْ يَرْتَجِعَهَا مِنْهُمْ أَفَهُوَ أَحَقُّ بِهَا أَمْ هُمْ؟ فَإِنْ قَالَ لَكَ: نَعَمْ، أَوْ لاَ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، وَهُوَ عَرِيفُ الْمَاءِ، وَإِنَّهُ يَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ لِي الْعِرَافَةَ بَعْدَهُ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ أَبِي يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ، فَقَالَ: (وَعَلَيْكَ وَعَلَى أَبِيكَ السَّلاَمُ). فَقَالَ: إِنَّ أَبِي جَعَلَ لِقَوْمِهِ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ عَلَى أَنْ يُسْلِمُوا فَأَسْلَمُوا وَحَسُنَ إِسْلاَمُهُمْ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَرْتَجِعَهَا مِنْهُمْ، أَفَهُوَ أَحَقُّ بِهَا أَمْ هُمْ؟ فَقَالَ: (إِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يُسْلِمَهَا لَهُمْ فَلْيُسْلِمْهَا، وَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يَرْتَجِعَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا مِنْهُمْ، فَإِنْ هُمْ أَسْلَمُوا فَلَهُمْ إِسْلاَمُهُمْ، وَإِنْ لَمْ يُسْلِمُوا قُوتِلُوا عَلَى الإِسْلاَمِ). فَقَالَ: إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ، وَهُوَ عَرِيفُ الْمَاءِ، وَإِنَّهُ يَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ لِي الْعِرَافَةَ بَعْدَهُ، فَقَالَ: (إِنَّ الْعِرَافَةَ حَقٌّ، وَلاَ بُدَّ لِلنَّاسِ مِنَ الْعُرَفَاءِ، وَلَكِنَّ الْعُرَفَاءَ فِي النَّارِ).

واتە: لە غالیبی (قطّان)ەوە، لەپیاوێکەوە لەباوکیەوە، لـە باپیریـەوە، دەگێرنـەوە، کـە لەسەرەڕێیەکدا بەسەر سەرچاوەی ئاوێکەوە بوون کە خۆیان و خەڵك و ئاژەڵەکانیان ئاویان لێ دەخواردەوە، کاتێ کە ئیسلامیان پێ گەیشت خاوەنی ئاوەکە سەد وشتری هەبوو وتی بە قەومەکەی: ئەم سەد وشترەتان دەدەمێ بە مەرجێ موسوڵمان بن، ئەوانیش هەموویان موسوڵمان بوون، ئەویش وشترەکانی دابەشکرد بەسەریاندا، ویستی وشـترەکان بگێڕێتـەوە بۆ خۆی، کوڕەکەی نارد بۆلای پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسـلم)، پێـی وت: بـڕۆ بـۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی بڵێ: باوکم سەلامت لـێ دەکـات، سـەد وشتری داوە بە قەومەکەی کە موسـوڵمان بـن، ئـەوانیش هـەموویان موسـوڵمان بـوون، ئەویش وشترەکانی دابەشکردوە بەسەریاندا، بەڵام دەیەوێت وشترەکانیان لـێ بسـەنێتەوە، ئایا باوکم لەپێشترە بەو وشترانە یان ئەوان؟ ئەگەر فەرمووی: بەڵێ، یـان نـا، پێـی بڵـێ: باوکم پیاوێکی بەساڵاچوە، سەرکاری ئاوەکەیە، داوات لێ دەکات لەدوای خۆی من بکەی بە سەرکاری ئاوەکە.

جا کوڕەکەی چو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: باوکم سـەلامت لێ دەکات، فەرموی: (سەلام لە خۆت و لە باوکت)، وتی: باوکم سـەد وشـتری داوە بـە قەومەکەی هەتا موسوڵمان بن، ئەوانیش هەموویان بەچـاکی موسـوڵمان بـوون، ئینجـا دەیەوێت وشترەکانیان لێ بسەنێتەوە، ئایـا بـاوکم لەپێشـترە بـەو وشـترانە یـان ئـەوان؟ فەرمووی: (ئەگەر حەزدەکات بیانداتێ بۆ خۆیان ئەوە بـا بیانـداتێ، ئەگـەر حـەزدەکات بیانگێڕێتەوە ئەوا ئـەو لەپێشـترە بـەو وشـترانە، ئەگـەر ئـەوان موسـوڵمان بـوون ئـەوە موسوڵمان بوونەکەیان بۆ خۆیانە، ئەگەر موسوڵمانیش نەبوون جەنگیان لەگەڵ دەکرێت). کوڕەکەی وتی: باوکم پیاوێکی بەساڵاچوە، سەرکاری ئاوەکەیە، داوات لێ دەکات لەدوای خۆی من بکەی بە سەرکاری ئاوەکە، فـەرمووی: (سـەرکاری(عرافە) حـەق و پێویسـتەو کارێکی چاکە بۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری خـەڵك، بۆیـە هـەردەبێ خـەڵك هـەیانبێ بـۆ بەرژەوەندیان، بەڵام سەرکارەکان زۆربەیان لە ئاگردان بەهۆی نادادپەروەریانەوە).

## باسی سەبارەت بە دانانی نوسەر بۆ فەرمانڕەوا

## ٦ - باب فِي اتِّخَاذِ الْكَاتِبِ.

**٢٩٣٥ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: السِّجِلُّ كَاتِبٌ، كَانَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (سجل) پیاوێ بوو، نوسەری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.

- فەرمودەکە صەحیح نیە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوسەری نەبوە بەناوی (سجل)ەوە، هەروەها لەناو هەوالآندا کەسێ نەبوە کە ناوی (سجل) بێ - .

## باسی سەبارەت بە دانانی کەسێ بۆ کۆکردنەوەی سەدەقە.

## ٧ - باب فِي السِّعَايَةِ عَلَى الصَّدَقَةِ.

**٢٩٣٦ - (صحيح) عن رافع بن خديج قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (الْعَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالْحَقِّ كَالْغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ).**

واتە: لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (ئەو کەسەی کاری زەکات کۆکردنەوەیە ئەگەر کارەکەی

بەڕاستی و بەچاکی ئەنجام بدات و بە پێی شەرع بێت وەك ئەو غەزاکەرە وایە کە لەرێگەی خوای گەورەدا غەزا دەکات هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی).

**٢٩٣٧ - (ضعيف) عن عقبة بن عامر قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ صَاحِبُ مَكْسٍ).**

واتە: لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (ئەو باجگر و گومرگ وەرگرەی کە ماڵ و سامان بە ستەم و ناڕەوا لەخەڵك وەردەگرێت ناچێتە بەهەشتەوە).

**٢٩٣٨ - (صحيح مقطوع) عن ابن إسحاق قال: الَّذِي يَعْشُرُ النَّاسَ: يَعْنِي صَاحِبَ الْمَكْسِ.**

واتە: لە ئیبنو ئیسحاقەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەو کەسەی کە دە یەك لەخەڵك وەردەگرێت: واتە (صَاحِبَ الْمَكْسِ).

## باسی سەبارەت بە دانانی جێنشین.

## ٨ - باب فِي الْخَلِيفَةِ يَسْتَخْلِفُ.

**٢٩٣٩ - (صحيح) عن ابن عمر قال: قال عمر: إِنِّي إِنْ لاَ أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَسْتَخْلِفْ، وَإِنْ أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ قَدِ اسْتَخْلَفَ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ ذَكَرَ**

رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبَا بَكْرٍ فَعَلِمْتُ أَنَّهُ لاَ يَعْدِلُ بِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدًا، وَأَنَّهُ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ - کاتێ کە پێکرا وتیان: جێنشینێ بۆ خۆت دانێ - وتی: من جێنشین بۆ خۆم دانانێم، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جێنشینی بۆ خۆی دانەنا، خۆ ئەگەر جێنشینیش دابنێم هیچی تێدا نیە چونکە ئەبو بەکر جێنشینی بۆ خۆی دانا، ئیبنو عومەر وتی: سوێند بە (الله) کە باسی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئەبو بەکری کرد ئیتر زانیم جێنشین بۆ خۆی دانانێت و، کەس ناگۆڕێتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە (بیعە)پەیماندان.

## ٩ – باب مَا جَاءَ فِي الْبَيْعَةِ.

٢٩٤٠ - (صحيح) عن ابن عمر قال: كُنَّا نُبَايِعُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَيُلَقِّنُنَا: فِيمَا اسْتَطَعْتَ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئێمە پەیمانمان دەدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لەقسەی دەرنەچین و گوێڕایەڵی بکەین، فێری دەکردین کە بڵێین: ئەوەندەی لەتوانامادا هەبێت.

**٢٩٤١ - (صحيح) عن عوروة، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَخْبَرَتْهُ عَنْ بَيْعَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ النِّسَاءَ، قَالَتْ: مَا مَسَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، إِلاَّ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا فَإِذَا أَخَذَ عَلَيْهَا فَأَعْطَتْهُ قَالَ: (اذْهَبِي فَقَدْ بَايَعْتُكِ).**

واتە: لە عوروەوە دەگێرنەوە، کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ چۆنیەتی پەیماندانی ئافرەتانی بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێ راگەیاندوە، وتویەتی: هەرگیز پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستی نەکەوتوە لەدەستی هیچ ئافرەتێکی نامەحرەم، تەنها ئەوەندە نەبێ کە بە قسە پەیمانی لێ وەردەگرت، جا ئەگەر قبوڵی بکردایە دەیفەرموو: (برۆ ئەوە بێگومان پەیمانم لێ وەرگرتی).

**٢٩٤٢ - (صحيح) عن عبد الله بن هشام قال: وَكَانَ قَدْ أَدْرَكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَذَهَبَتْ بِهِ أُمُّهُ زَيْنَبُ بِنْتُ حُمَيْدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَايِعْهُ. فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(هُوَ صَغِيرٌ). فَمَسَحَ رَأْسَهُ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی هیشامەوە دەگێرنەوە، کە گەیشتوە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، دایکی زەینەبی کچی حومەید بە منداڵی بردویەتی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەیمان وەرگرە لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوە بچوکە -

پێویست ناکات پەیمان لە کەسی باڵغ وەردەگیرێت - ) جا دەستی هێنا بەسەری (عَبْدُ اللَّه)دا.

## باسی سەبارەت بە دیاریکردنی ڕۆزی لە خەزێنەی دەوڵەت لەلایەن فەرمانڕواوە بۆ ئەوانەی کاریان پێ دەسپێرێت.

## ١٠ - باب فِي أَرْزَاقِ الْعُمَّالِ.

**٢٩٤٣ - (صحيح) عن عبد الله بن بريدة، عن أبيه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنِ اسْتَعْمَلْنَاهُ عَلَى عَمَلٍ فَرَزَقْنَاهُ رِزْقًا فَمَا أَخَذَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ غُلُولٌ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی بورەیدەوە، لەباوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێکمان لەسەر کارێك دانا و رزق و رۆزیەکمان بۆ دیاریکرد بەرامبەر بە کارەکەی لەوە بەو لاوە هەرچی وەربگرێت گزی و ناپاکی یە).

**٢٩٤٤ - (صحيح) عن ابن الساعدي قال: اسْتَعْمَلَنِي عُمَرُ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَلَمَّا فَرَغْتُ أَمَرَ لِي بِعُمَالَةٍ، فَقُلْتُ: إِنَّمَا عَمِلْتُ لِلَّهِ، قَالَ: خُذْ مَا أُعْطِيتَ، فَإِنِّي قَدْ عَمِلْتُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَعَمَّلَنِي.**

واتە: لە ئیبنو ساعیدییەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) ڕەزای خوای لێ بێ کردمی بە سەرکاری زەکات کۆکردنەوە، کاتێ کە لێبومەوە فەرمانی دا کە کرێم بدەنێ بەرامبەر بە کارەکەم، وتم: من لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ئەو کارەم کردوە و پاداشتم لەلای خوای گەورەیە، وتی: ئەوەی دەتدەمێ وەریبگرە، چونکە منیش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارەم کردوەو، کرێشیان پێ داوم.

٢٩٤٥ - (صحيح) عن المستورد بن شداد قال: سمعت النبي صلى الله عليه و سلم يقول: (مَنْ كَانَ لَنَا عَامِلاً فَلْيَكْتَسِبْ زَوْجَةً، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ خَادِمٌ فَلْيَكْتَسِبْ خَادِمًا، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَسْكَنٌ فَلْيَكْتَسِبْ مَسْكَنًا). قَالَ: قَالَ أَبو بَكْرٍ: أُخْبِرْتُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (مَنِ اتَّخَذَ غَيْرَ ذَلِكَ فَهُوَ غَالٌّ أَوْ سَارِقٌ).

واتە: لە موستەوریدی کوڕی شەددادەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو: (هەرکەسێك بوو بە سەرکاری ئێمە با ژنێ بێنێ، ئەگەر خزمەتکای نەبوو با خزمەتکارێ ڕابگرێ، ئەگەر خانوی نەبوو با خانویە بۆ خۆی پەیدا بکات). وتی: ئەبو بەکر وتی: بۆم باسکراوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك لەوە زیاتر هەڵبگرێت ئەوە ئەوە گزیکارە یان دزە).

# باسی سەبارەت بەو دیارییەی کە دەدرێت بەوانەی فەرمانڕەوا کاریان پێ دەسپێردرێت لەلایەن ژێردەستەکانەوە.

## ١١ - باب فِي هَدَايَا الْعُمَّالِ.

٢٩٤٦ - (صحيح) عن أبو حميد الساعدي: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعْمَلَ رَجُلاً مِنَ الأَزْدِ يُقَالُ لَهُ ابْنُ اللُّتْبِيَّةِ - قَالَ ابْنُ السَّرْحِ: ابْنُ الأُتْبِيَّةِ - عَلَى الصَّدَقَةِ، فَجَاءَ فَقَالَ: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، فَقَامَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: (مَا بَالُ الْعَامِلِ نَبْعَثُهُ فَيَجِيءُ فَيَقُولُ: هَذَا لَكُمْ، وَهَذَا أُهْدِيَ لِي، أَلاَّ جَلَسَ فِي بَيْتِ أُمِّهِ أَوْ أَبِيهِ، فَيَنْظُرَ أَيُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ؟ لاَ يَأْتِي أَحَدٌ مِنْكُمْ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا فَلَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً فَلَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعَرُ). ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْنَا عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ، اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ).

واتە: لە ئەبو حومەیدی ساعیدییەوە هاتوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی ئەزدی کرد بە سەرکاری سەر زەکات ناوی (ابْنُ اللُّتْبِيَّةِ) بوو — ئیبنو سەرح وتی: (ابْنُ الأُتْبِيَّةِ) — کاتێ کە هاتەوە وتی: ئەمە هی ئێوەیەو، ئەمەش هی منە بە دیاری بۆم

هاتوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرکەوتە سەر مینبەر راوەستاو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو فەرمووی: (ئەمە چی پێ دەڵێن هەندێ سەرکار کە دەینێرم بۆ شوێنێ دێتەوە دەڵێ: ئەمە هی ئێوەیەو، ئەمەش هی منە بە دیاری بۆم هاتوە، جا ئەگەر وایە بۆچی لەماڵی دایکی یان لەماڵی باوکی دانانیشێت بزانێ دیاری بۆ دێت یان نا؟ هەرکەسێ شتێ لەماڵی زەکات بۆ خۆی ببات ئەوە لەرۆژی قیامەتدا ئەو شتە دەهێنێ، جا ئەگەر وشتری دزی بێ وشترەکە دەبۆڕێنێ، ئەگەر رەشە ولاخی دزی بێ رەشە ولاخەکە دەقۆڕێنێ، ئەگەر مەر یان بزنی دزی بێ مەرەکە یان بزنەکە دەباڕێنێ). لەپاشدا هەردوودەستی بەرزکردەوە هەتا سپیایی هەردوو بن باڵی دەرکەوت، ئینجا فەرمووی: (خوایە تۆ شایەت بە ئەوا من پێم راگەیاندن، خوایە تۆ شایەت بە ئەوا من پێم راگەیاندن).

## باسی سەبارەت بە گزی و ناپاکی لە زەکات.

## ١٢ – باب فِي غُلُولِ الصَّدَقَةِ.

٢٩٤٧ - (حسن) عن أبو مسعود الأنصاري قال: بَعَثَنِي النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاعِيًا، ثُمَّ قَالَ: (انْطَلِقْ أَبَا مَسْعُودٍ وَلاَ أُلْفِيَنَّكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَجِيءُ عَلَى ظَهْرِكَ بَعِيرٌ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ لَهُ رُغَاءٌ قَدْ غَلَلْتَهُ). قَالَ: إِذًا لاَ أَنْطَلِقُ. قَالَ: (إِذًا لاَ أُكْرِهُكَ).

واتە: لە ئەبو مەسعودی ئەنصارییەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناردمی بە سەرکار بۆ کۆکردنەوەی زەکات، فەرمووی: (ئەی ئەبو مەسعود بڕۆ بەڵام نامەوێت لەرۆژی قیامەتدا پێت بگەم وشترێك لە وشتری زەکات کە دزی بێتت بە

کۆڵتەوەبێ و ببۆڕێنێ). وتی: دەی کەواتە ئەو کارە ناکەم و ناڕۆم، فەرمووی: (دەی منیش زۆرت لێ ناکەم ئارەزووی خۆتە).

## باسی دەربارەی ئەوەی لەسەر پێشەوایە بەشی ژێردەستەکانی بدات و دادپەروەر بێت لەنێوانیاندا، وە دەرگا دانەخات بە ڕووی هەژارەکانیاندا.

## ١٣ - باب فِيمَا يَلْزَمُ الإِمَامَ مِنْ أَمْرِ الرَّعِيَّةِ وَالْحَجَبَةِ عَنْهُ.

٢٩٤٨ - (صحيح) عن أبو مريم الأزدي قال: دَخَلْتُ عَلَى مُعَاوِيَةَ فَقَالَ مَا أَنْعَمَنَا بِكَ أَبَا فُلاَنٍ - وَهِيَ كَلِمَةٌ تَقُولُهَا الْعَرَبُ - فَقُلْتُ: حَدِيثًا سَمِعْتُهُ أُخْبِرُكَ بِهِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (مَنْ وَلاَّهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ فَاحْتَجَبَ، دُونَ حَاجَتِهِمْ وَخَلَّتِهِمْ وَفَقْرِهِمْ: احْتَجَبَ اللَّهُ عَنْهُ دُونَ حَاجَتِهِ وَخَلَّتِهِ وَفَقْرِهِ). قَالَ: فَجَعَلَ رَجُلاً عَلَى حَوَائِجِ النَّاسِ.

واتە: لە ئەبو مەریەمی ئەزدیەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چومە ژوردوە بۆلای موعاویە وتی: موعاویە خۆشحاڵ بوو وتی: بەم هاتنەت چ نیعمەتێکت بۆ هێناوین —

وتەیەکە عەرەب دەیڵێن – وتم: فەرموودەیەکە بیستومە بۆتی باس دەکەم، بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هەرکەسێ خوای گەورە بەرپرسێتێکی موسوڵمانانی پێ بسپێرێت پەرژینێکی دانا لەنێوان خۆی و پێویستی و هەژاری و نەبوونی و نەداری ئەواندا، خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا پەرژینێك لەنێوان خۆی و پێویستی و هەژاری و نەبوونی و نەداری ئەودا دادەنێ). وتی: ئیتر موعاویە بوو بە کەسێ بەدەم پێویستیەکانی خەڵکەوە دەچو، دەرگای بەڕووی هەژاراندا دانەدەخست.

**٢٩٤٩ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(مَا أُوتِيكُمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا أَمْنَعُكُمُوهُ إِنْ أَنَا إِلاَّ خَازِنٌ أَضَعُ حَيْثُ أُمِرْتُ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو شتەی کە پێتان دەبەخشم، یان ئەو شتەی کە پێتان نابەخشم بەئارەزووی خۆم نیە، بەڵکو بەپێی فەرمانی خوایە، بەس من ئەوەی کە فەرمانم پێ کراوە لەلایەن خوای گەورەوە جێبەجێی دەکەم، چۆن فەرمانم پێ بکات بەو شێوەیە جێبەجێی دەکەم).

**٢٩٥٠ - (حسن موقوف) عن مالك بن أوس بن الحدثان قال: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَوْمًا الْفَيْءَ فَقَالَ: مَا أَنَا بِأَحَقَّ بِهَذَا الْفَيْءِ مِنْكُمْ، وَمَا أَحَدٌ مِنَّا بِأَحَقَّ بِهِ مِنْ أَحَدٍ، إِلاَّ أَنَّا عَلَى مَنَازِلِنَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَقَسْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: فَالرَّجُلُ وَقِدَمُهُ، وَالرَّجُلُ وَبَلاَؤُهُ، وَالرَّجُلُ وَعِيَالُهُ، وَالرَّجُلُ وَحَاجَتُهُ.**

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی (الْحَدَثَان)ەوە دەگێڕنـەوە، كـە وتویـەتی: ڕۆژێ پێشەوا عومەری كوڕی (خَطَّـاب) ڕەزای خوای لێ بێ باسی (الْفَـيْء)ی كـرد – (الْفَـيْء) بریتیە لە ماڵ و سـامانی كـافران كـە موسـوڵمانان بـەبێ جـەنگ و كوشـتار دەسـتیان دەكەوێت – ، وتی: من شایستەتر نیم بە (الْفَيْء) لەئێوە من و ئێـوە چـون یـەكین و بـۆ هەمومانە، منیش بە ئەندازەی یەكێ لەئێوە بەشـم دەكـەوێت، هـیچ كەسـێ لـە ئیمـە شایستەتر نیە پێی لە كەسێكی تر، بەڵام ئەوەندە هەیە ئێمە بەپێی پلەو پایەمان بـەشمان بۆ دادەنرێت كە لە كتێبەكەی خوای گـەورەدا دیـاریكراوەو ڕونكراوەتـەوە، ئـەو بەشـەی دەدرێتێ كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆی داناوە: پیاو هەیە دەست پێشـخەری كردوەو زوتر موسوڵمان بووە، پیاو هەیە دەردەسەری و مەینەتی زۆری چەشـتوەو هـەوڵی زۆری داوە لەپێناو سەرخستنی ئیسلامدا، پیاو هەیە خێزاندارەو، هەیـە تـەنیا خۆیـەتی چۆن وەك ئـەو كەسـە بەشـی دەدرێـتێ كـە خـاوەنی دە منداڵـە، پیـاو هەیـە هـەژار و كەمدەستەو زیاتر پێویستیەتی، بۆیە هەركەسێ بەپێی پێویستی خۆی بەشی بۆ دادەنرێت.

## باسی دابەشكردنی (الْفَيْء)[1]

## ١٤ – باب فِي قَسْمِ الْفَيْءِ.

**٢٩٥١ - (حسن) عن زيد بن أسلم: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ دَخَلَ عَلَى مُعَاوِيَةَ، فَقَالَ: حَاجَتُكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ: عَطَاءُ الْمُحَرَّرِينَ، فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَّلَ مَا جَاءَهُ شَيْءٌ بَدَأَ بِالْمُحَرَّرِينَ.**

[1] - (الْفَيْء): ئەو ماڵ و سامانەیە بەبێ جەنگ و كوشتار دەستی موسوڵمانان دەكەوێت.

واتە: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێڕنەوە، کە (عَبْدُ اللَّـه)ی کـوڕی عومـەر ڕەزای خوایان لێ بێ چو بۆلای موعاویە، وتی: ئەی باوکی (عَبْدُ الـرَّحْمَن) پێویستیت بە چی یە بیڵێ، وتی: لە ماڵی (الْفَـيْء) بەشی بەندە ئازادکراوەکان بدە — چونکە هـەتا بەنـدەبوون ژیانیان لەسەر گەورەکەیان بوە لەپاشدا کە ئازاد کـران لەدیوانـدا ناویـان نـەبوە - خـۆم پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) دیوە کە شتێکی بۆ دەهات لەپێشـدا بەشـی ئـەوانی دەدا.

**٢٩٥٢ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أُتِيَ بِظَبْيَةٍ فِيهَا خَرَزٌ، فَقَسَمَهَا لِلْحُرَّةِ وَالأَمَـةِ، قَالَـتْ عَائِشَةُ: كَانَ أَبِي يَقْسِمُ لِلْحُرِّ وَالْعَبْدِ.**

واتە: لە عـائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنـەوە، کـە هەنبانەیـە ئـەو شـتەی کـە تێشوی تێ دەکرێت یان کیسەیە مورویان هێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليـه وسـلم)، ئەویش دابەشیکرد بەسەر ژنانی ئازادو کەنیزەکدا، عائیشە وتی: باوکم ماڵی (الْفَـيْء)ی دابەش دەکرد بەسەر ئازاد و کۆیلەدا - واتە وەك یەك بەشی دەدان و جیاوازی نەدەکرد لە نێوانیاندا - .

**٢٩٥٣ - (صحيح) عن عوف بن مالك: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِـهِ، فَـأَعْطَى الآهِـلَ حَظَّيْنِ، وَأَعْطَى الْعَزَبَ حَظًّا. زَادَ ابْـنُ الْمُصَـفَّى: فَـدُعِينَا، وَكُنْتُ أُدْعَى قَبْلَ عَمَّارٍ، فَدُعِيتُ فَأَعْطَانِي حَظَّيْنِ وَكَانَ لِي أَهْلٌ، ثُمَّ دُعِيَ بَعْدِي عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ فَأَعْطَى لَهُ حَظًّا وَاحِدًا.**

واتە: لە عەوفی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر ماڵی (الفيء)ی بۆ بهاتایە هەر ئەو ڕۆژە دابەشی دەکردو دوای نەدەخست، ئەوەی ژنی ببوایە دوو بەشی دەدایە، ئەوەشی ژنی نەبوایە یەك بەشی دەدایە. ئیبنو (مصفّى) ئەمەی بۆ زیاد کرد: عەوف وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بانگی کردین، منی لەپێش عەممارەوە بانگ کرد، بانگی کردم و دوو بەشی پێدام، چونکە ژنم هەبوو، لەدوای منیش عەمماری کوڕی یاسری بانگ کرد، یەك بەشی دایە چونکە ژنی نەبوو.

## باسی سەبارەت بە ڕۆزی منداڵی وردو خاوخێزانی کەم دەرامەت.

## ١٥ – باب فِي أَرْزَاقِ الذُّرِّيَّةِ.

**٢٩٥٤ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (من بۆ هەموو باوەڕدارێ لەخۆی لەپێشترم، ئەوەی بمرێ و ماڵی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوە بۆ خزم و کەسوکارەکەیەتی، ئەگەر قەرزی لەسەر بوو قەرزەکەی لەسەر من خۆم بۆی دەبژێرم، ئەگەر خێزانی هەژار و بێ داڵدەی لەپاش بەجێما گوزەرانیان لەسەر خۆمە).

**٢٩٥٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ، وَمَنْ تَرَكَ كَلاًّ فَإِلَيْنَا).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەوەی بمرێ و ماڵی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوە بۆ میرتگرەکانی، ئەگەر قەرزی لەسەر بوو یان خێزانی هەژار و بێ داڵدەی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوا خۆم قەرزەکەی بۆی دەبژێرم و ژیان و گوزەرانی خێزانە هەژارەکەشی لەسەر خۆمە).

**٢٩٥٦ - (صحيح) عن جابر بن عبد الله: عن النبي صلى الله عليه و سلم كان يقول: (أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، فَأَيُّمَا رَجُلٍ مَاتَ وَتَرَكَ دَيْنًا فَإِلَيَّ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ).**

واتە: لە جابری کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (من بۆ هەموو باوەڕدارێ لەخۆی لەپێشترم، ئەوەی بمرێ و قەرزی لەسەر بوو قەرزەکەی لەسەر من خۆم بۆی دەبژێرم، ئەگەر ماڵی لەپاش بەجێبمێنێ ئەوە بۆ میرتگرەکانی).

## باسی پیاو لە چی تەمەنێکدا جیهادی (فەرزی عەینی) لەسەرەو وەك ئەوان لەدەستکەوتی جەنگی بەشی دەبێت بێگومان کاتێ کە باڵغ بوو.

## ١٦ - باب مَتَى يُفْرَضُ لِلرَّجُلِ فِي الْمُقَاتِلَةِ.

**٢٩٥٧ - (صحيح) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عُرِضَهُ يَوْمَ أُحُدٍ، وَهُوَ ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ (سنةً) فَلَمْ يُجِزْهُ، وَعُرِضَهُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، وَهُوَ ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، فَأَجَازَهُ.**

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە لە ڕۆژی جەنگی ئوحوددا چواردە ساڵان بوو برایە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی بەشداری جەنگەکە بکات ڕێگەی پێ نەدا، بەڵام لەڕۆژی (خەندەق)دا پانزە ساڵان بوو برایە خزمەتی ڕێگەی پێ دا بەشداری بکات.

## باسی سەبارەت بە كەراهەتی بەخشش و دیاری بەرامبەر بە كاریٚ لەكۆتایی زەماندا.

## ١٧ - باب فِي كَرَاهِيَةِ الافْتِرَاضِ فِي آخِرِ الزَّمَانِ.

**٢٩٥٨ - (ضعيف) عن سليم بن مطير- شَيْخٌ مِنْ أَهْلِ وَادِي الْقُرَى – قال: حَدَّثَنِي أَبِي مُطَيْرٌ أَنَّهُ خَرَجَ حَاجًّا حَتَّى إِذَا كَانَ بِالسُّوَيْدَاءِ إِذَا أَنَا بِرَجُلٍ قَدْ جَاءَ كَأَنَّهُ يَطْلُبُ دَوَاءً وَحُضُضًا، فَقَالَ أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهُوَ يَعِظُ النَّاسَ وَيَأْمُرُهُمْ وَيَنْهَاهُمْ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ خُذُوا الْعَطَاءَ مَا كَانَ عَطَاءً فَإِذَا تَجَاحَفَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْمُلْكِ وَكَانَ عَنْ دِينِ أَحَدِكُمْ فَدَعُوهُ).**

واتە: لە سولەیمی كوڕی (مُطَیر)ەوە — كە شێخیٚ بوو لە خەڵكی (وادی القری) ،شوێنێكە لەنێوان مەدینەو شامدا - دەگێرنەوە، كە وتویەتی: ئەبو (مُطَیر) بۆی باس كردم (مُطَیر) دەرچو بۆ حەج هەتا گەیشتە (سویداء) پیاوێكی بینی داوای دەرمان و (حُضُض)ی كرد - (حُضُض) جۆرە دەرمانێكە - ، وتی: كەسیٚ كە لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بیستبو بۆی گێڕامەوە لە ڕۆژی حەجیماڵ ئاوایی دا كاتیٚ كە ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد فەرمانی پیٚ دەكردن بەوەی كە خوای گەورە فەرمانی پیٚ كردون و ڕێگری لیٚ دەكرن لەوەی كە خوای گەورە حەرامی كردبو لەسەریان، فەرمووی: (ئەی خەڵكینە بەخشش و دیاری وەربگرن هەتا بەخشش و دیاری بێت بە تەواوی مانا،

ئەگەر قورەیش جەنگ و بەربەرەكانێیان كرد لەسەر كورسی و دەسەڵات بەخشش و دیاری بەرامبەر بە دین و لەسەر حسابی دین بوو ئەوە وەری مەگرن).

**٢٩٥٩ - (ضعيف) عن سليم بن مطير - مِنْ أَهْلِ وَادِي الْقُرَى - عَنْ أَبِيه، أَنَّهُ حَدَّثَهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَأَمَرَ النَّاسَ وَنَهَاهُمْ، ثُمَّ قَالَ: (اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ). قَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ. ثُمَّ قَالَ: (إِذَا تَجَاحَفَتْ قُرَيْشٌ عَلَى الْمُلْكِ فِيمَا بَيْنَهَا وَعَادَ الْعَطَاءُ أَوْ كَانَ رُشًا فَدَعُوهُ). فَقِيلَ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا ذُو الزَّوَائِدِ صَاحِبُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ**

واتە: لە سولەیمی كوڕی (مُطَیر)ەوە — كە خەڵكی (وادی القرى) بوو — لە باوكیەوە دەگێڕنەوە، كە (مُطَیر) بۆسولەیمی باس كردوە وتویەتی: لە پیاوێكم بیست دەیوت: لە ڕۆژی حەجیماڵ ئاوایی دا گوێم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد فەرمانی پێ دەكردن بەوەی كە خوای گەورە فەرمانی پێ كردون و ڕێگری لێ دەكرن لەوەی كە خوای گەورە حەرامی كردبو لەسەریان، لەپاشدا فەرمووی: (خودایە ئەوا گەیاندم)، خەڵكەكە وتیان: خودایە بەڵێ گەیاندی، ئینجا فەرمووی: (ئەگەر قورەیش جەنگ و بەربەرەكانێیان كرد لەسەر كورسی و دەسەڵات، بەخشش و دیاری لەپێناوی تەنەزولدا بوو لە كارێكی دیندا ئەوە پێویستە وەرنەگیرێت، یان ئەگەر وەك بەرتیل درا ئەوە بە هەمان شێوە نابێ وەربگیرێت). وترا: ئەم پیاوە كێ یە؟ وتیان: ئەوە (ذُو الزَّوَائِد)ە، هاوەڵی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم).

## باسی سەبارەت بە دیوان[1].

## ١٨ – باب فِي تَدْوِينِ الْعَطَاءِ.

٢٩٦٠ - (صحيح الإسناد) عن عبد الله بن كعب بن مالك الأنصاري: أَنَّ جَيْشًا مِنَ الأَنْصَارِ كَانُوا بِأَرْضِ فَارِسَ مَعَ أَمِيرِهِمْ، وَكَانَ عُمَرُ يُعْقِبُ الْجُيُوشَ فِي كُلِّ عَامٍ، فَشُغِلَ عَنْهُمْ عُمَرُ، فَلَمَّا مَرَّ الأَجَلُ قَفَلَ أَهْلُ ذَلِكَ الثَّغْرِ، فَاشْتَدَّ عَلَيْهِمْ وَتَوَاعَدَهُمْ وَهُمْ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالُوا: يَا عُمَرُ، إِنَّكَ غَفَلْتَ عَنَّا وَتَرَكْتَ فِينَا الَّذِي أَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ إِعْقَابِ بَعْضِ الْغَزِيَّةِ بَعْضًا.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی كەعبی كوڕی مالیكی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە، كە سوپایە لە ئەنصار لەگەڵ سەركردەكەیاندا لە وڵاتی فارس بوون پاسەوانی سنوری دەوڵەتی ئیسلامیان دەكرد، پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ هەموو ساڵێ ئەو هێزانەی دەگۆڕی كە پاسەوانی سنوری دەوڵەتی ئیسلام بوون بە كۆمەڵێكی تر بۆ ئەوەی جێگەی ئەوان بگرنەوە، پێشەوا عومەر لەیادی چو ئەو سوپایە بگۆڕێت بە كۆمەڵێكی تر كە لە وڵاتی فارس بوون، كاتێ كە ماوەكەیان كۆتایی هات و كەسی بۆ نەناردن بەبێ پرس گەڕانەوەو شوێنەكەی خۆیان چۆڵ كرد، عومەر توڕە بوو لێیان لەكاتێكدا كە ئەوانە لە هەواڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوون، وتیان: ئەی عومەر، تۆ ئێمەت لەیادچو، ئەوەی

[1] - دیوان: ناوی ئەندامانی سوپای تێدا تۆمار دەكرێت لەگەڵ ئەوانەی كە بەخشش و دیاریان پێ دەدرێت.

کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردبو بە گۆڕینی ئەو هێزانە جێبەجێت نەکردو وازت لێ هێنا، ئێمەش ئەو ماوەیەمان تەواو کرد کە بۆت دیاری کردبوین کەست بۆ نەناردین بۆیە ئێمەش گەڕاینەوە بۆ ناو ماڵ و خاو خێزانی خۆمان.

٢٩٦١ - (صحيح) عن ابن لعدي بن عدي الكندي: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ كَتَبَ إِنَّ مَنْ سَأَلَ عَنْ مَوَاضِعِ الْفَيْءِ فَهُوَ مَا حَكَمَ فِيهِ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضى الله عنه، فَرَآهُ الْمُؤْمِنُونَ عَدْلاً مُوَافِقًا لِقَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (جَعَلَ اللَّهُ الْحَقَّ عَلَى لِسَانِ عُمَرَ وَقَلْبِهِ). فَرَضَ الأَعْطِيَةَ للمسلمين، وَعَقَدَ لأَهْلِ الأَدْيَانِ ذِمَّةً بِمَا فُرِضَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْجِزْيَةِ، لَمْ يَضْرِبْ فِيهَا بِخُمُسٍ وَلاَ مَغْنَمٍ.

واتە: لە کوڕێکی عەدی کوڕی عەدی کیندییەوە، دەگێرنەوە، کە عومەری کوڕی (عبد العزيز) نامەی نوسی بۆ سەرکارەنی و هەموو ئەو ناوچانەی کە لەژێر رکێفی دەوڵەتی ئیسلامدا بوون، نوسی ئەوەی دەربارەی سەرفکردنی ماڵی(فيء) پرسیار دەکات کە بەکێ دەبەخشرێت و لە چ جێگایەکدا سەرف دەکرێت و چۆن دابەش دەکرێت: ئەوە حوکمەکەی بەو شێوەیەیە کە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطَّاب) رەزای خوای لێ بێ بڕیاری لەسەر داوە و دایناوە، چونکە موسوڵمانان بە دادپەروەریان دەزانی و حوکمەکەی هەق و راست بوو، ئەمەش رێك دەکەوێت لەگەڵ ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت: (خوای گەورە هەق و راستی دەرخست لەسەر زمان و دڵی عومەر). دیوانی دانا بۆ بەخشین بە موسوڵمانان بۆ ئەوەی بزانێ بەکێی بەخشیوەو بەکێشی نەبەخشیوە، لەکاتی دابەشکردندا هەموو خەڵك دەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو دیوانانە کە ناوەکانی تێدا تۆمار کرابوون، بۆ خاوەن نامە ئاسمانیەکانیش کە بمێننەوەو پاراستنی سەرو ماڵیان

لەئەستۆ(ذمة)ی موسوڵماناندا بێ، ئەو سەرانە(جزیە)یەیە بدەن کە خوای گەورە واجبی کردوە لەسەریان، لەو سەرانە(جزیە)یەش نە پێنج یەکی لێ دەردەکردو نە وەك غەنیمەتیش دابەشی دەکرد بەڵکو بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان بوو بە گشتی.

## باسی سەبارەت بەو ماڵەی کە لەپاش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەجێماوە.

## ١٩ - باب فِي صَفَايَا رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنَ الأَمْوَالِ.

٢٩٦٣ - (صحيح) عن مالك بن أوس بن الحدثان قال: أَرْسَلَ إِلَيَّ عُمَرُ حِينَ تَعَالَى النَّهَارُ، فَجِئْتُهُ، فَوَجَدْتُهُ جَالِسًا عَلَى سَرِيرٍ مُفْضِيًا إِلَى رِمَالِهِ، فَقَالَ حِينَ دَخَلْتُ عَلَيْهِ: يَا مَالُ إِنَّهُ قَدْ دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ قَوْمِكَ، وَإِنِّي قَدْ أَمَرْتُ فِيهِمْ بِشَيْءٍ، فَاقْسِمْ فِيهِمْ، قُلْتُ: لَوْ أَمَرْتَ غَيْرِي بِذَلِكَ، فَقَالَ: خُذْهُ. فَجَاءَهُ يَرْفَأُ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَالزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ، وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَدَخَلُوا، ثُمَّ جَاءَهُ يَرْفَأُ فَقَالَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ هَلْ لَكَ فِي الْعَبَّاسِ وَعَلِيٍّ قَالَ نَعَمْ. فَأَذِنَ لَهُمْ فَدَخَلُوا فَقَالَ الْعَبَّاسُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ

بَيْنِى وَبَيْنَ هَذَا - يَعْنِى عَلِيًّا - فَقَالَ بَعْضُهُمْ: أَجَلْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، اقْضِ بَيْنَهُمَا وَارْحَمْهُمَا. - قَالَ مَالِكُ بْنُ أَوْسٍ: خُيِّلَ إِلَيَّ أَنَّهُمَا قَدَّمَا أُولَئِكَ النَّفَرَ لِذَلِكَ - . فَقَالَ عُمَرُ رَحِمَهُ اللَّهُ: اتَّئِدَا. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أُولَئِكَ الرَّهْطِ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، هَلْ تَعْلَمُونَ أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ)؟ قَالُوا: نَعَمْ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى عَلِىٍّ وَالْعَبَّاسِ رضى الله عنهما فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ الَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ هَلْ تَعْلَمَانِ أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ)؟ فَقَالاَ: نَعَمْ . قَالَ فَإِنَّ اللَّهَ خَصَّ رَسُولَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِخَاصَّةٍ لَمْ يَخُصَّ بِهَا أَحَدًا مِنَ النَّاسِ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾). وَكَانَ اللَّهُ أَفَاءَ عَلَى رَسُولِهِ بَنِى النَّضِيرِ، فَوَاللَّهِ مَا اسْتَأْثَرَ بِهَا عَلَيْكُمْ وَلاَ أَخَذَهَا دُونَكُمْ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْخُذُ مِنْهَا نَفَقَةَ سَنَةٍ أَوْ نَفَقَتَهُ وَنَفَقَةَ أَهْلِهِ سَنَةً، وَيَجْعَلُ مَا بَقِىَ أُسْوَةَ الْمَالِ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى أُولَئِكَ الرَّهْطِ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ هَلْ

تَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى الْعَبَّاسِ وَعَلِيٍّ رضى الله عنهما فَقَالَ أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ الَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ هَلْ تَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ. فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَجِئْتَ أَنْتَ وَهَذَا إِلَى أَبِى بَكْرٍ تَطْلُبُ أَنْتَ مِيرَاثَكَ مِنِ ابْنِ أَخِيكَ، وَيَطْلُبُ هَذَا مِيرَاثَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَحِمَهُ اللَّهُ: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ). وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، فَوَلِيَهَا أَبُو بَكْرٍ فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُو بَكْرٍ قُلْتُ أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَوَلِيُّ أَبِى بَكْرٍ، فَوَلِيتُهَا مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ أَلِيَهَا، فَجِئْتَ أَنْتَ وَهَذَا، وَأَنْتُمَا جَمِيعٌ وَأَمْرُكُمَا وَاحِدٌ، فَسَأَلْتُمَانِيهَا فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمَا أَنْ أَدْفَعَهَا إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ أَنْ تَلِيَاهَا بِالَّذِى كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَلِيهَا، فَأَخَذْتُمَاهَا مِنِّى عَلَى ذَلِكَ، ثُمَّ جِئْتُمَانِى لأَقْضِىَ بَيْنَكُمَا بِغَيْرِ ذَلِكَ، وَاللَّهِ لاَ أَقْضِى بَيْنَكُمَا بِغَيْرِ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَرُدَّاهَا إِلَىَّ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: إِنَّمَا سَأَلاَهُ أَنْ يَكُونَ يُصَيِّرُهُ بَيْنَهُمَا نِصْفَيْنِ، لاَ أَنَّهُمَا جَهِلاَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ نُورَثُ، مَا

**تَرَكْنَا صَدَقَةٌ). فَإِنَّهُمَا كَانَا لاَ يَطْلُبَانِ إِلاَّ الصَّوَابَ. فَقَالَ عُمَرُ: لاَ أُوقِعُ عَلَيْهِ اسْمَ الْقَسْمِ أَدَعُهُ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ.**

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی (الحدثان)ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: چێشتەنگاوێ كاتێ كە خۆر بەرز بویەوە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ ناردی بەدواما، منیش رۆشتم بۆلای، تەماشام كرد لەسەر تەختەیەكی بە پەلكە خورما چنراوی رووت دانیشتوە دۆشەك و ژێرەخەری لەسەر رانەخراوە، بەڵكو هەر تەختە رەق و تەقەكە بوو، مالیك وتی: لەكاتێكدا كە من چومە ژورەوە بۆلای، وتی: ئەی مال واتە ئەی مالیك، چەند خێزانێ لەهۆزەكەی تۆ هاتوون بۆلام و هانایان هێناوە — وەك ئەوەی وشكە سالی رووی تێ كردبن - ، منیش هەندێ یارمەتیم بڕیارداوە بۆیان، مالەكە وەر بگرە خۆت دابەشی بكە بەسەریاندا، منیش وتم: خۆزگە فەرمانت دەكرد بە كەسێكی تر ئەو كارە بكات، عومەر وتی: دەبێ وەری بگری. دەرگەوانەكەی كە ناوی (يَرْفَأ) بوو هات وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران، (عُثْمَان)ی كوڕی عەففان و (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی عەوف و زوبێری كوڕی عەوام و سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص لەدەرەوە چاوەڕوانن، دەتەوێ بێنە ژورەوە بۆلات؟ عومەر وتی: بەڵێ، مۆڵەتی پێ دان چونەژورەوە، لەپاش كەمێ (يَرْفَأ) هاتەوە بۆلای وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران، عەباس و عەلیش لەدەرەوە چاوەڕوانن، دەتەوێ بێنە ژورەوە بۆلات؟ عومەر وتی: بەڵێ، مۆڵەتی پێ دان چونەژورەوە، عەباس وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران دادگایی من و عەلی بكە، هەندێك لەوانەی كە ئامادەبوون واتە لە (عُثْمَان) و هاوڕێكانی وتیان: ئەی پێشەوای باوەڕداران دادگایی نیوان ئەم دوانە بكەو لەو كێشەیە رزگاریان بكە. مالیكی كوڕی ئەوس وتی: وائەزانم كە عەباس و عەلی ئەو نەفەرانەیان لەپێش خۆیانەوە ناردبوو بۆ ئەوەی لەو كێشەیەدا قسەی خێر بكەن - . لەپاشدا پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ رووی كردە ئەو كۆمەڵە واتە (عُثْمَان) و هاوڕێكانی وتی: لەسەرخۆو ئارام بن، تو ئەو خوایەی كە بە فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی راوەستاوە، ئایا ئاگادارن كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە

ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت). وتیان: بەڵێ، لەپاشدا عومەر رووی کردە عەباس و عەلی رەزای خوایان لێ بێ، وتی: تو ئەو خوایەی کە بە فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی راوەستاوە، ئێوەش ئاگادارن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت). ئەوانیش وتیان: بەڵێ، وتی: خوای گەورە لەم ماڵی(فيء)ە هەندێ شتی بە تایبەتی تەرخان کردوە بۆ پێغەمبەرەکەی، ئەو تایبەتمەندیەشی بە کەسی تر نەداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾). سورة الحشر: ٦.

واتە: ئەو دەستکەوتانە، خوای گەورە لەجولەکەی سەندوە و بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەکەی، ئێوە هیچ خۆتان ماندو نەکردبو بۆ بەدەستهێنانی، نە بەسواری ئەسپ بۆی چوبون نە بەسواری وشتر واتە هیچ ئەسپ و وشترێکتان بۆ تاو نەداوە، بەڵکو ئەوە خوایە پێغەمبەرەکەی زاڵ دەکات بەسەر هەر دەستەو تاقمێکدا کە بیەوێت، خوایش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

خوای گەورە ماڵی (بنی نضیر)ی بە (فيء) بەخشیە پێغەمبەرەکەی - (الْفَيْء): ئەو ماڵ و سامانەیە بەبێ جەنگ و کوشتار دەستی موسوڵمانان دەکەوێت - ، سوێند بە (الله) ئەو ماڵەی بە تەنها بۆخۆی خەرج نەدەکرد ئیللا بەشی ئێوەشی لێ دەدا، ، ئەگەرچی بە تەنها بۆ خۆشی تەرخان کرابوو لەلایەن خوای گەورەوە، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەرجی و رۆزی ساڵانەی خۆی و خاوخێزانی لە ماڵی(فيء) دابین دەکرد، ئەوەشی کە دەمایەوە خەرجی دەکرد بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان. ئینجا رووی کردە کۆمەڵەکە واتە (عُثْمَان) و هاورێکانی، وتی: تو ئەو خوایەی کە بە فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی راوەستاوە، ئێوەش ئاگادارن و ئەوە دەزانن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو شێوەیە ئەو ماڵەی خەرج دەکرد، وتیان: بەڵێ، لەپاشدا رووی کردە عەباس و عەلی

ڕەزای خوایان لێ بێ، وتی: تو ئەو خوایەی کە بە فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی ڕاوەستاوە، ئێوەش ئاگادارن و ئەوە دەزانن، وتیان: بەڵێ. کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد ئەبو بەکر وتی: من خەلیفەی پێغەمبەری خودام (صلی الله علیه وسلم) و لەجێی ئەو کاروبارەکانی ئەنجام دەدەم، ئەوە بوو تۆ و ئەمە هاتن بۆلای ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ، تۆ ئەی عەباس داوای میراتت دەکرد لە میراتی برازاکەت، عەلیش داوای میراتی (فاطمة)ی هاوسەری دەکرد، لە میراتی باوکی، ئەبو بەکریش وتی: شتی وا نییە، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت). خوای گەورە دەزانێت کە ئەبو بەکر ڕاستگۆو چاکەکار و هەقخواز و شوێنکەوتەی هەق و ڕاستی بوو، هەتا لەژیاندا بوو ئەو ماڵەی نەدانێ. کاتێ کە ئەبو بەکر وەفاتی کردو منیش بووم بە جێنشینی، وتم: من جێنشینی پێغەمبەری خودام (صلی الله علیه وسلم) هەروەها جێنشینی ئەبو بەکریشم، بڕیارم دا ئەوەندەی کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێ پەیڕەوی ئەوان بکەم و لە ڕێبازی ئەوان دەرنەچم، جا تۆ ئەی عەباس لەگەڵ عەلی قسەتان کردبو بە یەك و هاتن بۆلای من، داوای میراتەکەتان لێ کردم، منیش وتم: ئەگەر دەتانەوێ میراتەکەتان تەسلیم دەکەم بەمەرجێ بەڵێن و پەیمان بدەن بە خوای گەورە پەیڕەوی ئەو بەرنامەیە بکەن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەژیانی خۆیدا جێبەجێی دەکرد بەو شێوەیە خەرجی بکەن، جا بەڵێن و پەیمانتان پێ دام. لەپاشدا هاتنەوە بڕیارێکی ترتان بۆ بدەم و دابەشی بکەم بەسەرتاندا، سوێند بە (الله) هەتا لەژیاندا بم جگە لەو بڕیارە بڕیاری ترتان بۆ نادەم، ئەگەر ناشتوانن بەرنامەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەکر و من جێبەجێ بکەن ئەوا بەرەو ڕووی خۆمی بکەنەوە و بۆم بگێڕنەوە.

ئەبو داود دەڵێت: عەباس و عەلی ئەوەیان دەزانی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت). داوایان

لیٚ كرد لەنێوانیاندا دابەشی بكات و یەكی نیوەیان بداتیٚ، وە هەردوكیان هەق و راستیان دەویست. پێشەوا عومەر وتی: نابیٚ ناوی میرات و دابەشكردنی لیٚ بنرێت - نەوەكا بە تێپەڕبونی ڕۆژگار دابەشی بكەن بەسەر میراتبەرانیدا - ، وازی لیٚ بهێنن با وەك خۆی بمێنێتەوە.

٢٩٦٤ - (صحيح) عن مالك بن أوس بهذه القصة قال: وَهُمَا - يَعْنِى عَلِيًّا وَالْعَبَّاسَ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُمَا - يَخْتَصِمَانِ فِيمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَمْوَالِ بَنِى النَّضِيرِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: أَرَادَ أَنْ لاَ يُوقِعَ عَلَيْهِ اسْمَ قَسْمٍ.

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەوسەوە، هەمان بەسەرهات هاتوە، وتی: ئەو دوانە — واتە عەباس و عەلی رەزای خوایان لیٚ بیٚ — كێشە كەوتە نیوانیانەوە لەسەر مالی (بنی نضیر)ی كە خوای گەورە بە (فيء) تەرخانی كردبو بۆ پێغەمبەرەكەی.

ئەبو داود دەڵێت: پێشەوا عومەر دەیویست ناوی میرات و دابەشكردنی لیٚ نەنرێت.

٢٩٦٥ - (صحيح) عن عمر قال: كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِى النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالِصًا يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ - قَالَ ابْنُ عَبْدَةَ يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ قُوتَ سَنَةٍ - فَمَا بَقِىَ جُعِلَ فِى الْكُرَاعِ وَعُدَّةً فِى سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قَالَ ابْنُ عَبْدَةَ: فِى الْكُرَاعِ وَالسِّلاَحِ.

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: مـالّی (بنـی نضـیر) لەو مالاّنە بوو كە خوای گەورە بـە (فيء) تـەرخانی كردبـو بـۆ پێغەمبەرەكـەی، موسوڵمانان بۆ بەدەستهێنانی هیچ خۆیان ماندو نەكردبو، هیچ ئەسـپ و وشـترێكیان بـۆ تاو نەدابو، بەڵكو بەبێ جەنگ دەستیان كەوتبو، بە تەنها تایبەت بوو بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش بۆ خۆی و خاوخێزانی خەرج دەكـرد، ئەوەشـی كـە دەمایـەوە چەك و ئەسپ و ولاّخی سواری پـێ دەكـڕی بـۆ ئامادەكـاری بـەكارهێنان لـەرێی خـوای گەورەدا. ئیبنو عەبدە دەڵێت: چەك و ئەسپی پێ دەكڕی بۆ جیهادكردن لەرێی خوادا.

**٢٩٦٦ - (صحيح) عن الزهري قـال: قـال عمـر: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ). قـالَ الزُّهْـرِيُّ: قَالَ عُمَرُ: هَذِهِ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاصَّةً قُرَى عُرَيْنَةَ: فَدَكَ: وَكَذَا وَكَذَا، مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَ لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِـنْ دِيَـارِهِمْ وَأَمْـوَالِهِمْ، وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ. وَالَّذِينَ جَـاءُوا مِـنْ بَعْدِهِمْ، فَاسْتَوْعَبَتْ هَذِهِ الآيَةُ النَّاسَ، فَلَـمْ يَبْـقَ أَحَـدٌ مِـنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ لَهُ فِيهَا حَقٌّ - قَالَ أَيُّوبُ: أَوْ قَالَ: حَـظٌّ - إِلاَّ بَعْضَ مَنْ تَمْلِكُونَ مِنْ أَرِقَّائِكُمْ.**

واتە: لە زوهریەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ وتی: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ). سورة الحشـر: ٦. واتـە:

ئەو دەستكەوتانە، خواى گەورە لەجولەكەى سەندوە و بەخشیویەتى بە پێغەمبەرەكەى، ئێوە هیچ ئەسپ و وشترێكتان بۆ تاو نەداوە.

زوهرى دەڵێت: پێشەوا عومەر ڕەزاى خواى لێ بێ وتویەتى: ئەمە تەنها تایبەتە بە پێغەمبەرى خواوە (صلى الله علیه وسلم) دێهاتى عورەینە: فەدەك و ئەوەو ئەوە - واتە وەكماڵى (قریظة) و (بني نضیر) - ، ئەو دەستكەوتانەى، خواى گەورە بەخشیویەتى بە پێغەمبەرەكەى لە خەڵكى دێهات و شارەكانى جولەكە، ئەوە خوا بڕیارى لەسەرداوە كە بۆ پێغەمبەر و خزمانیەتى، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە، وە بۆ نەدارانى كۆچكەرانە ئەوانەى كە دەركران لەماڵ و سامانیان، وە بۆ ئەو هەژارانەى كە لەپێش كۆچكەراندا نیشتەجێبون لە مەدینە و كردیان بە بارەگاى باوەڕ، ئەوانەش لەپاش ئەمانەوە هاتوون، ئەم ئایەتە هەموو خەڵكى گرتەوە بە گشتى، هیچ موسوڵمانێ نەمایەوە هەقى تێیدا نەبێ، ئەیوب وتى: یان لە جیاتى (حَقٌّ) وتى: (حظ) واتە: بەشى، تەنها كەنیزەك بەندەكانتان نەبێ كە ئەوانە هەقیان لەو ماڵى (فيء)ەدا نیە.

**٢٩٦٧ - (حسن الإسناد) عن مالك بن أوس بن الحدثان قال: كَانَ فِيمَا احْتَجَّ بِهِ عُمَرُ رضى الله عنه أَنَّهُ قَالَ: كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثُ صَفَايَا: بَنُو النَّضِيرِ، وَخَيْبَرُ، وَفَدَكُ. فَأَمَّا بَنُو النَّضِيرِ: فَكَانَتْ حُبْسًا لِنَوَائِبِهِ، وَأَمَّا فَدَكُ فَكَانَتْ حُبْسًا لأَبْنَاءِ السَّبِيلِ، وَأَمَّا خَيْبَرُ فَجَزَّأَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ: جُزْءَيْنِ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، وَجُزْءًا نَفَقَةً لأَهْلِهِ، فَمَا فَضَلَ عَنْ نَفَقَةِ أَهْلِهِ جَعَلَهُ بَيْنَ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ.**

واتە: لە مالیكی كوڕی ئەوسی كوڕی (الحدثان)ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ بەڵگەی هێناوەتەوە كە ماڵی (فيء) دابەش ناكرێ بەڵكو بەشی خەرجی خێزانەكانی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) لێ دادەنرێ و ئەوەشی كە مایەوە لەپێناوی خوای گەورەدا خەرج دەكرێ، بە ئامادەبونی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو كارەی كردو هیچیان ئینكاریان نەكرد، عومەر وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ پشكی هەڵبژاردەی هەبوو: ئەوانەش (بَنُو النَّضِيرِ) و خەیبەر و فەدەك بوون. دەستكەوتی (بَنُو النَّضِيرِ) تەرخان كرابو بۆ لیقەومان و دیوەخان و كڕینی چەك و كەرەسەی جەنگی و دەستگیرۆیی هەژاران، (فَدَك)یشی تەرخان كردبو بۆ كۆمەكی ڕێبواران، دەستكەوتی خەیبەریش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی كردبوی بە سێ بەشەوە: دوو بەشی دەبەخشیەوە بەناو موسوڵمانانندا، بەشەكەی تریشی دادەنا بۆ خەرجی خاوخێزانی، ئەوەشی كە لەوان دەمایەوە دەیدا بەو هەژارانەی لە مەككەوە كۆچیان كرد بۆ مەدینە.

**٢٩٦٨ - (صحيح) عن عروة بن الزوبير، عن عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم أنها قالت: أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرْسَلَتْ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضى الله عنه تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ بِالْمَدِينَةِ وَفَدَكَ وَمَا بَقِيَ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ مِنْ هَذَا الْمَالِ). وَإِنِّي وَاللَّهِ لاَ أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْ صَدَقَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ حَالِهَا الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ**

رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلأَعْمَلَنَّ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه أَنْ يَدْفَعَ إِلَى فَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلاَمُ مِنْهَا شَيْئًا.

واته: له عوروەی كوڕی زوبەیرەوه دەگێرنەوه، عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی گێراوەتەوه، كه (فاطمة)ی كچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەدوای وەفاتی باوكی ناردی بۆلای پێشەوا ئەبو بەكری صدیق رەزای خوای لێ بێ داوای بەشه میراتی خۆی لێ كرد، له میراتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەی كه خوای گەورە بە (فيء) پێی بەخشی له مەدینەو فەدەك و، لەو بەشەی كه له پێنج یەكی دەستكەوتی خەیبەر دەمایەوه. پێشەوا ئەبو بەكری صدیق رەزای خوای لێ بێ وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (میرات له ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمه بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەكرێت، بەڵام خەرجی كەسوكاری موحەممەد لەسەر (بيت المال)ە). سوێند بە (الله) من هیچ شتێ له خێر و خێراتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناگۆڕم، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چی لەم ماڵه كردوه منیش هەروای لێ دەكەم، پێشەوا ئەبو بەكر رەزای خوای لێ بێ قایل نەبوو هیچ شتێ لەو ماڵه بدات بە (فاطمة).

٢٩٦٩ - (صحيح) عن عروة بن الزوبير، أنّ عائشة زوج النبي صلى الله عليه وسلم، أخبرته بهذا الحديث، قال: وَفَاطِمَةُ عَلَيْهَا السَّلاَمُ حِينَئِذٍ تَطْلُبُ صَدَقَةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّتِي بِالْمَدِينَةِ، وَفَدَكَ، وَمَا بَقِيَ مِنْ خُمُسِ خَيْبَرَ. قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ،

وَإِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ فِى هَـذَا الْمَـالِ). يَعْنِـى مَـالَ اللَّـهِ، (لَيْسَ لَهُمْ أَنْ يَزِيدُوا عَلَى الْمَأْكَلِ).

واتە: لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە هاتوە، کە عائیشەی خێزانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموودەی پێشوی بۆ گێڕاوەتەوە، عوروە وتی: لەوکاتەدا (فاطمة)سەلامی خوای لەسەر بێ داوای بەشە میراتی خۆی لێ کرد، لە میراتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەوەی کە خوای گەورە بە (فيء) پێی بەخشی لە مەدینەو فەدەك و، لەو بەشەی کە لە پێنج یەکی دەستکەوتی خەیبەر دەمایەوە. عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ وتی: پێشەوا ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خوای لێ بێ وتی: بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت، بەڵام خەرجی کەسوکاری موحەممەد لەسەر (بیت المال)ە). واتە لە ماڵی خوا، کەسوکاری موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە خواردن و خەرجی ساڵانە زیاتریان بۆ نیە.

٢٩٧٠ - (صحيح) عن ابن شهاب قال: أخبرني عروة أن عائشة رضي الله عنها، أخبرته بهذا الحديث، قال فيه: فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَيْهَا ذَلِكَ، وَقَالَ لَسْتُ تَارِكًا شَيْئًا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعْمَلُ بِهِ، إِلاَّ عَمِلْتُ بِهِ، إِنِّى أَخْشَى إِنْ تَرَكْتُ شَيْئًا مِنْ أَمْرِهِ أَنْ أَزِيغَ. فَأَمَّا صَدَقَتُهُ بِالْمَدِينَةِ فَدَفَعَهَا عُمَرُ إِلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُم، فَغَلَبَهُ عَلِيٌّ عَلَيْهَا، وَأَمَّا خَيْبَرُ وَفَدَكُ فَأَمْسَكَهُمَا عُمَرُ وَقَالَ: هُمَا صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَتَا لِحُقُوقِهِ

الَّتِي تَعْرُوهُ وَنَوَائِبِهِ، وَأَمْرُهُمَا إِلَى مَنْ وَلِيَ الأَمْرَ. قَالَ: فَهُمَا عَلَى ذَلِكَ إِلَى الْيَوْمِ.

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: عورووە بۆی باس کردم، کە عائیشە فەرمودەی پێشوی بۆ گێڕاوەتەوە، زوهری لە فەرمودەکەیدا وتی: پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ ئینکاری کردو قایل نەبوو هیچ شتێ لەوماڵەی بداتێ واتە بە (فاطمة)، وتیشی: واز لە کارێ ناهێنم کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەیڕەوی لێ کردوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو ماڵەی چی لەو ماڵە کردوە منیش پەیڕەوی دەکەم ئاوەهای لێ دەکەم، دەترسم شتێ لە فەرمانی ئەو جێبەجێ نەکەم ئەو کاتە لە هەق لادەم و گومڕا ببم. جا خێر و خێراتەکەی مەدینەی دایە دەست عەباس و عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ، عەلی دەستی بەسەردا گرت، بەڵام پشکی خەیبەر و فەدەکی نەدا بەکەس وتی: ئەم دوانە خێر و خێراتی پێغەمبەری خودان (صلی الله علیه وسلم) بۆ دەستگیرۆیی هەژاران و ئەوانەی کە دەهاتن داوای شتێکیان لێ دەکرد، کاری ئەو دوانە واتە پشکی خەیبەر و فەدەك لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدەست خەلیفەی موسوڵمانان بوو. زوهری وتی: ئەو دوانە هەتا ئەم ڕۆژگارەش هەر بەو شێوەیەن.

٢٩٧١ - (ضعيف الإسناد) عن الزهري في قوله: ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾. قال: صَالَحَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْلَ فَدَكَ - وَقُرًى قَدْ سَمَّاهَا لاَ أَحْفَظُهَا - وَهُوَ مُحَاصِرٌ قَوْمًا آخَرِينَ فَأَرْسَلُوا إِلَيْهِ بِالصُّلْحِ قَالَ: ﴿فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ﴾. يَقُولُ: بِغَيْرِ قِتَالٍ. قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَكَانَتْ بَنُو النَّضِيرِ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَالِصًا لَمْ

**يَفْتَحُوهَا عَنْوَةً، افْتَتَحُوهَا عَلَى صُلْحٍ فَقَسَمَهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَ الْمُهَاجِرِينَ، لَمْ يُعْطِ الأَنْصَارَ مِنْهَا شَيْئًا، إِلاَّ رَجُلَيْنِ كَانَتْ بِهِمَا حَاجَةٌ.**

واته: لە زوهریەوە دەربارەی ئەم ئایەتەوە: (فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ). وتويەتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێکهاتنی کرد لەسەر فەدەك - و چەند دێهاتێکی تر شێخەکەم ناوی بردن بەلاّم من بۆم لەبەر نەکرا - ، لەوکاتەدا لەگەلّ فەدەکدا گەمارۆی قەومێکی تری دابوو — لە خەلّکی خەیبەر - ئەوانیش ناردیان بۆلای داوایان لیّ کرد کە پێکهاتنیان لەگەلّ بکات، خوای گەورە فەرمووی: (فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ). وتی: واتە بە بیّ جەنگ و کوشتار، زوهری وتی: مالّی (بنو نضير) بەتایبەت بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار نەگیرا، بەلّکو بە پێکهاتن رزگار کرا، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دابەشی کردن بەسەر موهاجرین دا ئەوانەی کە لە مەککەوە کۆچیان کردبو بۆ مەدینە چونکە زۆر پێویستیان بوو مالّ و سامانیان لە مەککە بەجێهێشتبو لە پێناوی خوای گەورەدا، هیچ شتێکی لیّ نەدا بە ئەنصارەکان، تەنیا بەشی دوو کەسیان نەبیّ ئەوانیش زۆر پێویستیان پێی هەبوو.

**٢٩٧٢ - (ضعيف) عَنِ الْمُغِيرَةِ قَالَ جَمَعَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ بَنِي مَرْوَانَ حِينَ اسْتُخْلِفَ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَتْ لَهُ فَدَكُ، فَكَانَ يُنْفِقُ مِنْهَا وَيَعُودُ مِنْهَا عَلَى صَغِيرِ بَنِي هَاشِمٍ، وَيُزَوِّجُ مِنْهَا أَيِّمَهُمْ، وَإِنَّ فَاطِمَةَ سَأَلَتْهُ أَنْ يَجْعَلَهَا لَهَا، فَأَبَى فَكَانَتْ كَذَلِكَ فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ، فَلَمَّا أَنْ وَلِيَ أَبُو بَكْرٍ**

رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَمِلَ فِيهَا بِمَا عَمِلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي حَيَاتِهِ حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ فَلَمَّا أَنْ وَلِيَ عُمَرُ عَمِلَ فِيهَا بِمِثْلِ مَا عَمِلاَ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ، ثُمَّ أَقْطَعَهَا مَرْوَانُ، ثُمَّ صَارَتْ لِعُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، (ثم) قَالَ: عمر - يَعْنِي عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ -: فَرَأَيْتُ أَمْرًا مَنَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاطِمَةَ (عَلَيْهَا السَّلاَمُ) لَيْسَ لِي بِحَقٍّ، وَأَنَا أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ رَدَدْتُهَا عَلَى مَا كَانَتْ. يَعْنِي عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَلِيَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ الْخِلاَفَةَ وَغَلَّتُهُ أَرْبَعُونَ أَلْفَ دِينَارٍ، وَتُوُفِّيَ وَغَلَّتُهُ أَرْبَعُمِائَةِ دِينَارٍ، وَلَوْ بَقِيَ لَكَانَ أَقَلَّ.

واتە: لە موغیرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە عومەری کوڕی (عبد العزیز) بوو بە خەلیفە هۆزی بەنو مەروانی کۆکردەوە وتی: ماڵ و سامانی فەدەك تایبەت بوو بە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم)، جار لەدوای جار بە چاکی بەشی منداڵە بچوك و هەتیوەکانی بەنی هاشیمی لێ دەدا کاتێ کە دەهاتنەوە داوایان دەکرد بەشی دەدانەوە، هەروەها بەشی ئەو ئافرەت و پیاوانەی دەدا کە هاوسەریان نەبوو، (فاطمة) داوای لێ کرد کە فەدەك بۆ ئەو بێ، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قایل نەبوو، داواکەی رەتکردەوەو قبوڵی نەکرد، ئیتر لەژیانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەو شێوەیە بوو، هەتا وەفاتی کرد، کاتێ کە پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەژیانی خۆیدا لەوبارەوە چی کرد ئەویش هەر بەو شێوەیەی کرد، هەتا وەفاتی کرد، کاتێ کە پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەبو بەکر لەوبارەوە چیان کرد ئەویش هەر

بەو شێوەیەی کرد، هەتا وەفاتی کرد. لەپاشدا مەروانی کوڕی حەکەم باپیری عومەر بچڕی بۆ خۆی و شوێنکەوتوانی، کاتیّ کە عومەر بوو بە خەلیفە فەدەك کەوتە دەستی، لەپاشدا عومەر وتی: واتە عومەری کوڕی (عبد العزیز) - : پێم وایە شتیّ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رێگری لیّ کردبیّ کە بۆ (فاطمة) نەبیّ، ئەگەر (فاطمة) هەقی نەبیّ، ئیتر کەس هەقی ئەوەی نیە، ئەوا من ئێوە دەکەم بە شایەت کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارە چۆن بوە منیش هەر بەو شێوەیەی لیّ دەکەم.

ئەبو داود دەڵێت: کاتیّ کە عومەری کوڕی (عبد العزیز) بوو بە خەلیفە ماڵ و سامانەکەی چل هەزار دینار بوو، کاتیّ کە وەفاتی کرد چوار سەد دینار بوو، ئەگەر بمایە کەمتری دەکرد.

**٢٩٧٣ - (حسن) عن أبي الطفيل رضي الله عنه قال: جَاءَتْ فَاطِمَةُ رضى الله عنها إِلَى أَبِى بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ تَطْلُبُ مِيرَاثَهَا مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَطْعَمَ نَبِيًّا طُعْمَةً فَهِيَ لِلَّذِي يَقُومُ مِنْ بَعْدِهِ).**

واتە: لە (أبي الطفیل)ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کاتیّ کە پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لیّ بیّ بوو بە خەلیفە (فاطمة) هات بۆلای داوای بەشە میراتی خۆی لیّ کرد، لە میراتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، (أبي الطفیل) وتی: پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لیّ بیّ وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە خواردنیّ یان ماڵێکی بە (فيء) بەخشی بە

پێغەمبەرێ، ئەو پێغەمبەرە چۆنی خەرج کردوە، دەبێ ئەو کەسەش کە دەبێتە جێنشینی هەر بەو شێوەیە خەرجی بکات).

**٢٩٧٤ - (صحيح) عن أبو هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وآله وسلم أنه قال: (لاَ تَقْتَسِمُ وَرَثَتِي دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ). قَالَ أَبُو دَاوُدَ: (مُؤْنَةِ عَامِلِي). يَعْنِي أَكَرَةَ الأَرْضِ.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (میراتبەرانی من دینار — و درهەم - دابەش ناکەن، ئەوەی لەپاش خۆم بەجێ دەمێنێ لەپاش خەرجی خێزانەکانم و خەرجی خەلیفەو ئیشکەرەکانم خێر و صەدەقەیە بۆ هەژاران). ئەبو داود دەڵێت: (مُؤْنَةِ عَامِلِي). واتە: ئەوانەی کە خەریکی کشتوکاڵن.

**٢٩٧٥ - (صحيح) عن أبو البختري قال: سَمِعْتُ حَدِيثًا مِنْ رَجُلٍ فَأَعْجَبَنِي فَقُلْتُ: اكْتُبْهُ لِي، فَأَتَى بِهِ مَكْتُوبًا مُذَبَّرًا: دَخَلَ الْعَبَّاسُ وَعَلِيٌّ عَلَى عُمَرَ، وَعِنْدَهُ طَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَسَعْدٌ، وَهُمَا يَخْتَصِمَانِ، فَقَالَ عُمَرُ لِطَلْحَةَ وَالزُّبَيْرِ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ وَسَعْدٍ: أَلَمْ تَعْلَمُوا أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (كُلُّ مَالِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَدَقَةٌ، إِلاَّ مَا أَطْعَمَهُ أَهْلَهُ وَكَسَاهُمْ، إِنَّا لاَ نُورَثُ). قَالُوا بَلَى. قَالَ: فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنْفِقُ مِنْ**

مَالِهِ عَلَى أَهْلِهِ وَيَتَصَدَّقُ بِفَضْلِهِ، ثُمَّ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَلِيَهَا أَبُو بَكْرٍ سَنَتَيْنِ فَكَانَ يَصْنَعُ الَّذِي كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا مِنْ حَدِيثِ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ.

واتە: لە ئەبو بەختەرییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: فەرمودەیەکم لە پیاوێکەوە بیستوە زۆر پێم سەیر بوو وتم: بۆم بنوسە، بە خەتێکی جوان بۆی نوسیم کە بە ئاسانی دەخوێنرایەوە: عەباس و عەلی کێشەیان هەبوو چونەژورەوە بۆلای پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ، لەوکاتەدا (طلحة) و زوبێر و (عَبْدُ الرَّحْمَن) و سەعد لەخزمەتیدا بوون، پێشەوا عومەر بە (طلحة) و زوبێر و (عَبْدُ الرَّحْمَن) و سەعدی وت: ئایا ئێوە ئاگادارن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەموو ماڵ و سامانێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خێر و صەدەقەیە، جگە لە خەرجی خواردن و کاڵای خێزانەکانی، میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت). هەموویان وتیان: بەڵێ، عومەر وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەسرەف و خەرجی خێزانەکانی لە ماڵ و سامانی خۆی دەکرد، ئەوەشی کە دەمایەوە دەیکرد بە خێر و صەدەقە، لەپاشدا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ بوو بە خەلیفە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەژیانی خۆیدا لەوبارەوە چی کرد ئەویش هەر ئەو کارەی دەکرد، ئینجا ئەبو بەختەری هەندێ لە فەرمودەکەی مالیکی کوڕی (حدثان)ی گێڕایەوە کە پێشتر باسکرا.

٢٩٧٦ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: إِنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ إِلَى أَبِي بَكْرٍ

الصِّدِّيقِ فَيَسْأَلْنَهُ ثُمُنَهُنَّ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ لَهُنَّ عَائِشَةُ: أَلَيْسَ قَدْ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ).

واتە: لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بێگومان کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، خێزانەکانی ویستیان (عُثْمَان)ی کوڕی عەففان ڕەزای خوای لێ بێ بنێرن بۆلای ئەبو بەکری صدیق ڕەزای خوای لێ بێ بۆئەوەی داوای بەشە میراتی خۆیان بۆ بکات، لە میراتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، عائیشە پێی وتن ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەیفەرمووە: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت).

٢٩٧٧ - (حسن) عن ابن شهاب بإسناده نحوه، قلت: أَلاَ تَتَّقِينَ اللَّهَ أَلَمْ تَسْمَعْنَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَإِنَّمَا هَذَا الْمَالُ لآلِ مُحَمَّدٍ لِنَائِبَتِهِمْ وَلِضَيْفِهِمْ فَإِذَا مِتُّ فَهُوَ إِلَى مَنْ وَلِيَ الأَمْرَ مِنْ بَعْدِي).

واتە: لە ئیبنو شیهابەوە فەرموودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە، عائیشە وتی: بە خێزانەکانی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) وت: ئەوە لەخوای گەورە ناترسن، ئایا نەتانبیستوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (میرات لە ئێمەی پێغەمبەران ناگیرێت، ئەوەی لەپاش ئێمە بەجێبمێنێ دەبێ بە خێر و بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان خەرج دەکرێت، بێگومان ئەم ماڵە بۆ کەسوکاری موحەممەد و

لێقەوامان و دەستگیرۆیی هەژاران و میوانانیەتی، کاتێ کە وەفاتیشی کرد ئیتر بۆ ئەو کەسە دەبێت کە لەدوای من کاروباری موسوڵمانان دەگرێتە ئەستۆ).

## باسی سەبارەت بە رونکردنەوەی چۆنیەتی دابەشکردنی پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگی و پشکی کەسوکار و خزمانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

## ٢٠ - باب فِي بَيَانِ مَوَاضِعِ قَسْمِ الْخُمُسِ وَسَهْمِ ذِي الْقُرْبَى.

٢٩٧٨ - (صحيح) عن جبير بن مطعم: أَنَّهُ جَاءَ هُوَ وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ يُكَلِّمَانِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا قَسَمَ مِنَ الْخُمُسِ بَيْنَ بَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَسَمْتَ لإِخْوَانِنَا بَنِي الْمُطَّلِبِ، وَلَمْ تُعْطِنَا شَيْئًا، وَقَرَابَتُنَا وَقَرَابَتُهُمْ مِنْكَ وَاحِدَةٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (إِنَّمَا بَنُو هَاشِمٍ وَبَنُو الْمُطَّلِبِ شَيْءٌ وَاحِدٌ). قَالَ جُبَيْرٌ: وَلَمْ يَقْسِمْ لِبَنِي عَبْدِ شَمْسٍ، وَلاَ لِبَنِي نَوْفَلٍ، مِنْ ذَلِكَ الْخُمُسِ، كَمَا قَسَمَ لِبَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ. قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَقْسِمُ الْخُمُسَ نَحْوَ قَسْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُعْطِي قُرْبَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْطِيهِمْ. قَالَ: وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يُعْطِيهِمْ مِنْهُ، وَعُثْمَانُ بَعْدَهُ.

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئەو و پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەففان دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە پێنج یەکی دەسکەوتی جەنگی بەشی (بَنِي الْمُطَّلِب) و (بنی هاشم)ی دەدا قسەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پێنج یەکی دەسکەوتی جەنگی بەشی (بَنِي الْمُطَّلِب) دەدەی کەچی بەشی ئێمە نادەی لەکاتێکدا کە ئێمەو ئەوان بۆ خزمایەتی وەك یەك بە تۆ دەگەین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بێگومان (بَنو هاشِم) و (بَنو الْمُطَّلِب) یەکێکین)، جوبەیر وتی: لە پێنج یەکی دەسکەوتی جەنگی بەشی (بنی عبد الشمس) و (بنی نَوفَل)ی نەدەدا، وەك چۆن بەشی (بَنو هاشِم) و (بَنو الْمُطَّلِب)ی دەدا، زوهری وتی: پێشەوا ئەبو بەکر بەهەمان شێوە پێنج یەکی دابەش دەکرد بەڵام بەشی خزمانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) نەدەدا، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەشی دەدان، زوهری وتی: بەڵام پێشەوا عومەری کوڕی (خطاب) بەشی خزمانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دەدا، لەپاشدا پێشەوا (عثمان)یش بە هەمان شێوە بەشی دەدان.

٢٩٧٩ - (صحيح) عن جبير بن مطعم: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَقْسِمْ لِبَنِي عَبْدِ شَمْسٍ، وَلاَ لِبَنِي نَوْفَلٍ مِنَ الْخُمُسِ شَيْئًا، كَمَا قَسَمَ لِبَنِي هَاشِمٍ وَبَنِي الْمُطَّلِبِ. قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَقْسِمُ الْخُمُسَ نَحْوَ قَسْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُعْطِي قُرْبَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ،كَمَا كَانَ يُعْطِيهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَ عُمَرُ يُعْطِيهِمْ وَمَنْ كَانَ بَعْدَهُ مِنْهُمْ.

واته: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پێنج یەكی دەسكەوتی جەنگی هیچی بەشی (بـنی عبـد الشـمس) و (بنـی نَوفَـل)ی نەدەدا، وەك چۆن بەشی (بَنِي هاشِم) و (بَنِي الْمُطَّلِب)ی دەدا، زوهری وتی: پێشەوا ئـەبو بەكر بەهەمان شێوە پێنج یەكی دابەش دەكرد بەڵام بەشــی خزمــانی پێغەمبــەری خــوای (صلی الله علیه وسلم) نەدەدا، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیــه وســلم) بەشــی دەدان، بەڵام پێشەوا عومەر بەشی خزمانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دەدا، هــەروەها ئەوانەی كە لەدوای ئەویش بونە پێشەواو كاربەدەست.

٢٩٨٠ - (صحيح) عن جبير بن مطعم قال: لَمَّا كَـانَ يَـوْمُ خَيْبَـرَ وَضَـعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَهْمَ ذِي الْقُرْبَى فِـي بَنِـي هَاشِمٍ، وَبَنِي الْمُطَّلِبِ، وَتَرَكَ بَنِي نَوْفَلٍ وَبَنِي عَبْـدِ شَـمْسٍ، فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ حَتَّى أَتَيْنَا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَؤُلاَءِ بَنُو هَاشِمٍ لاَ نُنْكِـرُ فَضْلَهُمْ لِلْمَوْضِعِ الَّذِي وَضَـعَكَ اللَّـهُ بِـهِ مِـنْهُمْ، فَمَـا بَـالُ إِخْوَانِنَا بَنِي الْمُطَّلِبِ أَعْطَيْتَهُمْ وَتَرَكْتَنَا، وَقَرَابَتُنَـا وَاحِـدَةٌ؟ فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(أَنَا وَبَنُو الْمُطَّلِـبِ لاَ نَفْتَرِقُ فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلاَ إِسْلاَمٍ، وَإِنَّمَا نَحْنُ وَهُمْ شَيْءٌ وَاحِـدٌ). وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ.

واتە: لە جوبەیری کوڕی (مطعم)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە ڕۆژی خەیبەردا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پێنج یەکی دەسکەوتی جەنگی بەشی خزمە نزیکەکانی و (بنی هاشم) و (بَنِی الْمُطَّلِب)ی دا، بەڵام بەشی (بنی عبد الشمس) و (بنی نَوفَل)ی نەدا، من و پێشەوا (عثمان)ی کوڕی عەففان ڕۆشتین هەتا گەیشتینە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە ئینکاری فەزڵ و گەورەیی بەنو هاشیم ناکەین چونکە تۆ لەوانەوە نزیکتری خوای گەورە تۆی لەناو ئەواندا هەڵبژاردوە و پلەوپایەیەکی گەورەی پێ بەخشیوی، ئەی برایانمان لە (بَنِی الْمُطَّلِب) چی کە پشکت بۆ داناون و بەشی ئێمەت دانەناوە لەکاتێکدا کە ئێمەو ئەوان وەك یەکین بۆ تۆ لەڕووی خزمایەتیەوە؟ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (من و (بَنِو الْمُطَّلِب) لەسەردەمی نەزانی و لەسەردەمی ئیسلامدا پێکەوەبوین و لەیەك جیانەبوینەتەوە، بێگومان ئێمەو ئەوان یەکێکین)، پەنجەکانی کرد بەناو یەکدا.

**٢٩٨١ - (صحيح مقطوع) عن السدي فِي ذِي الْقُرْبَى قَالَ: هُمْ بَنُو عَبْدِ الْمُطَّلِبِ.**

واتە: لە سودییەوە هاتوە کە (ذي القربى) (بَنِو الْمُطَّلِب) دەگرێتەوە.

**٢٩٨٢ - (صحيح) عن يزيد بن هرمز: أَنَّ نَجْدَةَ الْحَرُورِيَّ حِينَ حَجَّ فِي فِتْنَةِ ابْنِ الزُّبَيْرِ أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ يَسْأَلُهُ عَنْ سَهْمِ ذِي الْقُرْبَى، وَيَقُولُ: لِمَنْ تَرَاهُ؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لِقُرْبَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَسَمَهُ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَدْ كَانَ عُمَرُ عَرَضَ عَلَيْنَا مِنْ ذَلِكَ عَرْضًا رَأَيْنَاهُ دُونَ حَقِّنَا فَرَدَدْنَاهُ عَلَيْهِ، وَأَبَيْنَا أَنْ نَقْبَلَهُ.**

واتە: لە یەزیدی كوڕی هورمزەوە دەگێڕنەوە، كە نەجدەی حەروری - سەرۆكی خەواریجەكان - لەسەردەمی فیتنەی ئیبنو زوبێردا چو حەجی كرد، جا كەسێكی نارد بۆ لای ئیبنو عەباس رەزای خوای لێ بێ بۆئەوەی پرسیاری لێ بكات دەربارەی پشكی كەسوكار و خزمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەروەها وتی: بە بۆچونی تۆ ئەو پشكە بە كێ دەدرێت؟ ئیبنو عەباس وتی: دەدرێت بە كەسوكار و خزمانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چونكە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەژیانی خۆیدا دابەشی دەكرد بەسەریاندا، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ پێشنیاری كرد بۆمان كە پشكی كەسوكار و خزمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بداتە دەست ئێمە دابەشی بكەین و خەرجی ئەوانەی لێ بدەین كە هەقیان هەیە بەشیان بدرێت بەڵام ئێمە ئەوەمان بە هەقی خۆمان نەزانی و قبوڵمان نەكرد.

**٢٩٨٣ - (ضعيف الإسناد) عن عبد الرحمن بن أبي ليلى قال: سَمِعْتُ عَلِيًّا يَقُولُ: وَلاَّنِى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خُمُسَ الْخُمُسِ، فَوَضَعْتُهُ مَوَاضِعَهُ حَيَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَحَيَاةَ أَبِى بَكْرٍ، وَحَيَاةَ عُمَرَ، فَأُتِىَ بِمَالٍ، فَدَعَانِى، فَقَالَ خُذْهُ. فَقُلْتُ: لاَ أُرِيدُهُ. قَالَ: خُذْهُ فَأَنْتُمْ أَحَقُّ بِهِ. قُلْتُ، قَدِ اسْتَغْنَيْنَا عَنْهُ، فَجَعَلَهُ فِى بَيْتِ الْمَالِ.**

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئیبنو ئەبی لەیلاوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كردمی بە سەرپەرشتیاری پێنج یەكی پێنج یەك، منیش لەجێی خۆیدا سەرفم كرد لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و سەردەمی پێشەوایان ئەبو بەكر و عومەردا، ماڵ و سامانێكی زۆریان هێنا بۆ پێشەوا عومەر، بانگی كردم، وتی: ئەو ماڵە بگرە، وتم:

نامەوێت سەرپەرشتیاری ناكەم، وتی: بیگرە ئێوە شایستەترین كەسن بەو ماڵە، وتم: پێویستمان پێی نیە، ئیتر ماڵ و سامانەكەی خستە (بیت المال) واتە گەنجینەی موسوڵمانان.

**٢٩٨٤ - (ضعيف الإسناد) عن عبد الرحمن بن أبي ليلى قال: سَمِعْتُ عَلِيًّا عَلَيْهِ السَّلاَمُ يَقُولُ: اجْتَمَعْتُ أَنَا وَالْعَبَّاسُ وَفَاطِمَةُ وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ رَأَيْتَ أَنْ تُوَلِّيَنِي حَقَّنَا مِنْ هَذَا الْخُمُسِ فِي كِتَابِ اللَّهِ، فَأَقْسِمَهُ حَيَاتَكَ كَيْ لاَ يُنَازِعَنِي أَحَدٌ بَعْدَكَ، فَافْعَلْ، قَالَ: فَفَعَلَ ذَلِكَ، قَالَ: فَقَسَمْتُهُ حَيَاةَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ وَلاَّنِيهِ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، حَتَّى إِذَا كَانَتْ آخِرُ سَنَةٍ مِنْ سِنِي عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَإِنَّهُ أَتَاهُ مَالٌ كَثِيرٌ، فَعَزَلَ حَقَّنَا، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيَّ، فَقُلْتُ بِنَا عَنْهُ الْعَامَ غِنًى: وَبِالْمُسْلِمِينَ إِلَيْهِ حَاجَةٌ، فَارْدُدْهُ عَلَيْهِمْ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ لَمْ يَدْعُنِي إِلَيْهِ أَحَدٌ بَعْدَ عُمَرَ. فَلَقِيتُ الْعَبَّاسَ بَعْدَ مَا خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِ عُمَرَ، فَقَالَ: يَا عَلِيُّ، حَرَمْتَنَا الْغَدَاةَ شَيْئًا لاَ يُرَدُّ عَلَيْنَا أَبَدًا، وَكَانَ رَجُلاً دَاهِيًا.**

واتە: لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی كوڕی ئیبنو ئەبی لەیلاوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: بیستم لە پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: من و عەباس و (فاطمة)و زەیدی كوڕی (حارثة) كۆبوینەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تۆ من دەكەیتە سەرپەرشتیاری ئەم پێنج یەكە كە خوای گەورە لە

قورئانەکەیدا بۆی دیاریکردوین، دابەشی بکەم بەسەر ئەوانەدا کە شایستەن دەی لەژیانی خۆتدا دابەشی بکە با لەدوای تۆ کەس کێشەم بۆ دروست نەکات لەسەری، پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو کارەی کرد، هەروەها وتی: لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دابەشم کرد بەسەر ئەوانەدا کە شایستەن، لەپاشدا پێشەوا ئەبو بەکر رەزای خوای لێ بێ کردمی بە سەرپەرشتیاری بە هەمان شێوە دابەشم کرد، هەتا کۆتا ساڵی سەردەمی خەلیفایەتی پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ ماڵ و سامانێکی زۆریان بۆ هێنا، بەشی ئێمەی جیاکردەوە، ئینجا ناردی بەدواما بۆ ئەوەی دابەشی بکەم بەسەر خزماندا، وتم: ئێمە ئەمساڵ دەوڵەمەندین و پێویستمان پێی نیە، موسوڵمانان زۆریان پێویستە بیدە بەوان، پێشەوا عومەریش دابەشی کرد بەسەر موسوڵمانە هەژارەکاندا، ئیتر لەدوای عومەر کەس بانگی نەکردم بۆ ئەو مەبەستە. کاتێ کە لەلای پێشەوا عومەر هاتمەوە گەیشتم بە عەباس وتی: ئەی عەلی ئەم بەیانیە لە شتێ بێ بەشت کردین ئیتر هەرگیز بۆمان ناگەڕێتەوە، بێگومان عەباس پیاوێکی ماقوڵ و لێهاتو خاوەن راو بۆچون بوو.

**٢٩٨٥ – (صحيح) عن عبد الله بن الحارث بن نوفل الهاشمي: أَنَّ عَبْدَ الْمُطَّلِبِ بْنَ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَاهُ رَبِيعَةَ بْنَ الْحَارِثِ، وَعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، قَالاَ لِعَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ رَبِيعَةَ وَلِلْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ: ائْتِيَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُولاَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ بَلَغْنَا مِنَ السِّنِّ مَا تَرَى، وَأَحْبَبْنَا أَنْ نَتَزَوَّجَ، وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَبَرُّ النَّاسِ وَأَوْصَلُهُمْ، وَلَيْسَ عِنْدَ أَبَوَيْنَا مَا يُصْدِقَانِ عَنَّا، فَاسْتَعْمِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلَى الصَّدَقَاتِ، فَلْنُؤَدِّ إِلَيْكَ مَا**

يُؤَدِّى الْعُمَّالُ، وَلْنُصِبْ مَا كَانَ فِيهَا مِنْ مِرْفَقٍ. قَالَ: فَـأَتَى إِلَيْنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ وَنَحْنُ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، فَقَالَ لَنَا: إِنَّ رَسُولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ: لاَ وَاللَّـهِ لاَ نَسْتَعْمِلُ مِنْكُمْ أَحَدًا عَلَى الصَّدَقَةِ. فَقَالَ لَهُ رَبِيعَةُ: هَذَا مِنْ أَمْرِكَ، قَدْ نِلْتَ صِهْرَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَـمْ نَحْسُدْكَ عَلَيْهِ، فَأَلْقَى عَلِيٌّ رِدَاءَهُ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَيْهِ: فَقَـالَ: أَنَا أَبُو حَسَنٍ الْقَـرْمُ، وَاللَّـهِ لاَ أَرِيـمُ حَتَّـى يَرْجِـعَ إِلَيْكُمَـا ابْنَاكُمَا بِجَوَابِ مَا بَعَثْتُمَا بِهِ إِلَى النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ. قَالَ عَبْدُ الْمُطَّلِبِ: فَانْطَلَقْتُ أَنَا وَالْفَضْـلُ إِلَـى بَـابِ حُجْرَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَتَّى نُوَافِقَ صَلاَةَ الظُّهْـرِ قَدْ قَامَتْ، فَصَلَّيْنَا مَعَ النَّاسِ، ثُمَّ أَسْرَعْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ إِلَى بَابِ حُجْرَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُـوَ يَوْمَئِـذٍ عِنْـدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَقُمْنَا بِالْبَابِ حَتَّى أَتَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَخَذَ بِأُذُنِى وَأُذُنِ الْفَضْلِ: ثُمَّ قَالَ: (أَخْرِجَا مَا تُصَرِّرَانِ)، ثُمَّ دَخَلَ فَأَذِنَ لِى وَلِلْفَضْلِ، فَدَخَلْنَا، فَتَوَاكَلْنَا الْكَلاَمَ قَلِيلاً، ثُمَّ كَلَّمْتُهُ، أَوْ كَلَّمَهُ الْفَضْـلُ - قَـدْ شَـكَّ فِـى ذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ - قَالَ كَلَّمَهُ بِالأَمْرِ الَّذِى أَمَرَنَـا بِـهِ أَبَوَانَـا. فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاعَةً وَرَفَعَ بَصَـرَهُ قِبَلَ سَقْفِ الْبَيْتِ حَتَّى طَالَ عَلَيْنَا أَنَّهُ لاَ يَرْجِعُ إِلَيْنَا شَيْئًا،

حَتَّى رَأَيْنَا زَيْنَبَ تَلْمَعُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ بِيَدِهَا، تُرِيدُ أَنْ لاَ تَعْجَلاَ وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي أَمْرِنَا، ثُمَّ خَفَّضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ فَقَالَ لَنَا: (إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَةَ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ، وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ، ادْعُوا لِي نَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ). فَدُعِيَ لَهُ نَوْفَلُ بْنُ الْحَارِثِ، فَقَالَ: (يَا نَوْفَلُ أَنْكِحْ عَبْدَ الْمُطَّلِبِ). فَأَنْكَحَنِي نَوْفَلٌ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ادْعُوا لِي مَحْمِيَةَ بْنَ جَزْءٍ). وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي زُبَيْدٍ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اسْتَعْمَلَهُ عَلَى الأَخْمَاسِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمَحْمِيَةَ: (أَنْكِحِ الْفَضْلَ). فَأَنْكَحَهُ، ثُمَّ قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(قُمْ فَأَصْدِقْ عَنْهُمَا مِنَ الْخُمُسِ كَذَا وَكَذَا). لَمْ يُسَمِّهِ لِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْحَارِثِ.

واته: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی (حارث)ی کوڕی نەوفەلی هاشیمییەوە دەگێڕنەوە، کە (عَبْدُ المُطلب)ی کوڕی رەبیعەی کوڕی (حارث)ی کوڕی (عَبْدُ المُطلب) بۆی باس کردوە کە باوکی رەبیعەی کوڕی (حارث) و عەباسی کوڕی (عَبْدُ المُطلب) وتیان بە (عَبْدُ المُطلب)ی کوڕی رەبیعەو (فضل)ی کوڕی عەباس: بڕۆن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی بڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، دەبینی گەورە بوین حەزدەکەین ژن بهێنین، تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاکترین کەسی بۆ بەجێهێنانی (سیلەی رەحم)پەیوەندی خزمایەتی، ئەگەر ژنمان هێنا باوکی هەردوکمان دەسەڵاتی

ئەوەیان نیە مارەییمان بۆ بدەن، ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەمانەوێ ئێمە بكەی بە كاربەدەست لەبارەی ئەم زەكاتەوەو، بەڵكو ئێمەش بەرامبەر بەو كارە ماڵ و سامانێكمان دەسكەوێت ژنی پێبهێنین. ئەوەی كە خەڵك پێت دەدات، ئێمەش دەیدەین بە تۆ. (عَبْدُ المُطلب)ی كوڕی رەبیعە وتی: ئێمە لەسەر ئەو حاڵە بوین پێشەوا عەلی كوڕی (أَبِی طَالِب) رەزای خوای لێ بێ هات بۆ ناومان، پێی وتین: نا سوێند بە (الله) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ كامتان ناكات بە كاربەدەست لەبارەی زەكاتەوە، رەبیعە پێی وت: ئەمە لە حەسودیتەوەیە، تۆ بویتەتە زاوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، كەچی ئێمە لەسەر ئەوە (حەسودی)ئیرەییت پێ نابەین، پێشەوا عەلی (رداء)پۆشاكەكەی سەرشانی راخست، لەپاشدا لەسەری راكشا، وتی: من باوكی حەسەنم لە ئێوە لەپێشترم بۆ راوبۆچون و خاوەن ئەزمون و تەجروبەم سوێند بە (الله) لێرە نارۆم هەتا كوڕەكانتان وەڵامەكەتان لە لایەن پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بۆ دێنێتەوە، بۆئەوەی وا نەزانن كە من (حەسودی)ئیرەییتان پێ دەبەم، (عَبْدُ المُطلب) وتی: من و (فضل) رۆشتین لەكاتی نوێژی نیوەڕۆدا گەیشتین، قامەت كرا بۆ نوێژ، ئێمەش لەگەڵ خەڵكەكە نوێژمان كرد بە كۆمەڵ، لەپاشدا من و (فضل) بە پەلە رۆشتین بۆ بەردەم دەرگای ژورەكەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لەوكاتەدا لەلای زەینەبی كچی جەحش بوو چونكە سەرەی ئەو بوو، لەبەردەم دەرگادا راوەستاین هەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەشریفی هات، لەڕووی سۆزو بەزەییەوە گوێی هەردوكمانی گرت، لەپاشدا فەرمووی: (ئەوەی لە سنگتاندا كۆتانكردۆتەوەو شاردوتانەتەوە دەریبڕن). ئینجا رۆشتەژوورەوە مۆڵەتی پێ داین ئێمەش چوینەژورەوە بۆلای، من و (فضل) كەمێ قسەمان كرد بۆ یەكتر، لەپاشدا من قسەم لەگەڵ كرد، یان (فضل) قسەی لەگەڵ كرد - (عَبْدُ اللّٰه)ی كوڕی (حارث) راوی فەرمودەكە گومانی هەبوو لەوەدا كە كامیان قسەی لەگەڵ كرد - ، (عَبْدُ المُطلب)ی كوڕی رەبیعە وتی: (فضل) قسەی لەگەڵ كرد دەربارەی ئەوەی كە باوكمان پێی راسپاردین. پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ماوەیە بێدەنگ بوو، سەری هەڵبڕی بۆ سەقفی ماڵەكە ئەوەندە درێژەی كێشا وامان دەزانی ئیتر وەڵامان

ناداتەوە، هەتا زەینەبمان بینی لەودیوی پەردەوە بەدەستی ئاماژەی بۆ کردین بە ئاماژەکەی دەیویست کە پەلە نەکەین، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرقاڵە بە کارەکەی ئێمەوە، لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەری دانەواند، پێی فەرمووین: (بەڕاستی زەکات نابێ بۆ موحەممەد و کەسوکاری موحەممەد، بەڕاستی ئەوە چڵکی خەڵکە، نەوفەلی کوڕی (حارث)م بۆ بانگ بکەن)، ئەوانیش نەوفەلی کوڕی (حارث)یان بۆ بانگ کرد، فەرمووی: (ئەی نەوفەل کچەکەی خۆت مارە بکە لە (عَبْدُ المُطلب)، جا نەوفەل کچەکە خۆی لێ مارەکردم، لەپاشدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (مەحمییەی کوڕی (جزء)م بۆ بانگ بکەن)، کە پیاوێ بوو لە هۆزی زوبەید، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کردبوی بە کاربەدەستی پێنج یەك، بۆیان بانگ کرد، پێی فەرموو: (ئەی مەحمییە کچەکەی خۆت مارە بکە لە (فضل)، ئەویش کچەکەی خۆی لێ مارەکرد، لەپاشدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە مەحمییەی فەرموو: (هەستە لە پشکی پێنج یەکی ئەوە و ئەوە بەشی مارەیی بدە بە (عَبْدُ المُطلب) و (فضل)، زوهری دەڵێت: (عَبْدُ اللّه)ی کوڕی (حارث) ناوی مارەییەکەی نەهێنا بۆم.

٢٩٨٦ - (صحيح) عن علي بن أبي طالب قال: كَانَتْ لِي شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِي مِنَ الْمَغْنَمِ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْطَانِي شَارِفًا مِنَ الْخُمُسِ يَوْمَئِذٍ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْنِيَ بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَاعَدْتُ رَجُلاً صَوَّاغًا مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ أَنْ يَرْتَحِلَ مَعِي فَنَأْتِيَ بِإِذْخِرٍ، أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ مِنَ الصَّوَّاغِينَ فَأَسْتَعِينَ بِهِ فِي وَلِيمَةِ عُرْسِي، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَيَّ مَتَاعًا مِنَ الأَقْتَابِ وَالْغَرَائِرِ وَالْحِبَالِ، وَشَارِفَايَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ

حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، أَقْبَلْتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ، فَإِذَا بِشَارِفَيَّ قَدِ اجْتُبَّتْ أَسْنِمَتُهُمَا، وَبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَا، وَأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَيَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ، فَقُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ قَالُوا: فَعَلَهُ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الأَنْصَارِ، غَنَّتْهُ قَيْنَةٌ وَأَصْحَابَهُ، فَقَالَتْ فِي غِنَائِهَا:

أَلاَ يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ

فَوَثَبَ إِلَى السَّيْفِ، فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا، وَأَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا!. قَالَ عَلِيٌّ: فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، قَالَ: فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِي لَقِيتُ، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(مَا لَكَ). قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ، فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا، وَهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ. فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِرِدَائِهِ فَارْتَدَاهُ، ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ حَتَّى جَاءَ الْبَيْتَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ، فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ، فَإِذَا

**حَمْزَةُ ثَمِلٌ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى وَجْهِهِ، ثُمَّ قَالَ حَمْزَةُ: وَهَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لأَبِي، فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ ثَمِلٌ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى، فَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ.**

واتە: لە پێشەوا عەلی كوڕی (أَبِي طَالِب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، كە وتویەتی: وشترێكی سەرەم هەبوو لە دەسكەوتی جەنگی بەدر بەرم كەوتبو، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) لەوكاتەدا لە پشكی پێنج یەك وشترێكی سەرەی تری پێدام، كاتێ كە ویستم (فاطمة)ی كچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بگوێزمەوە، پیاوێكی ئاڵتونچیم لە جولەكەكانی بەنی قونەیقاع پەیدا كرد بۆئەوەی لەگەڵم بێت بۆ هێنانی (إذخر) كە ڕوەكێكی گەڵا پان و بۆن خۆشە، ئەمویست بیفرۆشم بە زەرنگەرەكان بۆ ئیشوكاری كورەی زەڕنگەرییەكەیان، بۆ ئەوەی شتێك لە ماڵ و سامانم دەسكەوێت بۆ سازكردنی زەماوەندەكەم و گواستنەوەی (فاطمة)، لە تەنیشت ماڵی پیاوێكی ئەنصارییەوە وشترەكانم یخ دابوو لەكاتێكدا كە من خەریكی ئەوە بووم حەبل و گوریس و كۆپان و كەل و پەلی وشترەكان ڕێك بخەم، كە گەڕامەوە بۆ لایان دەبینم هەردوو وشترەكە كۆپارەكانیان بڕاوەو كەلەكەیان هەڵدڕاوەو جەرگیان دەرهێنراوەو بڕاوە، كە ئەو دیمەنە سامناكەم بینی ڕاچەنیم و فرمێسك بە چاوەكانمدا هاتەخوارەوەو گریام، وتم: ئەمە كێ ئەم كارەی كردوە؟ وتیان: حەمزەی كوڕی (عَبْدُ المُطلب)، ئەوەتا لەو ماڵەدا لەگەڵ كۆمەڵێ لە ئەنصار دەخۆنەوەو مەی دەنۆشن – بێگومان ئەمە لەپێش ئەوەدا ڕویداوە كە مەی حەرام نەكرابو – ، كەنیزەكێكی گۆرانی بێژ گۆرانی بۆ خۆی و هاوڕێكانی دەڵێ: لەكاتی چڕیندا دەڵێ: (أَلاَ يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ). واتە: ئەی حەمزە ئاگاداری ئەو دوو وشترە قەڵەوە

بە... كورتەی مانای شیعرەكە ئەوەیە حەمزە هەڵدەنێ بۆ ئەوەی پەلاماریان بدات و شتێ لە گۆشتەكەیان بۆ بهێنێ هەتا بیخۆن...

حەمزەش بە پەلە بە شمشێرەوە رادەپەڕێ كۆپارەكانیان دەبڕێ و كەلەكەیان هەڵدەدڕێ و جەرگیان دەردەهێنێ و دەیبات. پێشەوا عەلی وتی: رۆشتم هەتا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ سكاڵا لەوكاتەدا زەیدی كوڕی (حارثة) لەلای دانیشتبو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ڕەنگ و روخسارما كە تێك چو بوو زانی كە شتێكم لێ قەوماوە، فەرمووی: (ئەوە چیتە؟). وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەرگیز رۆژی وەك ئەمڕۆم نەدیوە ئەوەندە قورس و گران بێ لەسەرم، حەمزە دەستدرێژی كردۆتە سەر وشترەكانم و كۆپارەكانیانی بڕیوەو كەلەكەیانی هەڵدڕیوە، ئەوەتا لەو ماڵەدا لەگەڵ كۆمەڵێ لە ئەنصار دەخۆنەوەو مەی دەنۆشن.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داوای عەبایەكی كرد بۆیان هێنا كردیەبەری و بەپێ كەوتەڕێ، من و زەیدی كوڕی (حارثة)ش كەوتینە شوێنی هەتا گەیشتینە ئەو ماڵەی كە حەمزەی لێ بوو، داوای مۆڵەتی چونەژورەوەی كرد، مۆڵەتی پێدرا، كاتێ كە چونەژورەوە ئەوان دەیانخواردەوەو مەست و سەرخۆش بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە حەمزە تورە بوو سەرزەنشتی كرد لەسەر ئەو كارە ناشایستەیەی كە كردبوی، سەیرمان كرد حەمزە مەستە، بە هۆی مەستیەوە چاوەكانی سور بووە، جا حەمزە سەیری پێكانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) كرد، لەپاشدا سەری هەڵبڕی سەیری ئەژنۆكانی كرد، ئینجا سەری زیاتر هەڵبڕی سەیری ناوكی كرد، لەپاشدا سەری زیاتر هەڵبڕی سەیری ناوچاوانی كرد، لەپاشدا وتی: ئێوە خۆتان بەچی دەزانن، ئێوە كۆیلەی (عَبْدُ المُطلب)ی باوكم بوون - كە دەكاتە باپیری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پێشەوا عەلی، مەبەستی حەمزە ئەوە بووە كە ئەو لەوان نزیكترە لە (عَبْدُ المُطلب)ەوە - ، ئیتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زانی كە سەرخۆشە لەبەرئەوەی قسەو رەفتاری ناشیرینی تر نەنوێنێ پاشەو پاش گەڕایە دواوەو لەماڵەكە دەرچو، ئێمەش بەدوایا لەخزمەتیدا دەرچوین.

٢٩٨٧ - (صحيح) عن الفضل بن الحسن الضمري، أَنَّ ابْنَ أُمِّ الْحَكَمِ - أَوْ ضُبَاعَةَ ابْنَتَي الزُّبَيْرِ – حَدَّثَهُ، عَنْ إِحْدَاهُمَا أَنَّهَا قَالَتْ: أَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْيًا، فَذَهَبْتُ أَنَا وَأُخْتِي وَفَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَحْنُ فِيهِ، وَسَأَلْنَاهُ أَنْ يَأْمُرَ لَنَا بِشَيْءٍ مِنَ السَّبْيِ، فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(سَبَقَكُنَّ يَتَامَى بَدْرٍ، لَكِنْ سَأَدُلُّكُنَّ عَلَى مَا هُوَ خَيْرٌ لَكُنَّ مِنْ ذَلِكَ: تُكَبِّرْنَ اللَّهَ عَلَى أَثَرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ تَكْبِيرَةً، وَثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ تَسْبِيحَةً، وَثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ تَحْمِيدَةً، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). قَالَ عَيَّاشٌ: وَهُمَا ابْنَتَا عَمِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە (فضل)ی کوڕی حەسەنی (ضَّمْرِيِّ)ەوە دەگێڕنەوە، کە ئیبنو ئومی حەکەم – یان (ضُبَاعَة)ی کچی زوبێر – بۆی گێڕاوەتەوە، لە یەکێکیانەوە هاتوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خزمەتکاری بەرکەوتبو، من و خوشکەکەم و (فاطمة)ی کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوین بۆ خزمەتی سکاڵای خۆمان کرد لەدەست قورسی ئیشوکاری ناوماڵ و بێ خزمەتکاری، داوامان لێ کرد فەرمان بدات بۆئەوەی خزمەتکارمان بداتێ بۆ خزمەتکردنی ماڵەکانمان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (هەتیوەکانی جەنگی بەدر لەپێشترن دانمان بەوان، بەڵام شتێکتان نیشان دەدەم چاکترە بۆتان لەوەی کە داوای دەکەن: لەدوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە: سی و سێ

جار بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێن: (الحَمدُ لِله)، سی و سێ جـار بڵـێن: (اللّـهُ أَكْبَر)، یەك جاریش بڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْـكُ وَلَـهُ الْحَمْـدُ، وَهُـوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). واتە: هـیچ پەرسـتراوێك نیـە بەهـەق جگـە لـە (الله) تـاكی بـێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە. عەییاش دەڵێـت: هەردووكیان واتە: ئیبنو ئومی حەكەم و (ضُبَاعَة)ی كچی زوبێر كچی مـامی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بوون.

٢٩٨٨ - (ضعيف) عن ابن أعبد قال: قَالَ لِي عَلِيٌّ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ أَلاَ أُحَدِّثُكَ عَنِّي وَعَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ، وَكَانَتْ مِنْ أَحَبِّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ، قُلْتُ: بَلَـى. قَـالَ: إِنَّهَـا جَرَّتْ بِالرَّحَى حَتَّى أَثَّرَ فِي يَدِهَا، وَاسْتَقَتْ بِالْقِرْبَةِ حَتَّى أَثَّرَ فِي نَحْرِهَا، وَكَنَسَتِ الْبَيْتَ حَتَّـى اغْبَـرَّتْ ثِيَابُهَـا، فَـأَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَدَمٌ، فَقُلْـتُ: لَـوْ أَتَيْـتِ أَبَـاكِ فَسَأَلْتِيهِ خَادِمًا! فَأَتَتْهُ، فَوَجَـدَتْ عِنْـدَهُ حُـدَّاثًا، فَرَجَعَـتْ، فَأَتَاهَا مِنَ الْغَدِ، فَقَـالَ: (مَـا كَـانَ حَاجَتُـكِ؟). فَسَـكَتَتْ، فَقُلْتُ: أَنَا أُحَدِّثُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، جَرَّتْ بِالرَّحَى حَتَّى أَثَّـرَتْ فِي يَدِهَا، وَحَمَلَتْ بِالْقِرْبَةِ حَتَّى أَثَّرَتْ فِي نَحْرِهَـا، فَلَمَّـا أَنْ جَاءَكَ الْخَدَمُ أَمَرْتُهَا أَنْ تَأْتِيَكَ فَتَسْتَخْدِمَكَ خَادِمًـا يَقِيهَـا حَرَّ مَا هِيَ فِيهِ. قَالَ: (اتَّقِي اللَّهَ يَا فَاطِمَـةُ، وَأَدِّي فَرِيضَـةَ رَبِّكِ، وَاعْمَلِي عَمَلَ أَهْلِكِ، فَإِذَا أَخَذْتِ مَضْـجَعَكِ فَسَـبِّحِي ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَاحْمَدِي ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ، وَكَبِّرِي أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ،

فَتِلْكَ مِائَةٌ، فَهِيَ خَيْرٌ لَكِ مِنْ خَادِمٍ). قَالَتْ: رَضِيتُ عَنِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَعَنْ رَسُولِهِ.

واتە: لە ئیبنو ئەعبودەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ پێی وتم: ئایا بەسەرهاتێكت بۆ نەگێڕمەوە دەربارەی خۆم و (فاطمة)ی كچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بێگومان (فاطمة) خۆشەویست ترین كەس بوو لەلای، وتم: بەڵێ بۆم باس بكە، وتی: (فاطمة) دەستهاڕی بەكاردەهێنا دەستی ماندو شەكەت دەبوو، ئاوی دەكێشا و كاریگەری كردبوە سەر سنگی،ماڵی گسگ دەداو پۆشاكەكانی تۆزاوی دەبوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نۆكەری بۆ هات، وتم: ئەگەر بێی بۆلای باوكت داوای نۆكەر بكەیت دەتداتێ، هات بۆلای باوكی لەوكاتەدا خەڵكانێكی لێ بوو قسەیان دەكرد، گەڕایەوە بۆ ماڵەكەی خۆی، بۆ ڕۆژی دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هات بۆلای (فاطمة)، فەرمووی: (ئیشت چی بوو؟)، (فاطمة) لەشەرماندا بێدەنگ بوو، پێشەوا عەلی وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) من بۆت باس دەكەم كە ئیشی چی بوو، چی دەوێت، دەستهاڕی بەكارهێناوە دەستی ماندو شەكەت بوە، ئاو دەكێشێ و كاریگەری كردۆتە سەر سنگی، كە تۆ نۆكەرت بۆ هات منیش فەرمانم پێكرد بێت بۆ خزمەتت داوای نۆكەرێكت لێ بكات بۆ ئەوەی لە تینی گەرما بیپارێزێ و لە ماندێتی بیحەسێنێتەوەو خزمەتی ماڵەكەی بۆ بكات، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی (فاطمة) لەخوا بترسە، فەرزەكانی پەروەردگارت بەجێبێنە، ئیشوكاری ماڵ و خانەوادەكەت بكە، كاتێ كە چویتە سەرجێگا بۆ خەوتن: سی و سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّه)، سی و سێ جار بڵێ: (الحَمدُ لِله)، سی و چوار جار بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَر)، ئەوە دەكاتە سەد لە نۆكەر زۆر چاكترە بۆت، عائیشە وتی: هەرچی لەلایەن خوای گەورەو پێغەمبەرەكەیەوە بێت پێی رازیم.

**٢٩٨٩ - (ضعيف) عن ابن أعبد قال: بِهَذِهِ الْقِصَّةِ، قَالَ: وَلَمْ يُخْدِمْهَا.**

واتە: لە ئیبنو ئەعبودەوە هەمان بەسەرهات هاتوە، وتی: نۆكەری نەدایە.

**٢٩٩٠ - (ضعيف الإسناد) عن مجاعة: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَطْلُبُ دِيَةَ أَخِيهِ - قَتَلَتْهُ بَنُو سَدُوسٍ مِنْ بَنِي ذُهْلٍ - فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (لَوْ كُنْتُ جَاعِلاً لِمُشْرِكٍ دِيَةً جَعَلْتُ لأَخِيكَ وَلَكِنْ سَأُعْطِيكَ مِنْهُ عُقْبَى). فَكَتَبَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِمِائَةٍ مِنَ الإِبِلِ مِنْ أَوَّلِ خُمُسٍ يَخْرُجُ مِنْ مُشْرِكِي بَنِي ذُهْلٍ، فَأَخَذَ طَائِفَةً مِنْهَا، وَأَسْلَمَتْ بَنُو ذُهْلٍ فَطَلَبَهَا بَعْدُ مُجَّاعَةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ، وَأَتَاهُ بِكِتَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَتَبَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ بِاثْنَيْ عَشَرَ أَلْفَ صَاعٍ مِنْ صَدَقَةِ الْيَمَامَةِ: أَرْبَعَةِ آلاَفٍ بُرٌّ، وَأَرْبَعَةِ آلاَفٍ شَعِيرٌ، وَأَرْبَعَةِ آلاَفٍ تَمْرٌ، وَكَانَ فِي كِتَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِمُجَّاعَةَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا كِتَابٌ مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ، لِمُجَّاعَةَ بْنِ مُرَارَةَ مِنْ بَنِي سُلْمَى، إِنِّي أَعْطَيْتُهُ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ مِنْ أَوَّلِ خُمُسٍ يَخْرُجُ مِنْ مُشْرِكِي بَنِي ذُهْلٍ، عُقْبَةً مِنْ أَخِيهِ).**

واتە: لە موجاعەوە دەگێڕنەوە، تیرەی سەدوس كە تیرەیە بوون لە هۆزی (ذُهْل) برایەكی موجاعەیان كوشتبو ئەویش چوە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)،

داوای خوێنی براكەی كرد لە (بیت المال)خەزێنەی موسوڵمانان، پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەگـەر لـە (بیـت المال)خەزێنــەی موسـوڵمانان خـوێنی كەسـێكی هاوبەش بۆ خوا دانەرم بدایە، ئەوا خوێنی براكەی تۆشم لێ دەدا، بەڵام لـەبریتی ئـەوەدا شتێكی ترت دەدەمێ، لەوكاتەدا لە غەزادا بوون بەرامبەر بە هاوبەش بۆ خـوا دانــەرانی هۆزی (ذُهْـل)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی نوسی كە لە پێـنج یـەكی یەكـەم دەستكەوتی جەنگی هاوبەش بۆ خوا دانەرانی بەنی (ذُهْل) سەد وشتری بدەنێ، ئـەوانیش كۆمـەڵێ وشتریان دایە بەڵام سەدەكەی تەواو نەكرد، كۆمـەڵێكی مایـەوە، هـۆزی (ذُهْـل) موسوڵمان بوون، لەسەردەمی پێشەوا ئەبو بەكردا نامەكەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) هێنا داوای باقی وشترەكانی كرد، ئەبو بەكر بۆی نوسـی كە دوانزە هەزار مەن(صـاع) لـە صەدەقەی یەمامەی بدەنێ: چوار هەزار مەن(صاع) گەنم، چوار هەزار مەن(صـاع) جـۆ، چوار هەزار مەن(صاع) خورما، لەجیاتی ئەو وشترانەی كە مابوون، نامەكەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ موجاعـە بـەم شـێوەیە نوسـرابوو: (بـەناوی خـوای بەخشـدەو میهرەبان، ئەم نامەیە لە موحەممەدی پێغەمبەرەوە بۆ موجاعەی كوڕی مورارە لـە بـەنی سولمی، ئەوا من لەجیاتی خوێنی براكەی سەد وشترم پێ بەخشی لە پێـنج یـەكی یەكـەم دەستكەوتی جەنگی هاوبەش بۆ خوا دانەرانی هۆزی (ذُهْل).

## باسی ئەوەی هاتوە دەربارەی پشكی (صفیّ).

## ٢١ - باب مَا جَاءَ فِي سَهْمِ الصَّفِيِّ.

**٢٩٩١ - (ضعيف الإسناد) عن عامر الشعبي قال:كَانَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَهْمٌ يُدْعَى الصَّفِيَّ إِنْ شَاءَ عَبْدًا، وَإِنْ شَاءَ أَمَةً، وَإِنْ شَاءَ فَرَسًا، يَخْتَارُهُ قَبْلَ الْخُمُسِ.**

واتە: لە عامیری شەعبییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) پشکێکی تایبەتی هەبوو لەپێش دابەشکردنی غەنیمەتدا هەڵیدەبژارد بۆ خۆی پێی دەوترا: (صفيّ)، ئیتر کۆیلە بوایە، یان کەنیزەك، یا ئەسپ هەرکام لەوانە کە بیوستایە.

**٢٩٩٢ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عون قال: سَأَلْتُ مُحَمَّدًا عَنْ سَهْمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالصَّفِيِّ، قَالَ: كَانَ يُضْرَبُ لَهُ بِسَهْمٍ مَعَ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ لَمْ يَشْهَدْ، وَالصَّفِيُّ يُؤْخَذُ لَهُ رَأْسٌ مِنَ الْخُمُسِ: قَبْلَ كُلِّ شَيْءٍ.**

واتە: لە ئیبنو عەونەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە پشکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و (صفيّ) لە موحەممەد - واتە ئیبنو سیرین — م پرسی، وتی: لەدەستکەوتی جەنگی لەگەڵ موسوسوڵماناندا پشکێکیان بۆ دادەنا با بەشداری ئەو جەنگەشی نەکردایەو ئامادە نەبوایە، (صفيّ)یش ئەوەیە لەپێش هەموو شتێکەوە لە پشکی پێنج یەك دەیدرایە جا دابەش دەکرا.

**٢٩٩٣ - (ضعيف الإسناد) عن قتادة قال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا غَزَا كَانَ لَهُ سَهْمٌ صَافٍ يَأْخُذُهُ مِنْ حَيْثُ شَاءَهُ، فَكَانَتْ صَفِيَّةُ مِنْ ذَلِكَ السَّهْمِ، وَكَانَ إِذَا لَمْ يَغْزُ بِنَفْسِهِ ضُرِبَ لَهُ بِسَهْمِهِ وَلَمْ يُخَيَّرْ.**

واتە: لە قەتادەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر بەشداری غەزای بکردایە پشکێکی تایبەتی هەبوو دەیدرایە لەوەی کە خۆی بیویستایە

هەڵیدەبژارد، (صـفیّة)ی هاوسەریشی لەو پشکە تایبەتە بوو، ئەگەر بەشداریشی نەکردایە ئەوا پشکە تایبەتەکەیان بۆ هەڵدەبژارد، خۆی هەڵی نەدەبژارد.

**٢٩٩٤ - (صحيح) عن عائشة رضي الله عنها قالت: كَانَتْ صَـفِيَّةُ مِـنَ الصَّفِيِّ.**

واتە: لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: بێگومـان (صـفیّة)ی هاوسەری لەو پشکە تایبەتە بوو کە پێی دەوترا (الصّفيّ).

**٢٩٩٥ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: قَدِمْنَا خَيْبَرَ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّـهُ تَعَالَى الْحِصْنَ، ذُكِرَ لَهُ جَمَالُ صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَى، وَقَـدْ قُتِـلَ زَوْجُهَا، وَكَانَتْ عَرُوسًا، فَاصْطَفَاهَا رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِنَفْسِهِ، فَخَرَجَ بِهَا حَتَّى بَلَغْنَا سُدَّ الصَّهْبَاءِ حَلَّتْ فَبَنَى بِهَا.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: چوین بۆ غەزای خەیبـەر، کاتێ کە بە پشتیوانی خوای گەورە قەڵاکە رزگار کرا، (صـفیّة) تازە بوك بوو، مێردەکەی لە غەزای خەیبەردا کوژرا، جا باسی جوانی و شۆخ و شەنگی (صفیّە)ی کچی (حُیَـیّ)یان کرد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئـەویش هەڵیبـژارد بـۆ خـۆی، لـە خەیبـەر دەرچوین هەتا گەیشتینە (سدّ الصهباء) لەوێ (صـفیّة) لەخوێنی حەیز پاك بویـەوە، جـا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوە لای.

**٢٩٩٦ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: صَارَتْ صَفِيَّةُ لِدِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ، ثُمَّ صَارَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (صفيّة) پشکی (دحْيَة الْكَلْبِيِّ) بوو، کاتێ کە باسی ئەوەیان کرد کچی یەکێ لە پاشاکانیانە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵیبژارد بۆ خۆی.

**٢٩٩٧ - (صحيح لكن قوله: (وَأَحْسِبُهُ ...) فيه نظر لأنه بني بها في (سد الصهباء) كما تقدم) عن أنس قال: وَقَعَ فِي سَهْمِ دِحْيَةَ جَارِيَةٌ جَمِيلَةٌ، فَاشْتَرَاهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِسَبْعَةِ أَرْؤُسٍ، ثُمَّ دَفَعَهَا إِلَى أُمِّ سُلَيْمٍ تَصْنَعُهَا وَتُهَيِّئُهَا. قَالَ حَمَّادٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ: وَتَعْتَدُّ فِي بَيْتِهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ.**

واتە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە پشکەکەی (دحْيَة)دا کەنیزەکێکی جوان هەبوو - بێگومان (صفيّة) بوو - ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لێی کڕی بە حەوت سەر پشك - لەبرێتی ئەوەدا وازی لێ بێنێ بۆی نەك بە کڕین و فرۆشتن - لەپاشدا ناردی بۆ ئومو سولەیم بۆئەوەی بۆی برازێنێتەوەو بۆی ئامادەی بکات. حەماد دەڵێت: وائەزانم راوی وتی: (صفيّە)ی کچی (حُيَيّ) لەماڵی ئومو سولەیم ڕازێنرایەوەو ئامادەکرا.

**٢٩٩٨ - (صحيح) عن أنس بن مالك قال: جُمِعَ السَّبْيُ - يَعْنِي بِخَيْبَرَ - فَجَاءَ دِحْيَةُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ، قَالَ: (اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً). فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ،**

فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ - قَالَ يَعْقُوبُ - صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، سَيِّدَةَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ، ثُمَّ اتَّفَقَا - مَا تَصْلُحُ إِلاَّ لَكَ! قَالَ: (ادْعُوهُ بِهَا). فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ لَهُ: (خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا). وَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لەخەیبەر سەبایەکان کۆکرانەوە، (دِحْيَة) هات وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەنیزەکێکم بەرێ لێیان، فەرمووی: (بڕۆ کەنیزەکێ بەرە بۆ خۆت)، ئەویش (صفيّە)ی کچی (حُيَيّ) هەڵبژارد بۆ خۆی، پیاوێ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەت بەخشیوە بە (دِحْيَة) — یەعقوب وتی - (صفيّة)ی کچی (حُيَيّ)، گەورەی (قُرَيْظَة) و (النَّضِير)، لەپاشدا هەردوو راوی ڕێکن — (صفيّە) شایانی کەس نیە تۆ نەبێ! فەرمووی: (بڕۆن بیانهێنن بۆ ئێرە)، ئەوانیش هاتن، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەیری (صفيّە)ی کرد، بە (دِحْيَة)ی فەرموو: (بڕۆ کەنیزەکێکی تر هەڵبژێرە بۆ خۆت). جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئازادی کردو مارەی کرد بۆ خۆی.

٢٩٩٩ — (صحيح الإسناد) عن يزيد بن عبد الله قال: كُنَّا بِالْمِرْبَدِ، فَجَاءَ رَجُلٌ أَشْعَثُ الرَّأْسِ بِيَدِهِ قِطْعَةُ أَدِيمٍ أَحْمَرَ، فَقُلْنَا: كَأَنَّكَ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ؟ فَقَالَ: أَجَلْ، قُلْنَا: نَاوِلْنَا هَذِهِ

الْقِطْعَةَ الأَدِيمَ الَّتِي فِي يَدِكَ، فَنَاوَلَنَاهَا، فَقَرَأْنَاهَا ما فيها، فَإِذَا فِيهَا: (مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى بَنِي زُهَيْرِ بْنِ أُقَيْشٍ، إِنَّكُمْ إِنْ شَهِدْتُمْ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَأَقَمْتُمُ الصَّلاَةَ، وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ، وَأَدَّيْتُمُ الْخُمُسَ مِنَ الْمَغْنَمِ، وَسَهْمَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَسَهْمَ الصَّفِيِّ: أَنْتُمْ آمِنُونَ بِأَمَانِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ). فَقُلْنَا: مَنْ كَتَبَ لَكَ هَذَا الْكِتَابَ؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

واتە: لە یەزیدی کوڕی (عَبْدُ اللَّـه)وە دەگێڕنـەوە، کـە وتویـەتی: لەمیربـەد بـووین، پیاوێکی قژ گڤ هات پارچەیە چەرمی پێ بوو، وتمان: لەوەدەچێ تۆ خەڵکی بیابان بیـت؟ وتی: بەڵێ، وتمان: ئەو پارچە چەرمەمان بـدەرێ کـە بەدەسـتەوەیە، پارچـە چـەرمەکەی داینێ، ئەوەی تێیدا نوسرابوو خوێندمانەوە، نوسرابوو: (لە موحەممەدی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ بەنی زوهەیری کوڕی قەیس، ئەگەر ئێوە شایەتیتان دا، کە جگە لـە (الله) هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە، موحەممـەد پێغەمبـەری خوایـەو، نوێـژتان کـردو، زەکاتتان دەرکردو، پێنج یەکی دەستکەوتی جەنگیتان دا، لەگەڵ پشکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و، پشکی تایبەتی(الصَّفِيّ): ئەوە ئێوە بێ ترس و ئەمینن بە ئەمانەتی خواو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم).

## باسی جولەکە چۆن لەمەدینە دەرکران.

## ٢٢ - باب كَيْفَ كَانَ إِخْرَاجُ الْيَهُودِ مِنَ الْمَدِينَةِ.

٣٠٠٠ - (صحيح الإسناد) عن كعب بن مالك - وَكَانَ أَحَدَ الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ، وَكَانَ كَعْبُ بْنُ الأَشْرَفِ يَهْجُو النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَيُحَرِّضُ عَلَيْهِ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ وَأَهْلُهَا أَخْلاَطٌ: مِنْهُمُ الْمُسْلِمُونَ، وَالْمُشْرِكُونَ يَعْبُدُونَ الأَوْثَانَ، وَالْيَهُودُ، وَكَانُوا يُؤْذُونَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ، فَأَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ بِالصَّبْرِ وَالْعَفْوِ، فَفِيهِمْ أَنْزَلَ اللَّهُ: (وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ ) الآيَةَ. فَلَمَّا أَبَى كَعْبُ بْنُ الأَشْرَفِ أَنْ يَنْزِعَ عَنْ أَذَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ أَنْ يَبْعَثَ رَهْطًا يَقْتُلُونَهُ، فَبَعَثَ مُحَمَّدَ بْنَ مَسْلَمَةَ، وَذَكَرَ قِصَّةَ قَتْلِهِ، فَلَمَّا قَتَلُوهُ فَزِعَتِ الْيَهُودُ وَالْمُشْرِكُونَ، فَغَدَوْا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: طُرِقَ صَاحِبُنَا فَقُتِلَ. فَذَكَرَ لَهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِى كَانَ يَقُولُ، وَدَعَاهُمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَنْ يَكْتُبَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ كِتَابًا يَنْتَهُونَ إِلَى

**مَا فِيهِ، فَكَتَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْمُسْلِمِينَ عَامَّةً صَحِيفَةً.**

واتە: لە كەعبی كوڕی مالیكەوە دەگێڕنەوە، كەعب یەكێ بوو لەو سێ كەسەی كە لە جەنگی تەبوك دواكەوتن و خوای گەورە لێیان خۆش بوو، كەعبی كوڕی ئەشرەف بە شیعرەكانی هەجوی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەكرد قسەی ناشیرینی بەرامبەر دەكرد، كافرەكانی قورەیش لێ هاندەدا، كاتێ كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەیشتە مەدینە خەڵكی مەدینە لەمانە پێكهاتبون موسوڵمان و جولەكەو هاوبەش بۆ خوا دانەران كە بتیان دەپەرست، جولەكەكان بە شیعرەكانیان و زمانیان ئازاری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵەكانیان دەدا، خوای گەورە فەرمانی كرد بە پێغەمبەرەكەی بە ئارامگرتن و لێبوردن، دەربارەیان ئەم ئایەتەی دابەزاندا: (وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ ). سورة آل عمران: ١٨٦. واتە: دەبیستن لەوانەی كە نامەیان پێ دراوە لەپێش ئێوە قسەی ناخۆش.

كاتێ كە زانی كەعبی كوڕی ئەشرەف دەست هەڵناگرێ لە ئازاردانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی كرد بە سەعدی كوڕی (معاذ) كۆمەڵێ بنێرێ بۆ كوشتنی، سەعدیش موحەممەدی كوڕی مەسلەمەی نارد بۆ كوشتنی، جا راوی فەرموودەكە بەسەرهاتی چۆنیەتی كوشتنەكەی گێڕایەوە، كاتێ كە كوشتیان جولەكەو هاوبەش بۆ خوا دانەران ترسیان لێ نیشت، سەر لەبەیانی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتیان: ئەم شەو خەڵك هاتونەتە ناو قەڵاكەوەو كەعبیان كوشتوە، جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی ئەوەی بۆ كردن كە كەعب چۆن هەجوی كردوەو ئازاری داوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای لێكردن كە پەیمان نامەیە بنوسن و لێی لانەدەن و پابەند بن پێیەوە، جا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نامەیەكی نوسی لەنێوان خۆی و ئەوان و موسوڵمانان بەگشتی.

٣٠٠١ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عباس قال: لَمَّا أَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُرَيْشًا يَوْمَ بَدْرٍ وَقَدِمَ الْمَدِينَةَ جَمَعَ الْيَهُودَ فِي سُوقِ بَنِي قَيْنُقَاعَ فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ يَهُودَ، أَسْلِمُوا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَ قُرَيْشًا). قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، لاَ يَغُرَّنَّكَ مِنْ نَفْسِكَ أَنَّكَ قَتَلْتَ نَفَرًا مِنْ قُرَيْشٍ كَانُوا أَغْمَارًا لاَ يَعْرِفُونَ الْقِتَالَ، إِنَّكَ لَوْ قَاتَلْتَنَا لَعَرَفْتَ أَنَّا نَحْنُ النَّاسُ وَأَنَّكَ لَمْ تَلْقَ مِثْلَنَا! فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي ذَلِكَ: (قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ). قَرَأَ مُصَرِّفٌ إِلَى قَوْلِهِ: (فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ). بِبَدْرٍ (وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسوڵمانان بە پشتیوانی خوای گەورە لەجەنگی بەدردا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، کۆمەڵێ لە گەورەکانی قورەیشیان کوشت و کۆمەڵێکیشیان لێ بەدیل گرتن، کاتێ کە گەیشتەوە ناو شاری مەدینە، جولەکەکان لە بازاڕی بەنی قەینوقاع کۆکردەوە، فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی جولەکە وەرن موسوڵمان بن پێش ئەوەی کە توشی قورەیش هات توشی ئێوەش ببێت). وتیان: ئەی موحەممەد لەخۆت بایی مەبە، بەوەی کە چەند کەسێکت لە قورەیش کوشتوە، کە خیبرەیان نەبووەو بێ ئەزموون بوون و شارەزای کاروباری جەنگ نەبوون، ئەگەر لەگەڵ ئێمە بجەنگی ئەو کاتە دەزانی ئێمە چەندە ئازاو نەبەردین و شارەزای کاروباری جەنگین، هەروەها دەزانی نەجەنگاوی بەرامبەر بەکەسانێکی وەك ئێمە لە ئازایەتی و کۆڵنەدان و دامەزراویدا لە جەنگدا.

خـوای گـەورە لـەوبارەوە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـدا: (﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٢﴾﴾). سورة آل عمران: ١٢. واتە: بڵێ بەوانەی كە بێ بڕوان لەمەولا ئەشكێن و ژێـر دەكـەون، وە كۆدەكرێنـەوە بـەرەو دۆزەخ كـە ناخۆشـترین شوێنە.

موصەریف راوی فەرموودەكە ئایەتەكەی خوێنـدەوە هـەتا گەیشـتە: (﴿فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾). واتە: لە جەنگی بەدردا دەستەیەكیان دەجەنگین لە ڕێـی خـوادا. (﴿وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ﴾). سورة آل عمران: ٣١. واتە: دەستەكەی تریشیان بێ بڕوابوون.

**٣٠٠٢ - (ضعيف) عن محيصة، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قـال: (مَنْ ظَفِرْتُمْ بِهِ مِنْ رِجَالِ يَهُودَ فَـاقْتُلُوهُ). فَوَثَـبَ مُحَيِّصَـةُ عَلَى شَبِيبَةَ: رَجُلٍ مِنْ تُجَّارِ يَهُـودَ كَـانَ يُلاَبِسُـهُمْ، فَقَتَلَـهُ، وَكَانَ حُوَيِّصَةُ إِذْ ذَاكَ لَمْ يُسْلِمْ، وَكَانَ أَسَـنَّ مِـنْ مُحَيِّصَـةَ، فَلَمَّا قَتَلَهُ جَعَلَ حُوَيِّصَةُ يَضْرِبُهُ، وَيَقُولُ: يَا عَدُوَّ اللَّـهِ، أَمَـا وَاللَّهِ لَرُبَّ شَحْمٍ فِي بَطْنِكَ مِنْ مَالِهِ.**

واتـە: لـە موحەیيصـەوە دەگێرنـەوە، كـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله علیـه وسـلم) فەرموویەتی: (بۆ هـەر پیـاوێكی جولەكـە هـەڵتان دەسـتكەوت فرسـەتی لـێ بهێـنن و بیكوژن). موحەیيصە پەلاماری شەبیبەی داو كوشتی كە یەكێك بـوو لـە بازرگانـەكانی جولەكە تێكەڵاوی هەبوو لەگەڵی، حوەیيصە ـی برای كە - تا ئەوكاتە موسوڵمان نەبوو بوو، گەورەتریش بوو لە موحەیيصە، كاتێ كە كوشـتی حـوەییص دای لـە موحەیيصـەو وتی: ئەی دوژمنی خوا، سوێند بە (الله) هەندێ لەو بەزو چەوریەی ناوسكت لەماڵی ئـەو جولەكەیە كە كوشتت — واتە تۆ نان خۆری ئەوی - .

**٣٠٠٣ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: بَيْنَا نَحْنُ فِى الْمَسْجِدِ إِذْ خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: (انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ). فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى جِئْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَنَادَاهُمْ فَقَالَ: (يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا). فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا). فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ذَلِكَ أُرِيدُ). ثُمَّ قَالَهَا الثَّالِثَةَ: (اعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَإِنِّى أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَرْضِ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: جارێ لەمزگەوت بوین پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ ناومان فەرمووی: (با بڕۆین بۆناو جولەکەکان). جا لەخزمەتیدا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ناویان، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەستا بانگی کردن و فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی جولەکە موسوڵمان بن، سەلامەت دەبن). وتیان: ئەی باوکی قاسم بەڕاستی پەیامی خۆت گەیاند، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: (ئەی کۆمەڵی جولەکە موسوڵمان بن، سەلامەت دەبن). وتیان: ئەی باوکی قاسم بەڕاستی پەیامی خۆت گەیاند، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: (دە منیش ئەوەم دەوێت). بۆ سێیەم جار پێی فەرموون: ( بزانن کە ئەم خاکە هی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، من دەمەوێت لەم خاکە دەرتان بکەم، ئەگەر ماڵێ شتێکتان هەیە

بیفرۆشن و بەخۆشی خۆتان برۆن، باش بزانن کە ئەم خاکە هـی خـواو پێغەمبەرەکەیـەتی (صلی الله علیه وسلم) ئەگەر بە خۆشی خۆتان نەڕۆن بەزەبری شیر و تیر دەرتان دەکەم).

## باسی دەربارەی هەواڵی (بنی النضیر).

## ٢٣ - باب فِي خَبَرِ النَّضِيرِ.

٣٠٠٤ - (صحيح الإسناد) عن الزهري، عن عبد الرحمن بـن كعـب بـن مالك: عن رجل من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّ كُفَّارَ قُرَيْشٍ كَتَبُوا إِلَى ابْنِ أُبَيٍّ وَمَـنْ كَـانَ يَعْبُـدُ مَعَـهُ الأَوْثَانَ مِنَ الأَوْسِ وَالْخَزْرَجِ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَوْمَئِذٍ بِالْمَدِينَةِ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ: إِنَّكُمْ آوَيْـتُمْ صَـاحِبَنَا وَإِنَّا نُقْسِمُ بِاللَّهِ لَتُقَاتِلُنَّـهُ أَوْ لَتُخْرِجُنَّـهُ أَوْ لَنَسِـيرَنَّ إِلَـيْكُمْ بِأَجْمَعِنَا حَتَّى نَقْتُلَ مُقَاتِلَتَكُمْ وَنَسْتَبِيحَ نِسَاءَكُمْ. فَلَمَّـا بَلَـغَ ذَلِكَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ وَمَنْ كَانَ مَعَـهُ مِـنْ عَبَـدَةِ الأَوْثَـانِ اجْتَمَعُوا لِقِتَالِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمَّا بَلَغَ ذَلِـكَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَقِيَهُمْ فَقَالَ: (لَقَدْ بَلَـغَ وَعِيـدُ قُرَيْشٍ مِنْكُمُ الْمَبَالِغَ، مَا كَانَتْ تَكِيدُكُمْ بِأَكْثَرَ مِمَّا تُرِيدُونَ أَنْ تَكِيـدُوا بِـهِ أَنْفُسَـكُمْ، تُرِيـدُونَ أَنْ تُقَـاتِلُوا أَبْنَـاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ). فَلَمَّا سَمِعُوا ذَلِكَ مِنَ النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ

وَسَلَّمَ تَفَرَّقُوا، فَبَلَغَ ذَلِكَ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، فَكَتَبَتْ كُفَّارُ قُرَيْشٍ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ إِلَى الْيَهُودِ: إِنَّكُمْ أَهْلُ الْحَلْقَةِ وَالْحُصُونِ، وَإِنَّكُمْ لَتُقَاتِلُنَّ صَاحِبَنَا أَوْ لَنَفْعَلَنَّ كَذَا وَكَذَا، وَلاَ يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَدَمِ نِسَائِكُمْ شَيْءٌ - وَهِيَ الْخَلاَخِيلُ - . فَلَمَّا بَلَغَ كِتَابُهُمُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَجْمَعَتْ بَنُو النَّضِيرِ بِالْغَدْرِ: فَأَرْسَلُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ اخْرُجْ إِلَيْنَا فِي ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ أَصْحَابِكَ وَلْيَخْرُجْ مِنَّا ثَلاَثُونَ حَبْرًا، حَتَّى نَلْتَقِيَ بِمَكَانِ الْمَنْصَفِ فَيَسْمَعُوا مِنْكَ. فَإِنْ صَدَّقُوكَ وَآمَنُوا بِكَ آمَنَّا بِكَ، فَقَصَّ خَبَرَهُمْ، فَلَمَّا كَانَ الْغَدُ غَدَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْكَتَائِبِ فَحَصَرَهُمْ، فَقَالَ لَهُمْ: (إِنَّكُمْ وَاللَّهِ لاَ تَأْمَنُونَ عِنْدِي إِلاَّ بِعَهْدٍ تُعَاهِدُونِي عَلَيْهِ). فَأَبَوْا أَنْ يُعْطُوهُ عَهْدًا، فَقَاتَلَهُمْ يَوْمَهُمْ ذَلِكَ، ثُمَّ غَدَا الْغَدُ عَلَى بَنِي قُرَيْظَةَ بِالْكَتَائِبِ، وَتَرَكَ بَنِي النَّضِيرِ، وَدَعَاهُمْ إِلَى أَنْ يُعَاهِدُوهُ، فَعَاهَدُوهُ، فَانْصَرَفَ عَنْهُمْ، وَغَدَا عَلَى بَنِي النَّضِيرِ بِالْكَتَائِبِ، فَقَاتَلَهُمْ حَتَّى نَزَلُوا عَلَى الْجَلاَءِ، فَجَلَتْ بَنُو النَّضِيرِ وَاحْتَمَلُوا مَا أَقَلَّتِ الإِبِلُ مِنْ أَمْتِعَتِهِمْ وَأَبْوَابِ بُيُوتِهِمْ وَخَشَبِهَا، فَكَانَ نَخْلُ بَنِي النَّضِيرِ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاصَّةً، أَعْطَاهُ اللَّهُ إِيَّاهَا وَخَصَّهُ بِهَا، فَقَالَ: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ

مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ). يَقُولُ: بِغَيْرِ قِتَالٍ، فَأَعْطَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَكْثَرَهَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَقَسَمَهَا بَيْنَهُمْ، وَقَسَمَ مِنْهَا لِرَجُلَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ وَكَانَا ذَوِي حَاجَةٍ، لَمْ يَقْسِمْ لأَحَدٍ مِنَ الأَنْصَارِ غَيْرَهُمَا، وَبَقِيَ مِنْهَا صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّتِي فِي أَيْدِي بَنِي فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا.

واتە: لە زوهریەوە، لە (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، لە پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە بوو لەپێش روودانی جەنگی بەدر، کافرەکانی قورەیش نامەیان نوسی بۆ ئیبنو ئوبەی - (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئوبەی سەرۆکی مونافیقەکانی مەدینە - و ئەوانەی لەگەڵ ئەو بتیان دەپەرست لە هۆزی ئەوس و خەزرەج، ئێوە دالدەی موحەممەدتان داوەو لە ماڵی خۆتاندا جێگاتان کردۆتەوە، ئێمەش سوێن بە (اللّٰه) یان ئەوەتا ئێوە جەنگیان لەگەڵ دەکەن، یا لە خاکی خۆتان دەریان دەکەن، ئەگەر ئەو کارە نەکەن ئەوا ئێمە بە هەموو جەنگاوەرەکانمانەوە دێینە سەرتان بۆ جەنگ، جەنگاوەرەکانتان دەکوژین و ئافرەتەکانیشتان دەفڕێنین و دەیانکەینە (سەبایا)کۆیلە، کاتێ کە نامەکەی قورەیش گەیشتە دەستی (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئوبەی و ئەوانەی لەگەڵی بوون و بتیان دەپەرست کۆبونەوە بۆ جەنگ بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کاتێ کە هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئوبەی و ئەوانەی لەگەڵی بوون فەرموو: (بێگومان بەڵێن و هەڕەشەی قورەیشتان پێ گەیشتوە کە زێدەڕۆیی زۆری تێدا کراوە، فێڵ و تەڵەکەی قورەیش ئەوەندەی ئەوە زیانتان پێ ناگەیەنێ کە ئێوە لەخۆتانی دەکەن، ئێوە ئەگەر لەگەڵ ئێمە بجەنگ ئەوا منداڵ و براکانی خۆتان دەکوژن کە موسوڵمان بوون و

لەگەڵ ئێمەن، ئەمەش زیاتر زیانتان پێ دەگەیەنێ لەوەی کە لەگەڵ قورەیشدا بجەنگن!)، کاتێ کە ئەوەیان بیست لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و زانیان کە جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان زیانی زیاترە بۆیان بڵاوەیان لێ کردو وازیان هێنا لەو کارە، ئەو هەواڵە گەیشتەوە بە کافرەکانی قورەیش، لەدوای رودانی جەنگی بەدر و سەرکەوتنی موسوڵمانان، کافرەکانی قورەیش نامەیان نوسی بۆ جولەکەکانی مەدینە بەم شێوەیە: ئێوە خاوەنی چەك قەڵغان و قەڵای قایمن، یان ئەوەتا بەرامبەر بە موحەممەد دەجەنگن یا ئەوەو ئەوەتان لەگەڵ دەکەین، هیچ شتێ نامێنێ لەنیوان ئێمەو ئافرەتەکانتاندا - هەڕەشەیان لێ کردن کە دێین بۆتان و جەنگتان لەگەڵ دەکەین و ئافرەتەکانتان بەدیل دەگرین و دەیانکەینە کۆیلە، کاتێ کە هەواڵی نامەکەی قورەیش بۆ جولەکەکانی مەدینە گەیشت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، جولەکەکانی بەنو (نضير) کۆبونەوەو سوربوون لەسەر غەدر و ناپاکی بەرامبەری و کوشتنی، جولەکەکان ناردیان بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): کە سی کەس لە هاوەڵانی بنێرێ ئێمەش سی کەس لە زاناکانمان دەنێرین هەتا زاناکانی ئێمەو نوێنەرەکانی ئێوە لە ناوەڕاستی ڕێگای نێوان ماڵەکانی هەردولامان بەیەك دەگەن و گوێ لە وتەکانت دەگرن، جا ئەگەر زاناکانی ئێمە قسەکانی تۆیان بەڕاست زانی و باوەڕیان پێ هێنایت ئەوا ئێمەش باوەڕت پێ دەهێنین. ڕاوی فەرمودەکە بەسەرهاتی جولەکەکانی گێڕایەوە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەرەبەیانی ڕۆژی دواتردا بە چەند (کەتیبە)یە کۆمەڵێ لە سوپاوە چواردەوری جولەکەکانی گرت بۆ ئەوەی بدات بەسەریاندا، پێی فەرموون: (سوێند بە (الله) ئێوە لەدەستم ئەمین و سەلامەت نابن مەگەر بەڵێن و پەیمانم بدەنێ، بەڵێن و پەیمانێ کە ڕێکەوین لەسەری و جێبەجێی بکەن). جولەکەکان ملیان نەداو بەڵێنیان نەدایە، بۆیە هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جەنگی لەگەڵ کردن، لەپاشدا لەبەرەبەیانی ڕۆژی دواتردا بە چەند (کەتیبە)یە کۆمەڵێ لە سوپاوە دای بەسەر (بني قريضة)داو، وازیهێنا لە (بني نضير)، داوای کرد لە (بني قريضة) بەڵێن و پەیمانی بدەنێ، ئەوانیش بەڵێن و پەیمانیان پێ دا، ئیتر گەڕایەوە لەلای ئەوان،

لەبەرەبەیانی ڕۆژی دواتردا بە چەند (کەتیبە)یە کۆمەڵێ لە سوپاوە دای بەسەر جولەکەکانی (بني نضير)دا، جەنگی لەگەڵ کردن هەتا ناچاری کردن لە قەڵاکانیان هاتنەخوارەوەو لەمەدینە دەریکردن بۆ وڵاتی شام، ئەوانیش هەرچی کەل و پەل و دەرگاو تەختەو داری ماڵەکانیان هەبوو نایان لە وشترەکانیان و لەگەڵ خۆیان بردیان، ئیتر باخە خورماکانی (بني نضير) تەرخان کرا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە بە تایبەتی بەخشی بەو، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡهُمۡ فَمَآ أَوۡجَفۡتُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ خَيۡلٖ وَلَا رِكَابٖ). سورة الحشر: ٦.

واتە: ئەو دەستکەوتانە، خوای گەورە لەجولەکەی سەندوە و بەخشیویەتی بە پێغەمبەرەکەی، ئێوە هیچ خۆتان ماندو نەکردبو بۆ بەدەستهێنانی، نە بەسواری ئەسپ بۆی چوبون نە بەسواری وشتر واتە هیچ ئەسپ و وشترێکتان بۆ تاو نەداوە.

وتی: واتە بە بێ جەنگ و کوشتار، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆربەی بەخشی بە کۆچەران(مهاجرين)و دابەشی کرد بە سەریاندا - چونکە ئەوان ماڵ و سامانی خۆیان لە مەککە بەجێهێشتبو لە پێناوی خوای گەورەدا - ،،هیچ شتێکی لێ نەدا بە ئەنصارەکان، تەنیا بەشی دوو کەسیان نەبێ کە زۆر پێویستیان پێی هەبوو. جا ئەو خێرو صەدەقەیەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەدەست نەوەی (فاطمة)وە ڕەزای خوای لێ بێ مایەوە.

**٣٠٠٥ – (صحيح) عن ابن عمر، أَنَّ يَهُودَ بَنِي النَّضِيرِ وَقُرَيْظَةَ حَارَبُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأَجْلَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَنِي النَّضِيرِ، وَأَقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَأَوْلاَدَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بِرَسُولِ**

اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَمَّنَهُمْ وَأَسْلَمُوا، وَأَجْلَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَهُودَ الْمَدِينَةِ كُلَّهُمْ: بَنِي قَيْنُقَاعَ، وَهُمْ قَوْمُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَمٍ، وَيَهُودَ بَنِي حَارِثَةَ، وَكُلَّ يَهُودِي كَانَ بِالْمَدِينَةِ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: (بنی نضیر) و (بنی قریظة) لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جەنگیان کرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (بنی نضیر)ی دەرکرد، (بنی قریظة)ی هێشتەوەو منەتی کرد بەسەریانداو ئازادی کردن هەتا دواتر دژایەتی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) کرد جا ئەوانیشی دەرکرد - پانزە شەو ئابڵوقەیدان ئابڵوقەکە تەنگی پێ هەڵچنین و، خوای گەورە ترسی خستە نێو دڵەکانیانەوەو رازی بوون بە بڕیاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، لە قەڵاکانیان هاتنەخوارەوە - . پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پیاوەکانی کوشتن و ژن و منداڵ و ماڵ و سامانەکانیانی دابەشکرد بەسەر موسوڵماناندا، جگە لە هەندێکیان نەبێ کە گەیشتن بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویش پەنای دان لەپاشدا موسوڵمان بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرچی جولەکە هەبوو لە مەدینە دەریکردن: جولەکەکانی بەنی قەینوقاع کە خزم و کەسی (عبد الله)ی کوڕی سەلام بوون، جولەکەکانی بەنو (حارثة)و، هەر جولەکەیە لە مەدینە نیشتەجێ بوو.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە حوکمی زەوی خەیبەر

## ٢٤ - باب مَا جَاءَ فِي حُكْمِ أَرْضِ خَيْبَرَ.

٣٠٠٦ - (حسن الإسناد) عن ابن عمر، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاتَلَ أَهْلَ خَيْبَرَ، فَغَلَبَ عَلَى النَّخْلِ وَالأَرْضِ، وَأَلْجَأَهُمْ إِلَى قَصْرِهِمْ، فَصَالَحُوهُ عَلَى أَنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّفْرَاءَ وَالْبَيْضَاءَ وَالْحَلْقَةَ، وَلَهُمْ مَا حَمَلَتْ رِكَابُهُمْ، عَلَى أَنْ لاَ يَكْتُمُوا، وَلاَ يُغَيِّبُوا شَيْئًا، فَإِنْ فَعَلُوا فَلاَ ذِمَّةَ لَهُمْ وَلاَ عَهْدَ، فَغَيَّبُوا مَسْكًا لِحُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ، وَقَدْ كَانَ قُتِلَ قَبْلَ خَيْبَرَ، كَانَ احْتَمَلَهُ مَعَهُ يَوْمَ بَنِي النَّضِيرِ حِينَ أُجْلِيَتِ النَّضِيرُ، فِيهِ حُلِيُّهُمْ، قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِسَعْيَةَ: (أَيْنَ مَسْكُ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ؟). قَالَ أَذْهَبَتْهُ الْحُرُوبُ وَالنَّفَقَاتُ، فَوَجَدُوا الْمَسْكَ، فَقَتَلَ ابْنَ أَبِي الْحُقَيْقِ وَسَبَى نِسَاءَهُمْ وَذَرَارِيَّهُمْ، وَأَرَادَ أَنْ يُجْلِيَهُمْ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ دَعْنَا نَعْمَلْ فِي هَذِهِ الأَرْضِ وَلَنَا الشَّطْرُ - مَا بَدَا لَكَ - وَلَكُمُ الشَّطْرُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْطِي كُلَّ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ ثَمَانِينَ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ، وَعِشْرِينَ وَسْقًا مِنْ شَعِيرٍ.

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كاتێ كە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لەگەڵ خەڵكی خەیبەر جەنگی كرد، دەستی گرت بەسەر زەوی و دارخورماكانیاندا، ئابلۆقەیدان و ناچاری كردن چونە ناو كۆشك و تەلار و قەلاكانیانەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیە وسلم) پێكهاتن كە ئالتون و زێڕ و زیو و چەك و قەڵغانەكانیان بۆ ئەو بێ، بۆ جولەكەكانیش یەكی باری وشترێ كەل و پەل، بەمەرجێ هیچ شتێ لە ئالتون و زێڕ و زیو و چەك و قەڵغانەكانیان نەشارنەوە، ئەگەر كاری لەو جۆرەیان كرد ئیتر هیچ و ئەمان و بەڵێنێ دادیان نادات و گوناهی خۆیان لەسەر خۆیان دەبێت، حویەیی كوڕی (أَخْطَب)كە یەكێ بوو لە جولەكەكان لەپێش جەنگی خەیبەردا كوژرا، پێستێكی هەبوو خشڵ و زێڕو زیوی تێدا بوو، هی جولەكەكانی (بنو نضیر) بوو كاتێ كە لە مەدینە دەركران دەستی كەوتبو، جولەكەكان ئەو پێستەیان شاردەوەو دیارنەما، ئیبنو عومەر وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بە سەعیە – كە مامی حویەیە بوو پیاوێكی جولەكە بوو– فەرموو: (پێستەكەی حویەیی كوڕی (أَخْطَب) لە كوێ یە؟)، وتی: لەكاروباری جەنگدا خەرج كراو تەواو بووە، جا هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) پێستەكەیان دۆزییەوەو جولەكەكان بەدرۆكەوتنەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) ئیبنو ئەبی حوقەیقی كوشت - كە سەرۆكی جولەكەكانی خەیبەر بوو چونكە بەڵێنەكەی شكاند - ، ژن و وەچەو نەوەكانیانی كرد بە كۆیلە، كاتێ كە ویستی لەوڵاتی خۆیان دەریان بكات، وتیان: ئەی موحەممەد وازمان لێ بێنە با لەزەویەكانی خۆماندا كاربكەین ماوەی ئەوەندەی كە تۆ دەتەوێ، نیوەی بەرهەمەكەی بۆ ئێمە بێ و نیوەشی بۆ تۆ بێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) رازی بوو، لە پشكی پێنج یەكی بەرهەمی ئەو زەویانەی خەیبەر بۆ بژێوی ساڵانەی هەریەكێ لە خێزانەكانی خۆی سەد ویسق خورماو بیست ویسق جۆی تەرخان كرد.

**٣٠٠٧ - (حسن صحيح) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما، أن عمر قال: أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ عَامَلَ يَهُودَ خَيْبَرَ عَلَى أَنَّا نُخْرِجُهُمْ إِذَا شِئْنَا، فَمَنْ كَانَ لَهُ مَالٌ فَلْيَلْحَقْ بِهِ، فَإِنِّي مُخْرِجٌ يَهُودَ. فَأَخْرَجَهُمْ.**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا وتی: ئەی خەڵکینە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کاری کرد بە جولەکەکانی خەیبەر لەسەر ئەوە پێکهاتن کە هەرکاتێ موسوڵمانان ویستیان دەریان بکەن، جا ئەو کەسەی کە ماڵ و سامان و باخ و کشتوکاڵی هەیە لە خەیبەر بەدەست جولەکەوەیە با بچێت لێی بسەنێتەوەو بیپارێزێ، چونکە من لە مەدینە دەریان دەکەم، ئیتر عومەر ڕەزای خوای لێ بێ دەریکردن.

**٣٠٠٨ - (حسن الإسناد) عن عبد الله بن عمر رضي الله عنهما قال: لَمَّا افْتُتِحَتْ خَيْبَرُ سَأَلَتْ يَهُودُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُقِرَّهُمْ عَلَى أَنْ يَعْمَلُوا عَلَى النِّصْفِ مِمَّا خَرَجَ مِنْهَا، فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(أُقِرُّكُمْ فِيهَا عَلَى ذَلِكَ مَا شِئْنَا). فَكَانُوا عَلَى ذَلِكَ، وَكَانَ التَّمْرُ يُقْسَمُ عَلَى السُّهْمَانِ مِنْ نِصْفِ خَيْبَرَ، وَيَأْخُذُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْخُمُسَ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَطْعَمَ كُلَّ امْرَأَةٍ مِنْ أَزْوَاجِهِ مِنَ الْخُمُسِ مِائَةَ وَسْقٍ تَمْرًا**

وَعِشْرِينَ وَسْقًا شَعِيرًا، فَلَمَّا أَرَادَ عُمَرُ إِخْرَاجَ الْيَهُودِ أَرْسَلَ إِلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لَهُنَّ: مَنْ أَحَبَّ مِنْكُنَّ أَنْ أَقْسِمَ لَهَا نَخْلاً بِخَرْصِهَا مِائَةَ وَسْقٍ، فَيَكُونَ لَهَا أَصْلُهَا وَأَرْضُهَا وَمَاؤُهَا، وَمِنَ الزَّرْعِ مَزْرَعَةُ خَرْصٍ عِشْرِينَ وَسْقًا: فَعَلْنَا، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ نَعْزِلَ الَّذِي لَهَا فِي الْخُمُسِ كَمَا هُوَ: فَعَلْنَا.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خەیبەر ڕزگار کرا جولەکەکان داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە ڕێگەیان بدات لە خەیبەر بمێننەوەو نیشتەجێ بن و لەزەویەکانی خۆیاندا کاربکەن بەمەرجێ نیوەی بەرهەمی دارخورماو کشتوکاڵەکەیان بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێ و نیوەکەی تریشی بۆ خۆیان بێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ڕێگەتان دەدەم هەتا ئەوکاتەی کە خۆمان دەمانەوێ، هەرکاتێ ویستمان دەرتانکەین، دەرتان دەکەین)، ئیتر کار بەو جۆرە بەردەوام بوو هەتا سەردەمی خەلافەتی پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ ئەوکاتە ئەو دەریکردن.

ئیتر لەوکاتەوە هەموو ساڵێ بەرهەمی دارخورماکانی زەوی خەیبەر دابەش دەکرا بۆ دوو پشك هەر یەکەو پشکی خۆی دەبرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێنج یەکی وەردەگرت بۆ خۆی، لەو پێنج یەکە بۆ بژێوی ساڵانەی هەریەکێ لە خێزانەکانی سەد ویسق خورماو بیست ویسق جۆی تەرخان دەکرد.

پێشەوا عومەر ڕەزای خوای لێ بێ لەسەردەمی خەلافەتی خۆیدا کاتێ کە ویستی جولەکەکانی خەیبەر دەربکات، ناردی بۆلای خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پرس و ڕای پێکردن و پێی وتن: ئەوەی دەیەوێت سەد ویسق خورماکەی بەدار خورماکەوە بۆ دەبخەملێنین و ئەسڵی دارخورماکەو زەویەکەو ئاوەکەی بۆ ئەو دەبێت،

لەکشتوکاڵیش بیست ویسق جۆ بە خەملاندن، ئێمە دەیدەینێ، ئەوەشی وەك جاران سەد ویسق خورماو بیست ویسق جۆکەی خۆی دەوێت لە پێنج یەك، هەر دەیدەینێ.

**٣٠٠٩ - (صحيح) عن أنس بن مالك، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزَا خَيْبَرَ فَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، فَجَمَعَ السَّبْيَ.**

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) غەزای جولەکەکانی خەیبەری کرد، بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار سەرکەوتین بەسەریانداو خەیبەرمان گرت، ئەو ئافرەتانەی کە بەدیل گیران کرانە(سەبایا)کۆیلەو دابەشکران بەسەر جەنگاوەرەکاندا.

**٣٠١٠ - (حسن صحيح) عن سهل بن أبي حثمة قال: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ نِصْفَيْنِ: نِصْفًا لِنَوَائِبِهِ وَحَاجَتِهِ، وَنِصْفًا بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، قَسَمَهَا بَيْنَهُمْ عَلَى ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَهْمًا.**

واتە: لە سەهلی کوڕی (حَثْمَةَ)وە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خەیبەری کرد بە دوو بەشەوە نیوەی بۆ پێویستی و بەرژەوەندی موسوڵمانان و هەژاران و لێقەوماوان، نیوەکەی تریشی بۆ موسوڵمانان کە هەژدە پشك بوو دابەشی دەکرد بە سەریاندا.

**٣٠١١ - (صحيح بما قبله) عن بشير بن يسار قال: لَمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ قَسَمَهَا عَلَى سِتَّةٍ وَثَلَاثِينَ**

**سَهْمًا، جَمَعَ كُلُّ سَهْمٍ مِائَةَ سَهْمٍ، فَعَزَلَ نِصْفَهَا لِنَوَائِبِهِ وَمَا يَنْزِلُ بِهِ: الْوَطِيحَةَ وَالْكُتَيْبَةَ وَمَا أُحِيزَ مَعَهُمَا، وَعَزَلَ النِّصْفَ الآخَرَ فَقَسَمَهُ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ: الشَّقَّ وَالنَّطَاةَ وَمَا أُحِيزَ مَعَهُمَا، وَكَانَ سَهْمُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا أُحِيزَ مَعَهُمَا.**

واتە: لە بوشەیری کوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە خوای گەورە خەیبەری بە (فيء) بەخشی بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) کردی بە سی و شەش پشکەوە، هەر پشکێکی دانا بۆ سەد کەس، نیوەیە لەوە تەرخان کراِ بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسوڵمانان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نیوەی دانا بۆ دیوەخان و ئەو نوێنەرانەی دەهاتنەخزمەتی کە بریتی بوون لەم شوێنانە: (الْوَطِيحَة) و (الْكُتَيْبَة)و ئەو شوێنانەی کە سەر بەوان بوون. نیوەکەی تری دابەشکرد بەسەر موسوڵماناندا کە بریتی بوون لەم شوێنانە: (الشَّقّ) و (النَّطَاة)و ئەو شوێنانەی کە سەر بەوان بوون، پشکەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو شوێنانە بوو کە سەر بە (الشَّقّ) و (النَّطَاة) بوون لەدوای دەرکردنی پێنج یەك.

**٣٠١٢ - (صحيح الاسناد) عن بشير بن يسار، أَنَّهُ سَمِعَ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالُوا: فَذَكَرَ هَذَا الْحَدِيثَ، قَالَ: فَكَانَ النِّصْفُ سِهَامَ الْمُسْلِمِينَ، وَسَهْمَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَعَزَلَ النِّصْفَ لِلْمُسْلِمِينَ لِمَا يَنُوبُهُ مِنَ الأُمُورِ وَالنَّوَائِبِ.**

واتە: لە بوشەیری كوڕی یەسارەوە دەگێرنەوە، كە لە چەند كەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بیستویەتی كە وتویانە: جا راوی فەرمودەی پێشوی گێڕایەوە، بەشیر وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەیبەری كرد بە دوو بەشەوە نیوەی دانا بۆ موسوڵمانان، خۆشی لەو نیوەیە پشكی هەبوو، بەشێكی جیاكردبوەوە بۆ دیوەخان و پێویستی و بەرژەوەندی موسوڵمانان و هەژاران و كارەسات و لێقەومان و ئەو نوێنەرانەی كە دەهاتن بۆ خزمەتی.

**٣٠١٣ - (صحيح الاسناد) عن بشير بن يسار مولى الأنصار، عن رجال من أصحاب النبي صلى الله عليه و سلم: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا ظَهَرَ عَلَى خَيْبَرَ قَسَمَهَا عَلَى سِتَّةٍ وَثَلَاثِينَ سَهْمًا، جَمَعَ كُلُّ سَهْمٍ مِائَةَ سَهْمٍ، فَكَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلِلْمُسْلِمِينَ النِّصْفُ مِنْ ذَلِكَ، وَعَزَلَ النِّصْفَ الْبَاقِيَ لِمَنْ نَزَلَ بِهِ مِنَ الْوُفُودِ وَالْأُمُورِ وَنَوَائِبِ النَّاسِ.**

واتە: لە بوشەیری كوڕی یەساری بەندەی ئازادكراوی ئەنصارەوە، لە چەند كەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەگێرنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كاتێ كە سەركەوت بەسەر جولەكەكانی خەیبەردا خەیبەری كردی بە سی و شەش پشكەوە، هەر پشكێكی دانا بۆ سەد كەس، بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسوڵمانان نیوەیە لەوە تەرخان كرا، نیوەكەی تریشی تەرخان كرد بۆ ئەو نوێنەرانەی دەهاتنەخزمەتی بۆ هەژاران و لێقەوماوان و كاروباری موسوڵمانان و بەرژەوەندیان.

٣٠١٤ - (صحيح بما قبله) عن بشير بن يسار: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ خَيْبَرَ قَسَمَهَا سِتَّةً وَثَلَاثِينَ سَهْمًا جَمْعًا، فَعَزَلَ لِلْمُسْلِمِينَ الشَّطْرَ: ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَهْمًا، يَجْمَعُ كُلُّ سَهْمٍ مِائَةً النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَهُمْ، لَهُ سَهْمٌ كَسَهْمِ أَحَدِهِمْ، وَعَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَهْمًا - وَهُوَ الشَّطْرُ - لِنَوَائِبِهِ وَمَا يَنْزِلُ بِهِ مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ، فَكَانَ ذَلِكَ الْوَطِيحَ وَالْكُتَيْبَةَ وَالسُّلَالِمَ وَتَوَابِعَهَا، فَلَمَّا صَارَتِ الْأَمْوَالُ بِيَدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالْمُسْلِمِينَ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ عُمَّالٌ يَكْفُونَهُمْ عَمَلَهَا، فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْيَهُودَ فَعَامَلَهُمْ.

واتە: لە بوشەیری كوڕی یەسارەوە دەگێڕنەوە: كاتێ كە خوای گەورە خەیبەری بە (فيء) بەخشی بە پێغەمبەرەكەی (صلى الله عليه وسلم) كردی بە سی و شەش پشكەوە، بەشێكی تەرخان كرد بۆ موسوڵمانان، هەژدە پشك بوو، هەر پشكێكی دانا بۆ سەد كەس پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەكێ بوو لەوانە، پشكێكی بۆ دانرا وەك هەر یەكێ لەو سەد كەسە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەژدە پشكی جیاكردەوە — كە بەشێك بوو — بۆ دیوەخان و پێویستی و بەرژەوەندی موسوڵمانان و هەژاران و كارەسات و لێقەومان و ئەو نوێنەرانەی كە دەهاتن بۆ خزمەتی، ئەو شوێنانەش بریتی بوون لە: (الْوَطِيحَة) و (الْكُتَيْبَة)و (السُّلَالِم) و ئەو شوێنانەی كە سەر بەوان بوون. كاتێ كە ئەو شوێنانە بەدەستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسوڵمانانەوە بوو كرێكاری دەستنەكەوت كە سەرپەرشتیان بكات و كاربكەن لەو زەویانەدا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جولەكەكانی بانگ كرد پێكهات لەگەڵیان كە لەو زەویانەدا كاربكەن بە نیوەیی.

٣٠١٥ - (حسن) عن مجمع بن جارية الأنصاري - وكان أحد القراء الذين قرءوا القرآن قال: قُسِمَتْ خَيْبَرُ عَلَى أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ، فَقَسَمَهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى ثَمَانِيَةَ عَشَرَ سَهْمًا، وَكَانَ الْجَيْشُ أَلْفًا وَخَمْسَ مِئَةٍ، فِيهِمْ ثَلاَثُمِائَةِ فَارِسٍ، فَأَعْطَى الْفَارِسَ سَهْمَيْنِ، وَأَعْطَى الرَّاجِلَ سَهْمًا.

واتە: لە موجەمیعی ئەنصاریەوە — کە یەکێ بوو لە قورئان خوێنەکان - دەگێرنەوە: کە وتویەتی: خەیبەر دابەشکرا بەسەر ئەوانەدا کە بەشداری پێکهاتنی حودەیبیەیان کردبوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کردی بە هەژدە پشکەوە، سوپاکە هەزار و پێنج سەد کەس بوو، سێ سەد کەسیان سوار بوون و ئەوانەی تریان پیادە، جا دوو بەشی دانا بۆ هەر سوارێ، هەرکەسێکیش کە پیادە بوو بەشێکی بۆ دانا.

٣٠١٦ - (ضعيف الاسناد) عن الزهري وعبد الله بن أبي بكر وبعض ولد محمد بن مسلمة قالوا: بَقِيَتْ بَقِيَّةٌ مِنْ أَهْلِ خَيْبَرَ فَتَحَصَّنُوا، فَسَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يَحْقِنَ دِمَاءَهُمْ وَيُسَيِّرَهُمْ، فَفَعَلَ، فَسَمِعَ بِذَلِكَ أَهْلُ فَدَكَ فَنَزَلُوا عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَاصَّةً، لأَنَّهُ لَمْ يُوجِفْ عَلَيْهَا بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ.

واتە: لە زوهری و (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی ئەبو بەکر و هەندێ لە کوڕانی موحەممەدی کوڕی مەسلەمەوە دەگێرنەوە، کە وتویانە: هەندێ لە قەڵاکانی خەیبەر مابوون رزگار بکرێن خەڵکەکە چوبونە ناو قەڵاکانیان و خۆیان حەشاردابوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

و موسوڵمانان گەمارۆیان دان، ئەوانیش داوایان کرد لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە نەیانکوژێت و خوێنیان نەڕێژێ بەڵام لە وڵاتی خۆیان دەریان کات، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەریکردن، کاتێ کە خەڵکی فەدەك ئەوەیان بیست ئەوانیش بە هەمان شێوە وڵاتیان بەجێهێشت، ئیتر ئەو شوێنانە تایبەت بوون بە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، چونکە بە بێ جەنگ و کوشتار رزگارکران و موسوڵمانان ئەسپیان بۆ تاو نەدابوو.

**٣٠١٧ - (ضعيف) عن سعيد بن المسيب: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ افْتَتَحَ بَعْضَ خَيْبَرَ عَنْوَةً.**

واتە: لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێ لەخاکی خەیبەری بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار رزگار کرد.

(ضعيف) قال أبو داود: عن ابن شهاب: أَنَّ خَيْبَرَ كَانَ بَعْضُهَا عَنْوَةً، وَبَعْضُهَا صُلْحًا، وَالْكُتَيْبَةُ أَكْثَرُهَا عَنْوَةً، وَفِيهَا صُلْحٌ. قُلْتُ لِمَالِكٍ: وَمَا الْكُتَيْبَةُ؟ قَالَ: أَرْضُ خَيْبَرَ وَهِيَ أَرْبَعُونَ أَلْفَ عَذْقٍ.

ئەبو داود دەڵێت: لە ئیبنو شیهابیەوە هاتوە، کە هەندێ لەخاکی خەیبەری بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار رزگار کرا، هەندێکیشی بە پێکهاتن، زۆربەی خاکی (الْكُتَيْبَة) بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار رزگار کرا، ئەوی تریشی بە پێکهاتن. بە مالیکم وت: (الْكُتَيْبَة) چی یە؟ وتی: زەوی خەیبەر بوو کە چل هەزار دارخورما بوو.

**٣٠١٨ - (صحيح) عن ابن شهاب قال: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ افْتَتَحَ خَيْبَرَ عَنْوَةً بَعْدَ الْقِتَالِ، وَنَزَلَ مَنْ نَزَلَ مِنْ أَهْلِهَا عَلَى الْجَلاَءِ بَعْدَ الْقِتَالِ.**

واتە: لە ئیبنو شیهابییەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێم گەیشتوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خاکی خەیبەری بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار رزگار کرد، لەدوای جەنگ هەندێ لە خەڵکەکەی رازی بوون بە دەرکردن لەولاتی خۆیان و لە قەلاکانیان هاتنەخوارەوەو دەرچون.

**٣٠١٩ - (حسن) عن ابن شهاب قال: خَمَّسَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ، ثُمَّ قَسَّمَ سَائِرَهَا عَلَى مَنْ شَهِدَهَا وَمَنْ غَابَ عَنْهَا مِنْ أَهْلِ الْحُدَيْبِيَةِ.**

واتە: لە ئیبنو شیهابییەوە هاتوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێنج یەکی خاکی خەیبەری دانا بۆ خۆی، لەپاشدا ئەوەی کە مایەوە دابەشیکرد بەسەر ئەوانەدا کە ئامادەی جەنگەکە بوون و ئەوانەش کە ئامادەنەبوون لەو خەڵکانەی کە بەشداری پێکهاتنی حودەیبییەیان کردبو.

**٣٠٢٠ - (صحيح) عن عمر قال: لَوْلاَ آخِرُ الْمُسْلِمِينَ مَا فَتَحْتُ قَرْيَةً إِلاَّ قَسَمْتُهَا كَمَا قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ.**

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: ئەگەر لەبەر ئەو موسوڵمانە هەژارانە نەبێت کە لەدوای ئێمەوە دێن ئەوا هەر شوێنێ رزگار بکرایە دابەشم دەکرد بەسەر جەنگاوەراندا، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەیبەری دابەشکرد.

- پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ پێی وابوو ئەو خاکە رزگار کراوانە بکرێنە وەقف بۆ ئەوەی موسوڵمانان سودی لێ وەربگرن - .

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە هەواڵی رزگاركردنی شاری مەككە.

## ٢٥ - باب مَا جَاءَ فِي خَبَرِ مَكَّةَ.

٣٠٢١ - (حسن) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الْفَتْحِ جَاءَهُ الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بِأَبِي سُفْيَانَ بْنِ حَرْبٍ، فَأَسْلَمَ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَقَالَ لَهُ الْعَبَّاسُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ يُحِبُّ هَذَا الْفَخْرَ، فَلَوْ جَعَلْتَ لَهُ شَيْئًا، قَالَ: (نَعَمْ، مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ عَلَيْهِ بَابَهُ فَهُوَ آمِنٌ).

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، كە لەساڵی رزگاركردنی شاری مەككەدا عەباسی كوڕی (عبد المطلب) ئەبو سوفیانی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەبو سوفیان موسوڵمان بوو لە (مر الظهران) كە شوێنێكە لەنزیك مەككە، عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەبو سوفیان پیاوێكە حەزی لەم فەخرو شانازیەیە كە خەڵك بەكاروباری دنیاوە دەیكەن، بەڵكو شتێكی بۆ بكەیت فەخرو شانازی پێوە بكات و ببێتەهۆی بەهێزی ئیمانەكەی، فەرمووی: (بەڵێ، ئەوەی بچێتەماڵی ئەبو سوفیانەوە ئەوە ئەمین و سەلامەتە، ئەوەی دەرگای ماڵەكەی لەسەر خۆی داخات ئەوەش هەر ئەمین و سەلامەتە).

٣٠٢٢ - (حسن) عن ابن عباس قال: لَمَّا نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّ الظَّهْرَانِ، قَالَ الْعَبَّاسُ: قُلْتُ: وَاللَّهِ لَئِنْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَكَّةَ عَنْوَةً قَبْلَ أَنْ يَأْتُوهُ فَيَسْتَأْمِنُوهُ، إِنَّهُ لَهَلاَكُ قُرَيْشٍ، فَجَلَسْتُ عَلَى بَغْلَةِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: لَعَلِّي أَجِدُ ذَا حَاجَةٍ يَأْتِي أَهْلَ مَكَّةَ فَيُخْبِرُهُمْ بِمَكَانِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِيَخْرُجُوا إِلَيْهِ فَيَسْتَأْمِنُوهُ، فَإِنِّي لأَسِيرُ إِذْ سَمِعْتُ كَلاَمَ أَبِي سُفْيَانَ، وَبُدَيْلِ بْنِ وَرْقَاءَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا حَنْظَلَةَ فَعَرَفَ صَوْتِي، فَقَالَ: أَبُو الْفَضْلِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: مَا لَكَ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي، قُلْتُ: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَالنَّاسُ، قَالَ: فَمَا الْحِيلَةُ؟ قَالَ: فَرَكِبَ خَلْفِي وَرَجَعَ صَاحِبُهُ، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَوْتُ بِهِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ يُحِبُّ هَذَا الْفَخْرَ، فَاجْعَلْ لَهُ شَيْئًا، قَالَ: (نَعَمْ مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ عَلَيْهِ دَارَهُ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَهُوَ آمِنٌ). قَالَ: فَتَفَرَّقَ النَّاسُ إِلَى دُورِهِمْ وَإِلَى الْمَسْجِدِ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، لەساڵی ڕزگارکردنی شاری مەککەدا کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ سوپاکەی لە (مرّ الظهران)

دابەزی، عەباس وتی: لەدڵی خۆمدا وتم: سوێند بە (الله) ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار بچێتە ناو شاری مەککەوە پێش ئەوەی خەڵی مەککە بێن و داوای ئەمان بکەن، ئەوە خەڵکی قورەیش بە هیلاکا دەچن و سەرکەوتو نابن، بەسواری ئێسترەکەی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیە وسلم) لەدڵی خۆمدا وتم: بەڵکو کەسێکم دەسکەوێت خۆی کارێکی پێویستی هەبێ بڕوات بۆ مەککە هەواڵی شوێنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) و سوپاکەی رابگەیەنێت بە خەڵکی مەککە، بۆئەوەی لەمەکە دەرچن و داوای ئەمانی لێ بکەن، من لەوناوەدا دەگەڕام بۆ ئەوەی یەکێ بدۆزمەوە ئەو هەواڵە بگەیەنێ بە خەڵکی مەککە گوێم لەدەنگی ئەبو سوفیان و بودەیلی کوڕی (ورقاء) بوو، وتم: ئەی (أَبَا حَنْظَلَةَ) نازناوی ئەبو سوفیان بوو، دەنگی ناسیمەوە، وتی: تۆ (أَبو الْفَضْل)ی؟ نازناوی عەباس بوو، وتم: بەڵێ، وتی: چیت دەوێ باوك و دایکم بە قوربانت بێ، وتم: ئەوە پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیە وسلم) لەگەڵ سوپای موسوڵماناندا دەیانەوێ بچنە مەککەوە، وتی: چار چی یە؟ ئیبنو عەباس وتی: ئەبو سوفیان لە پاشکۆی منەوە سوار بوو، هاوڕێکەی بودەیلی کوڕی (ورقاء) گەڕایەوە بۆ مەککە، کاتێ کە ڕۆژ بویەوە بردم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) موسوڵمان بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم)، ئەبو سوفیان پیاوێکە حەزی لەم فەخرو شانازیەیە کە خەڵك بەکاروباری دنیاوە دەیکەن، بەڵکو شتێکی بۆ بکەیت فەخرو شانازی پێوە بکات و ببێتەهۆی بەهێزی ئیمانەکەی، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی: (بەڵێ، ئەوەی بچێتە ماڵی ئەبو سوفیانەوە ئەوە ئەمین و سەلامەتە، ئەوەی دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی داخات ئەمین و سەلامەتە، ئەوەی بچێتە مزگەوتەوە ئەوەش هەر ئەمین و سەلامەتە). ئیبنو عەباس وتی: ئیتر خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد بەرەو ماڵەکانیان و بەرەو مزگەوتی حەرام.

**٣٠٢٣ - (صحيح الاسناد) عن وهب بن منبه قال: سَأَلْتُ جَابِرًا: هَلْ غَنِمُوا يَوْمَ الْفَتْحِ شَيْئًا؟ قَالَ: لاَ.**

واتە: لە وەهەبی کوڕی مونەبیهەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە جابرم پرسی: ئایا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی رزگارکردنی شاری مەککەدا هیچ غەنیمەتێکی گرت؟ وتی: نەء بەڵکو منەتی کرد بەسەریاندا فەرمووی: ئەمڕۆ ئێوە ئازادن - .

**٣٠٢٤ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا دَخَلَ مَكَّةَ سَرَّحَ الزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ، وَأَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ، وَخَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ عَلَى الْخَيْلِ، وَقَالَ: (يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، اهْتِفْ بِالأَنْصَارِ). قَالَ: اسْلُكُوا هَذَا الطَّرِيقَ، فَلاَ يُشْرِفَنَّ لَكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ أَنَمْتُمُوهُ! فَنَادَى مُنَادٍ لاَ قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ! فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(مَنْ دَخَلَ دَارًا فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَلْقَى السِّلاَحَ فَهُوَ آمِنٌ). وَعَمَدَ صَنَادِيدُ قُرَيْشٍ، فَدَخَلُوا الْكَعْبَةَ، فَغَصَّ بِهِمْ، وَطَافَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ، ثُمَّ أَخَذَ بِجَنْبَتَيِ الْبَابِ، فَخَرَجُوا، فَبَايَعُوا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الإِسْلاَمِ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ - سَأَلَهُ رَجُلٌ، قَالَ: مَكَّةَ عَنْوَةً هِيَ؟ - قَالَ: أَيْشٍ يَضُرُّكَ مَا كَانَتْ؟! قَالَ: فَصُلْحٌ؟ قَالَ: لاَ.**

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوە ناو شاری مەککەوە زوبێری کوڕی عەوام و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و خالیدی کوڕی وەلیدی بەسواری ئەسپەوە هەریەکێ لە لایەکەوە نارد بۆ ناو شاری مەککە، فەرمووی: (ئەی ئەبو هورەیرە، ئەنصارەکانم بۆ بانگ بکە). ئەبو هورەیرە ئەنصارەکانی بانگ کردو هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموون: (ئێوە ئەم ڕێگەیە بگرنەبەر – ڕێگەی سەرەوەی مەککە - ، هەرکەسێ هاتەڕێگاتان بیکوژن، جارچی یە جاریدا لەم ڕۆژە بەدواوە قورەیش نیە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی بچێتە ماڵەوە ئەوە ئەمین و سەلامەتە، ئەوەی چەکەکەی دابنێ ئەمین و سەلامەتە). جا گەورەکانی قورەیش چونە کەعبەوە، کەعبە پڕبوو لێیان و قەرەباڵغ بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەوافی ماڵی خوای کرد، جا لەدوای مەقامی ئیبراهیمەوە دوو رکات نوێژی کرد، لەپاشدا دەستی گرت بە هەردوو لاشیپانی دەرگاکەوە، گەورەکانی قورەیش هاتنەدەرەوەو بەڵێن و پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەر ئیسلام و موسوڵمان بوون. ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو لە وەڵامی پیاوێکدا کە پرسیاری لێ کرد: ئایا مەککە بە زەبرو زەنگ و جەنگ و کوشتار رزگار کرا؟ - وتی: ئەوەی کە رویدا چ زیانێکی بۆ تۆ هەیە؟! وتی: ئەی بە پێکهاتن؟ وتی: نا.

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە هەواڵی رزگارکردنی (طائف).

## ٢٦ – باب مَا جَاءَ فِي خَبَرِ الطَّائِفِ.

**٣٠٢٥ - (صحيح) عن وهب قال: سَأَلْتُ جَابِرًا عَنْ شَأْنِ ثَقِيفٍ إِذْ بَايَعَتْ، قَالَ: اشْتَرَطَتْ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ لاَ صَدَقَةَ عَلَيْهَا وَلاَ جِهَادَ، وَأَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ يَقُولُ: (سَيَتَصَدَّقُونَ وَيُجَاهِدُونَ إِذَا أَسْلَمُوا).**

واتە: لە وەهەبەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: سەبارەت بە حاڵ و کاروباری خەڵکی (ثقیف) کاتیَ کە بەڵێن و پەیمانیان دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و موسوڵمان بوون لە جابرم پرسی؟ ئەویش وتی: مەرجیان دانا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە زەکات نەدەن و جیهادیش نەکەن – بۆیە مەرجەکەی قبوڵ کردن چونکە لەوکاتەدا هیچیانیان لەسەر نەبوو بۆ زەکاتەکە ئەوە دەبوایە ساڵی بەسەردا تێ پەڕێ و بۆ جیهادەکەش لەوکاتەدا دوژمن هێرشی بۆ نەکردبوون و جیهادی فەرزی عەین نەبوو، هەروەها دەیزانی ئەگەر موسوڵمان بن زەکاتیش دەدەن و جیهادیش دەکەن - ، لەدوایدا جابر گوێی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو فەرمووی: (ئەگەر خەڵکی (ثقیف) موسوڵمان بن زەکاتیش دەدەن و جیهادیش دەکەن).

**٣٠٢٦ - (ضعيف) عن عثمان بن أبي العاص: أَنَّ وَفْدَ ثَقِيفٍ لَمَّا قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْزَلَهُمُ الْمَسْجِدَ، لِيَكُونَ أَرَقَّ لِقُلُوبِهِمْ، فَاشْتَرَطُوا عَلَيْهِ أَنْ لاَ يُحْشَرُوا وَلاَ**

يُعْشَـرُوا وَلاَ يُجَبُّـوا، فَقَـال رسـول الله صـلى الله عليـه وسلم:(لَكُمْ أَنْ لاَ تُحْشَرُوا وَلاَ تُعْشَرُوا، وَلاَ خَيْـرَ فِـى دِيـنٍ لَيْسَ فِيهِ رُكُوعٌ).

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی ئەبو عاصەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە نوێنەری خەڵکی (ثقیف) گەیشتن بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) میوانداری کردن لە مزگەوت، بۆئەوەی دڵیان نەرم ببێ، مەرجیان دانا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە جیهاد نەکەن – یان دەرنەچن بۆ لای زەکات کۆکەرەوە بەڵکو سەرکارەکان بڕۆن لەشوێنی خۆیان زەکاتەکانیان لێ وەرگرن - ، دەیەکی ماڵ و سامانیان نەدەن و رکوع نەبەن واتە نوێژنەکەن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (نە جیهاد بکەن و نە دەیەکی ماڵ و سامانتان بدەن، بەڵام خێر لەدینێکدا نیە کە رکوعی تێدا نەبێت - نوێژ نەکردنی قبوڵ نەکرد چونکە لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار فەرزە - ).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بە حوکمی خاکی یەمەن.

## ٢٧ – باب مَا جَاءَ فِي حُكْمِ أَرْضِ الْيَمَنِ.

٣٠٢٧ - (ضعيف الاسناد) عن عامر بن شهر رضي الله عنه قال: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَتْ لِـى هَمْـدَانُ: هَـلْ أَنْتَ آتٍ هَذَا الرَّجُلَ وَمُرْتَادٌ لَنَـا: فَـإِنْ رَضِـيتَ لَنَـا شَـيْئًا قَبِلْنَاهُ، وَإِنْ كَرِهْتَ شَيْئًا كَرِهْنَاهُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، فَجِئْتُ، حَتَّـى

قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَضِيتُ أَمْرَهُ، وَأَسْلَمَ قَوْمِي، وَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هَذَا الْكِتَابَ إِلَى عُمَيْرٍ ذِي مَرَّانَ، قَالَ: وَبَعَثَ مَالِكَ بْنَ مِرَارَةَ الرَّهَاوِيَّ إِلَى الْيَمَنِ جَمِيعًا، فَأَسْلَمَ عَكٌّ ذُو خَيْوَانَ، قَالَ: فَقِيلَ لِعَكٍ: انْطَلِقْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَخُذْ مِنْهُ الأَمَانَ عَلَى قَرْيَتِكَ وَمَالِكَ، فَقَدِمَ وَكَتَبَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ لِعَكٍ ذِي خَيْوَانَ، إِنْ كَانَ صَادِقًا فِي أَرْضِهِ وَمَالِهِ وَرَقِيقِهِ فَلَهُ الأَمَانُ وَذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ). وَكَتَبَ خَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ.

واتە: لە عامیری کوڕی شەهرەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەحی بۆ هات و بانگەوازەکەی بڵاوبووەوە و گەیشتە یەمەن، هەمەدان پێیان وتم: تۆ لەلای ئەو پیاوە هاتویت واتە لەلای پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، رابەر و چاوساغی ئێمەیی و هەق و خێر و خۆشیت دەوێ بۆ ئێمە، ئەگەر تۆ رازیت ئێمەش شوێنی بکەوین ئەوا ئێمە شوێنی دەکەوین، ئەگەر پێشت ناخۆشە ئەوا ئێمەش پێمان ناخۆشەو شوێنی ناکەوین، وتم: بەڵێ، هاتم، هەتا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، رازی بووم بە دینی ئیسلام و موسوڵمان بووم، قەومەکەشم موسوڵمان بوون، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم نامەیەی نوسی بۆ عومەیری (ذِي مَرَّان). عامیر وتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مالیکی کوڕی میرارەی رەهاوی نارد بۆ سەر هەموو خەڵکی یەمەن، عەکی (ذِي خَيْوَان)ی هەمەدانی موسوڵمان بوو، عامیر وتی: بە عەکی وت: بڕۆ بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)،

داوای ئەمان بکە بۆ ناوچەکەت و موڵك و ماڵ و سامانەکەت، ئەویش رۆشت بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مالیکی کوڕی میراره هاتوه بۆ ناومان ئیسلامی پیّ راگەیاندوین و موسولّمان بووین، موڵك و ماڵ و سامانێکم هەیە نامەیەکم بۆ بنوسە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ نوسی بەم شێوەیە: (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەد پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ عەکی (ذِي خَيْوَان)، ئەگەر راستگۆ بوو لە زەوی و موڵك و ماڵ و سامانەکەی و کۆیلەکانی ئەوە ئەمانی بۆ هەیە لە ئەستۆ(ذمة)ی خواو لە ئەستۆ(ذمة)ی موحەممەد پێغەمبەری خوادایە). خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص نامەکەی نوسی.

**٣٠٢٨ - (ضعيف الاسناد) عن جده أبيض بن حمال:** أَنَّهُ كَلَّمَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الصَّدَقَةِ حِينَ وَفَدَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: (يَا أَخَا سَبَإٍ، لاَ بُدَّ مِنْ صَدَقَةٍ). فَقَالَ: إِنَّمَا زَرْعُنَا الْقُطْنُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَقَدْ تَبَدَّدَتْ سَبَأٌ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهُمْ إِلاَّ قَلِيلٌ بِمَأْرِبٍ، فَصَالَحَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى سَبْعِينَ حُلَّةِ بَزٍ مِنْ قِيمَةِ وَفَاءِ بَزِّ الْمَعَافِرِ، كُلَّ سَنَةٍ، عَمَّنْ بَقِيَ مِنْ سَبَإٍ بِمَأْرِبَ. فَلَمْ يَزَالُوا يُؤَدُّونَهَا حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَإِنَّ الْعُمَّالَ انْتَقَضُوا عَلَيْهِمْ بَعْدَ قَبْضِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا صَالَحَ أَبْيَضُ بْنُ حَمَّالٍ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْحُلَلِ السَّبْعِينَ، فَرَدَّ ذَلِكَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى مَا وَضَعَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ

**وَسَلَّمَ، حَتَّى مَاتَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمَّا مَاتَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، انْتَقَضَ ذَلِكَ وَصَارَتْ عَلَى الصَّدَقَةِ.**

واتە: لە (أَبْيَض)ی کوڕی حەممالەوە، دەگێرنەوە، کاتێ کە بە نوێنەری قەومەکەی چوە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بە زەکاتی دە یەك گفتوگۆی لەگەڵ کردوە کە لێیان نەسەنرێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەی برای سەبەعەردەبێ زەکات و زەکاتی دە یەك بدەن، چونکە هەقی خوایەو فەرزە لەسەر موسوڵمانان - ). (أَبْيَض) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە لۆکەمان چاندوە، خەڵکی سەبەعبلاوەیان لێ کردوەو هەریەکە چون بە لایەکدا، کەمێکیان نەبێ کە لە مەئرەب ماونەتەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەو سەبەئیانەی کە لە مەئرەب مابونەوە پێکهات لەسەر ئەوەی کە ساڵانە حەفتا (حلە) بە نرخی پۆشاکی مەعافیری - (حلە) دوو پارچە پۆشاکی یەمانی بوو پارچەیەکی دەدرا بەسەر شانداو پارچەکەی تری بەشی خوارەوەی جەستەی پێ دادەپۆشرا، مەعافیر ناوی هۆزێ یان ناوچەیە بوو لە یەمەن - ، جا بەردەوام ئەو حەفتا (حلە)یان دەدا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەتا وەفاتی کرد، بەڵام لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو حەفتا (حلە)کەیان نەدا، پێشەوا ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێ ناچاری کردن کە ئەو حەفتا (حلە)یە بدەن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دایانبوو وە پێکهاتبون لەسەری لەگەڵ (أَبْيَض)ی کوڕی حەممال، ئیتر بەردەوام حەفتا (حلە)کەیان دەدا هەتا پێشەوا ئەبو بەکر وەفاتی کرد، لەدوای وەفاتی پێشەوا ئەبو بەکر پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو حەفتا (حلە)کەیان نەدا، بەڵام وەك موسوڵمانانی تر زەکاتی دە یەك یان نیوەی دە یەکیان دەدا.

# باسی سەبارەت بە دەرکردنی جولەکە لە دورگەی عەرەب.

# ٢٨ - باب فِي إِخْرَاجِ الْيَهُودِ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ.

٣٠٢٩ - (صحيح) عن ابن عباس: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْصَى بِثَلاَثَةٍ فَقَالَ: (أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مِمَّا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ). قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ، أَوْ قَالَ: فَأُنْسِيتُهَا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ ڕاسپێری بۆ کردین فەرمووی: (هاوبەش بۆ خوا دانەران دەرکەن لە دورگەی عەرەب و، وەك خۆم بە جوانی نوێنەر بەرێ بکەن و ڕێزیان بگرن و میوانداریان بکەن و چاك بن لەگەڵیان). ئیبنو عەباس وتی: لە ڕاسپێری سێیەم بێدەنگ بوو، یان وتی: باسی کرد بەڵام من لەیادم نەماوە.

٣٠٣٠ - (صحيح) عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه أنه سمع رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: (لأُخْرِجَنَّ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، فَلاَ أَتْرُكُ فِيهَا إِلاَّ مُسْلِمًا).

واتە: لە پێشەوا عومەری کوڕی (خَطّاب)ەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە، کە لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بیستوە فەرموویەتی: (جولەکەو گاورەکان لە دورگەی عەرەب دەردەکەم، جگە لەموسوڵمان کەسی تری تێدا ناهێڵم).

**٣٠٣١ - (صحيح) عن عمر رضي الله عنه قال: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، بِمَعْنَاهُ، وَالأَوَّلُ أَتَمُّ.**

واتە: لە پێشەوا عومەرەوە رەزای خوای لێ بێ بە هەمان مانا فەرمودەی پێشو هاتوە، بەڵام فەرمودەی پێشو تەواو ترە.

**٣٠٣٢ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ تَكُونُ قِبْلَتَانِ فِي بَلَدٍ وَاحِدٍ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (نابێ لە ولاتێکدا دوو قیبلە هەبێت — واتە موسوڵمانان روو بکەنە قیبلەیەك و غەیری ئەوانیش روو بکەنە قیبلەیەکی تر - ).

**٣٠٣٣ - (صحيح مقطوع) عن سعيد -يعني ابن عبد العزيز - قال: جَزِيرَةُ الْعَرَبِ مَا بَيْنَ الْوَادِي إِلَى أَقْصَى الْيَمَنِ، إِلَى تُخُومِ الْعِرَاقِ إِلَى الْبَحْرِ.**

واتە: لە سەعید — واتە ئیبنو (عبد العزيز) — ەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: دورگەی عەرەب لە (وادي القرى)وە هەتا ئەوپەری یەمەن و، تا سنوری عێراق هەتا دەریا دەگرێتەوە.

**٣٠٣٤- (ضعيف موقوف) عن مالك قال: عُمَرُ أَجْلَى أَهْلَ نَجْرَانَ وَلَمْ يُجْلَوْا مِنْ تَيْمَاءَ، لأَنَّهَا لَيْسَتْ مِنْ بِلاَدِ الْعَرَبِ، فَأَمَّا**

الْوَادِي فَإِنِّي أَرَى إِنَّمَا لَمْ يُجْلَ مَنْ فِيهَا مِنَ الْيَهُـودِ: أَنَّهُـمْ لَمْ يَرَوْهَا مِنْ أَرْضِ الْعَرَبِ.

واتە: لە مالیك — ی كوڕی ئەنەس - ەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێشەوا عومـەری كوڕی (خَطَّاب) خەڵكی نەجرانی دەركرد بەڵام خەڵكەكەی لە (تیمـاء) دەرنەكرد، چـونكە سەر بە وڵاتی عـەرەب نـەبو، دەربـارەی (وادی القـری) پـێم وایـە جولەكـەكانی ئـەوێی دەرنەكرد، چونكە هاوەڵان پێیان وابو (وادی القری) سەر بە خاكی عەرەب نی یە.

٣٠٣٤ (م) - (ضعيف موقوف) عن ابن وهب قال: قال مالك: قَدْ أَجْلَـى عُمَرُ رَحِمَهُ اللَّهُ يَهُودَ نَجْرَانَ وَفَدَكَ.

واتە: لە ئیبنو وەهبەوە دەگێڕنەوە، كە وتویـەتی: مالیـك وتـی: بێگومـان پێشـەوا عومەر ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ، جولەكەكانی نەجران و فەدەكی دەركرد.

## باسی سەبارەت بە دابەشنەكردنی ڕەشە خاكی عێراق و ئەو زەویانەی كە بە زەبرو زەنگ دەگیران بەسەر جەنگاوەراندا.

## ٢٩- باب فِي إِيقَافِ أَرْضِ السَّوَادِ وَأَرْضِ الْعَنْوَةِ.

٣٠٣٥ - (صحيح) عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صـلى الله عليـه وآله وسلم: (مَنَعَتِ الْعِرَاقُ قَفِيزَهَا وَدِرْهَمَهَا، وَمَنَعَتِ الشَّامُ

مُدْيَهَا وَدِينَارَهَا، وَمَنَعَتْ مِصْرُ إِرْدَبَّهَا وَدِينَارَهَا، ثُمَّ عُـدْتُمْ مِنْ حَيْثُ بَدَأْتُمْ). - قَالَهَا زُهَيْرٌ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ - شَهِدَ عَلَـى ذَلِكَ لَحْمُ أَبِى هُرَيْرَةَ وَدَمُهُ.

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) فەرموویەتی: (هاکا خەڵکی وڵاتی عێراق خەرجی خەڵەو خەرمان و بـاجی مـاڵ پارەیـان نەدا، وە هاکا خەڵکی شام سـەرانەو بـاج و خـەرجی خەڵـەو خـەرمان و پارەیـان نـەدا، هەروەها هاکا خەڵکی میصر سەرانەو باج و خـەرجی خەڵـەو خـەرمان و پارەیـان نـەدا، لەپاشدا دەگەڕێنەوە بۆ کوفر و بێ باوەڕی لەدوای موسوڵمان بوونتان). زوهێـر سـێ جـار ئەم رستەیەی دواوەی دووبارە کردەوە، گۆشت و خوێنی ئـەبو هـورەیرە لەسـەر راسـتی و دروستی ئەم فەرمودەیە شایەتی دەدات.

٣٠٣٦ - (صحيح) عن أبو هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (أَيُّمَا قَرْيَةٍ أَتَيْتُمُوهَا وَأَقَمْتُمْ فِيهَـا فَسَـهْمُكُمْ فِيهَـا، وَأَيُّمَا قَرْيَةٍ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ خُمُسَهَا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ، ثُمَّ هِيَ لَكُمْ).

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسـلم) فەرموویەتی: (هەر دێیەك کە چونە ناویەوەو تێیدا مانەوە ئـەوە بەشـی ئێـوەی تێدایـە- واتە ئەگەر بەبێ جەنگ گیرا - ، هەر دێیەك دژایەتی خواو پێغەمبەرەکـەی کـرد، ئـەوە پێنج یەکی هی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، لەپاشدا ئەو دێیە هی ئێوەیە - واتە ئەگەر بـە جەنگ گیرا - ).

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی سەرانە.

## ٣٠ - باب فِي أَخْذِ الْجِزْيَةِ.

٣٠٣٧ - (حسن) عن أنس بن مالك وعن عثمان بن أبي سليمان: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ إِلَى أُكَيْدِرِ دُومَةَ، فَأُخِذَ فَأَتَوْهُ بِهِ، فَحَقَنَ لَهُ دَمَهُ، وَصَالَحَهُ عَلَى الْجِزْيَةِ.

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیك و (عُثْمَان)ی کوڕی ئەبو سولەیمانەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ سەر ئوکەیدەر کە پاشای (دُومَة الجندل) بو، پاشاکەیان بەدیل گرت و هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، نەیهێشت خوێنی بڕێژن ئەمانی دایەو پێکهات لەگەڵی کە ساڵانە سەرانە بدات و لەسەر وڵاتی خۆی بمێنێتەوە.

٣٠٣٨ - (صحيح) عن معاذ: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ كُلِّ حَالِمٍ - يَعْنِي مُحْتَلِمًا - دِينَارًا أَوْ عِدْلَهُ مِنَ الْمَعَافِرِيِّ، ثِيَابٌ تَكُونُ بِالْيَمَنِ.

واتە: لە (معـاذ)ەوە دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆ یەمەن فەرمانی پێ کرد لەهەر کەسێکی باڵغ دیناری یان بایی دیناری پۆشاکی مەعافیری وەربگرێت، پۆشاکێ بوو لەیەمەن دروست دەکرا.

٣٠٣٩ - (صحيح) عَنْ مُعَاذٍ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، مِثْلَهُ.

واتە: لە (معاذ)ەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە.

٣٠٤٠ - (ضعيف الاسناد) عن زياد بن حدير قال: قال علي رضي الله عنه: لَئِنْ بَقِيتُ لِنَصَارَى بَنِي تَغْلِبَ لأَقْتُلَنَّ الْمُقَاتِلَةَ وَلأَسْبِيَنَّ الذُّرِّيَّةَ، فَإِنِّي كَتَبْتُ الْكِتَابَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى أَنْ لاَ يُنَصِّرُوا أَبْنَاءَهُمْ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا حَدِيثٌ مُنْكَرٌ، بَلَغَنِي عَنْ أَحْمَدَ أَنَّهُ كَانَ يُنْكِرُ هَذَا الْحَدِيثَ إِنْكَارًا شَدِيدًا، وَهُوَ عِنْدَ بَعْضِ النَّاسِ شِبْهُ الْمَتْرُوكِ وَأَنْكَرُوا هَذَا الْحَدِيثَ عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ هَانِئٍ، قَالَ أَبُو عَلِيٍّ: وَلَمْ يَقْرَأْهُ أَبُو دَاوُدَ فِي الْعَرْضَةِ الثَّانِيَةِ.

واتە: لە زیادی کوڕی حودەیرەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێ بەخشیم و مام بۆ گاورەکانی (بَنِي تَغْلِب) جەنگاوەرەکانیان دەکوژم و ئافرەتەکانیشیان دەکەم بە کۆیلە، چونکە خۆم نامەی بەڵێن و پەیمانم نوسیوە لەنێوان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەواندا کە منداڵەکانیان نەکەنە گاور بەڵام ئەوان بەڵێنەکەیان شکاند.

٣٠٤١ - (ضعيف الاسناد) عن ابن عباس قال: صَالَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَهْلَ نَجْرَانَ عَلَى أَلْفَيْ حُلَّةٍ: النِّصْفُ فِي صَفَرٍ وَالْبَقِيَّةُ فِي رَجَبٍ، يُؤَدُّونَهَا إِلَى الْمُسْلِمِينَ، وَعَارِيَةِ

ثَلاَثِينَ دِرْعًا، وَثَلاَثِينَ فَرَسًا، وَثَلاَثِينَ بَعِيرًا، وَثَلاَثِينَ مِنْ كُلِّ صِنْفٍ مِنْ أَصْنَافِ السِّلاَحِ يَغْزُونَ بِهَا، وَالْمُسْلِمُونَ ضَامِنُونَ لَهَا حَتَّى يَرُدُّوهَا عَلَيْهِمْ إِنْ كَانَ بِالْيَمَنِ كَيْدٌ أَوْ غَدْرَةٌ : عَلَى أَنْ لاَ تُهْدَمَ لَهُمْ بَيْعَةٌ ،وَلاَ يُخْرَجُ لَهُمْ قَسٌّ، وَلاَ يُفْتَنُوا عَنْ دِينِهِمْ، مَا لَمْ يُحْدِثُوا حَدَثًا أَوْ يَأْكُلُوا الرِّبَا. قَالَ إِسْمَاعِيلُ: فَقَدْ أَكَلُوا الرِّبَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ:إِذَا نَقَضُوا بَعْضَ مَا اشْتَرَطَ عَلَيْهِمْ فَقَدْ أَحْدَثُوا.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لیّ بیّ دەگیّرنەوە، کە وتویەتی: پیّغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەڵکی نەجران پیّکهات لەسەر ئەوەی کە دوو هەزار پۆشاك(حلە) بدەن بە موسوڵمانان نیوەی لە مانگی صەفەرداو نیوەکەی تری لە مانگی رەجەبدا، ئەگەر لە ولاّتی یەمەن جەنگ بەرپا بو کە ببیّ بەهۆی پەیمان شکاندن و فیّلّ کردن ئەوا بە خواستن(عاریە) سی قەڵغان و سی ئەسپ و سی وشتر بدەن، وە لەهەر جۆرە چەکیّکیش لە چەکەکانی جەنگ سی چەك بدەن هەتا غەزای پیّ بکەن، موسوڵمانان ببنە زامنیان هەتا دەیاندەنەوە، بەمەرجیّ پەرستگاو کلیساکانیان نەرو‌خیّنن و، پیاوە ئایینی و قەشەکانیان دەرنەکریّن و، ناچاریش نەکریّن واز لەئایینی خۆیان بهیّنن بەڵکو لەسەر ئایینی خۆیان بمیّننەوەو ئازار نەدریّن، هەتا ئاژاوە نەنیّنەوە و سود(ربا) نەخۆن. ئەبو داود دەڵیّت: ئەگەر وازیان لەهەندیّ لەو مەرجانە هیّنا کە بۆیان دانراوە ئەوە مانای وایە ئاژاوەیان ناوەتەوە.

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی سەرانە لە ئاگرپەرستان.

## ٣١ - باب فِي أَخْذِ الْجِزْيَةِ مِنَ الْمَجُوسِ.

٣٠٤٢ - (حسن الاسناد موقوف) عن ابن عباس قال: إِنَّ أَهْلَ فَارِسَ لَمَّا مَاتَ نَبِيُّهُمْ كَتَبَ لَهُمْ إِبْلِيسُ الْمَجُوسِيَّةَ.

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: خەڵکی فارس کاتێ کە پێغەمبەرەکەیان مرد، شەیتان هەڵیخەڵەتاندن و لەجێی دینەکەیان ئاگرپەرستی بۆ دانان ئیتر ئەوانیش بوونە ئاگرپەرست.

٣٠٤٣ - (صحيح) عن بجالة قال: كُنْتُ كَاتِبًا لِجَزْءِ بْنِ مُعَاوِيَةَ عَمِّ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ، إِذْ جَاءَنَا كِتَابُ عُمَرَ قَبْلَ مَوْتِهِ بِسَنَةٍ: اقْتُلُوا كُلَّ سَاحِرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَ كُلِّ ذِي مَحْرَمٍ مِنَ الْمَجُوسِ، وَانْهَوْهُمْ عَنِ الزَّمْزَمَةِ، فَقَتَلْنَا فِي يَوْمٍ ثَلاَثَةَ سَوَاحِرَ، وَفَرَّقْنَا بَيْنَ كُلِّ رَجُلٍ مِنَ الْمَجُوسِ وَحَرِيمِهِ فِي كِتَابِ اللَّهِ. وَصَنَعَ طَعَامًا كَثِيرًا فَدَعَاهُمْ فَعَرَضَ السَّيْفَ عَلَى فَخِذِهِ، فَأَكَلُوا وَلَمْ يُزَمْزِمُوا، وَأَلْقَوْا وِقْرَ بَغْلٍ، أَوْ بَغْلَيْنِ، مِنَ الْوَرِقِ، وَلَمْ يَكُنْ عُمَرُ أَخَذَ الْجِزْيَةَ مِنَ الْمَجُوسِ حَتَّى شَهِدَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ

بْنُ عَوْفٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَخَذَهَا مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ.

واتە: لە بەجالەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: من نوسەری جەزئی کوڕی موعاویە بووم کە مامی ئەحنەفی کوڕی قەیس بو، کاتێ کە نامەکەی عومەر گەیشت سالێ پێش مردنی بەم شێوەیە نوسی بوی: هەموو جادوگەرێ بکوژن، هەموو ئاگرپەرستێ کە مەحرەمی خۆی هێناوە وەك دایکی و خوشکی و پوری جیایان بکەنەوە لەیەك، رێگریان بکەن لە چپە کە باو بو لەناو فارسەکاندا، ئێمەش لەرۆژێکدا سێ جادوگەرمان کوشت، هەموو ئەو ئاگرپەرستانەی کە مەحرەمی خۆیان مارەکردبو جیامان کردنەوە لەیەك، جەزئی کوڕی موعاویە خواردنێکی زۆری ئامادەکردو ئاگرپەرستەکانی بانگهێشتی کرد بۆ سەر خوانەکە، شمشێرەکەی لەسەر رانی دانا وەك هەڕەشەیە بۆ ئەوەی چپە نەکەن، جا لەترساندا بەبێ چپە نانەکەیان خوارد، باری ئێسترێ یان دوو ئێستر (أخلە)یان دا بە جەزئی کوڕی موعاویە - (أخلە) لە زیو دروست دەکرا نانیان پێ دەخوارد - ، پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ سەرانەی لە ئاگرپەرستان وەرنەگرت هەتا (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف شایەتی دا کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرانەی لە ئاگرپەرستانی وڵاتی هەجەر وەردەگرت.

٣٠٤٤ - (ضعيف الاسناد) عن ابن عباس قال: جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَسْبَذِيِّينَ مِنْ أَهْلِ الْبَحْرَيْنِ، - وَهُمْ مَجُوسُ أَهْلِ هَجَرَ - إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَمَكَثَ عِنْدَهُ، ثُمَّ خَرَجَ فَسَأَلْتُهُ: مَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ فِيكُمْ؟ قَالَ: شَرٌّ، قُلْتُ: مَهْ؟! قَالَ: الإِسْلاَمُ أَوِ الْقَتْلُ، قَالَ: وَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: قَبِلَ

مِنْهُمُ الْجِزْيَةَ. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَأَخَذَ النَّاسُ بِقَوْلِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَتَرَكُوا مَا سَمِعْتُ أَنَا مِنَ الأَسْبَذِيِّ.

واته: لە ئیبنو عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پیاوێ لە (أسبذي)یەکان کە خەڵکی بەحرەین و لە ئاگرپەرستانی خەڵکی ولآتی هەجەر بوو — هات بۆلای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لەلای مایەوە، لەپاشدا دەرچو ویستی بڕوات لێم پرسی: حوکم و بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی سەبارەت بە ئێوە چی بوو؟ وتی: شەڕ و خراپە، وتم: وسبە قسەی وەها مەکە، وتی: موسوڵمان بوون یان کوشتن بوو، ئیبنو عەباس وتی: (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوف وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو بەوەی کە سەرانەیان لێ وەربگرێت، ئیبنو عەباس وتی: خەڵك بە قسەی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ی کوڕی عەوفیان کردو، وازیان لەوە هێنا کەمن لە کابرای (أسبذي)م بیست.

## باسی توندوتیژی لە کۆکردنەوەی سەرانەدا.

## ٣٢ – باب فِي التَّشْدِيدِ فِي جِبَايَةِ الْجِزْيَةِ.

٣٠٤٥ - (صحيح) عن عروة بن الزبير: أَنَّ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ وَجَدَ رَجُلاً وَهُوَ عَلَى حِمْصَ يُشَمِّسُ نَاسًا مِنَ القِبْطِ فِي أَدَاءِ الْجِزْيَةِ، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ فِي الدُّنْيَا).

واته: لە عوروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێرنەوە، کە هیشامی کوڕی حیزام پیاوێکی بینی کاربەدەستی ناوچەی حیمص بوو لەسەر نەدانی سەرانە چەند (قیبط)یەکی خەڵکی

میصری لەبەر هەتاو راکشاند بوو، هیشام وتی: ئەم سزایە چی یە؟ بیستومە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، فەرمووی: (خوای گەورە لە قیامەتدا سزای ئەو کەسانە دەدات کە لە دونیادا خەڵك سزادەدەن).

## باسی سەبارەت بە وەرگرتنی دە یەك لە ماڵی بازرگانی (أَهْلِ الذِّمَّةِ) ئەگەر کاڵاکانیان جیاواز بوو

## ٣٣ - باب فِي تَعْشِيرِ أَهْلِ الذِّمَّةِ إِذَا اخْتَلَفُوا بِالتِّجَارَاتِ.

**٣٠٤٦ - (ضعيف) عن حرب بن عبيد الله عن جده أبي أمه، عن أبيه أنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (إِنَّمَا الْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى وَلَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ).**

واتە: لە حەربی کوڕی (عبيد الله)وە، لە باپیریەوە باوکی دایکی، لە باوکیەوە، دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (دەیەك بەس لە جولەکەو گاور وەردەگیرێت، موسوڵمانان دەیەکیان لەسەر نیەو لێیان وەرناگیرێت).

**٣٠٤٧ - (ضعيف مرسل) عن حرب بن عبيد الله، عن النبِي الله صلى الله عليه وسلم، بمعناه، قال: (خَرَاجٌ). مَكَانَ (الْعُشُورُ).**

واتە: لە حەربی کوڕی (عبيد الله)وە فەرمودەی پێشو بە هەمان مانا هاتوە، بەڵام لە جیاتی (الْعُشُور) وتی: (خَرَاج). واتە: باج.

٣٠٤٨ - (ضعيف) عن عطاء عن رجل من بكر بن وائل عن خاله قال: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُعَشِّرُ قَوْمِي؟ قَالَ: (إِنَّمَا الْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى).

واتە: لە (عطاء)وە، لە پیاوێكی بەكری كوڕی وائلەوە، لە خاڵیەوە، دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئایا قەومەكەی من دە یەكیان لەسەرە؟ فەرمووی: (دەیەك بەس لە جولەكەو گاور وەردەگیرێت).

٣٠٤٩ – (ضعيف) عن حرب بن عبيد الله بن عمير الثقفي، عن جده – رجل من بني تغلب- قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَسْلَمْتُ وَعَلَّمَنِي الإِسْلاَمَ، وَعَلَّمَنِي كَيْفَ آخُذُ الصَّدَقَةَ مِنْ قَوْمِي مِمَّنْ أَسْلَمَ، ثُمَّ رَجَعْتُ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُلُّ مَا عَلَّمْتَنِي قَدْ حَفِظْتُهُ إِلاَّ الصَّدَقَةَ، أَفَأُعَشِّرُهُمْ؟ قَالَ: (لاَ إِنَّمَا الْعُشُورُ عَلَى النَّصَارَى وَالْيَهُودِ).

واتە: لە حەربی كوڕی (عبيد الله)ی كوڕی عومەیری (الثقفي)وە، لە باپیریەوە – پیاوێ لە بەنی تەغلیبەوە - دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) موسوڵمان بوم و ئەرك و واجباتەكانی ئیسلامی فێر كردم، فێری ئەوەی كردم كە چۆن زەكات وەربگرم لەو كەسانەی لە قەومەكەم كە موسوڵمان بون، لەپاشدا گەڕامەوە بۆ خزمەتی، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەموو ئەوەی فێرت كردم لەبەرم كردوە جگە لە زەكات و صەدەقە، ئایا دە یەكیان لێ وەربگرم؟ فەرمووی: (نا بێگومان دەیەك بەس لە جولەكەو گاور وەردەگیرێت).

٣٠٥٠ - (ضعيف) عن العرباض بن سارية السلمي قال: نَزَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَيْبَرَ وَمَعَهُ مَنْ مَعَهُ مِنْ أَصْحَابِهِ، وَكَانَ صَاحِبُ خَيْبَرَ رَجُلاً مَارِدًا مُنْكَرًا، فَأَقْبَلَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، أَلَكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا حُمُرَنَا، وَتَأْكُلُوا ثَمَرَنَا، وَتَضْرِبُوا نِسَاءَنَا؟! فَغَضِبَ- يَعْنِي النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- وَقَالَ: (يَا ابْنَ عَوْفٍ! ارْكَبْ فَرَسَكَ ثُمَّ نَادِ: أَلاَ إِنَّ الْجَنَّةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لِمُؤْمِنٍ، وَأَنِ اجْتَمِعُوا لِلصَّلاَةِ). قَالَ: فَاجْتَمَعُوا، ثُمَّ صَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: (أَيَحْسَبُ أَحَدُكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ قَدْ يَظُنُّ: أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُحَرِّمْ شَيْئًا إِلاَّ مَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ؟! أَلاَ وَإِنِّي وَاللَّهِ قَدْ وَعَظْتُ وَأَمَرْتُ وَنَهَيْتُ عَنْ أَشْيَاءَ، إِنَّهَا لَمِثْلُ الْقُرْآنِ أَوْ أَكْثَرُ، وَأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُحِلَّ لَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتَ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ بِإِذْنٍ، وَلاَ ضَرْبَ نِسَائِهِمْ، وَلاَ أَكْلَ ثِمَارِهِمْ، إِذَا أَعْطَوْكُمُ الَّذِي عَلَيْهِمْ).

واتە: لە (عرباض)ی کوڕی ساریەی سولەمییەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و چەند کەسێ لە هاوەڵان کە لە خزمەتیدا بون لە خەیبەر دابەزین، خاوەنی خەیبەر پیاوێکی سەرکەش و لوت بەرزو خراپ بوو، ڕوی کردە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتی: ئەی موحەممەد، ئایا حەڵاڵە بۆ ئێوە گوێدرێژەکانمان سەربڕن و بەروبومەکانمان بخۆن و، لە ئافرەتەکانمان بدەن؟! پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تورە بوو، فەرمووی: (ئەی کوڕی عەوف! هەستە سواری ئەسپەکەت ببە

لەپاشدا جارِ بدەو بڵێ: ئاگاداربن بەهەشت حەڵاڵ نیە تەنیا بۆ باوەڕدار نەبێ، وە کۆببنەوە بۆ نوێژکردن - فەرمانی پێ کردن - )، راوی وتی: خەڵکەکە کۆبونەوە، ئینجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرنوێژی بۆ کردن، جا لەدوای نوێژەکە هەستا وتاری بۆدان و فەرمووی: (کەسێ لەئێوە لەسەر جێگاکەی خۆی راکشاوە وادەزانێ: خوای گەورە هیچ شتێکی حەرام نەکردوە تەنیا ئەو شتانە نەبێ کە لە قورئاندا حەرام کراون ؟! ئاگاداربن سوێند بە (اللّه) بێگومان من ئامۆژگاریم کردون و فەرمانم بە چەند شتانێك کردوەو چەند شتانێکیشم قەدەغەکردوە هێندەی ئەوانە دەبن کە لە قورئان دا فەرمانیان پێ کراوەو قەدەغەکراون بەڵکو زیاتریش — بێگومان ئەویش هەر بە وەحی بوە - ، بێگومان خوای گەورە بۆی حەڵاڵ نەکردون بچنە ناو ماڵی ئەو کەسانەی کە خاوەن نامەی ئاسمانین و خاوەن بەڵێنن(أَهْلِ الذِّمَّـةِ) مەگەر خۆیان مۆڵەتتان پێ بدەن و بەخۆشی خۆیان، هەروەها حەڵاڵی نەکردوە بۆتان بدەن لە ئافرەتەکانیان و، بەروبومەکانیان بخۆن ئەگەر سەرانە بدەن).

**٣٠٥١ - (ضعيف) عن هلال، عن رجل من ثقيف، عن رجل من جهينة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَعَلَّكُمْ تُقَاتِلُونَ قَوْمًا فَتَظْهَرُونَ عَلَيْهِمْ فَيَتَّقُونَكُمْ بِأَمْوَالِهِمْ دُونَ أَنْفُسِهِمْ وَأَبْنَائِهِمْ). قَالَ سَعِيدٌ فِي حَدِيثِهِ: (فَيُصَالِحُونَكُمْ عَلَى صُلْحٍ). ثُمَّ اتَّفَقَا (فَلاَ تُصِيبُوا مِنْهُمْ شَيْئًا فَوْقَ ذَلِكَ فَإِنَّهُ لاَ يَصْلُحُ لَكُمْ).**

واتە: لە هیلالەوە، لە پیاوێکی (ثقیف)ەوە، لە پیاوێکی جوهەینەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لەگەڵ قەومێکدا دەجەنگن سەردەکەون بەسەریاندا، ئەوانیش ماڵ و سامانی خۆیانتان دەدەنێ بۆ ئەوەی ببێتەهۆی پاراستنی خۆیان و منداڵەکانیان). سەعید لە فەرمودەکەیدا وتی: (بە رێککەوتن

لەگەڵتان پێك دێن کە شتێکتان بدەنێ ئێوەش کۆ و یەکدەنگ دەبن لەسەر وەرگرتنی)، ئینجا هەردوو راوی کۆ و یەکدەنگن: (ئێوەش لەوە زیاتریان لێ وەرمەگرن کە رێککەوتون لەسەری چونکە لەوە زیاتر حەڵاڵ نیە بۆتان).

**٣٠٥٢ - (صحيح) صفوان بن سليم، عن عدة من أبناء أصحاب رسول الله صلى الله عليه وسلم عن آبائهم دنية، عن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: (أَلاَ مَنْ ظَلَمَ مُعَاهِدًا أَوِ انْتَقَصَهُ أَوْ كَلَّفَهُ فَوْقَ طَاقَتِهِ أَوْ أَخَذَ مِنْهُ شَيْئًا بِغَيْرِ طِيبِ نَفْسٍ فَأَنَا حَجِيجُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ).**

واتە: لە صەفوانی کوڕی سولەیمەوە، لە کۆمەڵێ لە نەوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، لە باوکەکانیانەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێ ستەم بکات لە خاوەن پەیمانێ لە مافی کەم بکاتەوە یان داوای زیاتر لەتوانای خۆی لێ بکات یا شتێکی لێ وەربگرێت بەبێ رەزامەندی خۆی واتە بەزۆر لێی بسەنێت، ئەوە لە رۆژی قیامەتدا خۆم داواچیم لەسەری).

# باسی سەبارەت بە خاوەن پەیمان ئەگەر موسوڵمان بوو سەرانەی هەندێ لە ساڵەکەی لەسەر بوو ئایا سەرانەی لەسەرە یان نا؟

# ٣٤- باب فِي الذِّمِّيِّ يُسْلِمُ فِي بَعْضِ السَّنَةِ هَلْ عَلَيْهِ جِزْيَةٌ ؟

**٣٠٥٣ - (ضعيف) عن ابن عباس قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ جِزْيَةٌ).**

واتە: لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (موسوڵمان سەرانەی لەسەر نیە).

**٣٠٥٤ - (صحيح مقطوع) عن محمد بن كثير قال: سئل سفيان عن تفسير هذا فقال: إِذَا أَسْلَمَ فَلاَ جِزْيَةَ عَلَيْهِ.**

واتە: موحەممەدی کوڕی (کثیر) دەڵێت: دەربارەی تەفسیری ئەمە لە سوفیان — ی (ثوري) - پرسیار کرا وتی: ئەگەر موسوڵمان بوو سەرانەی لەسەر نیە ئیتر هی ساڵی تەواو بێت یان کەمتر لە ساڵێ.

# باسی دەربارەی حوکمی وەرگرتنی دیاری لەهاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەران.

## ٣٥ – باب فِى الإِمَامِ يَقْبَلُ هَدَايَا الْمُشْرِكِينَ.

٣٠٥٥ - (صحيح الاسناد) عَنْ زَيْدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَلاَّمٍ قَالَ: حَدَّثَنِى عَبْدُ اللَّهِ الْهَوْزَنِىُّ، قَالَ: لَقِيتُ بِلاَلاً مُؤَذِّنَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحَلَبَ، فَقُلْتُ: يَا بِلاَلُ، حَدِّثْنِى كَيْفَ كَانَتْ نَفَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَالَ: مَا كَانَ لَهُ شَىْءٌ، كُنْتُ أَنَا الَّذِى أَلِى ذَلِكَ مِنْهُ مُنْذُ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَنْ تُوُفِّىَ وَكَانَ إِذَا أَتَاهُ الإِنْسَانُ مُسْلِمًا فَرَآهُ عَارِيًا يَأْمُرُنِى فَأَنْطَلِقُ، فَأَسْتَقْرِضُ فَأَشْتَرِى لَهُ الْبُرْدَةَ فَأَكْسُوهُ وَأُطْعِمُهُ، حَتَّى اعْتَرَضَنِى رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: يَا بِلاَلُ، إِنَّ عِنْدِى سَعَةً فَلاَ تَسْتَقْرِضْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ مِنِّى، فَفَعَلْتُ فَلَمَّا أَنْ كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ تَوَضَّأْتُ ثُمَّ قُمْتُ لأُؤَذِّنَ بِالصَّلاَةِ، فَإِذَا الْمُشْرِكُ قَدْ أَقْبَلَ فِى عِصَابَةٍ مِنَ التُّجَّارِ، فَلَمَّا أَنْ رَآنِى قَالَ: يَا حَبَشِىُّ!. قُلْتُ: يَا لَبَّاهُ، فَتَجَهَّمَنِى وَقَالَ لِى قَوْلاً غَلِيظًا، وَقَالَ لِى: أَتَدْرِى كَمْ بَيْنَكَ وَبَيْنَ الشَّهْرِ؟ قَالَ: قُلْتُ: قَرِيبٌ، قَالَ إِنَّمَا بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ أَرْبَعٌ، فَآخُذُكَ بِالَّذِى عَلَيْكَ، فَأَرُدُّكَ تَرْعَى الْغَنَمَ، كَمَا كُنْتَ قَبْلَ ذَلِكَ! فَأَخَذَ فِى نَفْسِى مَا يَأْخُذُ فِى

أَنْفُسِ النَّاسِ. حَتَّى إِذَا صَلَّيْتُ الْعَتَمَةَ رَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى أَهْلِهِ فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَأَذِنَ لِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، إِنَّ الْمُشْرِكَ الَّذِي كُنْتُ أَتَدَيَّنُ مِنْهُ قَالَ لِي كَذَا وَكَذَا، وَلَيْسَ عِنْدَكَ مَا تَقْضِي عَنِّي، وَلاَ عِنْدِي، وَهُوَ فَاضِحِي، فَأْذَنْ لِي أَنْ آبَقَ إِلَى بَعْضِ هَؤُلاَءِ الأَحْيَاءِ الَّذِينَ قَدْ أَسْلَمُوا حَتَّى يَرْزُقَ اللَّهُ رَسُولَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا يَقْضِي عَنِّي! فَخَرَجْتُ حَتَّى إِذَا أَتَيْتُ مَنْزِلِي فَجَعَلْتُ سَيْفِي وَجِرَابِي وَنَعْلِي وَمِجَنِّي عِنْدَ رَأْسِي، حَتَّى إِذَا انْشَقَّ عَمُودُ الصُّبْحِ الأَوَّلِ أَرَدْتُ أَنْ أَنْطَلِقَ فَإِذَا إِنْسَانٌ يَسْعَى يَدْعُو: يَا بِلاَلُ، أَجِبْ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَتَيْتُهُ، فَإِذَا أَرْبَعُ رَكَائِبَ مُنَاخَاتٍ عَلَيْهِنَّ أَحْمَالُهُنَّ، فَاسْتَأْذَنْتُ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَبْشِرْ، فَقَدْ جَاءَكَ اللَّهُ بِقَضَائِكَ). ثُمَّ قَالَ: (أَلَمْ تَرَ الرَّكَائِبَ الْمُنَاخَاتِ الأَرْبَعَ؟). فَقُلْتُ: بَلَى، فَقَالَ: (إِنَّ لَكَ رِقَابَهُنَّ وَمَا عَلَيْهِنَّ، فَإِنَّ عَلَيْهِنَّ كِسْوَةً وَطَعَامًا أَهْدَاهُنَّ إِلَيَّ عَظِيمُ فَدَكَ، فَاقْبِضْهُنَّ وَاقْضِ دَيْنَكَ). فَفَعَلْتُ، فَذَكَرَ الْحَدِيثَ.

ثُمَّ انْطَلَقْتُ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَاعِدٌ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: (مَا فَعَلَ مَا

قِبَلَكَ؟). قُلْتُ: قَدْ قَضَى اللَّهُ كُلَّ شَيْءٍ كَانَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَلَمْ يَبْقَ شَيْءٌ، قَالَ: (أَفَضَلَ شَيْءٌ؟). قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: (انْظُرْ أَنْ تُرِيحَنِي مِنْهُ، فَإِنِّي لَسْتُ بِدَاخِلٍ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أَهْلِي حَتَّى تُرِيحَنِي مِنْهُ). فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعَتَمَةَ دَعَانِي فَقَالَ: (مَا فَعَلَ الَّذِي قِبَلَكَ؟). قَالَ: قُلْتُ: هُوَ مَعِي لَمْ يَأْتِنَا أَحَدٌ، فَبَاتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ، وَقَصَّ الْحَدِيثَ. حَتَّى إِذَا صَلَّى الْعَتَمَةَ - يَعْنِي مِنَ الْغَدِ - دَعَانِي قَالَ :(مَا فَعَلَ الَّذِي قِبَلَكَ؟). قَالَ: قُلْتُ: قَدْ أَرَاحَكَ اللَّهُ مِنْهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَكَبَّرَ وَحَمِدَ اللَّهَ شَفَقًا مِنْ أَنْ يُدْرِكَهُ الْمَوْتُ وَعِنْدَهُ ذَلِكَ، ثُمَّ اتَّبَعْتُهُ حَتَّى إِذَا جَاءَ أَزْوَاجَهُ فَسَلَّمَ عَلَى امْرَأَةٍ امْرَأَةٍ، حَتَّى أَتَى مَبِيتَهُ. فَهَذَا الَّذِي سَأَلْتَنِي عَنْهُ.

واتە: لە (عَبْدُ اللَّـه)ی هەوزەنییەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە حەلەب گەیشتم بە بیلالی بانگبێژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وتم: ئەی بیلال خەرجی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆن بوو؟ بیلال وتی: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو، لەوکاتەوە کە بوو بە پێغەمبەر هەتا ئەوکاتەی کە وەفاتی کرد من سەرپەرشتی کاروباری خەرجی ئەو بووم، کاتێ کە پیاوێکی موسوڵمان دەهاتە خزمەتی سەیری دەکرد روت و رەجاڵە، فەرمانی پێ دەکردم منیش دەرچوم قەرزم بۆ دەکرد بوردەیە پۆشاکێکم بۆ دەکری خۆی پێ پۆشتە دەکردەوەو خواردنم دەدایە، جارێ پیاوێ لە

هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەکان وتی: ئەی بیلال من پیاوێکی دەوڵەمەندم و ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە ئیتر لەمەولا لەخۆم نەبێ لەکەسی تر قەرز مەکە، منیش وەهام دەکرد لەکاتی پێویستیدا قەرزم لەو دەکرد، ڕۆژێك دەستنوێژم گرت، لەپاشدا هەستام بانگ بدەم کابرای هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر لەناو کۆمەڵێ بازرگاندا بوو کاتێ کە منی بینی، وتی: ئەی حەبەشی، وتم: ئەی (لبّاه)، بەرویەکی گرژ و ناخۆشەوە پێم گەیشت قسەیەکی ڕەق و توندی بەرامبەرم کرد، پێی وتم: ئایا دەزانی نێوانی تۆو سەری مانگ چەنێکی ماوە؟ بیلال وتی: وتم: نێوانی تۆو چوار شەوی ماوە، کاتێ کە سەری مانگ هات ئەو قەرزەی کە لەلاتە نەمدەیتەوە تۆ دەبەم لەجیاتی ئەو ماڵەدا کە لەلاتە، دەتکەمەوە بە کۆیلەو مەڕت پێ دەلەوەڕێنم وەك جاران، منیش خەم دایگرتم وەك چۆن ئەو خەڵکە خەم دایاندەگرێت، هەتا کاتێ کە نوێژی عیشام کرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ ناو خانەوادەکەی، داوای مۆڵەتم کرد بچمە خزمەتی، مۆڵەتی پێدام چومە ژورەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە خۆم دایك و باوکمەوە بەفیدات بین ئەو کابرا هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەرەی کە قەرزم لێ دەکرد ئەوەو ئەوەی پێ وتوم، نە تۆ ماڵ و سامانت هەیە هەتا قەرزەکەی بدەیتەوە لەجیاتی من وە نەمنیش ماڵ و سامانم هەیە هەتا قەرزەکەی بدەمەوە، ئیزنی دام کە بە پەلە بڕۆم بۆ ناو هەندێ لەو هۆزانەی کە موسوڵمان بوبون، هەتا خوای گەورە ڕۆزی پێغەمبەرەکەی بدات قەرزەکەم بداتەوە.

لەماڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چومەدەرەوە ڕۆشتم هەتا گەیشتمەوە ماڵەکەی خۆم، شمشێرەکەم و کەلانی شمشێرەکەم و نەعلەکانم و قەڵغانەکەمم هەڵگرت و خستمە سەر سەرم، هەتا بەیانی یەکەمی دا (فەجری کاذب) لەوکاتەدا ویستم دەرچم لەماڵ پیاوێ بە پەلە بەپێ هات بانگی کرد: ئەی بیلال پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بانگت دەکات، منیش ڕۆشتم هەتا گەیشتمە ئەوێ چوار وشتری باریم دی بە بارەوە یخیان دابو، داوای مۆڵەتی چونەژورەوەم کردو چومەژورەوە بۆ خزمەتی فەرمووی: (مزگێنی بێ، خوای گەورە ئەوەندە ماڵ و سامانی ناردوە کە قەرزەکەتی پێ بدەیتەوە)، لەپاشدا فەرمووی: (ئەو چوار وشترە بە بارەوە دەبینی کە یخیان داوە بە خۆیان بارەکانیانەوە بۆ تۆ،

بارەکەیان پۆشاك و خواردەمەنیە گەورەی فەدەك بە دیاری بۆی ناردوم، بیانبە قەرزەکەتی لێ بدەرەوە، منیش ئەوەم کرد، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

دوای ئەوەی قەرزەکەم دایەوە، لەپاشدا رۆشتم بۆ مزگەوت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مزگەوت دانیشتبو، سڵاوم لێ کرد، فەرمووی: (دەنگوباسی ئەو چوار وشترە بە بارەکەیانەوە چی یە ئایا قەرزەکەت داوەتەوە یان نا؟). وتم: خوای گەورە هەموو ئەو قەرزەی بژارد کە لەسەر پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بوو هیچی نەمایەوە)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (لەو ماڵ و سامانە هیچی ماوەتەوە؟)، وتم: بەڵێ، فەرمووی: (سەیر بکە بزانە چی ماوە خەرجی بکە بۆ ئەوانەی کە شایستەی ئەوەن یارمەتیان بدرێت لە موسوڵمانان هەتا دڵم بحەوێتەوە من ناچمەوە بۆ ماڵی هیچ یەکێ لە خێزانەکانم هەتا ئەو ماڵە نەدرێت بەوانەی کە هەژار و شایستەن و دڵم نەحەوێتەوە)، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نوێژی عیشای کرد بانگی کردم فەرمووی: (دەنگوباسی ماڵ و سامانەکە چی یە؟). وتم: لەلای خۆمە کەس نەهاتوە هەتا بیدەمێ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو شەوە لە مزگەوت رۆژی کردەوە نەرۆشتەوە بۆ ماڵەوە، جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە.

هەتا نوێژی عیشای رۆژی دواتری کرد لە مزگەوت بانگی کردم فەرمووی: (دەنگوباسی ماڵ و سامانەکە چی یە؟). بیلال وتی: وتم: هەموویم خەرج کرد بۆ ئەوانەی کە شایستەن، جا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (الله أکبر)ی کردو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد، دەترسا لەوەی مردن یەخەی پێ بگرێت و ئەو ماڵەی لەلا بێت، لەپاشدا کە چووەوە بۆ ناو خێزانەکانی شوێنی کەوتم یەك بە یەك سڵاوی لێ کردن، هەتا گەیشتە لای ئەوەیان سەرەی بوو شەو لەلای بێت، بیلال وتی: ئەمە بەسەرهاتی خەرجی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو - کە (عَبْدُ اللّٰه)ی هەوزەنی — دەربارەی پرسیاری لێ کردم — ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر دروستی وەرگرتنی دیاری لە کافر - .

**٣٠٥٦ - (صحيح الاسناد) عن معاوية، بِمَعْنَى إِسْنَادِ أَبِي تَوْبَةَ وَحَدِيثِهِ، قَالَ عِنْدَ قَوْلِهِ: (مَا يَقْضِي عَنِّي): فَسَكَتَ عَنِّي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَاغْتَمَزْتُهَا.**

واتە: لە موعاویەوە فەرمودەی پێشو هاتوە بە هەمان مانــاو سـەنەدی فەرمودەکـەی ئەبو تەوبە، بەڵام لەدوای (مَا يَقْضِي عَنِّــي): پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بێـدەنگ بوو بەرامبەرم، ئەوە قورس و گران بوو لەسەرم کاریگـەری هـەبوو لەســەرم کـە وەڵامــی نەدامەوە.

**٣٠٥٧ - (حسن صحيح) عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ، قَالَ: أَهْدَيْتُ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَاقَةً، فَقَـالَ:(أَسْـلَمْتَ؟). فَقُلْـتُ: لاَ. فَقَـالَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: (إِنِّــي نُهِيــتُ عَــنْ زَبْــدِ الْمُشْرِكِينَ).**

واتە: لە (عیاض)ی کوڕی حیمارەوە دەگێرنەوە، کە وتویەتی: وشــترە مێیــەکم کــردە دیاری بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، فەرمووی: (موسوڵمان بویت؟) وتم: نا، فەرمووی: (من ڕێگریم لێکراوە کە یارمەتی و باربو بەخشــینی هــاوەڵ بــۆ خــوا بڕیــاردەران قبــوڵ بکەم).

## باسی سەبارەت بە پێشەوا هەندێ لەو زەویە كە بۆی دیاریكراوە ببەخشێ بە ژێردەستەكانی.

## ٣٦ - باب فِي إِقْطَاعِ الأَرَضِينَ.

٣٠٥٨ - (صحيح) عن علقمة بن وائل، عن أبيه: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَهُ أَرْضًا بِحَضْرَمَوْتَ.

واتە: لە عەلقەمەی كوڕی وائلەوە، لە باوكیەوە دەگێرنەوە، كە زەویەكیان لە (حَضْرَمَوْت) - كە شوێنێ بوو لە ولآتی یەمەن - دیاریكرد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

٣٠٥٩ -(صحيح) عن علقمة بن وائل، بِإِسْنَادِهِ، مِثْلَهُ.

واتە: لە عەلقەمەی كوڕی وائلەوە فەرمودەی پێشو بە هەمان شێوە هاتوە.

٣٠٦٠ - (ضعيف الاسناد) عن عمرو بن حريث قال: خَطَّ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دَارًا بِالْمَدِينَةِ بِقَوْسٍ وَقَالَ: (أَزِيدُكَ؟ أَزِيدُكَ؟).

واتە: لە عەمری كوڕی (حريث)ەوە دەگێرنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە پارچەیە زەوی بۆ پێوام بە ئالەتێ كە زەویيان پێ دەپێوا فەرمووی: (ئەوەندە بەسە؟ یان بۆت زیاد بكەم؟ یان لەمەولا بۆت زیاد دەكەم ئێستا ئەوەندە بەسە).

**٣٠٦١ - (ضعيف) عن ربيعة بن أبي عبد الرحمن، عن غير واحد: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ، وَهِيَ مِنْ نَاحِيَةِ الْفُرْعِ، فَتِلْكَ الْمَعَادِنُ لاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا إِلاَّ الزَّكَاةُ إِلَى الْيَوْمِ.**

واتە: لە ڕەبیعەی كوڕی (عَبْدُ الرَّحْمَن)ەوە، لە چەند كەسێكی تـرەوە دەگێڕنـەوە، كـە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كانەكانی قەبەلیەی ناوچەی فورعی دا بە بیلالی كوڕی (حارث)، ئەو كانانە هەتا ئێستاش جگە لە زەكات هیچی تریان لێ وەرناگیرێت.

**٣٠٦٢ - (حسن) عبد الله بن عمرو بن عوف المزني عن أبيه عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ جَلْسِيَّهَا وَغَوْرِيَّهَا - وَقَالَ غَيْرُ الْعَبَّاسِ: جَلْسَهَا وَغَوْرَهَا - وَحَيْثُ يَصْلُحُ الزَّرْعُ مِنْ قُدْسٍ، وَلَمْ يُعْطِهِ حَقَّ مُسْلِمٍ، وَكَتَبَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا مَا أَعْطَى مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ، أَعْطَاهُ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ جَلْسِيَّهَا وَغَوْرِيَّهَا). وَقَالَ غَيره: (جَلْسَهَا وَغَوْرَهَا). (وَحَيْثُ يَصْلُحُ الزَّرْعُ مِنْ قُدْسٍ، وَلَمْ يُعْطِهِ حَقَّ مُسْلِمٍ).**

واتە: لە (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی عەمری كـوڕی عـەوفی موزەنییـەوە، لـە باوكیـەوە، لـە باپیریەوە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كانەكانی قەبەلیەی ناوچـەی

فورعی دا بە بیلالی کوڕی (حارث) بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە، جگە لە عەباس چەند کەسێکی تر وتویانە: بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە. کە بگونجێ بۆ کشتوکاڵ لە قودس ناوی کێوێکی گەورەیە لە نەجد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەقی موسوڵمانی نەدا بە بیلالی کوڕی (حارث)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ نوسی: (بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو زەویەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەخشی بە بیلالی کوڕی (حارث)ی موزەنی، کانەکانی قەبەلیەی پێ بەخشی بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە)، جگە لە عەباس چەند کەسێکی تر وتویانە: (بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە)، (کە بگونجێ بۆ کشتوکاڵ لە قودس، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەقی موسوڵمانی نەدایە).

٣٠٦٣ - (حسن) عن محمد بن النضر قال: سَمِعْتُ الْحُنَيْنِيَّ قَالَ: قَرَأْتُهُ غَيْرَ مَرَّةٍ، يَعْنِي كِتَابَ قَطِيعَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. قَالَ أَبو دَاوُدَ: عَنْ كَثِيرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ جَلْسِيَّهَا وَغَوْرِيَّهَا - قَالَ ابْنُ النَّضْرِ: وَجَرْسَهَا وَذَاتَ النُّصُبِ - ثُمَّ اتَّفَقَا: وَحَيْثُ يَصْلُحُ الزَّرْعُ مِنْ قُدْسٍ، وَلَمْ يُعْطِ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ حَقَّ مُسْلِمٍ، وَكَتَبَ لَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَذَا مَا أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِلاَلَ بْنَ الْحَارِثِ الْمُزَنِيَّ، أَعْطَاهُ مَعَادِنَ الْقَبَلِيَّةِ جَلْسَهَا وَغَوْرَهَا وَحَيْثُ يَصْلُحُ الزَّرْعُ مِنْ قُدْسٍ، وَلَمْ يُعْطِهِ حَقَّ مُسْلِمٍ).

واتە: لە مەحەممەدی کوڕی (نضـر)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: لە حونەینیم بیستوە وتویەتی: چەند جارێ نامەی ئەو پارچە زەویەم خوێندۆتەوە کە دیاریکراوە بۆ پێغەمبەر و پێی بەخشراوە. ئەبو داود دەڵێت: لە (کثیر)ی کوڕی (عَبْدُ اللَّه)وە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کانەکانی قەبەلیەی دا بە بیلالی کوڕی (حارث)ی موزەنی بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە، - مەحەممەدی کوڕی (نضر) وتی: بەرزاییەکانی و (جَرْسَهَا) و (ذَاتَ النُّصُب) ناوی دوو شوێن بوون لە نزیك مەدینە — جا هەردوو راوی رێکن: کە بگونجێ بۆ کشتوکاڵ لە قودس ناوی کێوێکی گەورەیە لە نەجد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەقی موسوڵمانی نەدا بە بیلالی کوڕی (حارث)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ نوسی: (ئەمە ئەو زەویەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەخشی بە بیلالی کوڕی (حارث)ی موزەنی، کانەکانی قەبەلیەی پێ بەخشی بە هەموو شوێنە بەرزو نزمەکانیەوە، کە بگونجێ بۆ کشتوکاڵ لە قودس، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەقی موسوڵمانی نەدا بە بیلالی کوڕی (حارث)).

**٣٠٦٤ - (حسن دون جملة الخفاف) عن أبيض بن حمال: أَنَّهُ وَفَدَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَاسْتَقْطَعَهُ الْمِلْحَ - قَالَ ابْنُ الْمُتَوَكِّلِ: الَّذِي بِمَأْرِبَ - فَقَطَعَهُ لَهُ، فَلَمَّا أَنْ وَلَّى قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمَجْلِسِ: أَتَدْرِي مَا قَطَعْتَ لَهُ، إِنَّمَا قَطَعْتَ لَهُ الْمَاءَ الْعِدَّ، قَالَ: فَانْتَزَعَ مِنْهُ. قَالَ: وَسَأَلَهُ عَمَّا يُحْمَى مِنَ الأَرَاكِ، قَالَ: (مَا لَمْ تَنَلْهُ خِفَافٌ). وَقَالَ ابْنُ الْمُتَوَكِّلِ: (أَخْفَافُ الإِبِلِ).**

واتە: لە (أبیض)ی کوڕی حەممالەوە دەگێڕنەوە، کە نوێنەر بووە چوەتە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) داوای کانی میلحی لێ کرد کە کانێ بوو لە کانەکان—

ئیبنو موتەوەکل وتی: لە مەئرەب بوو - ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێی بەخشی، کاتێ کە ڕۆشت یەکێ لە دانیشتوان وتی: ئایا دەزانی چیت پێ بەخشیوە، کانێکی ئامادەکراوت پێ بەخشیوە کە شوێنەکەی نزیکە بەردەوام خێر و بێری هەیە بۆ خەڵکەکە بەگشتی، پێویست ناکات کاری تێدا بکەن و خۆیانی تێدا ماندو بکەن بە ئاسانی سودی لێ دەبینن وەك چۆن سود لەئاو دەبینن، ڕاوی وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کانەکەی لە (أبیض) سەندەوە، ڕاوی وتی: داوای زەویەکی کرد کە ئەراك داری (سیواك)ی تێدا بێ بۆی پاوەن بکرێت، فەرمووی: (باشە بە مەرجێ دووربێت و شوێنێ نەبێ خانوی تێدا دروست بکرێ و ئاژەڵت بەرەڵا کرد نەیگاتێ لێی بلەوەڕێت). ئیبنو موتەوەکل وتی: (ئەوەندە دور بێت وشتری نەگاتێ لێی بلەوەڕێت).

**٣٠٦٥ - (ضعيف جدا مقطوع) عن هارون بن عبد الله قال: قال محمد بن الحسن المخزومي: (مَا لَمْ تَنَلْهُ أَخْفَافُ الإِبِلِ) يَعْنِى أَنَّ الإِبِلَ تَأْكُلُ مُنْتَهَى رُءُوسِهَا وَيُحْمَى مَا فَوْقَهُ.**

واتە: لە هارونی کوڕی (عبد الله)وە هاتوە، کە وتویەتی: موحەممەدی کوڕی حەسەنی مەخزومی وتی: (مَا لَمْ تَنَلْهُ أَخْفَافُ الإِبِلِ) واتە: ئەوەندەی وشتر دەمی دەیگاتێ لێی بخوات لەدوای ئەوەوە بۆی پاوەن بکرێت.

**٣٠٦٦ - (حسن بما قبله) عن أبيض بن حمال: أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ حِمَى الأَرَاكِ، فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(لاَ حِمَى فِى الأَرَاكِ). فَقَالَ: أَرَاكَةً فِى حِظَارِى، فَقَالَ النَّبِىُّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: (لاَ حِمَى فِى الأَرَاكِ). قَالَ فَرَجٌ: يَعْنِى بِحِظَارِى: الأَرْضَ الَّتِى فِيهَا الزَّرْعُ الْمُحَاطُ عَلَيْهَا.**

واتە: لە (أبیض)ی كوڕی حەممالەوە دەگێڕنەوە، كە دەربارەی پاوەنكردنی درەختی ئەراك(سیواك) لە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پرسی؟ فەرمووی: (درەختی ئەراك پاوەن ناكرێت چونكە خەڵك پێویستیان پێیەتی، وتی: ئەی ئایا ئەو درەختی ئەراكەی كە لە زەویەكەی خۆمدایە دەتوانم پاوەنی بكەم بۆ خۆم، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (درەختی ئەراك پاوەن ناكرێت چونكە خەڵك پێویستیان پێیەتی)، فەرەج وتی: مەبەست لە (بِحِظَارِي) واتە زەویەك كە كشتوكاڵی تێدا بێت دەوری ئەراكەكەی دابێت.

٣٠٦٧ - (ضعيف الاسناد) عن عثمان بن أبي حازم عن أبيه عن جده صخر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَزَا ثَقِيفًا، فَلَمَّا أَنْ سَمِعَ ذَلِكَ صَخْرٌ رَكِبَ فِي خَيْلٍ يُمِدُّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَجَدَ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَدِ انْصَرَفَ وَلَمْ يَفْتَحْ، فَجَعَلَ صَخْرٌ يَوْمَئِذٍ عَهْدَ اللَّهِ وَذِمَّتَهُ أَنْ لاَ يُفَارِقَ هَذَا الْقَصْرَ حَتَّى يَنْزِلُوا عَلَى حُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. فَلَمْ يُفَارِقْهُمْ حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ صَخْرٌ: أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ ثَقِيفًا قَدْ نَزَلَتْ عَلَى حُكْمِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَأَنَا مُقْبِلٌ إِلَيْهِمْ وَهُمْ فِي خَيْلٍ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالصَّلاَةِ جَامِعَةً، فَدَعَا لأَحْمَسَ عَشْرَ دَعَوَاتٍ: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لأَحْمَسَ فِي خَيْلِهَا وَرِجَالِهَا). وَأَتَاهُ الْقَوْمُ، فَتَكَلَّمَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّ صَخْرًا أَخَذَ عَمَّتِي وَدَخَلَتْ فِيمَا دَخَلَ فِيهِ الْمُسْلِمُونَ! فَدَعَاهُ فَقَالَ: (يَا صَخْرُ،

إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ، فَادْفَعْ إِلَى الْمُغِيرَةِ عَمَّتَهُ). فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ. وَسَأَلَ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَاءً لِبَنِي سُلَيْمٍ قَدْ هَرَبُوا عَنِ الإِسْلاَمِ، وَتَرَكُوا ذَلِكَ الْمَاءَ. فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَنْزِلْنِيهِ أَنَا وَقَوْمِي.، قَالَ: (نَعَمْ)، فَأَنْزَلَهُ وَأَسْلَمَ - يَعْنِي السُّلَمِيِّينَ - فَأَتَوْا صَخْرًا، فَسَأَلُوهُ أَنْ يَدْفَعَ إِلَيْهِمُ الْمَاءَ، فَأَبَى فَأَتَوُا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالُوا: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَسْلَمْنَا وَأَتَيْنَا صَخْرًا لِيَدْفَعَ إِلَيْنَا مَاءَنَا فَأَبَى عَلَيْنَا، فَأَتَاهُ فَقَالَ: (يَا صَخْرُ إِنَّ الْقَوْمَ إِذَا أَسْلَمُوا أَحْرَزُوا أَمْوَالَهُمْ وَدِمَاءَهُم، فَادْفَعْ إِلَى الْقَوْمِ مَاءَهُمْ). قَالَ نَعَمْ، يَا نَبِيَّ اللَّهِ. فَرَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَغَيَّرُ عِنْدَ ذَلِكَ حُمْرَةً، حَيَاءً مِنْ أَخْذِهِ الْجَارِيَةَ وَأَخْذِهِ الْمَاءَ.

واتە: لە (عُثْمَان)ی کوڕی ئەبو حازمەوە، لە باوکیەوە، لە باپیریەوە صەخر کە لە هۆزی ئەحمەس بوو، دەگێڕنەوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چواردەوری (ثقیف)ی گرت و ویستی غەزای بکات، صەخر هەواڵەکەی بیست بە کۆمەڵێ ئەسپ سوارەوە ڕۆشت بۆ یارمەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بینی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوەو (ثقیف)ی ڕزگار نەکرد، بەڵێن و پەیانی دا بە خوای گەورە کۆشك و تەلاری (ثقیف) بەجێ نەهێڵێ و غەزایان بکات هەتا ناچاریان دەکات ڕازی بن بە حوکم و بڕیاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، جا صەخر نامەی نوسی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەم شێوەیە: لەدواییدا: (ئەوە (ثقیف) ڕازی بوون بە حوکم و بڕیاری تۆ ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، من بەرامبەریان وەستاوم)،

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا کە کۆببنەوە بۆ نوێژ، دە دوعای کرد بۆ هۆزی ئەحمەس: (خوایە فەڕو بەرەکەت بخەیتەناو سوارەو پیادەی هۆزی ئەحمەسەوە ...).
جا هۆزی (ثقیف) هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، موغیرەی کوڕی شوعبە قسەی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) صەخر پورەکەمی گرتووەو کردویەتی بە کۆیلە مومسولمان بوە وەك چۆن موسولمانان چونەتە ناو ئیسلامەوەو موسولمان بوون ئەویش بەو شێوەیە! پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) صەخری بانگ کردو فەرمووی: (ئەی صەخر ئەگەر قەومێ موسولمان بوون ئیتر خوێن و سەرو ماڵیان پارێزراوە، پورەکەی موغیرە بگەڕێنەرەوە بۆ موغیرە). ئەویش بۆی گێڕایەوە. جا صەخر سەبارەت بەو کەسانەی کە لە هۆزی سولەیم لە ئیسلام هەڵهاتبون و سەرچاوەی ئاوەکەیان بەجێهێشتبو پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم ئاوە بدە بە خۆم و هۆزەکەم با لێی دابەزین و نیشتەجێ ببین، فەرمووی: (بەڵێ باشە). لەدوایدا سولەیمیەکان موسولمان بوون و هاتن بۆلای صەخر داوای ئاوەکەیان لێ کرد کە بیانداتەوە، بەلام صەخر ئاوەکەی نەدانەوە، ئینجا رۆشتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە موسولمان بووین و رۆشتین بۆلای صەخر داوای ئاوەکەمان لێ کرد کە بماندداتەوە، ئاوەکەی نەداینەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) صەخری بانگ کردو، فەرمووی: (ئەی صەخر، ئەگەر قەومێ موسولمان بوون ئیتر خوێن و سەرو ماڵیان پارێزراوە، ئاوەکەی خۆیانیان بۆ بگێڕەرەوە)، صەخر وتی: بەڵێ باشە ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، روخساری پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) دی سور هەڵگەڕابوو لەشەرماندا کە پورەکەی موغیرەو ئاوەکەی لێ وەرگرتەوە.

**٣٠٦٨ - (حسن الاسناد) عن سبرة بن عبد العزيز بن الربيع الجهني، عن أبيه، عن جده: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَزَلَ فِي مَوْضِعِ الْمَسْجِدِ تَحْتَ دَوْمَةٍ، فَأَقَامَ ثَلاَثًا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى**

**تَبُوكَ، وَإِنَّ جُهَيْنَةَ لَحِقُوهُ بِالرَّحْبَةِ، فَقَالَ لَهُمْ: (مَنْ أَهْلُ ذِي الْمَرْوَةِ؟). فَقَالُوا: بَنُو رِفَاعَةَ مِنْ جُهَيْنَةَ. فَقَالَ: (قَدْ أَقْطَعْتُهَا لِبَنِي رِفَاعَةَ). فَاقْتَسَمُوهَا، فَمِنْهُمْ مَنْ بَاعَ، وَمِنْهُمْ مَنْ أَمْسَكَ فَعَمِلَ. ثُمَّ سَأَلْتُ أَبَاهُ عَبْدَ الْعَزِيزِ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ فَحَدَّثَنِي بِبَعْضِهِ وَلَمْ يُحَدِّثْنِي بِهِ كُلِّهِ.**

واتە: لە سەبرەی کوڕی (عبد العزيز)ی کوڕی ڕەبیعی جوهەنییەوە لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ناوچەی جوهەینە لەشوێنێکدا دابەزی لەژێر درەختێکی گەورەدا سێ شەو مایەوە دواتر شوێنەکە کرا بە مزگەوت، لەپاشدا دەرچو بۆ تەبوك، جوهەینە گەیشتن بە پێغەمبەر لە زەویەکی فراواندا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: (کێ خەڵکی (ذِي الْمَرْوَةِ)یە؟) - (ذِي الْمَرْوَةِ) دێیەك بوو لە (وادي القرى) - ، وتیان بەنو ریفاعە کە لە هۆزی جوهەینەن، فەرمووی: (ئەوا من (ذِي الْمَرْوَةِ)م دانا بۆ بەنو ریفاعەو پێم بەخشین)، دابەشیانکرد بەسەریاندا، جا هەیان بوو بەشەکەی خۆی فرۆشت، هەشیان بوو ئاوەدانی کردەوە بۆ خۆی و کاری تێدا دەکرد. لەپاشدا لەباوکی سەبرە واتە لە(عبد العزيز)م پرسی دەربارەی ئەم فەرموودە هەندێکی بۆ گێڕامەوە بەڵام هەر هەمووی بۆ نەگێڕامەوە.

**٣٠٦٩ - (حسن صحيح) عن أسماء بنت أبو بكر: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَ الزُّبَيْرَ نَخْلاً.**

واتە: لە ئەسمائی کچی ئەبو بەکرەوە دەگێرنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) موڵك وماڵێکی بە بەرهەمی بەخشی بە زوبێر - پێ دەچێت لەو پێنج یەکە بێت کە تایبەت بوو بە خۆیەوە - .

٣٠٧٠ - (ضعيف الإسناد) عن قيلة قالت: قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَتْ: تَقَدَّمَ صَاحِبِي - تَعْنِي حُرَيْثَ بْنَ حَسَّانَ وَافِدَ بَكْرِ بْنِ وَائِلٍ - فَبَايَعَهُ عَلَى الإِسْلاَمِ عَلَيْهِ وَعَلَى قَوْمِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اكْتُبْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَنِي تَمِيمٍ بِالدَّهْنَاءِ أَنْ لاَ يُجَاوِزَهَا إِلَيْنَا مِنْهُمْ أَحَدٌ إِلاَّ مُسَافِرٌ أَوْ مُجَاوِرٌ. فَقَالَ: (اكْتُبْ لَهُ يَا غُلاَمُ بِالدَّهْنَاءِ). فَلَمَّا رَأَيْتُهُ قَدْ أَمَرَ لَهُ بِهَا شُخِصَ بِي وَهِيَ وَطَنِي وَدَارِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ لَمْ يَسْأَلْكَ السَّوِيَّةَ مِنَ الأَرْضِ إِذْ سَأَلَكَ، إِنَّمَا هِيَ هَذِهِ الدَّهْنَاءُ عِنْدَكَ مُقَيَّدُ الْجَمَلِ، وَمَرْعَى الْغَنَمِ، وَنِسَاءُ بَنِي تَمِيمٍ وَأَبْنَاؤُهَا وَرَاءَ ذَلِكَ، فَقَالَ: (أَمْسِكْ يَا غُلاَمُ، صَدَقَتِ الْمِسْكِينَةُ، الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، يَسَعُهُمَا الْمَاءُ وَالشَّجَرُ، وَيَتَعَاوَنَانِ عَلَى الْفُتَّانِ).

واتە: قیلەی كچی مەخرەمە دەڵێت: چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هاورێكەم واتە (حريث)ی كوڕی حەسسان كە نوێنەری هۆزی بەكری كوڕی وائیل بوو چوە پێشەوە لەجیاتی خۆی و هۆزەكەی بەڵێن و پەیمانی دا بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئیسلام، لەپاشدا (حريث) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە (الدَّهْنَاءِ) - كە شوێنێكی ناسراوە لە وڵاتی تەمیم – نامەیە بنوسە لەنێوان ئێمەو بەنی تەمیمدا كە كەس لەوان تێیدا نیشتەجێ نەبێت و دەست نەخاتە ناو كاروبارێەوە مەگەر كەسێ كە موسافیر بێ یان بەناویدا تێپەڕێت. پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ئەی غولام بۆی بنوسە)، كاتێ كە بینیم فەرمانی كرد خاكی (الدَّهْنَاءِ)

بۆ (حريث) بێت، لەکاتێکدا کە نیشتمان و ماڵی منەو لەوەڕگای بەنی تەمیمە زۆر پێی بێ تاقەت بووم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) (حريث) داوای خاکێکی مام ناوەندی لێ نەکردووی لەنێوان دوو خاکدا کە یەکێکیان بە پیت بێت و ئەوی تریان بێ پیت بێت، بەڵکو داوای خاکی (الدَّهْنَاءِ)ی لێ کردوی کە خاکێکی زۆر بە پیت و بەرەکەتە، لەوەڕگای ئاژەڵ و وشترەکانی بەنی تەمیمە، وشترەکانیان تێیدا دەحەوێنەوەو لێی دەرناچن دەڵێی بەستراونەتەوە، شوێنێکی نزیکە لە ئافرەت و منداڵەکانیانەوەو سودی لێ دەبینن، خەڵك بە گشتی سودی لێ وەردەگرن، لە تۆشەوە نزیکە دەتوانی بڕۆی بیبینی ئەو کاتە حەقیقەتت بۆ دەردەکەوێت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەو غوڵامەی کە نامەکەی دەنوسی فەرمووی: (ئەی غوڵام راوەستە واز لە نوسین بهێنە، میسکینە واتە قیلە کچی مەخرەمە راست دەکات، موسوڵمان برای موسوڵمانە، لە ئاو و لە لەوەڕگادا بەشدار و هاوبەشن، کاتێ کە شەیتان زیانی گەیاند بە دینەکەیان یان کاتێ کە بەلاو فیتنەیە رووی تێ کردن هاوکاری و کۆمەکی یەکتر دەکەن).

**٣٠٧١ - (ضعيف) عن أسمر بن مضرس قال: أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَبَايَعْتُهُ، فَقَالَ: (مَنْ سَبَقَ إِلَى مَا لَمْ يَسْبِقْهُ إِلَيْهِ مُسْلِمٌ: فَهُوَ لَهُ). قَالَ: فَخَرَجَ النَّاسُ يَتَعَادَوْنَ يَتَخَاطُّونَ.**

واتە: لە ئەسمەری کوڕی (مُضَرِّس)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: چومە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەڵێن و پەیمانم پێ دا موسوڵمان بووم، فەرمووی: (ئەوەی یەکەم کەس گەیشت بە خاکێ یان لەوەڕگایە یا دارێکی وشك کە پێشتر موسوڵمانێ پێی نەگەیشتبێت: ئەوە بۆ ئەوە). ئەسمەر وتی: خەڵکەکە بە پەلە دەرچوون خەتیان دەکێشا واتە هەریەکەیان پارچەیە زەوی بۆخۆی نیشانە دەکرد کە پێشتر کەس ئاوەدانی نەکردبوەوەو موڵکی کەس نەبوو.

٣٠٧٢ - (ضعيف الإسناد) عن ابن عمر: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَقْطَعَ الزُّبَيْرَ حُضْرَ فَرَسِهِ، فَأَجْرَى فَرَسَهُ حَتَّى قَامَ، ثُمَّ رَمَى بِسَوْطِهِ، فَقَالَ: (أَعْطُوهُ مِنْ حَيْثُ بَلَغَ السَّوْطُ).

واتە: لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەندە زەوی بەخشی بە زوبێر كە ئەسپەكەی تاودا هەتا وەستاو نەیتوانی بڕوات، لەپاشدا قامچیەكەی هەڵدا، فەرمووی: (قامچیەكە گەیشتە كوێ ئەوەندەی بدەنێ بۆ خۆی).

## باسی سەبارەت بە ئاوەدانكردنەوەی زەوی وێرانە.

## ٣٧ - باب فِي إِحْيَاءِ الْمَوَاتِ.

٣٠٧٣ - (صحيح) عن سعيد بن زيد، عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: (مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَةً فَهِيَ لَهُ، وَلَيْسَ لِعِرْقٍ ظَالِمٍ حَقٌّ).

واتە: لە سەعیدی كوڕی زەیدەوە هاتوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەركەسێك زەویەكی مردو یان وێرانە ئاوەدان بكاتەوە ئەوە بۆ خۆیەتی و موڵكی ئەوە، ئەگەر كەسێ لە موڵكی كەسێكی تردا درەختێ بچێنێ بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەكەی ئەوە فەرمانی پێ دەكرێت هەڵیكێشێ و هیچ مافێكی نیە بەو زەویەوە مەگەر خاوەن موڵكەكە خۆی رازی بێت وازی لێ بهێنرێت).

٣٠٧٤ - (حسن) عن يحيى بن عروة، عن أبيه: أن رسـول الله صـلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَحْيَا أَرْضًا مَيْتَـةً فَهِـيَ لَـهُ). وَذَكَـرَ مِثْلَهُ. قَالَ: فَلَقَدْ خَبَّرَنِـي الَّـذِي حَـدَّثَنِي هَـذَا الْحَـدِيثَ أَنَّ رَجُلَيْنِ اخْتَصَمَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَرَسَ أَحَدُهُمَا نَخْـلاً فِـي أَرْضِ الآخَـرِ، فَقَضَـى لِصَـاحِبِ الأَرْضِ بِأَرْضِهِ، وَأَمَرَ صَاحِبَ النَّخْلِ أَنْ يُخْـرِجَ نَخْلَـهُ مِنْهَـا، قَـالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهَا وَإِنَّهَا لَتُضْرَبُ أُصُولُهَا بِالْفُئُوسِ - وَإِنَّهَا لَنَخْلٌ عُمٌّ - حَتَّى أُخْرِجَتْ مِنْهَا.

واتە: لە يەحيای کوڕی عوروەوە، لە باوکیەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك زەویەکی مردو یان وێرانە ئاوەدان بکاتەوە ئـەوە بـۆ خۆیەتی). جا راوی فەرموودەکەی گێڕایەوە وەك فەرموودەکەی پێشـو. عـوروە وتـی: ئـەو کەسەی کە فەرموودەکەی بۆ گێڕامەوە پێی راگەیاندم کە دوو پیاو سکاڵایان بردە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسـلم) یـەکێکیان لـەزەوی ئـەوی تریانـدا دارخورمایـەکی چاندبو، پێغەمبەری خوا (صلی الله عليه وسلم) بڕیاری دا کە زەویەکە بۆ خاوەن زەویەکە بێت، ئەو کەسەش کە دارخورماکەی تێدا چاندبو لەزەویەکە بیباتەدەرەوە. وتی: بەڕاستی بینیم بە تەور دەیدا لەبنی دارخورماکە کە دارخورمایەکی درێژ بوو بڕییەوەو لە زەوی کابراکـە بردیەدەرەوە.

٣٠٧٥ - (حسن) عن ابن إسحق، بِإِسْنَادِهِ وَمَعْنَاهُ، إِلاَّ أَنَّهُ قَالَ عِنْدَ قَوْلِـهِ مَكَانَ: «الَّذِي حَدَّثَنِي هَذَا»، فَقَالَ: رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَأَكْثَرُ ظَنِّي أَنَّهُ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: فَأَنَا رَأَيْتُ الرَّجُلَ يَضْرِبُ فِي أُصُولِ النَّخْلِ.

واتە: لە ئیبنو ئیسحاقەوە بە هەمان سەنەدو مانا فەرموودەی پێشو هاتوە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە لە جیاتی ((ئەو کەسەی کە فەرموودەکەی بۆ گێڕامەوە)) وتی: پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ گێڕامەوە، زیاترین گومانم لەسەر ئەوەیە کە ئەبو سەعیدی خودری بێت: من ئەو پیاوەم دی — واتە خاوەنی دارخورماکە - بە تەور دەیدا لە بنی دارخورماکە.

٣٠٧٦ – (صحيح الإسناد) عن عوروة قال: أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَضَى أَنَّ الأَرْضَ أَرْضُ اللَّهِ، وَالْعِبَادَ عِبَادُ اللَّهِ، وَمَنْ أَحْيَا مَوَاتًا فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ، جَاءَنَا بِهَذَا عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الَّذِينَ جَاءُوا بِالصَّلَوَاتِ عَنْهُ.

واتە: عوروە دەڵێت: شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا کە زەوی زەوی خوایەو، بەندەکانیش بەندەی خوای گەورەن، هەرکەسێك زەویەکی مردو یان وێرانە ئاوەدان بکاتەوە ئەوە شایستەی ئەو کەسەیە، ئەوانەی کە ئەحکامی نوێژەکانیان بۆ نقلّ کردوین هەر ئەوانیش ئەوەیان بۆ گێڕاوینەتەوە ئەوانیش هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله عنیه وسلم) بوون.

٣٠٧٧ – (ضعيف) عن سمرة، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَنْ أَحَاطَ حَائِطًا عَلَى أَرْضٍ فَهِيَ لَهُ).

واتە: عــوروە دەڵێــت: شـایەتی دەدەم کــە پێغەمبــەری خــوا (صــلی الله علیــه وســلم) فەرموویەتی: (هەرکەسێك دیواریّ بکات بە چواردەوری زەویــەکی وێرانــەدا ئــەوە بـــۆ خۆیەتی و موڵکی ئەوە).

**٣٠٧٨ - (صحيح مقطوع) عن مالك، قال هيشـام: الْعِـرْقُ الظَّـالِمُ أَنْ يَغْرِسَ الرَّجُلُ فِي أَرْضِ غَيْرِهِ فَيَسْتَحِقَّهَا بِذَلِكَ. قَـالَ مَالِـكٌ وَالْعِرْقُ الظَّالِمُ كُلُّ مَا أُخِذَ وَاحْتُفِرَ وَغُرِسَ بِغَيْرِ حَق.**

واتە: لە مالیکەوە هاتوە، کە هیشام وتویەتی: (الْعِرْقُ الظَّـالِم) واتە کەسیّ لە موڵکی کەسێکی تردا درەختیّ بچێنیّ بیەویّ خۆی بە خاوەنی ئەو زەویە بزانــیّ بــە چـاندنی ئــەو درەختە — ئەوە ستەمە بــەوە نابێتــە خــاوەنی و واجبــە درەختەکــەش هەڵکێشـرێت - . مالیك وتی: (الْعِرْقُ الظَّالِم) بریتیە لە هەموو شتیّ کە ببرێت یان هەڵکەنرێت یا بچێنرێت لەزەوی کەسێکی تردا بە نارەوا.

**٣٠٧٩ - (صحيح) عن أبو حميد الساعدي قال: غَزَوْتُ مَـعَ رَسُـولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَبُوكَ، فَلَمَّا أَتَى وَادِيَ الْقُرَى إِذَا امْرَأَةٌ فِي حَدِيقَةٍ لَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ لأَصْحَابِهِ: (اخْرُصُوا). فَخَرَصَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَشَرَةَ أَوْسُقٍ، فَقَالَ لِلْمَرْأَةِ (أَحْصِي مَا يَخْرُجُ مِنْهَـا). فَأَتَيْنَا تَبُوكَ، فَأَهْدَى مَلِكُ أَيْلَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَغْلَةً بَيْضَاءَ، وَكَسَـاهُ بُـرْدَةً، وَكَتَـبَ لَـهُ، يَعْنِـي بِبَحْرِهِ، قَالَ: فَلَمَّا أَتَيْنَا وَادِيَ الْقُرَى قَالَ لِلْمَرْأَةِ: (كَـمْ كَـانَ**

**فِي حَدِيقَتِكِ). قَالَتْ عَشَرَةَ أَوْسُقٍ خَرْصَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(إِنِّي مُتَعَجِّلٌ إِلَى الْمَدِينَةِ، فَمَنْ أَرَادَ مِنْكُمْ أَنْ يَتَعَجَّلَ مَعِي فَلْيَتَعَجَّلْ).**

واتە: لە ئەبو حومەیدی ساعیدیەوە هاتوە، کە وتویەتی: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بەشداری جەنگی تەبوکم کرد، کاتێ کە گەیشتە (وادی القری) دای بەلای ژنێکدا لەناو باخە خورماکەی خۆیدا بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هاوەڵەکانی فەرموو: (تەخمینی بکەن بزانن بەرهەمەکەی چەندە)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەخمینی کرد بە دە ئەوسەق – ئەوسەق پێوانەیە بوو – ، بە ژنەکەی فەرموو: (بەرهەمی باخەکەت بەتەواوی پێوانە بکەو پارێزگاری لێ بکە)، کاتێ کە گەیشتینە تەبوك، مەلیکی شاری ئەیلە – کە شارێ بوو لەسەر کەناری دەریا – ئێسترێکی سپی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەجیاتی دیاریەکەی بوردەیەکی پێ بەخشی و سەبارەت بە وڵاتەکەی و خاکەکەی بۆی نوسی، با لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بمێنێتەوە بەمەرجێ ساڵانە سەرانە(جزیە) بدات. ئەبو حومەید وتی: کاتێ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە تەبوك گەڕایەوەو گەیشتینە (وادی القری) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ژنەکەی فەرموو: (باخەکەت چەندە خورمای تێدا بوو؟)، وتی: دە ئەوسەق، رێك وەك تەخمینەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەرچو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (من رێگەیەکی نزیکم گرتۆتەبەر بەرەو مەدینە جا کێ حەز دەکات با زوو لەگەڵم بێت).

**٣٠٨٠ - (صحيح الإسناد) عن زينب: أَنَّهَا كَانَتْ تَفْلِي رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَعِنْدَهُ امْرَأَةُ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ وَنِسَاءٌ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ، وَهُنَّ يَشْتَكِينَ مَنَازِلَهُنَّ: أَنَّهَا تَضِيقُ عَلَيْهِنَّ وَيُخْرَجْنَ مِنْهَا، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ تُوَرَّثَ دُورَ الْمُهَاجِرِينَ النِّسَاءُ. فَمَاتَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ، فَوَرِثَتْهُ امْرَأَتُهُ دَارًا بِالْمَدِينَةِ.**

واتە: لە زەینەبی دایكی باوەڕداران و هاوسەری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێرنەوە، كە سەری پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) دەبژنی، لەوكاتەدا كۆمەڵێ لە ئافرەتانی (مهاجرین)كۆچەرانی لەلابو لەگەڵ هاوسەرەكەی پێشەوا (عُثْمَان)ی كوڕی عەفان رەزای خوای لێ بێ، سكاڵای ئەو خانوانەیان دەكرد كە تێیدا دەژیان، گوایە جێگایان تەنگەو ڕوبەریان كەمەو، لەدوای مردنی مێردەكانیشیان دەریان دەكەن تێیاندا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی دا ئافرەتانی كۆچەران لەدوای مردنی مێردەكانیان لەماڵەكانی خۆیاندا دەرنەكرێن بەڵكو ئەو ماڵە بۆ ئەوان بێت بە میراتی و بە موڵكیەت — ئەم بڕیارەش تایبەت بوو بەوانەوە چونكە لە مەدینە غەریب بوون و هۆزو كەسوكاریان نەبوو - ، (عَبْدُ اللَّه)ی كوڕی مەسعود مرد، ماڵەكەی مەدینەی بوو بە ماڵی هاوسەرەكەی بە میراتی.

## باسی ئەوەی دەربارەی زەوی خەراج هاتوە[1].

## ٣٨ - باب مَا جَاءَ فِي الدُّخُولِ فِي أَرْضِ الْخَرَاجِ.

**٣٠٨١ - (ضعيف الإسناد) عن معاذ قال: مَنْ عَقَدَ الْجِزْيَةَ فِي عُنُقِهِ فَقَدْ بَرِئَ مِمَّا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.**

واتە: لە (معاذ)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: ئەو کەسەی سەرانە لەسەر گەردنی خۆ لاببات ئەوە بەرییە لەوەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بوە — ئەگە زەوی یە باجی لێ دەدرا موسوڵمانێ بیکڕێ واجبە لەسەری باجەکەی بدات ئەگەر نەیدا ئەوە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نی یە - .

**٣٠٨٢ - (ضعيف الإسناد) عن أبو الدرداء قال: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (مَنْ أَخَذَ أَرْضًا بِجِزْيَتِهَا فَقَدِ اسْتَقَالَ هِجْرَتَهُ، وَمَنْ نَزَعَ صَغَارَ كَافِرٍ مِنْ عُنُقِهِ فَجَعَلَهُ فِي عُنُقِهِ فَقَدْ وَلَّى الإِسْلاَمَ ظَهْرَهُ). قَالَ: فَسَمِعَ مِنِّي خَالِدُ بْنُ مَعْدَانَ هَذَا الْحَدِيثَ، فَقَالَ لِي: أَشَبِيبٌ حَدَّثَكَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَإِذَا قَدِمْتَ فَسَلْهُ فَلْيَكْتُبْ إِلَيَّ بِالْحَدِيثِ. قَالَ: فَكَتَبَهُ لَهُ، فَلَمَّا قَدِمْتُ سَأَلَنِي خَالِدُ بْنُ مَعْدَانَ الْقِرْطَاسَ، فَأَعْطَيْتُهُ، فَلَمَّا قَرَأَهُ تَرَكَ مَا فِي يَدَيْهِ مِنَ الأَرْضِ حِينَ سَمِعَ ذَلِكَ.**

---

[1] - زەوی خەراج ئەو زەویەیە کە موسوڵمانان لەگەڵ کافران لەسەری ڕێك دەکەون کە زەویەکە بەدەست کافرەکان خۆیانەوە بێت بەمەرجێ ساڵانە باج بدەن بە موسوڵمانان.

واتە: لە ئەبو دەردائەوە دەگێڕنەوە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەو كەسەی زەویە بە باجەكەیەوە بكڕێت یان بیگرێت بە ئیجار ئەوە نزیكە (هیجرەت)كۆچەكەی بەتاڵ بكاتەوە، هەركەس سوكی و ریسوایی یە لەگەردنی كافرێ لابەرێت و بیكاتە گەردنی خۆیەوە نزیكە لەوەی پشت لە ئیسلام بكات). راوی وتی: كاتێ كە خالیدی كوڕی مەعدان ئەم فەرمودەی لێ بیستم، پێی وتم: شەبیب بۆی گێڕایتەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەگەر پێی گەیشتی داوای لێ بكە ئەم فەرمودەم بۆ بنوسێتەوە، راوی وتی: شەبیب بۆی نوسیەوە، كاتێ كە پێی گەیشتم خالیدی كوڕی مەعدان داوای نامەكەی كرد، منیش دامە دەستی، نامەكەی خوێندەوە بە بیستنی فەرمودەكە وازی هێنا لەو زەویانەی كە باجیان لەسەر بوو لەبەردەستیدا ئەودا بوون.

## باسی دەربارەی زەویەك كە پێشەوا یان كەسێ پارێزگاری لێ بكات.

## ٣٩ - باب فِي الأَرْضِ يَحْمِيهَا الإِمَامُ أَوِ الرَّجُلُ.

**٣٠٨٣ - (صحيح) عن الصعب بن جثامة: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (لاَ حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَمَى النَّقِيعَ.**

واتە: لە صەعبی كوڕی (جثامة)وە دەگێڕنەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (پارێزگاری لە لەوەڕ نیە بۆ كەسی تر مەگەر بۆ خوای گەورەو بۆ پێغەمبەرەكەی). ئیبنو شیهاب وتی: پێم گەیشتوە كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پارێزگاری لە زەوی نەقیع كردوە بۆ وشتری زەكات.

٣٠٨٤ – (حسن) عن الصعب بن جثامة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَمَى النَّقِيعَ وَقَالَ (لاَ حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).

واتە: لە صەعبی کوڕی (جثامـة)وە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پارێزگاری لە زەوی نەقیع کردوە بۆ وشتری زەکات، فەرمووی: (پارێزگاری لە لەوەڕ نیـە بۆ کەسی تر مەگەر بۆ خوای گەورە).

## باسی ئەوەی هاتوە سەبارەت بەشاراوەی کۆن.

## ٤٠ – باب مَا جَاءَ فِي الرِّكَازِ وَمَا فِيهِ.

٣٠٨٥ - (صحيح) عن أبو هريرة: أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَـالَ: (فِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ).

واتە: لە ئـەبو هـورەیرەوە دەگێڕنـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) فەرموویەتی: (لە شاراوەی کۆندا پێنج یەك هەیە).

٣٠٨٦ - (صحيح مقطوع) عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: الرِّكَازُ الْكَنْزُ الْعَادِيُّ.

واتە: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: (رکاز) واتە شاراوەی کۆن(عادی).

٣٠٨٧ - (ضعيف) عن ضباعة بنت الزبير بن عبد المطلب بن هاشم أنها قالت: ذَهَبَ الْمِقْدَادُ لِحَاجَتِهِ بِبَقِيعِ الْخَبْخَبَةِ فَإِذَا جُرَذٌ يُخْرِجُ مِنْ جُحْرٍ دِينَارًا، ثُمَّ لَمْ يَزَلْ يُخْرِجُ دِينَارًا دِينَارًا، حَتَّى أَخْرَجَ سَبْعَةَ عَشَرَ دِينَارًا، ثُمَّ أَخْرَجَ خِرْقَةً حَمْرَاءَ - يَعْنِي فِيهَا دِينَارٌ - فَكَانَتْ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ دِينَارًا، فَذَهَبَ بِهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَخْبَرَهُ، وَقَالَ لَهُ: خُذْ صَدَقَتَهَا. فَقَالَ لَهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (هَلْ هَوَيْتَ إِلَى الْجُحْرِ؟). قَالَ: لاَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا).

واتە: لە (ضباعة)ی کچی زوبێری کوڕی (عبد المطلب)ەوە دەگێڕنەوە، کە وتویەتی: میقداد رۆشت بۆ جێبەجێکردنی پێویستیەکی خۆی لە بەقیعی خەبخەبە شوێنێکە لەچواردەوری مەدینە، جرجێکی بینی لە کونێکەوە دینارێکی هێنایە دەرەوە، لەپاشدا بەردەوام دینار دینار دەیهێنایە دەرەوە هەتا گەیشتە حەڤدە دینار، ئینجا پەڕۆیەکی سوری دەرهێنا ئەویش دینارێکی تێدا بوو ئەوە کردیە هەژدە دینار، جا میقداد هەژدە دینارەکەی برد بۆ خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەواڵەکەی پێ راگەیاندو، پێی وت: هانێ پێنج یەکەکەی لێ دەرکە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (ئایا دەستت درێژ کرد بۆ کونەکە؟). وتی: نا، فەرمووی: (دەی خوای گەورە فەڕو بەرەکەتی تێ بخات بۆت). - ئەگەر لەکونەکدا دەری بهێنایە ئەوە پێنج یەکی دەکەوت و بە (رکاز)شاراوە حساب دەکرا - .

## باسی هەڵدانەوەی گۆڕی کۆن کە ماڵ و سامانی تێدا بێت.

## ٤١ - باب نَبْشِ الْقُبُورِ الْعَادِيَّةِ يَكُونُ فِيهَا الْمَالُ.

**٣٠٨٨ - (ضعيف) عن عبد الله بن عمر قال: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ حِينَ خَرَجْنَا مَعَهُ إِلَى الطَّائِفِ فَمَرَرْنَا بِقَبْرٍ، فَقَال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(هَذَا قَبْرُ أَبِي رِغَالٍ، وَكَانَ بِهَذَا الْحَرَمِ يَدْفَعُ عَنْهُ، فَلَمَّا خَرَجَ أَصَابَتْهُ النِّقْمَةُ الَّتِي أَصَابَتْ قَوْمَهُ بِهَذَا الْمَكَانِ، فَدُفِنَ فِيهِ، وَآيَةُ ذَلِكَ أَنَّهُ دُفِنَ مَعَهُ غُصْنٌ مِنْ ذَهَبٍ، إِنْ أَنْتُمْ نَبَشْتُمْ عَنْهُ أَصَبْتُمُوهُ مَعَهُ). فَابْتَدَرَهُ النَّاسُ فَاسْتَخْرَجُوا الْغُصْنَ.**

واتە: (عَبْدُ اللَّه)ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: کاتێ کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دەرچوین بۆ (طائف) دامان بەلای گۆڕێکدا گوێم لێ بو فەرمووی: (ئەمە گۆڕی ئەبو رغالە، خوای گەورە لەم حەرەمەدا سزای دا، کاتێ لە حەرەم هاتەدەرەوە توشی ئەو سزایە بوو کە قەومەکەی لەم جێگایەدا توشیان بوو، هەر لێرەشدا نێژرا، بەڵگەش ئەوەیە کە پارچەیە ئاڵتون کە لەشێوەی لقە دارێکدایە لەگەڵی خراوەتە ناو گۆڕەکەیەوە، ئەگەر ئێوە گۆڕەکەیتان هەڵدایەوە ئەوکاتە ئەو پارچە ئاڵتونەتان دەست دەکەوێت). خەڵك بە پەلە ڕۆشتن پارچە ئاڵتونەکەیان دەرهێنا.

بە پشتیوانی خوای گەورە

لێرەدا بەرگی سێیەم تەواو بوو

چاوەڕێی بەرگەکانی ترین.

## ناوەرۆك

**سەرەتای کتێبی قوربانیەکان.................................... ٥٩١**